

# مێژوویەک لە لوولەی تفەنگەوە



## ڕۆژگارە سەختەکانی شاخ (١٩٧٩-١٩٩١)



شەهاب کەریم



شەهاب کەریم

# مێژوویەک لە لوولەی تفەنگەوە

ڕۆژگارە سەختەکانی شاخ (١٩٧٩-١٩٩١)

## ناسنامەی کتێب

- ناوی کتێب : مێژوویەک لە لوولەی تفەنگەوە
- بابەت: یاداشتەکانی پێشمەرگایەتی
- نووسینی : شەهاب کەریم
- نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ٢٠٢٠.
- پێوانەی کتێب: ١٧ x ٢٤.
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ١٠٠٠٠ دینار



لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٥٦٢)ی ساڵی ٢٠٢٠ی پێدراوە

## پێشکەشە بە:

بە هەموو بنەماڵەی شەهیدان و تێکۆشەرانی دێرین و زیندانییانی سیاسی و ڕێکخستنەکانی نێو شار کە لە سەرەتای هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئازادیخوازی ڕزگاریی گەلی کورد بوونە قوربانی، بەو شەهیدانەی هەمیشە لەبەر چاومن، بە گیانی پاکی شەهید ئاراس عەبدولڕەحمان (مامۆستا پێشڕەو)ی نەمر کە لە ژووری سێدارەدا ڕووبەڕووی جەللادەکان پێدەکەنی، پێشکەشە بە بنەماڵەی شەهید یاسین کەریم (مام ئاراس)ی حسک کە لەنێو شۆڕشدا بە غەدر لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قورباندا گوللەباران کرا، پێشکەشە بە گیانی پاکی ڕەزاق وەهاب (شەهید وریا)، لەسەر نهێنییە شاراوەکانی نێو شۆڕش بەناهەق شەهید کرا و جەستەی شێوێنرا، پێشکەشە بە گیانی پاکی شەهید سالاری حاجی دەروێش کە بەبێ بەڵگە و تەنها لەسەر بیروڕای جیاواز بە فیشەکی گڕدار شەهید کرا، پێشکەشە بە گیانی پاکی شەهید جەباری عەلی عەوێز کە بەبێ ئاگاییبوونی لە هیچ تاوانێکدا، جەستەی فڕێ درایە نێو بیرێکی قووڵی تاریکەوە، پێشکەشە بەو مرۆڤانەی ڕێگای ڕاستییان ون نەکردووە، پێشکەشە بەوانەی لە پێناوی عەدالەتدا تێکۆشان و بەڵام بوونە قوربانیی دەستی تیرۆر...

## مێژوویەک لە لوولەی تفەنگەوە

تاکوو بەڕاستی تفەنگێکت بە دەستەوە نەبێت، تێناگەیت گوللە چی دەبڕێ و ئازارەکەی چۆنە! تاکوو پێشمەرگەیەکی گیانلەسەردەست نەبیت، تێناگەی نرخی گیانبەخشین چەندە و بەخشندەش کێیە! تاکوو پەلاماری نانەڕەقی نێو کوانووی ڕۆژانی خەبات نەدەیت، تێناگەیت برسێتی چییە! ئەمانە لێکدانەوە و پرسیارێکردنی کەسێکی سادەن بۆ ژیانێک کە ساڵانێکی زۆر چرەدووکەڵ و بۆنی بارووتی لە شار و شاخ و زیندانەکان هەڵگرتووە، پریشکی گڕ و پەڵەی بەجێماوی خوێنی شەهیدی لێ بەجێ ماوە. نووسینەوەی ئەم مێژووە، دیوێکی تری پێچەوانەی گێڕانەوە دێرینەکانە کە لە خەباتی پێشمەرگەوە بۆ جیهانە فراوانەکەی سیاسەت و دەسەلات تۆماریان کردووە. ئەو مێژووەی کە بەشێک لە دەسەڵاتداری کوردی نووسیویانەتەوە، بەئەنقەست ئەو پرسیارانەیان پشتگوێ خستووە کە وەڵامەکەی بە خراپ بەسەر خۆیاندا دەشکایەوە. ئیتر لێرەوە لوولەی تفەنگی پێشمەرگەیەکی دێرینی پڕ لە بەخشین و قوربانی دێتە دەنگ و هەندێک نهێنیی ڕاستەقینە بۆ مێژوو تۆمار دەکات، کە ڕەنگە تەقاندنی دوا فیشەکی تفەنگەکەی خۆی بێت.

کەچی جگە لە باخێک، بۆ دەرمانیش باخێکت لێ نەدەبینی! ئێواران منی منداڵ لە چاوەڕوانیی باوکمدا بووم، دەکرێت بڵێم هەموو هاوتەمەنەکانم هەر چاوەڕێ بوون باوکیان بێتەوە، باوکەکانی ئەوسامان هەموویان لە یەک دەچوون. ئای چەندە باوکی خۆم خۆش دەویست! ئەو لە مێژوودا پەرتووکێک بوو پڕ لە ئازار، پڕ لە نهێنی، پڕ لە فرمێسک، پڕ لە پرسیار... چەند نازدار بوو کە دەهاتەوەماڵەوە، ئیتر ماڵەکەمان بۆنی ژیانی لێ دەهات، هەمیشە خۆراکی لەگەڵ خۆیدا دەهێنایەوە. باوکم تامی باخێکی پڕ لە گوڵاڵە و نێرگزی بەهاری دەدا، باوکم تامی نانی ئێوارانی دەدا و منیش هەمیشە تامەزرۆی نێو ئامێزی بووم. ئەو ساتەی سەرم لەسەر ڕانی دادەنا، نەمدەزانی نەدەبوو وا بکەم، ئیتر خەو دەیبردمەوە. کە بۆنی باوکمم دەکرد، هەستم دەکرد باوکم بۆنێکی لێ دێت بە هیچ کەسێکی ترەوە ئەو بۆنەم نەکردبوو. بۆنێک بوو، هەمیشە منی دەبردەوە ناو دونیایەک کە ئیتر هەستم بە فڕین دەکرد بۆ شوێنە دوورەکان، بۆ ئاسمانی شین و سواری پەڵە هەورێک دەبووم. تا ئێوارەیەکیان بارانی فرمێسکی چاوەکانی باوکم، سەر گۆناکانی تەڕ کردم. زۆر زۆرم پێ سەیر بوو، پرسیارم لێ کرد: باوکە، ئەوە دەگریەیت؟ وەڵامی دایەوە و گوتی: نا کوڕم، ناگریم. منیش لەگەڵیدا دەستم کرد بە گریان. هەڵڕشتنی فرمێسکی پیاو گەلێک مەزنە، وەک جەمال غەمباری شاعیر دەڵێت: کاتێک پیاو دەگری، کەون خەلەلی تیایە. بۆیە لە ناخەوە هەردووکمان بۆ بەختەوەریی ئەو ڕۆژگارەمان دەگریاین.

یەکەم جارم بوو باوکم ببینم کە دەگری، بەڵام سەدان جار دایکمم بینیبوو گریابوو، لام وا بوو تەنها دایک یان ئافرەت دەگری، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ئێوارەیە باوکم وانەیەکی نوێی لە ژیان فێر کردم. گریانی باوکم هەموو ئەو پرسیارانەی لە هزرمدا دروست کرد، دەتوانم بڵێم تۆوی دەیان پرسیاری لە هزرمدا چاند: کۆیلەبوون، بێ وڵاتی، ئازادی، چوونە چیا، یاخیبوون، هەژاری، قوڕولیتاوی زەمەن، نابەرابەری... ئای لەو وانە قووڵەی لەسەر ڕانی باوکم فێری بووم! وانەیەک پڕ بوو لە یاساکانی ژیان، ئەو یاسایانەی ژیانیان کردووە بە دوو کەرتەوە، ئەو یاسایانەی مرۆڤایەتییان لەتوپەت

# پێشەکی

**پێشمەرگە**

یەکێک لە نەریتە کەسی و گرنگەکانی ژیانم، لەبیرنەکردنی هاوڕێ شەهید و زیندووەکانمە. ئەو شەهیدانەی سەربەرزییان بۆ کردینە خەڵات و بە خوێنی خۆیان ئازادییان بۆ فەراهەم کردین و بوونە قەڵغان، ئەو هاوڕێیانەی بە ماندووبوون و شەونخوونی و ژیانی خۆیان، بنەماڵەکانیان پاراستین و نەیانهێشت خەبات و خوێنی شەهیدانمان بەفیڕۆ بڕۆن و ئامانجەکانمان سەر بخەن و بمانخەنە قۆناغێکی نوێ لە ژیانی ئاسوودەیی بۆ ئەم نیشتمانە.

گەرچی بیروڕای جیاواز لە بەردەمماندا گوزەر دەکەن، بەڵام هەرگیز پیرۆزیی هیچ کامیان و بیرەوەریی ساتەوەختێکی سەختی خەبات و تێکۆشانیان لەبیر ناکەم و هەر خۆشم دەوێن. ئەوان ماندوو بوون و منیان پاراست، منیش بۆ ئەوان خوێنی خۆم بەخشی. ئەوان بەخشندە بوون و ئەوانەی لەم هەستەش تێناگەن، دڵنیا بن کە ژیانی سەختی شار و شاخیان نەدیوە و پەشیمانی دەنۆشن و خۆشەویستی خەبات و ئەم خاکەش نین.

وشەی پێشمەرگە لە ناخ و دەروونی مندا بە شێوازێک چەکەرەی کردبوو و ڕەگی داکوتا، بە چرکەش لێم جودا نابێتەوە، چونکە مەزنترین کەسی نێو خێزانەکەمان کە هەمووان شانازیمان پێوە دەکرد، هەڵگری مانای ئەو وشەیە بوو. ئەو مرۆڤە مەزنەش کێ بوو؟

کاتێک ئێواران هەتاو ماڵئاوایی دەکرد، هەموو ڕێبوارە ماندووەکان پەلەی گەڕانەوەیان بوو بۆ ماڵەکانیان، گەڕەکەکەی ئێمەش پڕ بوو لە خەڵکی ماندوو و پیشەکار و کرێکار و پاسەوان و بارکێش و شۆفێر و فەرمانبەر. جا چیی تێدا نەبوو! دەتگوت کەشتییەکەی نووحە، پیاوە پیرەکان سڵاوەکانیان بۆنی ژیانی لێ دەهات، قسەکانیان بەهەند وەردەگیران. گەڕەکەکەمان ناوی چوارباخ بوو،

کردووە، ئایا باوکم بە پلانَ وای کرد؟ یان پێشبینیی ئەوەی کردبوو کە کوڕەکەی گەورە دەبێت و دەچێتە چیا و ئەویش باجی ئازادیی کوڕەکەی دەدات و لە زینداندا دایدەڕزێنن؟

باوکم بە هەژاری ڕازی بوو، ئێستا ئازادییشی لێ سەنراوەتەوە، دوژمنێکی چەندە دڕندەمان هەبوو، ئێستا من بەزەییم بە باوکم و دوژمنەکەشمدا دێتەوە! کە ڕێگەی مەنفامان گرتە بەر، کە ئازادی خۆی نمایش کرد، ئیتر نەمتوانی لەوە زیاتر لای باوکم بم و ئەویش نەخۆشی و پیری تەنگی پێ هەڵچنی و گیانی بەخشییە ژیانی ئێمە. وەک لە سەرەوە ئاماژەم پێ داوە، باوکم لە چین و توێژێکی هەژار و خێزانێکی هەژاردا پەروەردە بووە. لە ڕاستیدا بە دەوڵەمەنترین مرۆڤی جیهانی دەزانم، زۆرترین سەروەت و سامانی مرۆیی بۆ بەجێ هێشتین و وەک بەشەمیرات بۆمان مایەوە و دابەشمان کرد بەسەر من و دوو برای ترمدا، هەر برایەکمان بەشەمیراتی خۆی بەر کەوت و ئەویش ناوی «پێشمەرگە» بوو، کە مەزنترین و پیرۆزترین ناو بوو. لەم بەشەمیراتەدا، بەنرخترین سامانی ماددی و مەعنەوی هەبوو کە مێژوویەکی پڕ سەروەریی بەجێماوی باوکم بوو. لە خێزانەکەماندا، یەکەم کەسی ئەندامی خێزانەکەمان «حسێن» کە برا گەورەمان بوو، بوو بە پێشمەرگە و بەندەش بە هەمان شێوە، دواتریش «نووری» برام بوو بە پێشمەرگە. لەگەڵ تەمەنی ژیانی پێشمەرگایەتیماندا، هەریەکەمان بە جۆرێک دەکەوینە ژێر شالاوی دەستگیرکردن و ئەشکەنجدان و حوکمدانمان لەلایەن حکومەتی بەعسی شۆڤێنی سەددام حسێنەوە. ئەمە جگە لەوەی باوکم خۆی لە شۆڕشی ئەیلوولدا بۆ ماوەی سێ ساڵ زیندانی دەکرێت، جارێکی تریش لەسەر بوونی من بە پێشمەرگەی یەکێتی، بۆ ماوەی دوو مانگ لە دائیرەی ئەمنی سلێمانی زیندان دەکرێتەوە، دواتریش برا گەورەکەم بۆ ماوەی پێنج ساڵ حوکم دەدرێت و نووریی براشم لەگەڵ چوار هاوڕێی شار و هاوسەنگەری شاخ، بۆ ماوەی بیست ساڵ حوکمی بەسەردا دەسەپێنرێت. دووان لە هاوڕێکانی کە یەکێکیان بە ناوی عەبدوڵڵای سدیق سوارە بوو کە خاڵۆزای دایکمە، لەسێدارە دەدرێت.

نووریی براشم لە سەرەتای ڕاپەڕینی سەرتاسەری ئازادکردنی کوردستان، لەگەڵ فەرەیدوون دارتاش و مامۆستا حەمە سەرسپی و چەند هاوڕێیەکی زیندانیدا ئازاد دەکرێت و بەندەش یەکەم کەس بووم، دوای هاتنەوەی ئاسۆی قومری لە شاخ کە بوو بە سیخوڕی ڕژێم، دەستگیر کرام و بۆ ماوەی بیست ساڵ حوکم درام و دواتر بە لێبوردنی گشتیی ڕژێم ئازاد کرام.

پاش ئەوەی بە ئەرکی سەرشانی خۆم زانیوە، ئەو ڕۆژگارانەی لەگەڵ هاوسەنگەران و ئەو تێکۆشەرانەی لە ڕۆژگارە سەختەکاندا پێکەوە خەباتمان دەکرد بۆ ئازادی و سەرفرازی و بەدیهێنانی مافی چارەنووسی گەلەکەمان، مێژووی پڕ سەروەری و ڕووداو و کارەساتی پڕ تراژیدیا دووچاری هێزی پێشمەرگە دەبوونەوە و ئەو زوڵمانەی کە لەلایەن هەندێک بەرپرسەوە لەژێر ڕکێفی یاسای شۆڕش و ئەقڵیەتی توندڕەوانەی شاخەوە ڕووبەڕووی هەندێک لە تێکۆشەری قارەمانی بێتاوان دەکران، هەندێک لەو چیرۆکانە بگێڕمەوە. ئەو چیرۆکانەی پێشمەرگەیان دووچاری شکست دەکرد و بەرەو هەڵدێریان دەبردن، هەندێک لە مێژووی ئەو خەباتگێڕانە لەم پەرتووکەدا بۆ نەوەی نوێ بە ڕاست و دروستی، بەبێ بەرژەوەندیی حیزبی و بەرژەوەندیی تاکەکەسی بخەمە بەر دیدی خوێنەر...

کاتێک کەسێک بیەوێت باس لە یادەوەری و مێژووی شۆڕش و جۆری دروستبوونی شۆڕش بکات، دەبێت خودی ئەو کەسایەتییە بەشداری نێو ئەو شۆڕش و چیرۆک و بەسەرهات و قوربانییانە بێت کە لە نزیکەوە ئاگادار بوون، یاخود خودی خۆی بەشێکی گرنگی مێژووی ئەو خەباتە بووبێت. گەر واش نەبێت، نووسینەوەیان هەمیشە زیندوو نابێت و ناچێتە قاڵبی گێڕانەوەی مێژووی خەباتگێڕان و سەروەریی شەهیدان و نەبەردییەکانی هاوسەنگەرانمان. ئەگەرچی ڕەنگە بە یاسای حیزب و داوای تاکەکەس مێژوو بنووسرێتەوە و پاداشت و خەڵات بکرێت، بەڵام ئەوەش دەبێتە کاری چەواشەکاری بۆ دەرخستن و هەڵماڵینی ڕاستییەکان و بۆ نەوەی نوێ و خراپ تێگەیشتنیان. دەمەوێت ئەوەش بڵێم، ئەگەرچی بە هۆی درکاندنی هەڵە و کەموکوڕی و تاوان

و تەنانەت کێشە و ململانێکان و ئەو گرفتانەی بە یاسای شاخ دەسەپێنران؛ ماندووم بکەن، بەڵام هێشتا ناگاتە یەک تاڵە مووی سەری تێکۆشەرێک کە ڕۆژگارێک بووە ژیان و حەز و ئارەزووەکانی بۆ میللەتەکەی وەلا خستووە و ناخۆشترین ڕۆژگاری ژیانی لە چیاکاندا بەسەر بردووە.

دەمەوێت ئەوەش بڵێم هەندێک بابەت و نووسراوم بڵاو بوونەتەوە، لێرەدا دووبارە بە سەرنج و تێبینییەوە نووسیومنەتەوە. هەروەها داوای لێبوردن لە تەواوی هاوسەنگەران و ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشار و ئەو بەڕێزانەش دەکەم کە ناویانم لەیاد نەماوە و ناویانم نەهێناوە. بەئومێدم توانیبێتم خزمەتێکی بچووکی تەواوی خەڵکی کوردستانم کردبێت، لە ڕێگای نووسینەوەی ئەم باسە کورتەی ئەو مێژووەی خۆم بەشێک بووم لێی. بەئەمانەتەوە ڕاستیی ڕووداوەکانم خستۆتە سەر پەڕەی کاغەز، وەک ئەرکێکی ئەخلاقی و بەرپرسیارێتییەکی خۆم، وەک پێشمەرگەیەکی خاک و خەڵکی کوردستان بەرامبەر نەوەکانی داهاتوومان ئەم مێژووە بنووسمەوە، ئومێد دەکەم زامی برینەکانم نەکولاندبێتنەوە، بەڵکوو لە ڕێگای دەرخستنی حەقیقەتەکانەوە؛ هۆکارێک بم بۆ سارێژکردنی ئەو زامانە.

## چۆن ئیسلام کەعبەی بەلاوە پیرۆزە،<br>منیش ئاوا ئەو خێزانەم لا پیرۆزە

لە سەرەتادا وەکوو هەستی پیرۆزی نەتەوایەتی، دواتر ئەو ستەمە بەرجەستانەی دەرهەق بە ڕۆڵەکانی گەلەکەمان دەکران لەلایەن دوژمنانی میللەتەکەمانەوە، کە خۆشەویستترین و پیرۆزترین کەسی نزیکی «باوکم»ی دووچاری برسێتی و هەژاری و زیندانی و بەراکەندەیی کردبوو، یەکێکە لە نموونە زۆر و زەوەندەکان، لە هەمان کاتیشدا وێنای ئەو پێشمەرگە قارەمانانەی بە نوێژی نیوەڕۆ و بەبەر چاوی خەڵکەوە لە سەنتەری شاری سلێمانی (بەردەرکی سەرا)دا گوللەباران کران.

ئەمانە هەموویان تابلۆیەکی ڕەنگاوڕەنگی پڕ لە قینی شۆڕشگێڕیی لە ناخمدا ڕواند، سەرباری ئەوانەش بێبەشکردن و دووریم لە نازی باوکایەتی، یاخیبوونی کردە هەوێنی بەرەنگاربوونەوەم لەهەمبەر ئەو دۆخە نامرۆییەی دوژمن بەسەرماندا سەپاندبووی. بێگومان ئەمە ڕەنگی دابووەوە بەسەر هەموو تاکێکی مەردی کورددا، هەموو ئەوانە قایل نەبوون سەر بۆ دوژمن شۆڕ بکەن. بۆیە دەکرێت بڵێین ئەمە وێنای ژیانی گەلێکی ستەمدیدەیە، کە لەسەر دەستی نەتەوەی ستەمکاری باڵادەستەوە نەخشێنراوە. خانەوادەکەی ئێمەش وەکوو زۆرێک لە خانەوادە ڕقئەستوور و شۆڕشگێڕەکانی دیکە و بە هۆی شۆڕشگێڕیی ئەندامانی خێزانەکەمانەوە، بە ژیانێکی پڕ مەینەتی گوزەرانمان دەکرد. هەژاری و برسێتی برستی لێ بڕیبووین و ئێمەی منالی پەپوولەئاسا خەونمان بەو بەهەشتەوە دەبینی کە باوباپیرانمان قسەیان لەسەر دەکرد، ناچار بووین شان بدەینە بەر کارکردن بۆ پەیداکردنی بژێوی. منەتێک نییە بە گەلەکەمی بفرۆشمەوە، بەڵکوو بە ئەرکێکی سەرشانی خۆمی دەزانم باسی لێوە بکەم کە هەموو ئەو نەهامەتییانەی بەسەر خێزانەکەماندا هاتبوو، لە سۆنگەی ڕەتکردنەوەی سەردانەواندن و دیلێتی و یەخسیرییەوە سەرچاوەی گرتبوو. بۆیە هەر لە تەمەنی مێردمناڵیمەوە هێشتا بەتەواوی تام و چێژی ژیانی هەرزەکاریم نەچەشتبوو، بەبێ ئینتیما بۆ هیچ ئایدۆلۆژیایەک و تەنها ڕۆحی کوردایەتی هاندەر و پاڵنەری سەرەکیم بوون کە وای لێ کردم وەکوو چەکدارێک بەرامبەر بە زوڵم و زۆرداری، بیر لەوە بکەمەوە دیلی و ژێردەستی لە ئۆغری ئازادی و سەربەستیدا بنێم و غەمی میللەتەکەم بکەمە کەشکۆڵ و ملی ڕێگەی پڕ هەورازی خەباتی سەخت بگرمە بەر. بێسەروشوێنبوونی سەربازی ونی «زاکیرەم»؛ کاکە «حسێن»ی برام، ئەو کوڕە قارەمانەی کە ڕۆشت گوڵ دەسکەنە بکات و لە قژی کچانی نیشتمانەکەمی بدات و نەهێڵێت چیتر قژی کچانمان دەسکەنە بکرێت بە دەستی فاشییەکان، ڕۆیشت و نەگەڕایەوە، لە چاوەڕوانیی ئەوی بێ گۆڕ و بێ کەس و بێ ناونیشان

کە کەس تا ئێستەش نازانێت ئاخۆ لە گەشتە بێسنوور و دوورمەوداکەیدا چیی بەسەر هات، کە هەرگیزاوهەرگیز چاوم پێ نەکەوتەوە و نەگەڕایەوە! ئەو لاوە خوێنگەرم و قارەمانەی کە کەس نازانێت لە دارستانێکدا یاخود لە چیایەکی بەرزدا گورگ خواردی، یان بوو بە نێچیری کەڵبەی بەعسییە لە گورگ دڕندەکان؟ تاکوو ئێستەش کە چل ساڵ لە خەیاڵدانمدا من بە ئازاری چارەنووسی هاوڕێم کاکە حسێنەوە، فرمێسک و هەناسەی سارد و حەسرەت بەرهەمیەتی، لە کاتی ئەم نووسینەشمدا خەریکە گریانێکی نەبڕاوە وەکوو کانییەکی سەرشێت بە چاوەکانمدا فرمێسکی بێئامان تیایاندا سەر دەکات و چاوم خوێنین دەکات. چی مەینەتییەکە منالێک خۆشەویستێکی بێسەروشوێن بکرێت و لە سۆز و ئەوینی دایکەوە، ناچاری بکەن بیر لەوە بکاتەوە باوەشی گەرمی دایکی تووڕ بدات و باوەش بە چەکدا بکات؟ جوانیی منالّی فڕێ بدات و لەگەڵ ناسۆرییەکانی ژیاندا دەستلەملان بێت؟ سینەی پەنگخواردووی پڕ لە جوانیی منالّیم، وا ئێستا پڕ بووە لە قین و تۆڵە لە ستەمکاران! ئێستاش ئەو ساتەوەختانە وەکوو چەقۆیەکی تیژ قەتماغەی یادەوەرییەکانم هەڵدەدەنەوە و ڕقئەستوور و تۆڵەستێنترم دەکات، وەکوو فیلمێک کە مەینەتییەکانی ژیان دەرهێنەریەتی و کاکە حسێنیشم پاڵەوانیەتی، خۆشم دەبمە گەڕیدەیەکی ماندوونەناس بەدوای «حەقیقەتدا» کە هیچ مرۆڤێکی سەرگۆی ئەم زەمینە پەیی پێ نەبات. هاوڕێ خۆشەویستەکەم؛ حسێن گیان، چیت بەسەر هات؟ پێدەشتەکانی کۆیە و هەولێر جێژووانت بوون، باڵای زرافت وەکوو دارچنار بۆ گڵگۆی حاجی قادر دەچەماندەوە و کڕنووشت بۆ شێعر و ئەدەبیات و غەزەلی کوردایەتی دەبرد. ئەگەر هاتیەوە، بە دەنگە هێمنە لەسەرخۆکەت بەئەسپایی بچپێنە و منیش دێمەوە لە حزوورتا دەبمە گوندییەکی بێئارام و بێئۆقرە، جارێکی تریش وانەی سەربەرزیت لێوە فێر دەبم... دژوارییەکان و سەختیی ژیان، ڕەنجی بازی بێبڕست و بێتاقەتیی کرێکاریم، سەرنگونیی دۆست و «ئەحبابم»، تەسلیمی پێلووی چاوە ماندووەکانی دایکم، بێبەشبوونم لە خوێندن و گیرفانی بێ

پارە و هەژاری، ئەو دێوەزمەیە ببووە خانەخوێ و ئێمەش ئێشکگرانی ئەو بووین. یاساغکردنی کوردبوون و لەبەرکردنی جلوبەرگی نەتەوایەتی و بە زمانی دایک قسەکردن و سووتماککردنی کوردستان، ناچاریان کردم چیتر بەرگەی نەگرم و هەنگاوەکانم بە بەرزەڕێی تونێلی مەرگدا گڕی بدەم و بەرەو ئاسۆی دژوار مل بنێم و چارەنووسێکی نادیاری لەگەڵدا ئاوێتە بکەم و ببم بە پێشمەرگە. وا دەزانم ئێستایە و تا ئێستەش وەکوو خۆی لەبەر چاومدایە کە لەگەڵ حسێنی لە خۆم گەورەتر، هۆشیارتر، فامیدەتر و کۆڵنەدەرتر دواتریش بڕیارمان دا. پێکەوە بڕیارمان دا ئیتر شەق لە ژیانی ترسنۆکانە بدەین، چیتر یەخسیری قبووڵ نەکەین، ژیانی خۆمان لە پێناوی نەتەوەکەماندا لەگرەو بنێین، هەردووکمان لە مەیدانی سەر پردەکەی سلێمانی کرێکاراندا یەکترمان ناسی و بە یەکتر ئاشنابووین، هەردووکمان عەودالی دوای هێزی بازوومان بووین، هەردووکمان بیرکردنەوەمان لێک نزیک و چوونیەک بوو، هەردووکمان نەتەوە و نیشتمان پەروەر بووین، بۆیە دوا بڕیارمان دا پێکەوە ببین بە پێشمەرگەیەکی دڵسۆز و بەئەمەک بۆ گەل و نیشتمان، تاوەکوو خەونی شۆڕشگێڕانەمان لە نەمانی ستەم و چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و چینایەتی بهێنینە دی. حسێنی براگەورەئاسام کاتێک باسی شۆڕش و زیندان و دەستدرێژییەکانی بەعسم بۆ دەگێڕایەوە، ورد ورد گوێی خۆی هەڵدەخست و بەسەرنجەوە دەیڕوانییە ڕووخسارم و هەموو ئەو وشە و ڕستانەی لە زارم دەهاتنە دەر، ئەو بەهەستەوە گوێبیستیان دەبوو و هەندێک جار قوڕگی پڕ گریان دەبوو. منیش ئەوم دەخستە ژێر پرسیارەوە، بەڵام وەڵامم دەستگیر نەدەبوو، دیار بوو لێوانلێو بوو لە ڕقی چینایەتی و داخلەدڵ بوو بەرامبەر بە ستەمی ئاغا و دەرەبەگ، ئەوەش وای لێ کردبوو زێدی خۆی جێ هیشتبوو و لە شاری سلێمانیدا گیرسابووەوە و بەکوڵەمەرگی ژیانی غوربەت و دوور لە کەسوکاری هەڵبژاردبوو. ئەو جگە لە گوێگرتن، هیچ نهێنییەکی خۆی نەدەدرکاند و هیچ ڕازێکی خۆی بۆ باس نەدەکردم، تەنانەت نەمدەزانی لە کوێ شەوگار بەسەر

دەبات، چونکە مەیدانی کرێکاران شوێنی ئێمە و بەیەکشادبوونەوەمان بوو. هەتا جارێکیان بەدزییەوە و بێ ئەوەی پێی بزانێت؛ بەدوای کەوتم، لە دواییدا بۆم ڕوون بووەوە و پێم زانی هۆتێلێکی لاکەوتەی پەڕپووتی کردووەتە نیشتمانی تاکەکەسیی خۆی. من و حسێن وەک دوو ڕێبواری پەڕاگەندە بەدوای حەقیقەت و بەرەنگاربوونەوە، بێ چارەنووس ڕێگای هاتونەهاتمان بە هەنگاوە پڕ مەترسییەکانمانەوە گرێ دا و بە هەورازی ڕووەو ئاسۆ هەڵزنایں، چووین شەرەفی نازناوی پێشمەرگە بە باڵای خۆماندا ببڕین. سەردەمانێک بوو جەستەی نەتەوەکەم خوێنی لێ دەچۆڕا، خاڵە شەهاب و هاوڕێکانی لەسێدارە درابوون، لە هەکاری براکان پشتی یەکتریان شکاند و خوێنی خۆیان دەمژی، گوندنشینانی سنوورە دەستکردەکان پەرتەوازە کرابوون... خوێنڕژانێک بوو پڕواپڕ لە نەهامەتی، سیخناخ لە کارەساتی لێوانلێو لە مەرگ و قاتوقڕی، من وەکوو زەڕنەقووتەیەکی بێ پەڕ و باڵی تازە لە هێلکە چەکەرەکردوودا بووم، سەرم لە سیاسەت و کاری ڕێکخستن دەرنەدەکرد، سەرەڕای پێشمەرگایەتی و ژیانی پڕ لە کەند و سەختی چەکداری بەرامبەر بە دڕندەترین ڕژێمی سەردەم. لە ڕێگەی چەند کەسێکی هاوڕێی قوتابخانە و سەردەمی منالیمەوە، شوێن و ناونیشانی کەسێکیان پێ دام لە پێنجوێن بە ناوی «عومەر». پاش گەیشتنمان بۆ پێنجوێن، خۆمان پێ ناساند. ئەو هاوڕێیانەم کە لە کاتی منالیدا لە قوتابخانەدا لەگەڵمدا بوون و پێکەوە بووین: کاک فوئاد ناسراو بە «هەڵگورد»، مۆفەق ناسراو بە «ئارام»، خەباتی شێخ جەنابی برازای شەهید خاڵە شەهاب؛ ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، هاوڕێی یەک بووین، کە زۆربەی کاتی دوای قوتابخانەمان لە کۆلان و بەر دەرگای ماڵی خەباتی شێخ جەناب بەسەر دەبرد. مۆفەق کە زۆر بڕوا و متمانەم پێی بوو، ڕێنیشاندەرم بوو بۆ گەیشتن بە کەسێکی متمانەپێکراو لە پێنجوێن، لەو کاتەشدا برا گەورەکەی بە ناوی فایەق لەسەر پەیوەندیکردنیەوە بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدرانی کوردستانەوە، لە «دائیرەی ئەمن»ی

سلێمانی زیندان کرابوو، بە هەمان شێوە برایەکی عومەری ڕێنیشاندەرمان بۆ ناو هێزی پێشمەرگە، لەگەڵ فایەقدا لە زینداندا پێکەوە بوون، هەر ئەوەش ببووە هۆکاری ئەوەی ئێمەش بڕوا و متمانەی تەواومان بە عومەر هەبێت و تاکوو ئەوەی لە ڕێگەی ئەوەوە هاوکاری بکرێین و بگەینە ناو سنووری هێزی پێشمەرگەوە کە لەو کاتەدا بینینی پێشمەرگە و شوێنی دیاریکراویان زەحمەت بوو.

چوونی من و کاک حسێنی هاوڕێم بۆ پێنجوێن، جگە لەوەی هەڵەیەکی زۆر گەورە بوو، لە هەمان کاتیشدا سامناک و مەترسیداریش بوو. لە ساڵی ١٩٧٩دا لە تەمەنی (١٧) ساڵیدا درکم بە زۆر شت نەدەکرد، مرۆڤ لەو تەمەنەدا لەو بڕوایەدام بەئاستەم بتوانێت چاکە و خراپەی خۆی لێک جیا بکاتەوە. لەگەڵ کاکە حسێنی هاوڕێمدا، بێ سڵکردنەوە و بێ گوێدانە مەرگ، لە سلێمانییەوە باروبنەی قینی شۆڕشگێڕانەمان پێچایەوە و هەردووکمان بەرەو پێنجوێن بەڕێ کەوتین و لەوێش خۆمان گەیاندە کەسی دەستنیشانکراو کە برایەکی لەژێر چنگی بەعسییەکاندا لە زینداندا بوو ئەویش عومەر بوو، دوای ئەوەی سڵاو و ڕێزی ئارامی هاوڕێمان پێ گەیاند و داواکاریی خۆشمان بۆ چاوساغیکردنمان بۆ ناو هێزی پێشمەرگە پێ ڕاگەیاند. لە ڕاستیدا زۆر ڕێزی لێ گرتین و پێی ڕاگەیاندین بێگومان هاوکاریتان دەکەم و هەر چی داواکاریی ترتان هەیە، بۆتان جێبەجێ دەکەم. فەرمووی لێ کردین و بەدەم بیرکردنەوەوە بردینی لە چایخانەیەکی بچووکدا داینیشاندین و دوای ئەوەی دوو چای بۆ بانگ کردین و پێی ڕاگەیاندین و وتی: «ئێوە ماندوون و لێرەدا پشوویەک بدەن، منیش هەندێک کاری تایبەتیم هەیە و دەچمەماڵەوە و خێزانەکەم ئاگادار دەکەمەوە، بۆ ئەوەی خواردن و پێداویستیمان بۆ ئامادە بکات. لەم چایخانەدا بۆ نیوکاتژمێر دانیشن و پشوو بدەن و مەچن بە هیچ لایەکدا، تا وەکوو دەگەڕێمەوە بۆ لاتان.» کاتێک عومەر قسەکانی تەواو کرد و ڕۆشت و بەجێی هێشتین و هەر ئەوەندەی لەبەر چاو ون بوو، خاوەن چایخانەکە لەبەر ئەوەی گوێی بۆ قسەکانمان هەڵخستبوو، ئاگای

لە تەواوی پلان و بەرنامەی ئێمە و عومەر بوو، بەپەشۆکاوییەوە هاواری لێ کردین وتی: «نەگبەتینە، هەستن زوو خۆتان دەرباز بکەن، ئەو عومەرە بەکرێگیراوی بەعسە!» ئێمە لە ڕاستیدا نەمانزانیبوو کە عومەر بەتەواوی پێچەوانەی ڕەفتار و باوەڕ و کرداری برا قارەمانەکەیەتی کە لەژێر چنگی ڕژێمی بەعسدا لە زیندانی ئەمنی سلێمانیدا لەژێر ئازار و ئەشکەنجەدا بوو. قسەکانی خاوەن چایخانەکە شپرزەی کردین و لەگەڵ ئەوەشدا من خەڵکی شاری سلێمانی بووم و کاکە حسێنی هاوڕێشم خەڵکی کۆیە بوو، هەردووکمان نەشارەزا بووین، چونکە بۆ یەکەم جارمان بوو پێنجوێن ببینین و نەشماندەزانی ڕوو لە کوێ بکەین و بەتایبەتی لەو سەردەمەشدا پێنجوێن بە شێوەی ئێستە زۆر گەورە نەبوو، لە کەمترین کاتدا ئاشکرا دەبوویت، هەر ئەوەندەمان پێ کرا بەپەلە لە چایخانەکە وەدەرکەوین و بەهەڵەداوان خۆمان دوور خستەوە. لە سەرەتاوە دەبووایە ئێمەی بێئەزموون هەستمان پێ بکردایە، بەڵام ئەو هیچ ترس و سڵەمینەوەیەکی تێدا بەدی نەدەکرا و ڕاستەوخۆ لەگەڵ داواکاری و قسەکانی ئێمەدا هاوڕا بوو، بەڵام سەرنجی بچووکی من ئەوە بوو کاتێک قسەمان بۆ دەکرد و باسی سنووری هێزی پێشمەرگەمان دەکرد، دیار بوو ئەو خەیاڵی بە لایەکی تردا دەڕۆشت. یەکبینا و بێوچان، بە ڕۆشتنی نیمچەڕاکردنێکەوە، بە هەنگاوی پەلەی بێپسانەوە، تەپوتۆز لە بنی پێڵاوەکانماندا بڵند دەبووەوە، جارجارەش نەرمەڕاکردن، تەنگەنەفەسی دەکردین. ترس و دڵەڕاوکێمان بە قۆناغی یەکەمی غەدر و خیانەت لە عومەرەوە دەستی پێ کرد، ڕەنگ هەڵبزرکاو و گەروو وشک و بێ ئاو، ئارەقە لە سەرتاپای جەستەماندا دادەچۆڕا، خۆشمان نەماندەزانی چی ئاڕاستەیەکمان گرتووە و بەرەو کوێ مل دەنێین! تا نزیکی خۆرئاوابوون، ڕوو لە باشووری پێنجوێن هیلاک وماندوو شۆڕ بووینەوە، لە دواییدا بیستمانەوە قوتابخانە و مزگەوت و شەقام و کۆڵانەکانی پێنجوێن پڕ ببوون لە چەکدارانی ڕژێم و زۆر شوێن بەدوای ئێمەدا گەڕابوون. جێگەی ئاماژەیە کە ئارامی هاوڕێم لە پەیوەندیکردنی عومەر بە ڕژێمی بەعسەوە بێئاگا

بوو. بەڕێکەوت لە کۆلانێکدا تووشی ئافرەتێک هاتین، کە لەبەردەم ماڵەکەی خۆیاندا لە چاوەڕوانیی هاوسەرەکەیدا دانیشتبوو، پاش ئەوەی سلاومان لێ کرد و پێمان وت: «ئێمە خەڵکی شاری سلێمانین و لێرەش کەس ناناسین و هیچ شوێنێکیش شک نابەین و ئۆتۆمبێلیش نەماوە تاوەکوو بگەڕێینەوە بۆ سلێمانی، گەر نەبێتە ئەرک و ماندووبوون، هەر چۆنێک بێت هاوکاریمان بکەیت!» لە ڕاستیدا بۆ مێژوو دەڵێم، ئەو ئافرەتە شێرەژنی تەنگانە و مەرد و مەستوور و مرۆڤدۆست بوو، ڕاستەوخۆ فەرمووی لێ کردین و بەرەو ناو خانووە خنجیلانە بچکۆلەکەی پێشمان کەوت. لەدوای نیوکاتژمێر هاوسەرەکەشی هاتەوە و هەرکە چاوی بە ئێمە کەوت، بەشاگەشکەییەوە وتی: «ئەرێ ئافرەت ئەمانە خۆیانن!» لەگەڵ وای وت، من بەجارێک ئەژنۆم شل بوو و لە دڵی خۆمدا وتم: «لە دەمی گورگ بەر بووین و کەوتینە قوڕگی شێرەوە. ئەمیش لە عومەری سیخوڕی بەعس خراپتر دەرچوو!» خاوەن ماڵەکە دوای تێڕامانێنێکی ورد و درشت لێمان، ڕووی دەمی لە من کرد و بە سەربادانەوە وتی: «کوڕم، ئەوە چیتان قەوماندووە؟ خۆ سێ بەشی پێنجوێنتان لێ تەنراوە! تەواوی کووچە و کۆلانەکانی شار لەلایەن چەکدارانی ڕژێمەوە کۆنترۆڵ کراوە، گوایە دوو پێشمەرگە بە چەک و تفاقەوە لەناو پێنجوێندا دەسووڕێنەوە و منەی ئەوە دەکەن زەبرێک بوەشێنن! هەموو دامودەزگاکانی بەعس کەوتوونەتە ‹ئینزارەوە›!» بە ڕووخسارێکی نائومێد و چاو بەبەزەییەوە، بێ چاو نووقاندن پێی ڕاگەیاندین: «کوڕەکانم، ئاخر چۆن بە ڕۆژی ڕووناک لە ناوجەرگەی شاردا چالاکیی پێشمەرگە دەکرێت؟» لە ڕاستیدا جگە لەوەی من نەمدەزانی چەک چۆن بەکار دێت، نەشمدەزانی چالاکی مانای چییە، بۆیە لە وەلامدا وتم: «خاڵە گیان، بڕوا بکە ئێمە لێرە کەس ناناسین و بگرە شارەزای ناو پێنجوێن نین و ئەمەش یەکەم جارمانە ڕێمان بکەوێتە ئێرە، هەر چەندە کارێکی قورسە بۆ جەنابتان، بەڵکوو هەر چۆنێک بێت یارمەتیمان بدەیت و بە چی جۆرێک بێت ڕزگارمان بکەیت و بمانگەیەنیتە سنووری ناو هێزی پێشمەرگە!» ئەو پیاوە مرۆڤدۆست و

کوردپەروەر بوو، هەمان هەڵوێستی مەردانەی هاوسەرەکەی، بەبێ ترس و زۆر قارەمانانە دڵی داینەوە و بەڵێنی چاوساغیی پێ داین و وتی: «بێخەم بن لەوەی ڕێگاتان پیشان دەدەم!» بەدەم گفتوگۆوە پێی ڕاگەیاندین کە سەرکەوتوو نابین، بەڵام بە ویژدانی مەردایەتییەوە بەهانامانەوە هات و بەدڵفراوانییەوە خێزانەکەشی ئاگادار کردەوە بەوەی کە خواردنمان بۆ ڕێگا بۆ ئامادە بکات لەگەڵ خۆماندا بیبەین، نەبا لە ڕێگادا ماندوو بین و برسیمان بێت. دوای پشوویەکی باش لەوماڵەدا، ماڵئاواییمان لێ کردن و پیاوەکەش ویژدانی ئاسوودە نەبوو هەر ئاوا بەئاسانی دەستبەرداری دوو گەنجی نەشارەزا و بێچارەنووس بێت، خۆشی هاوشانی ئێمە کەوتە ڕێ و نزیکەی دوو کیلۆمەترێک لە دەرەوەی پێنجوێنی دوور خستینەوە و پاشان بەوردی چۆنیەتیی ڕێگاوبانەکە و ئامۆژگاریی خۆی پێ ڕاگەیاندین و وتی: «لە ڕێگەدا ئەملا و ئەولا مەکەن و چۆنم بۆ دەستنیشان کردوون، بەو شێوەیە بڕۆن. گەر هەڵەش بکەن، ئەوا دەکەونە ناو بۆسەی (ڕەبایەی) دوژمنەوە. ئەو نەخشەیەی بۆم کێشاون، دوای دوو کاتژمێر بەپێ دەگەنە ئاوێکی خوڕ، بەوریاییەوە لە ئاوە خوڕەکە بدەن و دەستی یەکتر بگرن، تا ناوقەدتان ئاوەکە قووڵە. کە پەڕینەوە ئەوبەر، دوو تا سێ کاتژمێری تر دەگەنە ناوچەی ئازادکراوەکان و ئیتر مەترسن، بەسەلامەتی بگەنە شوێنی خۆتان.» بە نائومێدییەکی زۆرەوە بەجێی هێشتین. بەداخەوە ئەگەرچی دوای ڕاپەڕینی سەرتاسەریی ئازادبوونی تەواوی کوردستان، چەند جارێکیش تەنها بۆ بەسەرکردنەوەی خاوەن ئەم ماڵە دڵسۆز و مرۆڤدۆستە سەردانی ئەو شوێنەم کردووە لە پێنجوێن، تەنها مێژوویەکی بچووکی ئەو ماڵەشم بۆ ڕوون نەبووەوە، ئاخۆ بۆ هەتاهەتایە هەردووکیان ماڵئاواییان لە ژیان کرد؟ یان بە هۆی دڵسۆزی و کوردپەروەریی خۆیانەوە ڕادەستی زیندانەکان کراون و بێسەروشوێن کراون؟ بۆیە هەمیشە دەڵێم چۆن ئیسلام کەعبەی بەلاوە پیرۆزە، منیش بەو شێوەیە ئەو ماڵەم لەلا پیرۆزە...

# هەنگاونان بەرەو ئاسۆ

خانەخوێی بەویژدان، جوامێرانە لێمان جودا بووەوە و خاوەن ماڵ گەڕایەوە، ئێمەش ملی ڕێگامان گرتە بەر. نەرمەبایەکی سارد و شنەی گەڵا و چریکەی ناوناوەی باڵندە و تەقەی تاکوتەرای سەربازە زارەترەکچووەکانی ناو ڕەبایەکان و خشەی شەڕواڵەکانمان و خیزەی هەناسەی سییەکانمان، چپەچپی نێوان من و هاوڕێکەم (حسێن) لەبەر ترووسکەی جریوەی ئەستێرەکاندا؛ لەناو یەکتردا تێکەڵ دەبوون. ئەستێرەکان چەشنی کچۆڵەی شەرمنی هەرزەکار، بەسەر سەرمانەوە سەرەتاتکێیان دەکرد، تێکەڵ بەیەک بووبوون، هەموو ئەمانە چەندە دژ بە یەک بوون، بەڵام وەک سیمفۆنیایەک دەهاتە بەر گوێم. سیمفۆنیای مەرگ، مەرگ لە پێناو گەڕان بەدوای هەقیقەت و ڕەتکردنەوەی ستەم و چەوسانەوە. لە ڕاستیدا مارشێک بوو، مارشی سەربازی کە پڕی بوو لە ئاوازی مەرگەسات و خوێن و مردن. تەپەی پێمان هەر لە تەپڵی فەنابوون دەچوو. شەوێکی دەیجوور بوو، وەکوو کۆرپەلە توند ئێمەی بە باوەشی خۆیەوە نووساندبوو. چۆن دایک کۆرپەکەی دەخەوێنیت و لایلایەی بۆ دەکات، بەو شێوەیە لایلایەی بۆ دەکردین و دڵی دەداینەوە و پێی دەگوتین: «مەترسن، شەو قەڵای مەردانە. هیممەت بکەن و هەنگاوەکانتان پێکەوە گرێ بدەن و وچان مەدەن، هاکا گەیشتنە مەزاری ئەو هەقیقەتە مردووەی ئێوە پێتان وایە زیندووە!»

ئاوەها هێدی هێدی هەنگاوەکانمان خاو دەبوونەوە، برستمان لێ بڕا و شل و شەکەت بووین، ئێمە گەشتی وا ترسناک و دوورودرێژمان نەبینیبوو، بۆیە بەناچاری دوای ئەوەی چەندین فرسەخ دوور کەوتبووینەوە، لەپەنا تاوێرێکدا لەسەر گازەرای پشت خۆمان دا بە زەویدا. جەستەمان شەلاڵی ئارەقە و هەناسەی مەرگمان تێکەڵ بە هەوای سارد بووبوو. تاوێک سەیری قووڵایی ئاسمانمان دەکرد، خەریک دەبوو خەو دەیبردینەوە،

ڕاست بووینەوە و پریاسکەکەمان هێنایە پێشەوە و کردمانەوە، هەندێک تەماتە و نان و هێلکەمان دەرهێنا و لەو دەمەدا بەراوردی نێوان «عومەری سیخوڕ» و «عومەری خانەخوێ»ی مرۆڤپەروەر بەرەو قووڵایی خەیاڵێکی بێسەروبن پەلکێشیان کردم. بە ئاهێکی ساردی پڕ شۆک و سەرسامی، خەیاڵەکەم پچڕاند و لەگەڵ «حسێن»ی هاوڕێمدا دەستمان بە ژەمە ناوەختی خواردنی ماندوویێتی کرد. چێژی ئەو خواردنە و بەهانای خاوەنەکەی، ورەبەخش بوون. لە دواییدا لەبەر تیشکی ئامۆژگاریی خانەخوێکەمان، بە مێشکی جەنجاڵەوە بەبێ ئەملا و ئەولا کردن، ڕێک ئەو تووڵەڕێیەمان گرت. پاشان گەیشتینە چەمێکی خوڕ، چەمێک ژیانمی گۆڕی. لەوێ کەوتینە بیرکردنەوە بۆ ئەوەی کارێک بکەین ئاوی چەمەکە نەمانبات و بگەینە ئەوبەر چەمەکە. قسەکانی خانەخوێ دەستی هەردووکمانی پێکەوە گرێ دا و هێواش هێواش قولەپێمان خستە ناو ئاوەکەوە و کەوتینە هەوڵی پەڕینەوە. لە دڵی خۆمدا زۆر دەترسام و هانام بۆ هێزێکی نادیار دەبرد، تاوەکوو لەم ئاوە دەربازمان بکات. زەحمەتی ئەو ساتەوەختە لە گێڕانەوە نایەت، دژوارترین و پڕمەترسیدارترین ساتەکانی ژیانم بوو تا ئەو کاتەی لە ئاوەکە چووینە ئەوبەرەوە. بەڵام کاکە «حسێن»ی هاوڕێم لە من گەورەتر و هێمن و لەسەرخۆ و بەسەبر و بەتەحەمولتریش بوو. جارجارەش دەنگی سەیروسەمەرە دەهاتە بەر گوێم و پەردەی گوێکانمی دەلەراندەوە، گوتم: «کاک حسێن ئەو دەنگانە چین؟» وەڵامی دایەوە و وتی: «مەترسە، گیانداری خشۆک و چەقەڵ و گورگن، بمانخۆن باشترە لەوەی سیخوڕێک بازرگانی بە خوێنمانەوە بکات!» شەرمم نەکرد، ترسی خۆمم دەربڕی، چونکە لە تەمەنمدا تراژیدیای وام نەبینیبوو. ئاخر منێکی مێردمنداڵی بێتاوان لە کوێ و ئەم هەموو ڕووداوە سەیروسەمەرە لەناکاوەی لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا بەسەرمدا هات، لە کوێ؟ قەدەرە و هاتووە و بە ویستی خۆم بەپیریەوە چووم و دەبێت بەرگەی بگرم. بەدەم ڕێگەوە هەزار و یەک غەم و خەیاڵ بە مێشکمدا گوزەریان دەکرد، خەریک بوو لە پەلوپۆی دەخستم. نزیکەی

کاتژمێرێک ڕێگابڕینی پڕ لە دڵەڕاوکێ، بە خۆمان نەزانیبوو کە تەواو لە ڕەبایەیەکی دوژمن نزیک کەوتبووینەوە، بە جۆرێک گوێمان لە دەمەتەقێی نێوان سەربازەکان بوو. خێرا دوور کەوتینەوە لە ڕەبایەکە، بەڵام ئەوان ناوبەناو فیشەکی گڕداریان بەو ناوەدا دەتەقاند، ئەمەش زیاتر هانی دەداین ماندوویێتی لەبیر خۆمان بەرینەوە. ئێمە لە ترسی ئەوان و ئەوانیش لە ترسی ڕۆحی خۆیان، ئەوان بە تەقەی تفەنگ و ئێمەش بە ترپەی دڵ و هەناسەی ساردمان...

ئەو شەوە ترسناک بوو، چۆقەچۆقی ددانی هاوڕێ نەخۆش و لەرزوتالێگرتووەکەم وەک دەنگی کەمانچەی سامناک دەهاتە بەر گوێم، وەلێ خوڕەی ئاوی چەمەکە هەموو شتێکی لەبیر بردینەوە. چەکەکەم لە باوەش دەنا و دەمخستەوە شانم، دامدەگرتە خوارەوە و ئاوڕێکی ئەملا و ئەولای خۆم دەدایەوە و ماچێکم دەکرد و دەمخستەوە باوەشم، وەک بڵێی منی مێردمنداڵ، کۆرپەلەی نۆبەرەی خۆم دەلاوێنمەوە، ئاوا قسەم لەگەڵیدا دەکرد. «تۆ بیرت نییە، هێشتا تۆم نەبوویت، ڕۆژێکیان لە دەمەدەمی هەرەسی شۆڕشدا بوو، پێشمەرگەیەک خۆی ڕادەستی دوژمن کردبوو. لەبەر دەرکی سەرادا و بەبەر چاوی حەشامەتێکی زۆرەوە، بە پێڵاوە دڕاوە لاستیکەکانیەوە، ئەفسەرێکی بەعسی دا بە زەویدا و چووە سەر سەری و پاشان تەواوی پیاوانی ڕژێم و سیخوڕەکانی تێی ئاڵان و زۆریان لێ دا، خوێن لە سەرتاپای جەستەیەوە دەچۆڕی... ڕۆڵە، من بۆیە تۆ لە ئامێزی خۆمدا دەلاوێنمەوە، دەمەوێت تۆڵەی فرمێسکی ئەو خوشک و دایکەی ڕۆڵەی شەهیدانەم بۆ وەربگریتەوە. مەهێڵە جووتیارەکان ڕەز و باخیان بسووتێت، مەهێڵە ئافرەتمان ئەتک و منداڵمان بە توونی ئاگری شۆفێنزماندا بکرێت. من تۆم لە بیلبیلەی چاوم خۆشتر دەوێت، چونکە تۆ ئاوات و ئامانجی بەرزی پاشەڕۆژی ژیانمیت، داڵدەمی و پشتوپەنامیت. تۆ دوا ئاواتمی و ئومێدی گەورەم پێتە. گەلێک هەوڵم دا نۆبەرەکەم قەڵەم و کاغەز بێت، بەڵام نەیانهێشت و لەباریان برد. شوکر تۆم هەیت...» شڵپ و هوڕی لەناکاوی

چەمەکە، زریزەی ئەم خەیاڵە بێسەروبنەمی یەک یەک لێک ترازاند. من و کاکە حسێنی هاوڕێ و برام، یەکسەر توند خۆمان دا بە زەویدا و خۆمان پێوە نووساند. لەپڕێکدا زەلامێک بە سواری هێسترەکەیەوە خۆی کرد بەمبەری ئاوەکەدا، دوای تەواو لێوردبوونەوەی، ئاهێکمان وەبەردا هاتەوە و دڵنیا بووین لەوەی ئەم جارەش سەلامەت دەردەچین. هەرکە سوارەکە بە ئێسترەکەیەوە پەڕییەوە و هاتە ئەمبەرەوە، ئێمەش زۆر بەخێرایی و یەکسەر لە بەردەمیا بەرزەپێ هەستاینە سەر پێ و هێسترەکەش بە بار و خاوەنەکەی سەریەوە سڵەمییەوە. کاتێک کابرای قاچاخچی بە دڵنیایی و سەرسامییەکی تێکەڵەوە لێمان ڕاما، چونکە کە قسەشمان لەگەڵدا دەکرد، ئەو وەڵامی نەدەدایەوە. لەپڕ دەرکەوتنی ئێمە و هەستانە سەرپێی کتوپڕمان، ترساندبووی. بە شێوازێک ترس دایگرتبوو، دوای چەند خولەکێک هاتەوە سەر خۆی و وەکوو ئەوەی تازەبەتازە قسەکانی ئێمە لە گوێیدا بزرنگێتەوە. پاشان بۆی ڕوون بووەوە کە ئێمە لێقەوماوین و لەسەر وڵاخەکەی دابەزی و کەوتە پرسیارلێکردنمان: «ئەوە خێرە، چی دەکەن لێرە؟ ئێوە چی کارەن و بۆچی گەیشتوونەتە ئێرە؟» ئێمەش بەسەرهاتی خۆمان بە ورد و درشتی و بەخێرایی بۆ باس کرد، ئەویش بێ یەک و دوو ئامادەیی خۆی بۆ هاوکاریکردنمان دەربڕی. بێگومان وەڵامەکەی ئەو بەلای ئێمەوە نامۆ نەبوو، کە داوای پارەی لێ کردین لەبەرامبەر پەڕینەوە و ڕێنماییکردنمان و وتی: «هەریەکەتان بە دە دینار دەپەڕێنمەوە. خۆ ئەگەر بتانەوێت بتانگەیەنمە ناو ئاوایی، بۆ ئەوەش یەکی پانزە دینارتان لێ دەستێنم.» من ئەو کاتە سی و پێنج دینار و حسێنی هاوڕێم چل دیناری پێ بوو. ئێمەش ڕازی بووین و یەک یەک بە سواری هێسترەکەی پەڕاندینیەوە و پێی وتین: «مەترسن، دانیشن و پشوویەک لێرە بدەن، ئێرە ترسی نییە. من دەچمە ئەوبەر و دەبێت بگەمە لای هەندێک بارهەڵگر کە چاوەڕێمن، بارەکەیان ڕادەست دەکەم و دەگەڕێمەوە لاتان و لەگەڵ خۆمدا دەتانبەم بۆ شوێنی مەبەست.» موچرکەی خۆشی و شادی جەستەمانی داگرتبوو، هەر چی ناخۆشی و

ترس و دڵەڕاوکێ و ماندووبوونی ڕێگاوبان بەسەرماندا هاتبوو، هەموویمان لەبیر چووەوە. لە شوێنی خۆماندا ڕاکشاین، پێڵووی چاوەکانم قورس ببوون و لە زۆرانبازیی خۆم و نیمچەخەودا بووم. هات و هاواری قاچاخچییەکە ڕایچڵەکاندم و خەوی لە چاوەکانم تۆراند و زۆر بەخێرایی وتی: «دەی باوکم، با بەڕێ بکەوین!» دواتر بەدەم قسە و باسەوە کەوتینە ڕێ، لە نیوەی ڕێگەدا بووین قاچاخچییەکە پێی وتین: «پانزە خولەکێکمان ماوە بگەینە جێگەی خۆتان، پارەکەتان حازر بکەن!» ئێمەش پارەکەمان پێ دا، بەڵام ئەو پانزە خولەکەی ئەو باسی کرد، لە کاتژمێریک پتر تێپەڕی کرد. ئەمە تەنها قسەی ناڕاستگۆیانەی ئەم نەبوو، بەڵکوو هەموو قاچاخچییەک لەم قسە ناڕاستگۆیانە دەکات، چونکە گەر وا نەبێت، بە قسەی خۆیان، کاریان ناڕوات بەڕێوە. کاتێک نزیک ئاوایی بووینەوە، سیمفۆنیای مەرگی ڕابردوومان بوو بە سیمفۆنیای ژیان و بووژانەوە: هۆهۆی کاکی شوان، قووقەی کەڵەشێر، باعەباع و دەنگ و زەنگۆڵەی ڕانەمەڕ و بزن... بە ماندوویتی و شەکەتییەوە، بە سەرتاپای جەستەمان ئارەقەی لێ دەچۆڕایەوە، بە پێڵاوی قوڕاویی دڕاو و پێ ئاوساوەوە، بە خۆشترین دیمەنی بەرەبەیانییەکی پڕ ئازادیمان سپارد و گەیشتینە ناو گوندی «خانمە شێخان» و لە کابرای وڵاخداری قاچاخچی جیا بووینەوە.

# هەڵکێشانمان لە ئەستێڵ

هێندە بەتاسوقەوە بووین بگەینە ناو هێزی پێشمەرگە، تەمەننامان دەکرد چرکەیەک پێشوەختتر پێیان شاد بین. بۆ یەکەم جاریش بە ئازایەتیی خانەخوێکەمان لە گوندی «خانمە شێخان» و گوندی «بایەوێ»، بە ئاواتی خۆمان گەیشتین و لە حزووری پێشمەرگەدا وەستاین.

پێش ئەوەی لەنێو گوندەکەدا بە دیداری پێشمەرگە شاد بین، دوو ڕۆژ پێشتر کاتێک قاچاخچییەکە ئێمەی هێنایە گوندەکە و لە ماڵێکی زۆر بەڕێز دایناین و بە خاوەن ماڵەکەی ڕاسپارد بەوەی شەوێک جێمان بکاتەوە، تاوەکوو بە دیداری هێزی پێشمەرگە شاد بین. لەو کاتەشدا ڕژێمی شای ئێران ڕووخابوو، دەروبەری ساڵی ١٩٧٩ بوو، خومەینی هێندەی نەبردبوو حوکمی ئێران بکات بە ناوی «جمهوری ئیسلامیی ئێران»، هێزی پێشمەرگەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە شار و شارۆچکەکانی ئێراندا بارەگایان دانابوو، هاتوچۆیان دەکرد و سەرقاڵی کار و چالاکییەکانی خۆیان دەبوون و خۆیان بۆ ئازادیی زیاتر ئامادە دەکرد. شەو داهات و خاوەن ماڵەکەمان لە کونجێکی ژوورەکەدا بۆ حەوانەوەمان جێگەی بۆ ئامادە کردین، سەرلەبەیانی هەموو پێکەوە بۆ ژەمی نانی بەیانی لەسەر سفرەی نانخواردن کۆ بووینەوە. منیش بۆ یەکەم جارم بوو لەو جۆرە خواردن و کۆبوونەوە گشتییە جوانەی کوردەواریی نێو گوندەکان ببینم. هەروەک پیشەی هەمیشەیی زۆرینەی خەڵکی شار کە بە بیجامەوە دەخەوتین و هەڵدەستاین، بە هەمان شێوە منی مێردمنداڵی تەمەن حەڤدە ساڵان بە بیجامەوە لەسەر سفرەکە بۆ نانخواردنی بەیانی دانیشتبووم، کاکە «حسێن»ی هاوڕێم بەزەردەخەنەیەکەوە ئیشارەتی بۆ کردم بەوەی بچم شەرواڵەکەم لەپێ بکەم، بەڵام من نەمدەزانی لە مەبەستی ئیشارەتەکەی چیم پێ دەڵێت! خاوەن ماڵەکە کاتێک منی بە بیجامەکەوە بینی، وتی :»ڕۆڵە، ئەوە چییە لەپێتدایە، هەستە خۆت کۆ بکەرەوە!» بەڵام هێشتا منی ناحاڵی لێی تێنەدەگەیشتم، هەتاوەکوو وای لێ هات خاوەن ماڵ وتی:

«ماڵت خراو نەبێت، تۆ هاتوویت ببیتە پێشمەرگە و کوردستان بە بیجامەوە ئازاد بکەیت!» منیش زۆر بەخێرایی هەستام و چووم  شەرواڵەکەم لەپێ کرد. دوای نانی بەیانی، هەموو پێکەوە چووینە نێو گوندەکە و لاوێکی هەرزەکاری قژ بژی سمێڵ قەترانی، جلوبەرگی خاکی لەبەری چەندین پێچ پشتێن و ناوقەدی قەڵەو، جیا لە لەشولارە لاوازەکەی، هەندێک شاجوری کلاشیکۆف و نارنجۆکی بەخۆیەوە هەڵواسیبوو، دیمەنێکی سەیری لەلام دروست کردبوو، کاتێک تێم ڕوانی و لێی ورد بوومەوە، ئەوم لێ دەبوو بە خۆم و خەونم بە سیمایەوە دەبینی. لە ناخەوە بەتاسووقەوە بووم ئاخۆ منیش دەتوانم لاسایی ئەو بکەمەوە؟ هەناسەم هەڵکێشا. هەموو ئەمانە وێنەی ئەو بەرپرسە بزێوەیان لە خەیاڵدانمدا کێشابوو خانەخوێکەمان ئاماژەی پێ دا و وتی: «ئەوە ‹جەمالی حەمەی خواکەرەمە›.» لێی نزیک بووینەوە  و بە دەنگی هێمن و دوای بەخێرهاتنمان، پرسیاری بە سەردا داباراندین: ناوتان چییە؟ خەڵکی کوێن؟ لەکوێوە هاتوون و لەبەر چی و بۆچی هاتوونەتە ئێرە؟ دەنگوباسی شار چییە؟ سلێمانی و کۆیە چۆن یەکتان گرتووە و بوونەتە هاورێی یەکتر؟ کێ دەڵێت بەعس نەیناردوون تاوەکوو سیخوڕی و خیانەتمان لێ بکەن! سەبارەت بە شاری سلێمانی و کۆیە، وەک پێشتر ئاماژەم پێ دا کاکە حسێنی هاوڕێم خەڵکی یەکێک لە گوندەکانی کۆیە بوو، پاشان من کرێکاریم دەکرد و لە مەیدانی کرێکاراندا و کارکردنەوە بووینە هاوڕێی یەکتر. پاشان پرسیاری تری ئاڕاستە کردین و وتی: «بە چی بەڵگەیەک بڕواتان پێ بکەم؟» منیش سەیری حسێنی هاوڕێم کرد و سەرگوزەشتەی هاتنمان و چۆنیەتیی یەکترناسینی خۆم و حسێن و بەرێکەوتنمان لە شاری سلێمانییەوە و چۆنیەتیی هەوڵدان بۆ بەگورگانخواردووکردنمان لەلایەن «عومەری سیخوڕ» و دەربازبوونمان و داڵدەدانی کابرای بوێر و شەرەفمەندی خەڵکی پێنجوێن و ڕێنماییکردنمان و پاشان بینینی قاچاخچییەکە لە نیوەشەودا و پەڕینەوەمان لە ڕووبارە تەنگ و بەخوڕ و ترسی مەرگ و دڵەڕاوکێ و ڕێنمایی شەونخونیمان بۆ باس کرد. دیارە ئێمە بە نەشارەزاییمان، بە سادەیی و نیازپاکییەوە لە

سەرەتاوە هەتا گەیشتنمان بەو ساتەی ئێمە لە بەردەمیدا وەستابووین، ئەمانەم هەمووی بە وردەکارییەوە بۆ گێڕایەوە، بەڵام ئەو بەسەرهات و ڕووداوانەی بۆم باس کرد، هیچ سەرنجی ڕانەکێشا. بۆ ئەوەی باوەڕ و متمانەمان پێ بکات، هێشتا هەر سوور بوو لەسەر پرسیارە گوماناوییەکەی خۆی. دووبارە پێی ڕاگەیاندین و پرسیاری لێ کردین: «کێ دەڵێت ئێوە لەلایەن دوژمنەوە نەنێردراون؟» دیارە وەڵامی پڕبەپێست و بڕواپێکەرمان پێ نەبوو، من پەیم بە درۆ و سیاسەت نەدەبرد، بۆیە جگە لە سوێندخواردن بۆی، ڕاستیی مەرامی دڵمان و ڕاستگۆییمان، شتێکی ترم شک نەدەبرد پەنای بۆ بەرم. ئەمەش گومانەکانی جەمالی حەمەی خواکەرەمی لەسەرمان نەک نەدەڕەواندەوە، بەڵکوو پرسیاری زیاتر و توندوتیژتری دەکرد. هەر چەندە باسی پێشمەرگایەتیی باوکم لە شۆڕشی ئەیلوولدا بەشانازییەوە بۆ گێڕایەوە، بەڵام ئەوەش دادی نەدەداین و لە گومانەکەی فریامان نەدەکەوت.

جەمالی حەمەی خواکەرەم کە بەرپرسی پێشمەرگەکان بوو، ئێمەی بەپشتگوێخستنەوە جێ هێشت و گەنجێکی تر بە تاقم و تفەنگ و چەند مەخزەنێکی لاقەدیەوە، کە ناوی «عەبدوڵڵا سوور» بوو، پێدەچوو ئەویش ئاستی بەرپرسیارێتیی هەبووبێت، ئێمەی بردە لای خۆی و ڕادەستی پێشمەرگەیەکی تری کردین و ئەویش بەرەو خواری ئاوایی ڕاپێچی کردین. ئیتر لەوێوە دۆخەکە تەواو پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئێمە سووڕایەوە بە دەورماندا و لەبریی ڕێزگرتن لە ئێمە، بە جنێوی سووک و قسەی بێتام؛ ورەی ئێمەی هەڵپاچی. لە دواییدا بووینە نێچیرێکی سەرکوێر و بەستەزمان، کە دەنگمان بە گوێی کەسدا ڕانەدەگەیشت و ناڵەمان ویژدانی کەسی نەدەبزواند. وێڕای ئەوەش، سەرنقومکردن و سەردەرهێنانمان بۆ چەند جارێک لە ئەستێڵی ئاو و بە قۆناغە تفەنگ شەلوکوتکردنمان و جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی گوایە ئێمە داردەستی دوژمنین و بۆ زەبروەشاندن ئاڕاستە و هەناردەی ناو هێزی پێشمەرگە کراوین، زیاتر ئێمەی شپرزە کرد. پاشان پێی ڕاگەیاندین بەوەی لای بەرپرسەکەیان و لای هیچ پێشمەرگەیەک و خەڵکی ناو ئاوایی باسی هیچ لێپێچینەوە و لێکۆڵینەوەیان نەکەین و وتی:

«گەر باسی بکەن و بیبیستمەوە چیم لێ کردوون، خراپترتان بەرامبەر دەکەم...» لە ڕاستیدا ئێمەش هێندەی ئەو ئازارەی دەچووە دەروونمان، سادە و ساکارانە سوێندی زیاترمان دەخوارد و نییەتپاکیی خۆمان بۆ دەربڕی، بەڵام گوێی لێ ڕانەدەگرتین و بڕوای پێ نەدەکردین. لە شانسی ئێمەدا فریادڕەسێک پەیدا بوو کە خەڵکی ئاواییەکە بوو و چاوی بە ئێمە کەوتبوو، بە دەنگی بڵندەوە لە پێشمەرگەکەی پرسی: «ئەوە خێرە تۆ وا لەو دوو منداڵە بەستەزمانە دەکەیت؟» ئەویش لە وەڵامدا وتی: «ئەمانە ڕژێمی بەعس ناردوونی بۆ کوشتنی ئێمە.» ئەو پیاوە تا بڵێی کەسێکی ڕەفتار جوان و میهرەبان و بەخشندە بوو، پاش ئەوەی ڕەفتاری توندڕەوانەی ئەو پێشمەرگەیەی بەرامبەر بە ئێمە بینی، ناچار بوو ببێت بە «کەفیلمان» و لەو میحنەت و دەردەسەرییە ڕزگارمان بکات. دیار بوو ئەو پیاوە دۆست و باوەڕپێکراوی شۆڕش و جەمالی حەمەی خواکەرەم بوو، ئیتر نازانم ئەو ڕەفتارە دزێوەی لەبەرامبەر ئێمەدا ئەنجام درا، بە فەرمانی خودی جەمالی حەمەی خواکەرەم بوو، یان ئەوی لێ بێئاگا بوو! لەدوای بەخشین و داوای لێبوردن و قەناعەتپێکردنمان بەوەی ناچارن بۆ پاک ڕاگرتنی ڕیزەکانیان، دەبێت ڕەفتار و کردەوەی لەو جۆرە بەرامبەر بەو کەسانە بنوێنن کە نە تەزکیەی ڕێکخستنەکانی ناوشاریان پێیە و نە ئەمانیش دەیانناسن... زۆر جار شەهید «جەمالی عەلی باپیر»یش ناچار دەکرا ڕەفتاری لەو جۆرە بنوێنێت، چونکە ڕژێمی بەعس زۆر کەسی لە سیخوڕەکانی خۆی بۆ زەبروەشاندن دەناردە ناو هێزی پێشمەرگە. دواتر جەمالی حەمەی خواکەرەم پێی ڕاگەیاندین بەوەی ئێمە بچینە سنووری هێزی پێشمەرگەی سلێمانی، نامەیەکی بچووکی بە تیپ پێچراوی پێ داین و وتی: «بچنە شاری مەریوان و لەوێوە بۆ شاری بانە و پاشان بچنە بلەکێ و لە سنووری دەستکردی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دووبارە ئاودیوی کوردستانی باشوور ببنەوە و لەوێ هێزی خۆمان؛ پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی لێیە و نامەکەش بدەنە دەست (بەکری حاجی سەفەر)، لەو سنوورەدا پێشمەرگەی خەڵکی شاری سلێمانیی لێیە و ڕەنگە باشتر بتانناسن.»

# ویڵبوون بەدوای کوانووی
# خەبات و جۆشی بوون بە پێشمەرگە

لەگەڵ هاوڕێی ڕێگەی مەرگەساتم کاکە حسێندا، لەلایەن جەمالی حەمەی خواکەرەمەوە نامەمان درایە دەست و بەپەلە و پەیتا پەیتا هەنگاوەکانمان ڕێگەی لوول دەدا، تاوەکوو بەپەلە و زۆر بەخێرایی بیگەیەنینە بەکری حاجی سەفەر[1]. جا ئێمەی گەنج بۆ ئەوەی زووتر بەرگی خاکی لەبەر بکەین و چەکی بەرگری و شەرەف لە شان بکەین و پیرۆزترین نازناوی پێشمەرگە هەڵبگرین و ببین بە بەشێک لە سروودی «ئەی پێشمەرگەی قارەمان، ئەی گیانفیدای کوردستان»، گوندی خانمە شێخان و هێزەکەی جەمالی حەمەی خواکەرەممان بەجێ هێشت و بە پیادە و ئۆتۆمبێل چەندین گوندی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیشمان بڕی و چووینە شاری مەریوان. شاری مەریوان؛ شارێکی شیرین و جوان و ئاووهەواکەشی پاکە، دانیشتووانەکەشی بەخزمەت و نیشتیمانپەروەرن. ئەو بڕە پارە کەمەی پێمان بوو، لەبن هاتبوو. بێ خەرجی و بە گیرفانی بەتاڵەوە گەیشتینە شاری مەریوان، تەنانەت یەک دیناری ئەو سەردەمەشمان پێ نەمابوو. لەو ئێوارە درەنگوەختەدا بێ پارە پوول و بێ کەس و غەریب و بێ داڵدە، سەری دنیامان لێ هاتبووەوە و نەماندەزانی چی تەکبیرێک لە حاڵی ناهەمواری خۆمان بکەین، پارووە نانێک چۆن پەیدا بکەین و بۆ حەوانەوە ڕوو لە کوێ بکەین و شەو بە چی کوێرەوەرییەک بگوزەرێنین.

---

[1] تێبینی: بەکری حاجی سەفەر لە کاتی نووسینی ئەم یادەوەرییەمدا کۆچی دوایی کردووە، بەڵام زۆرترین خەباتگێڕانی ئەو سەردەمەی ڕۆژگارە سەختەکان لە ژیاندا ماون و دەیناسن، فەرماندە و سەرکردەیەکی بەڕێز و ناسراوی نێو هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوو

بەکڵۆڵییەوە لەپەنا دیوارێکدا هەڵتووتاین و بەقەد تاڵە دەزوویەک ترووسکەمان لێوە بەدیار نەدەکەوت، ماندوویێتیی ڕێگا برستی لێ بڕیبووین، لەناکاودا بڵمەبڵمی خەفەی نێو لێوانی زەلامێک خۆی بە گوێچکەماندا ئاشنا کرد، تاوەکوو لێمان نزیک دەبووەوە، دەنگی زیاتر دەبیسترا و کاتێک گەیشتە ئاستی ئێمە و چاوی پێمان کەوت، وتی: «ئەوە شوێن نەماوە ئێرە نەبێ ‹سیغ› لێ بدەن؟» من نەمدەزانی مەبەستی چییە و دوای ساڵانێکی زۆر دواتر بۆم دەرکەوت کە پێی وا بوو ئێمە سەرقاڵی بەنگکێشان (تلیاک) بین. زیاتر لە ڕووخساری هەرزەکارانەمانی دەڕوانی، پێدەچوو پەشیمانییەک بنوێنێ، لەبەر ئەوەی دوای قسەکەی؛ یەکسەر دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: «بێرۆ! بێرۆ باوکم، با بچینۆ ماڵی ئێمە!» ئەمەش بووە شتێکی چاوەڕواننەکراو و بووە فریادڕەسمان و لە پێشمانەوە هەنگاوی گەورەی خێرای دەنا و بەپەلە بەرەو ماڵەکەیان گلۆر بووینەوە. دوایی بۆمان دەرکەوت ئەم کەسە خاوەن ماڵی پەنا دیوارەکە بوو، کە ئێمە کردبوومانە دەرەتان و داڵدەی خۆمان و لە پەنایدا هەڵترووشکابووین. کاتێک هەرسێکمان پێکەوە چووینە ماڵەکەی و پیاوەکە بانگی لە خێزانەکەی کرد، دوای پێشوازیی گەرمی ئەوان و ساتێک پشوودانی ئێمە، ئێوارەخوانیان ئامادە کرد. چوار منداڵیان هەبوو، لەپڕ یەکێک وەک هەورەبرووسکە خێرا و وەک بڵێی کارەبا شۆرتی کردبێت، بەلاماندا فرتەی بۆ کرد و یەکێکی تر لە مناڵەکانی لەبەینی ملی من و حسێنی هاوڕێمەوە سەری دەردەهێنا و جوکەیەکی بۆ دەکرد و دوو منداڵەکەی تریشیان بە پێچەوانەی یەکتر دەجوولانەوە، لەپڕ یەکێکیان دەگریا و ئەوی تریشیان پێدەکەنی، من سەرم سوڕ مابوو لە ڕەفتاری ئەو مندالانە و دایک و باوکیان هیچ باکیان پێ نەبوو، بەبێ ئەوەی هیچ نارەحەتییەکیان پێوە دیار بێت، ساتێک باوکەکەیان ڕووی لە ئێمە دەکرد و دەیوت: «هیچ نییە، لەگەڵ ئەو وەزعەدا ڕاهاتووین.» بەلام بەجیا خواردنیان بۆ ئێمە دانا و خاوەن ماڵی خانەخوێی خانەدان لەگەڵماندا نانی نەخوارد، بە تەنیشتمانەوە ئاگرێکی بچکۆلەی دەم دا و شیشێکی گۆشتبرژاندنی هێنا و داخی دەکرد

و جارجاره دەینا بە شتێکی ڕەنگ خورماییەوە و بە پارچە کاغەزێکی لوولەیی پڕ بە سییەکانی؛ دووکەڵی هەڵدەمشت. هەر چەندە ئەم کردارە لەو سەردەمەدا لای ئێمە زۆر نامۆ بوو، بەڵام فەرمووی «سیغ»لێدانی لێ دەکردین، دوای ساڵانێکی زۆر دواتر زانیم ئەوە «تلیاک» بووە و بەو جۆرە دەکێشرێت. هاوسەرەکەشی وردە وردە دەستی پێ کرد و لە هاوسەریەوە بووە هاوەڵی سیغلێدانی! ژنە بەڕێز و بەحورمەتەکەی ڕووی کردە ڕووخساری من و وتی: «ئێوە کێن و لە کوێوە هاتوون و بۆچی ڕووتان کردۆتە ئێرە و بەتەمای چین و چی دەکەن و لێرەوە بەرەو کوێ دەڕۆن؟» منیش وەکوو پرسیارە تێکەڵ و بێ بڕانەوەکەی ئەو، بە وەڵامی تێکەڵ و بێبڕانەوە وتم: «من خەڵکی شاری سلێمانیم» و ئاماژەم بۆ حسێنی هاوڕێم کرد: «ئەویش خەڵکی یەکێک لە گوندەکانی کۆیەیە و پێکەوە هاتووین ببین بە پێشمەرگە.» ژنەکە دەستی کرد بە بۆڵەبۆڵ، بە ڕووخسارێکی گرژ و تووڕەبوونەوە و تێسرەواندنی هەندێک شیرینەجنێو بە دایکم... هەر چەندە دایکە بەستەزمانەکەم لە هەموو ئەم کردەوانەی من بێئاگا بوو، وتی: «دەک عەمری ئەو دایکە نەمێنێت، وا تۆی بەرەڵای ئەم ناوە کردووە!» قسەی ژنی خاوەن ماڵ کسپەی لە دەروونم هەستاند و ناخی ورووژاندم و یەکسەر وێنەی دایکە کڵۆڵە خۆشینەدیوە بەشمەینەتەکەمم هاتە بەرچاو کە دەبێت ئاخۆ ئێستا لە بێچارەنووسیی مندا، چەندە بێحەوسەڵە بێت! پیاوەکە نیگەرانیی منی دەخوێندەوە، بۆیە دۆخەکەی بە لایەکی تردا برد و پرسیی: «ڕۆڵە، جا ئێوە پێشمەرگایەتیتان پێ دەکرێت؟» منیش پرسیارم کرد و لە وەڵامی پرسیارەکەی ئەودا وتم: «جا ئەوانەی پێشمەرگەن، چییان لە ئێمە زیاترە! ئەی بۆچی پێشمەرگایەتیمان پێ ناکرێت؟» پیاوەکە لە وەڵامدا وتی: «ڕۆڵە، ئێوە زۆرتان پێیە و کەمی دەردەبڕن!» لە ژوورێکی جیادا جێیان بۆ ڕاخستین و شەکەتی و ماندوویێتی هێندە تەنگی پێ هەڵچنیبووین، هەرکە چووینە سەر جێگە و خەوبردنەوەی چەندین کاتژمێریمان ماڵئاوایی لە شەوگار و پێشوازیی لە ڕۆژگار کرد. دواتر لە سەرەتاوە بەسەرهاتی

خۆمان بۆ خانەخوێ گێڕایەوە و پێمان ڕاگەیاند کە هیچ پارەیەکمان پێ نییە و بەنیازی چوونە شاری «بانە»ین، بە سوێندی کابرا بۆ حاڵ و گوزەرانمان، پاڵی پێوە نا ڕادەستی برایەکی خۆیمان بکات کە ئەویش لەسەر سەفەر بوو بۆ شاری بانە لەگەڵ خۆیدا بمانبات.

ئەو دەمە ڕژێمی پەهلەویی دوژمنی کورد؛ ئەوەندە نەبوو شاربەدەر کرابوو، ڕژێمی کۆنەپەرستی ئیسلامیی ئێرانیش هێندە نەبوو هاتبوونە سەر کار و ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە دۆخێکی یەکجار پاشەگەردانیدا بوو، کەس بە کەسەوە نەبوو، لە عێراقیشدا بە پلانێکی دۆستانە سەددام حسێن، ئەحمەد حەسەن بەکری لە عەرشی حوکمڕانیدا هێنابووە خوارەوە. بەگشتی حیزبەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەلێکی لەباریان بۆ ڕەخسابوو، ڕژێمی خومەینی هێشتا جێ پێی لەق و ناتۆکمە بوو، ڕەزا شا شیعرەکەی مامۆستا «هێمن»ی شاعیریشی بەزاندبوو کە دەڵێت: «بڕۆ بەغداد نیوەی ڕێت بێت...»، بەڵکوو وا ڕاو نرابوو، کونەمشکی لێ ببووە قەیسەری و ئەم زەمینە فراوانەی نەگرتە خۆی. ڕژێمی تازەی حوکمڕانیی کۆماری ئیسلامیی کۆنەپەرستی ئێران، بە هەمان شێوە بە هەمان پەیامی ڕژێمی پێشووتر، ئاڵای قڕکردنی گەلەکەمانی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بەرز کردبووەوە. زیندانیکردن و زەوتکردنی ئازادیی تاکی نێو کۆمەڵگە و گرتن و ڕاونان و شەڕ و پشێوی باڵی بەسەر کوردستاندا کێشابوو، نائارامی و بێئاسایشی و ترس و دڵەڕاوکێ؛ تۆقاندنی خەڵکەکە بوو. پێشمەرگە گیانبازەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بە ورەی بەرزەوە و بێ پسانەوە بەریان لە هێرش و پەلاماری چەتە پیاوکوژەکانی ئاخوندەکان دەگرت. تۆپ و تانک و زرێپۆشی سووتاو و سوپای تێکشکاو و دووکەڵی ڕەشی بەری ئاسمان گرتوو و تەرمی پێشمەرگەی شەهید و چەکدارانی دوژمن، تابلۆی خوێناویی پڕ ئەفسووس و ئەفسووناویی نێو گوند و شار و شارۆچکە و مەیدان و ڕێگەوبانەکان بوون. لاوانی وڵات پۆل پۆل بۆ شەڕی بەرگری؛ چەکی شەرەفیان دەکردە شان، جوامێرانەترین هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانییان تێدا بەدی دەکرا. ڕژێمی داخلەدڵی

ئیسلامیی کۆنەپەرست لە دژایەتیی گەلی کوردمان، هیچی تری لە ڕژێمی گۆڕنراوی شاهەنشاهی کەمتر نەبوو. بە پەلاماری دڕندانەی، سەرتاسەری کوردستانی خستە بەر هەڕەشەی سوتماککردنی خاک و جینۆسایدکردنی دانیشتووانەکەی، بێگومان بەبێ دەستپاراستن لە ژن و منداڵ و پیر و خەڵکی سڤیل. هەموو کونج و کەلەبەرێکی کردە زیندانی گەورە و مەیدانی لەسێدارەدان. ڕژێمی ئیسلامی وەکوو پیشەی دوژمنە هاوشێوەکان، تورکیا و عێراق و سووریا، سیاسەتی ڕەگەزپەرستانە و پاکتاوی نەژادی بووە سیمایەکی دیار و قێزەوەنی سیستمی نوێی شیعەگەرانیی ئێران. لەو ساتە مەرگاوییەی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا، بە سینەی پڕ لە حەسرەتی ئازادییەوە لەگەڵ حسێنی هاوڕێمدا خۆمان گەیاندە شاری بانە و لەوێشەوە بە داوای هاوکاریکردن لە خەڵکی و بە سکی برسییەوە و زۆرترین ڕێگا بە پێ و پێڵاوی دڕاوەوە، چووینە بلەکێ و پاشان بەرەو دیوی باشووری کوردستان و ئاوی بەخوڕی نێوان سنووری ڕۆژهەڵاتی کوردستانمان بڕی و ڕوومان لە گوندی چاڵە خەزێنەی ناوچەی شارباژێڕی کوردستانی باشوور کرد کە بەدەر لە کەرتەکەی جەمالی حەمەی خواکەرەم، ئەم جارەیان بە هێزێکی تر شاد بووین کە بەکری حاجی سەفەر سەرپەرشتیی دەکردن.

## هاندانمان بۆ تەقاندنەوەی دوو نارنجۆک

ناوچەی شارباژێڕ دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانییەوە، پڕە لە گوندی سەخت و دڵڕفێن، پێک هاتووە لە هەردوو شارباژێڕی سەخت و شارباژێڕی تەخت، دانیشتووانەکەی بەگشتی بۆ بژێویی ژیانیان خەریکی ئاژەڵداری و ڕەز و باخن. گوندی: گورگەیەر، وێڵەیەر، عازەبان، بزەنگیان، گوندی هۆنگەرێنە، شوکێو، باراو، موبڕە، مامەخەلان، گەڕەدێ، سیتەک، تەگەران، چەمیاڵە، چاڵەخەزێنە شاناخسێ و مەروێ و چەندین گوندی تریش هەن، هەموویان پانتایی شارباژێڕیان پێک هێناوە کە لانکەی پێشمەرگایەتی و قەڵای سەرهەڵدانەوەی شۆڕش و دڵ و دەروونی کوردایەتی بوون، هەزاران ڕۆڵەی قارەمانیان گۆش کردووە و سەدان شەهیدیان لە پێناوی کوردایەتیدا گیانیان بەخشیوە، هەمیشە سەرقافڵەی بەرخودان و خانەخوێی خانەدانی مقاوەمە و بەرگری بوون. چاڵەخەزێنە سەر بە شارباژێڕە و دەکەوێتە باشووری چوارتاوە، لەگەڵ چەمپاراو و بلەکێی سەر بە شاری بانەی کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا ڕووبارێکی چکۆلانەی بەخووڕ لێکیانی دابڕیوە، لەو سەردەمەدا ئەو نێوەندە چاوگەی کاروباری قاچاخچێتی و بازرگانی بوو، خەڵکەکەی ڕۆژانە بە وڵاخ و تراکتۆر و ئۆتۆمبێلی جۆری پیکاب سەرقاڵی ئیشوکار و مەیسەرکردنی بژێویی ژیان بوون، هەناردە و هاوردەکردنی گەلێک کاڵا و کەلوپەلی بازرگانیی عێراق و ئێرانی ناوچەکەی کردبووە جێبایەخی ئابوورییەکی پتەوی دانیشتووانەکەی، لەم کەینوبەینەدا ببووە سەرچاوەی داهاتێکی باشی گومرگ بۆ هێزی پێشمەرگە، وێڕای ئەمانەش کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بەشێکی دیکەی گرنگی ژیانی خەڵکەکە بوو. سپێدە بوو، من و هاوڕێکەم بە نامەکەی جەمالی حەمەی خواکەرەمەوە گەیشتینە شوێنی مەبەست و لەوبەری ڕووبارە بەخوڕەکەی کە کوردستانی باشوور و کوردستانی ڕۆژهەڵاتی دەستکردی لێک جیا دەکردەوە، دوو

پێشمەرگە بانگیان کردین و هەندێک پرسیار و لێکۆڵینەوەی سەرپێییان لێ کردین لەمەڕ چۆنیەتیی گەیشتنمان بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە و ئێمەش پێمان ڕاگەیاندن: کە لە گوندی خانمە شێخان و گوندی بایەوێ چاومان بە جەمالی حەمەی خواکەرەم کەوتووە و لە سنووری دەستکردی کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە بە نامەیەکی جەمالی حەمەی خواکەرەم بۆ بەکری حاجی سەفەر خۆمان گەیاندووەتە ئێرە، بۆ ئەوەی ببین بە پێشمەرگە. پاشان نامەکەمان دایە دەستیان، بۆ ئەوەی بیگەیەننە دەستی بەکری حاجی سەفەر کە لەو سنوورەدا بەرپرسێک بوو. دوو پێشمەرگەکە ئێمەیان لەگەڵ خۆیاندا بردە ناو ئاوایی و لەماڵێکدا چاومان بە بەکری حاجی سەفەر و پۆلێک پێشمەرگە کەوت، بەخێرهاتن و پێشوازیی گەرمیان؛ دڵشادیان کردین و بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە پرسیارێکمان لێ بکەن. لە ئێوارەدا کۆمەڵێک پێشمەرگەی تریش پەیدا بوون و بە هاتنی ئەوان، هەستمان دەکرد دۆخەکە گۆڕانی بەسەردا هات و ئاسایی نەبوو، چاویان لەسەرمان بوو، چرپاندن بە گوێی یەکتردا و جۆری سەیرکردن و تێڕوانینیان ببووە مایەی ترس بۆمان، کە لەو کاتەدا ئێمە سەرەتای لاوێتی و پێگەیشتنمان بوو، هیچ ئەزموونێکی تفت و تاڵی ژیان و جۆری تێکەڵاوبوونی خەڵکی گوندەکان و باری سیاسی و کۆمەڵایەتیمان نەبوو، خەیاڵی بێسەروبنی لاویم و بە ئاوات گەیشتنم بۆ بوون بە پێشمەرگە و لەشانکردنی تفەنگی بەرگری و دڵسۆزیم بۆ ڕێچکەی کوردایەتیی باوکم و بینینی ئەو پێشمەرگەیەی جەمالی حەمەی خواکەرەم کە ئازاری کاکە حسێنی هاوڕێمی دابوو و لە ئەستێڵی ئاو هەڵکێشانی و پرسیارەکانی بەکری حاجی سەفەر لە کاتی لێکۆڵینەوە لەگەڵماندا؛ سەنگ و تەرازووی جەستە و قسەکردنیشمانی شێواندبوو، زۆر زۆر دەترساین ئەو مەینەتییەی پێشمەرگەکەی جەمالی حەمەی خواکەرەم کە بەسەر ئێمەیدا هێنابوو، لێرەش دووبارەی بکاتەوە.

بەڵام بەکری حاجی سەفەر دوای خوێندنەوەی نامەکە، پێی وتین: «ئێوە لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانی ناو شارەوە نەنێردراون بۆ لای ئێمە و

پشتگیریی ئەوانتان پێ نییە و بڕواش ناکەم کەس هەبێت ئێوە بناسێت تاوەکوو ببێتە کەفیلتان و ئێمەش هەر وا بەئاسانی بڕوا و متمانەمان بە ئێوە نییە لای خۆمان چەکتان بدەینێ و وەک پێشمەرگە قبووڵتان بکەین، بەڵام داواکارییەکەم هەیە لە هەردووکتان، جارێک پشوویەک بدەن و دواتر پێتان ڕادەگەیەنم.»

بۆ شەوی دواتر پێشمەرگەیەک هات بۆ لامان و بەکورتی باسی خەباتی سیاسی و سەرەتای دەستپێکردنەوەی شۆڕشی نوێی یەکێتیی نیشتمانیی بۆ کردین. من و کاکە حسێنی هاوڕێم جگە لەوەی سەرمان بۆ دەلەقاند، هیچی تر لە سیاسەت تێنەدەگەیشتین، تەنها ئەوە نەبێت کە هەستمان بە زوڵم و ستەمی گەلە چەوساوەکەمان لەلایەن دوژمنەوە پێ دەکرد. پاشان پێی ڕاگەیاندین بۆ بڕوا و متمانەبوون و بوونمان بە پێشمەرگە، بچین لە شاری سلێمانی یەکی نارنجۆکێک بە ڕووی دوژمندا بتەقێنین، پاشان ئەڵقەی نارجۆکەکان لەگەڵ خۆماندا بۆ ئەوان بهێنینەوە، بۆ ئەوەی بزانن کە هەردووکمان نارنجۆکەکانمان تەقاندووەتەوە. دواتر پێی ڕاگەیاندین بەوە ئێمە دەبینە جێی باوەڕ و جێی متمانەی ئەوان و وەک پێشمەرگە قبووڵمان دەکەن. پاش ئەوەی بەکری حاجی سەفەر خۆی کرد بە ژووردا و پێشمەرگەکەش نارجۆکێکی بە دەستەوە گرت و لەبەر چاوی ئێمە ئەڵقەکەی دەرهێنا و پێشی ڕاگەیاندین کە چۆن هەڵدەدرێت و لە ماوەی چەند چرکەیەکی کەمدا دەتەقێتەوە و گەر بۆشمان نەکرا بیتەقێنینەوە، بە چی شێوەیەک ئەڵقەکەی بخەینەوە شوێنی خۆی و تاوەکوو بوارمان بۆ برەخسێت و دڵنیا بین لەوەی کە بەسەلامەتی دەردەچین و لە شوێنێکی تردا بیتەقێنینەوە. ئێمە لە مشتومڕی ئەوەدا بووین و زۆر بەوردی گوێمان بۆ قسەکان ڕادەگرت، لەپڕ پێشمەرگەیەکی بالابەرزی ڕیش درێژ لەبەر دەرگای هەیوانەکەدا دانیشتبوو و گوێبیستی تەواوی گفتوگۆکانمان بوو، ڕیشە درێژەکەی تەواو سەرنجی منی ڕاکێشابوو، چونکە لەو تەمەنەمدا ڕیشی هاوشێوەی ئەوم بەرچاو نەکەوتبوو، لەژێر سمێڵی و دەم و لێو

داپۆشراوەکەیەوە بێ ئەوەی هەست بە جووڵانی دەم و بزواندنی لچ و لێوی بکەین، گوێمان لە دەنگی بوو دەیوت: «بەنیاز بووم تا کوردستان ڕزگاری نەبێت؛ ڕیشم نەتاشم، بەڵام ئەگەر ئەم دوو گەنجە توانییان نارنجۆکەکان لەناو شاری سلێمانیدا بتەقێننەوە، ئەوا بەڵێن بێت ڕیشم بتاشم و ئیتر هەرگیزاوهەرگیز ڕیش نەهێڵمەوە!» لە لایەکەوە و خەفەتم بەوە دەخوارد من لەو تەمەنە هەرزەکارییەی حەڤدە بۆ هەژدە ساڵییەمدا ناتوانم وەکوو هێمایەک بۆ پێشمەرگایەتی، وەکوو ئەو پێشمەرگەیە ڕیش بهێڵمەوە، چونکە هێشتا موو ڕوومەتەکانمی دانەپۆشیبوو، کەچی سەیر لەوەدا بوو بەبێ هیچ لێکدانەوەیەکی سەرکەوتووانە، بەڵێنی ڕیشتاشینی خۆی بەستەوە بە چالاکییەکەی ئێمەوە. من و کاکە حسێنی هاوڕێم دوای ئەو هەموو دەردەسەری و ڕێگا سەخت و دوورەی کە بڕیبوومان، لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٩دا هەریەکە و نارنجۆکێکمان خستە گیرفانمانەوە و بەرەو شاری سلێمانی شۆڕ بووینەوە و بەپێی ڕێنماییەکانیان هەردوو نارنجۆکەکانمان تەقاندەوە، ئیتر نازانم ئەو پێشمەرگە باڵابەرزە ڕیشنە کە لە ناخەوە غیرەتی تیاماندا چاندبوو کە پێی وا بوو جگە لە خۆی، کەسی تر شۆڕشی پێ ناکرێت و قارەمانێتیی مرۆڤ لە ڕیشدا بەدی دەکرێت، هەر چەندە پەندێکی پێشینان هەیە و دەڵێت: بە ڕیش نییە و بە ئیشە، ئیتر نازانم ئەو قارەمانە ڕیشی تاشی یان نا؟ بەڵام ئەفسووس لە دواییدا بیستمەوە کە دەستبەرداری پێشمەرگایەتی بووە و لە شاری بانەی کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا گیرساوەتەوە و ژیانی هاوسەرگیریی پێک هیناوە و نەک ڕیشی، بەڵکوو سمێڵیشی تاشیبوو.

## تەقاندنەوەی دوو نارنجۆک و
## دابڕانی من و کاکە حسێنی هاوڕێم

منێکی مێردمنداڵ کە لە هەموو ژیانمدا بە خەونیش چۆلەکەیەکم سەر نەبڕیبوو، خەونم بە تەقە و خوێنڕشتنەوە نەدیبوو، نەمدەزانی چەک لە چ کاتێکدا بۆ کوشتنی بەرامبەر بەکار دێت، هەر ئەوەندەم دەزانی و لەیادم بوو کاتێک ماڵمان لە گەڕەکی چوارباخ و بەرامبەرمان ماڵی حەمەی نەوتفرۆش بوو کە پیاوێکی هەژار بوو و چەند منداڵێکی هەبوو، جگە لەوەی بۆ باری گوزەرانی کاری نەوتفرۆشیی بەر ماڵانی گەڕەکەکانی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر جار بەتایبەت لە شەوانی ساردی زستان و بەفربارینێکی زۆردا، ئەم پیاوە چەند تانجییەکی هەبوو، لە بەرەبەیاندا دەچوو بۆ ڕاو و زۆر جار چەند ئاژەڵێکی وەک ڕێوی و کەروێشک و پەلەوەری لەگەڵ بەخەبەرهاتنەوەی خەڵکی گەڕەکدا لەگەڵ خۆیدا دەهێنایەوە ماڵەوە، چەندین جار دەمبینی چەند ئاژەڵێکی بە خوێن و بە قورسکەقورسکی پڕ لە ئازاری برینداری بەشانازییەوە نیشانی خەڵکی و دراوسێکانی دەدا و وەک بڵێیت قارەمانێکی بێوێنەی دژی ڕژێمە دیکتاتۆرەکانی گەلی کوردە. بەڵام لە ناخی منداڵێکی وەک مندا، پیاوێک بوو ترس و تۆقاندنی لە ناخمدا چاندبوو. زۆر جار لەگەڵ دەرکەوتنی بە خۆی و عەرەبانە دوو ئەسپییەکەی و تەنکەرە نەوتەکەی دواوە، حەزم نەدەکرد نە باوکم و نە دایکم و نە براکەم تەنها پیاڵەیەک نەوتی لێ بکڕن، من وام دەبینی بکوژ هەر بکوژە، جا چی مرۆڤێک بکوژێت، یان پێ بە مێرووولەیەکدا بنێت، یان ئاژەڵێکی بەستەزمان بکوژێت. بۆیە لە ناخمدا حەمەی نەوتفرۆشم بە نامرۆڤترین و بێبەزەییترین کەس دەهاتە پێش چاو... کاتێک بەکری حاجی سەفەر ئەو کارەی پێ ڕاسپاردین، سەرەتا موچرکەیەکی جەستەتەزێن دایگرتم، تەنانەت خۆشم نەمدەزانی لە ترساندا بوو یان لە خۆشییەکی هەرزەکارانەی کاڵفامێک کە شانازیم بە

ڕاپەڕاندنی ئەرکێکی بەو شێوەیە و لەو جۆرە دەکرد، بێ ئەوەی ئەوە لێک بدەمەوە کە نارنجۆک و تەقەمەنی و هەموو جۆرە چەکێک هیچ بەرهەمێکیان نییە جگە لە خوێنڕشتن و ماڵوێرانیی مرۆڤ نەبێت، نارنجۆکەکانی ئێمەش بۆ کۆستخستنی خێزانەکان و لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەیان بوو. جا خانەوادەی ئێمە و بەرامبەرەکەمانی گیرۆدە بکردایە، چوونیەک بوو، دایک و باوک جگەرسووتاو، خوشک و برا ڕەشپۆشکراو و ژن و منداڵیشی سەرگەردان دەکرد، خورپە و نائارامییشی دەخستە دڵانەوە و برینی سارێژنەبووی لە جەستەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە جێ خۆش دەکرد و تێکشکانی جوانییەکان و دزێوی و درندەیی بەرجەستە دەکرد. چ مەرگەساتێکە بە سازدانی مەرگی مرۆڤێک، شایی و لوغان بگێڕدرێت! ماتەمگێڕانی خانەوادەکان بە چاندنی بوغز و ڕق و قین لەبەرامبەر یەکتردا، سووتەمەنی و بوودەڵەکانیش بازرگانی شەڕ بوون. ئێمە یەخەی یەکترمان دادەڕی و هەندێک لە سەرکردەکانیش پێکی دەستکەوتی زیاتریان دەنۆشی. ئێمە بە بەردەباز دەکراین و ئەوانیش بەسەر جەستەی شەکەت و خوێناویماندا دەپەڕینەوە بۆ پۆستی باڵاتر. ئاوا بە هەمان شێوەی گەشتە مەترسیدارەکەی پێشوومان کە بە تووڵەڕێگەی مەرگدا گوزەرمان کرد و خۆمان گەیاندە ناو هێزی پێشمەرگە و بنکەکانیان، ئەم جارە مەترسیدارتر لە جاران و بە هەمان ڕێگەی هاتونەهاتەوە باوەشمان بە مەرگدا دەکرد، بۆ ئەوەی لەبریی شیرینی و ڕووناکی، تاریکی بەسەر ئەم و ئەو خانەوادەیەدا ببەخشینەوە. جوامێرییەکی هەرزەکارانە و بەبێ لێکدانەوە لە ئامانج و هۆکار و ئاکامەکەی، ئێمە دەمانویست ژیان لە کەسانێک زەوت بکەین، دایک و باوکێک جگەرسووتاو بکەین، خوشک و برا غەمبار و ڕەشپۆش و کۆستی ژن و منداڵەکانیان بخەین و لە خوێناوی خۆیاندا بیانگەوزێنین. بەو جۆرە بە فەرمانی بەکری حاجی سەفەر و لە خۆشەویستیی بوون پێشمەرگایەتیماندا، چاومان بە ڕواڵەتی ئەو کەسانە هەڵنەدەهات کە بە پیاوی ڕژێمیان دەناساندن و ئەرکی ئێمە وەک پێشمەرگە ئەوە بوو ئەو ئەرکە جێبەجێ بکەین کە لەسەروو

خۆمانەوە پێیان ڕادەسپاردین. بەهەرحاڵ، دووەم گەشتی مەرگبارمان لە چاڵەخەزێنەوە بەرەو شاری سلێمانی بە هەنگاوەکانمانەوە پێچا و هێندە پەلەپرووزێمان بوو کە ئەگەر سەربازێک بکوژین، ئەوا جەرگی سەددام حسێن بە ساجەوە هەڵدەکرووزێنین. بێگومان هەردووکمان قەناعەتی قووڵمان بەوە هەبوو کە لێدانی بەعسی فاشی داگیرکەر لە هەر شوێنێکدا بێت، ئەرکێکی پیرۆزە و گیانی خۆشمان دانابێت؛ پاشگەز نەدەبووینەوە لە بەجێگەیاندنی. ئەمە سروشتی پێشمەرگە و ناوی پێشمەرگە و ئەرکی پێشمەرگەی کوردستانە. ئیتر لەگەڵ هاوڕێی غەریب و بێکەسم کاکە حسێن، هەر چەندە ناوی ئەو گوندانەمان نەدەزانی، لەبەر ئەوەی بۆ یەکەم جارمان بوو بەو سنوورەدا تێپەڕین و بەپێی ئەو نەخشە و پلانەی بۆمان کێشرابوو، دواتر لە گوندی تەگەران سەرمان هەڵدایەوە و دوو لاوی هەژاری نەفامی وەک ئێمە بە خۆمان و دوو نارنجۆکەوە بە ڕۆژی نیوەڕۆ خۆمان کرد بە گوندەکەدا. پاش ماوەیەکی زۆری پێشمەرگایەتیبوونم، ئینجا بۆم دەرکەوت و زانیم گوندی تەگەران چەندە مەترسیدارە و زۆربەی زۆری چەکدارەکانی سەر بە ڕژێم، لە کاتی پەڕینەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ سنووری ناوچەی شارباژێڕ، بۆسەیان بۆ دادەنان و دەیان پێشمەرگە و فەرماندەی بەجەرگی تیا شەهید دەبوو، چونکە گوندی تەگەران ڕاستەوخۆ لەسەر ڕێگەی سەرەکیی شاری سلێمانی و گوندەکانی تر بوو. پاشان تەگەران بە حوکمی ئەوەی سنووری جوگرافیای وا هەڵدەکەوت، جێگەی پەڕینەوە بوو بۆ گوندەکانی نێوان شارباژێڕ و دۆڵەڕووت و گوندەکانی بەری دۆڵی. هەر چەندە دانیشتووانی گوندی تەگەران بە هۆی هاوکاریکردنیان بۆ شۆڕش و جێگەی حەوانەوە و شاردنەوەی پێشمەرگە بریندارەکان و هاوکاریکردنیان لە کاتی پەڕینەوەیاندا، لەلایەن ڕژێمەوە تووشی کێشە و گیروگرفتی زۆر دەبوون و مێژوویەکی دێرینیان هەیە لە بەشداریکردنی شۆڕشی نوێی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا.

دوای ئەوەی تەواوی جەستەمان شەکەت بوو و ماندووبوونێکی زۆرمان

پێوە دیار بوو، لەماڵێکدا لامان دا و منیش لە گێلێتیی خۆم و نەفامیی خۆمەوە نارنجۆکەکەم دەرهێنا و خاوەن ماڵ دەستی کرد بە ناڕەزایی دەربڕین و بە دەنگی بەرز و جارجارەش بە دەنگێکی نزمەوە پێی ڕادەگەیاندین هەر دەبێت بە زووترین کات ئەو ماڵە بەجێ بهێڵین، چونکە ئەو گوندە مەترسیی زۆری لەسەرە و سەرەڕێیە و نزیکی سەربازگە و ڕەبابییەکانی ڕژێمن. ناچار هەر چۆنێک بوو خاوەن ماڵ بەپەلە هەندێک خواردەمەنیی سەوزەی وەک کەوەر و پیاز و تەماتەی بۆ هێناین و جگە لەوەی ڕێزیشی لێ گرتبووین، لە ترساندا هەروەک دەرکردنیش؛ دەریکردین و بەهێمنی و زۆر بە دەنگێکی نزمەوە و بەترسەوە پێی گوتین: «بەم گردەدا سەر بکەون و دواتر دەچنە ئەودیو (گوندی سیرەمێرگ)...» ئێمەش بەپێی ڕێنماییەکانی خاوەن ماڵەکە بەڕێ کەوتین و دوای گوندی سیرەمێرگ، چووینە گوندی خەمزە و دواتر بۆ گوندی کەڵەکن کە چەند کیلۆمەترێکی کەم لە شاری سلێمانییەوە دوور بوو. دیارە بۆ پێشمەرگە و دانیشتووانەکەی مەترسیدارترین گوند بوو و خەڵکێکی زۆر باش و نیشتمانپەروەر و چەندین ئەندام و پێشمەرگە و فەرماندەی دڵسۆز و شەهیدیان هەبوو. لەلایەن دانیشتووانی گوندی کەڵەکنەوە هەواڵی ئەوەمان هەبوو بەوەی لەنزیک شارەوە بۆسەی چەکدارەکانی ڕژێمی لێیە و مانەوەمان باشترە لەوەی بپەڕینەوە و بچینە ناو شاری سلێمانییەوە. ئێمەش لەبەر پاراستنی ژیانی خۆمان و نەکەوتنە نێو بۆسەی چەکدارەکانی ڕژێم، بڕیاری مانەوەمان لە گوندی کەڵەکەن دا و بۆ شەوی دواتر پەڕیینەوە بۆ شاری سلێمانی. من نارنجۆکەکەی خۆم پێ بوو و کاکە حسێنی هاوڕێشم نارنجۆکەکەی خۆی پێ بوو، هەردووکمان بڕیارمان دا بەوەی لە شوێنی مەبەست و تایبەتدا یەک بگرینەوە و کاتژمێرەکەشمان دیاری کرد. برا گەورەکەم، ئەویش بە هەمان شێوە کە ناوی «حسێن» بوو، من چووم لە ماڵی ئەواندا خۆم داڵدە دا و کاکە حسێنی هاوڕێشم چوو بۆ ئەو هۆتێلەی کە لە ڕابردوودا لەنزیک مزگەوتی خانەقا و وەک بێدەرەتانێک لەوێ دەژیا. بۆ سبەی لە شوێنی دیاریکراودا چاومان بەیەک کەوتەوە و نەخشە و پلانمان

داڕشت کە چۆن بتوانین هەردوو نارنجۆکەکە بتەقێنینەوە.

سەرەتا لە کۆلانێکدا هەردوو ئەڵقەی نارنجۆکەکەمان دەرهێنا و لە ترساندا توند دەستمان پێوە گرتبوو، چونکە پێشتر لە گوندی چاڵەخەزێنە بە هەردووکمان ڕاگەیەنرابوو کە دوای ئەوەی ئەڵقەی نارنجۆکەکان دەربهێنن و فڕێی بدەن، لە ماوەی چەند چرکەیەکی کەمدا دەتەقێنەوە. ئەڵقەکانیشمان لە گیرفانماندا هەڵگرتبوو، چونکە پێمان وترابوو بۆ ئەوەی بڕوا و متمانەمان پێ بکرێت، دەبێت ئەڵقەکان لەگەڵ خۆماندا بهێنینەوە بۆ خۆیان. دوای مشتومڕێکی زۆر، دەستمان هەر لە گیرفانماندا بوو بە نارنجۆکەکانەوە، تەواو پەنجەکانی دەستمان ماندوو ببوون، هەر جارەی نارنجۆکەکەمان دەخستە دەستەکەی ترمانەوە و بیرمان لەوە دەکردەوە کاری تەقینەوەکە لە کوێ ئەنجام بدەین! زۆر شوێنی سەرەکی و گشتی لە دامودەزگاکانی ڕژێم گەڕاین کە بتوانین گورزێکی کوشندەی باش لە دوژمن بوەشێنین، بەڵام گونجاو نەبوو. دواتر لەگەڵ حسێنی هاوڕێمدا بە کۆڵانە تەنگ و باریکەکانی ئەسحابەسپیدا کە ناوجەرگەی شار بوو، بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی ژیان و گیانلێسەندنەوەی داگیرکەرانی کوردستان، بێگومان ئەگەر دەستمان بە تاوانبارێک یان جەللاد و سیخوڕێک بگەیشتایە، ڕەنگە بمتوانیبایە بڵێم کارێکی باش و پەسەند و بەجێمان کردووە، لێ نەوەکوو بەکری حاجی سەفەر کە تا ئەم نووسینەم لە ژیاندا نەماوە و ڕۆحی شاد بێت بەو شێوەیە ئاراستەی کردین و ئێمەی لاوی هەرزەکاریش کەمئەزموون و بەردیدەلێڵ بووین و بایەخمان پێ نەدەدا و دەمانویست هەر چی زووترە ترسێک بخەینە نێو دڵی چەکدارەکانی ڕژێم، ژاوەژاوێک لە شاردا بنێینەوە و ئەنجامەکەشی هەر چی بووایە؛ گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو بەلامانەوە. ئیتر بێ نەخشە و بەبێ بەرنامە، دوو گەنج بە دوو نارنجۆکەوە عەوداڵ بووین، تاکوو هەلێکی گونجاومان بۆ بڕەخسێت و ئەڵقەی نارنجۆکەکان بە دیاریی متمانەبەخشین بگێڕینەوە بۆ بەکری حاجی سەفەر.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٩دا، لە شەقامی ئەسحابەسپیدا ئۆتۆمبێلێکی

سەربازیی جۆری «زیل» دەهاتە شەقامی ئەسحابەسپی و لەوێدا ئەفسەرێک و هەندێک سەربازی لێ دادەبەزین بۆ بازاڕیکردن و دوای ماوەیەکی کەم دەگەڕانەوە بۆ سەربازگەکەیان لە دەرەوەی شار. ئەسحابەسپی شوێنی پیشەوەران و کڕین و فرۆشتنی کاڵا و پێداویستی و بە دەیان دووکانی هاوڵاتیی لێ بوو و یەکجار گەورە بوو، ڕۆژانە سەدان هاوڵاتی ڕوو دەکەنە ئەو شوێنە و جگە لەوەی هەموو جۆرە چەکدارێکی ڕژێم، هەر لە پۆلیس و ئەمن و ئیستخبارات لەو شوێنەدا بۆ مەبەستی سەرەکیی خۆیان لەوێدا هاتوچۆیان دەکرد و کۆ دەبوونەوە. ئێمە بڕیارمان دابوو خۆمان لە بۆسەی ئەواندا بنێین و ڕق و قینی خۆمان و فەرمانی بەکری حاجی سەفەریان بەسەردا هەڵبڕێژین.

لە کاتی دیاریکراودا، دوای وردبینییەکی باش، خۆمان ئامادە کردبوو کە ئۆتۆمبێلەکە گەیشتە شوێنی دیاریکراو، بەبێ ئەوەی بواریان بدەین سەربازەکانی لێ دابەزن و ئەو بەیانییە بازاڕی بکەن و بگەڕێنەوە بۆ سەربازگەکانیان، من و کاکە حسێنی هاوڕێم هەرکە ئۆتۆمبێلەکە وەستا و زۆر بەخێرایی و بەهەڵمەتەوە و بەبێ ترس ڕامانکرد بەرەو ڕووی، لەو کاتەشدا بەڕێکەوت پاسێکی هاتوچۆی سلێمانی و سەرچنار کە کۆتایی وێستگە بوو و هاوڵاتییان دادەبەزین و سەر دەکەوتن، لە کتوپڕێکدا هەردوو نارنجۆکەکەمان هەڵدایە ناو سەربازەکانەوە.

دواتر هەواڵمان پێ گەیشت کە ئەفسەرێک و چوار سەرباز کوژراون و دوو سەربازیش بریندار بوون. لەو کاتەشدا دراوسێیەکی خۆمان[1] لە سەرچنار کاری دەکرد بە پاس و بەڕێکەوت لە وێستگەی پاسەکەدا

---

١. لە ئێستادا کورێکی؛ هاوڕێی براکەمە و لە وڵاتی ئەڵمانیا لە شاری میوشن دەژی و زۆر جاریش وەکوو مێژوویەکی مەزن باس لە برینداریی باوکی و چالاکییەکەی ئێمە دەکات و بە دڵفراوانی و ئەوپەڕی خۆشەویستییەوە ئاهی پڕحەسرەت بۆ گۆڕونبووی هاوڕێی دڵسۆز و بەوەفام کاکە «حسێن»ی نیشتمانپەروەر هەڵدەکێشێت.

دابەزیبوو، لە کاتی ئەنجامدانی چالاکییەکەی ئێمەدا؛ ئێمە دەبینێت کە نارنجۆکەکان هەڵدەدەینە ناو «زیل»ی سەربازییەکەوە و من دەناسێتەوە و پریشکی پارچەی نارنجۆکەکەی بەر دەکەوێت و قاچی ڕاستی بریندار دەبێت، کاتێک بەبرینداری دەکەوێت بە زەویدا و ناتوانێت هەستێت و هەنگاو هەڵهێنێت، پیاوانی ڕژێم لەگەڵ لاشەی مردووەکانی سەربازەکاندا ئەویش لەگەڵ خۆیاندا بۆ نەخۆشخانەی سەربازی دەبەن و دواتر لێپرسینەوە و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکەن، هیچ ڕاستییەک نادرکێنێت، بەڵام کاتێک خانەوادەکەی سەردانی دەکەن، ئەندامانی خێزانەکەی ئاگادار دەکاتەوە، ئەوانیش بە هەمان شێوە ماڵی باوکم کە نزیکترین دراوسێیان بووین؛ ئاگادار دەکەنەوە بەوەی من و هاوڕێیەکم کارێکی لەو جۆرەمان ئەنجام داوە و لە دڵفراوانیی خۆیانەوە و هەست بە بوونی گەل و نیشتمان، چاو لە کارەکەی ئێمە دەپۆشن. هەر چەندە ئێمە بەبێ بەرژەوەندی و پاداشت بەو کارە هەستاین، لێ کولتوور و کۆمەڵگەی ئێمە جیاوازتر بیر دەکەنەوە و زۆر جار ئەو کارانەش دەبنە هۆی کێشە و ململانێ و ئاستی تۆڵەسەندنەوە.

لە کاتی ئەنجامدانی چالاکییەکە و بۆ چەند چرکەیەک دەنگێکی بەرز شەقامی ئەسحابەسپیی هەژاند و هاوار وناڵەی سەربازی بریندار و گڕی ئاگری ئۆتۆمبێلی سووتاو، تەواوی حەشامەتەکەی بەسەریەکدا دابوو، هەر کەسە و لە ترسی گیانی خۆیدا نەیدەزانی بەرەو کوێ ڕابکات. خاوەنی عەرەبانە دەستگێڕەکانی ئەو شوێنەی  ئێمە چالاکییەکەمان تێدا ئەنجام دا کە سەرقاڵی بژێویی باری گوزەرانیان بوون، هەموویان شوێنی کارەکەیان بەجێ هێشت و هەریەکە و بە لایەکدا ڕایاندەکرد. ڕێژنەی گوللەمان بەسەردا داباری و دەمودەست بەپەلە و بەڕاکردنەوە چووینە نێو کۆڵانەکانەوە. هەر لە ئەسحابەسپییەوە و  بۆ دووریی سێ سەد مەترێک، مزگەوتی دوو دەرگای لێیە و دەرگای سەرەکی لە شەقامی ئەسحابەسپییەوە دەست پێ دەکات و کۆتایی دەرگای دووەمی دەچێتەوە سەر کۆڵانە باریکەکانی پشتی سینەما دڵشادی ئەو سەردەمە و دواتر بەرەو خوار دەبێتەوە و بە هەمان کۆڵاندا بۆ پشتی دەرگای مزگەوتی خانەقا، هەر لەوێدا

هۆتێلێکی دوو نهۆمیی لێ بوو، هەرزانبەها و خەڵکی کرێکار و بێدەرەتانی بە نرخێکی کەم تیایدا دەژیان، کاکە حسێنی هاوڕێشم لەوێدا دەژیا و بێکەس و بێدەرەتان، وەک لە سەرەتاوە ئاماژەم پێ دا بە هۆی کرێکارییەوە لە مەیدانی کرێکاریدا پێی ئاشنا بووم، چەند جارێکیش سەردانم کردبوو لەو هۆتێلەدا، هەریەکەمان بە لایەکدا ڕامانکرد و منیش خۆم کرد بە مزگەوتی دوو دەرگا دا و بەڕاکردن چوومەوە سەر ئەو کۆلانەی کە هۆتێلەکەی کاکە حسێنی هاوڕێمی تێدا دەژیا و بە ڕەنگی هەڵبزڕکاو و ماندووبوونێکی زۆر و ترسەوە بەدوای حسێنی هاوڕێمدا دەگەڕام و خۆم کرد بە هۆتێلەکەدا و هەواڵی حسێنی هاوڕێم پرسی و لە وەڵامدا گوتیان لە دوێنێوە نەهاتووەتەوە. مەخابن، لەو کاتەوە تاکوو ئێستەش من و کاکە حسێنی هاوڕێم لێک دابڕاین و ئێستاشی لەگەڵدا بێت، ئەو لێکدابڕانەمان بووە لێکدابڕانی هەتاهەتایی.

ئەفسووس چارەنووسی ئەو هاوڕێیەم تا هەنووکەش بۆتە برینێکی بەسوێ و سات بە ساتی ژیانم دەکولێتەوە و هەمیشە سۆراخی دەکەم و لەنێو بیرەوەرییەکانماندا تل دەدەم. ئەوە یەکەم چالاکی و چاوکردنەوەم بوو، لەو تاقیکردنەوەیەدا بە سەرکەوتووییەکی ویژدان بریندارەوە هاتمە دەرێ، سەرەڕای ئەوەی کە خۆشەویستترین هاوڕێم کە پێکەوە ژیانێک بووین لە دوو جەستەدا، بۆ یەکجاری لێک دابڕاین و وای لێ کردووم تاوەکوو مردن خانەکانی مێشکم بە کۆمەڵێ ئاواتەوە بۆ دووبارە بینینەوەی هاوڕێم سەرقاڵ بێت.

زۆر جاریش بیر دەکەمەوە ئاخۆ کاکە حسێنی هاوڕێم بە ئەڵقەی نارنجۆکەکەی گیرفانیەوە دەستگیر کرابێت و بووبێتە بەڵگەیەکی بەرجەستە و حاشاهەڵنەگر و مایەی لەسێدارەدان، یان گوللەبارانکردنی و گۆڕ ون کرابێت! ئەمەش یەکێکە لە هەڵە دزێوەکانی هەندێک لە فەرماندە و سەرکردەکان و هاوشێوەکانی نێو شۆڕش، کە ڕۆڵەی خەڵکیان بەبێ گوێدانە ئاکام و چارەنووسیان دەبردە نێو مەنجەنیقی مەترسیدارترین فەرمانی خۆیانەوە. دەنا چی پێویستی بە دەرکردنی ئەڵقەی نارنجۆکەکان دەبوو بۆ جەنابیان بگەڕێتەوە، کە بەمە سەرەداوی بێگومان زانیاری دەست دوژمن دەکەوێت!

دەکرا لە ڕێگەیەکی ترەوە، بەتایبەت ڕێی ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشار و پاشان کار و کردەوەی خۆکوژی و چالاکیی لەو جۆرە و زەبروەشاندن و تەقینەوەیەکی ترسناکی لەو جۆرە بە زووترین کات تەنانەت لەلایەن هاوڵاتییانیشەوە باس دەکرا و لەنێو هێزی پێشمەرگەشدا دەبیسترا و دەکرا لە ڕێی تایبەتی خۆیانەوە جەختیان لە ڕاستیی چالاکییەکە بکردایەتەوە. بۆیە دەکرێت ئەوەی لە سەرەوە بە ئێمە کرا، لە سێ ڕووەوە ڕەخنەی لێ بگرین:

١. مامەڵەکردن بە گیانی کەسانی وەکوو ئێمەوە کە شارەزایی سەربازیمان نەبوو.

٢. دیارینەکردنی ئامانجێکی ڕوون لە ئەنجامدانی چالاکییەکە. دیارە تەنها مەبەستمان شڵەژاندنی هێزە مۆڵخواردووەکانی بەعس بوو لە شارەکە، بۆ ئەوەی نەتوانن بە ئارەزووی خۆیان بێن و بچن و هەست بە ئارامی بکەن، بەڵام بێ لێکدانەوەی سەرئەنجامەکەی و پێوەبوونی خەڵکی سڤیل.

٣. پاشان داواکردنی ئەڵقەی نارنجۆک و بەڵگەی بەرجەستەی چالاکییەکە، کە دەبێتە مایەی مەترسییەکی گەورە بۆ سەر ژیانی گەنجانی پڕ لە ورەی شۆڕشگێڕی وەکوو ئێمە.

## ئەوانەی لەنێو شۆڕشدا ون بوون

### شەهید مام ئاراسی حسک؛ قارەمانی ڕۆژگار و شەهیدی دەستی غەدر

یاسە هەتیوی هاوڕێم یەکێک بوو لەو پاڵەوانانەی لە شۆڕشدا ون بوو. ئەو کاتەی کە بووین بە دراوسێ، لە گەڕەکی چوارباخ لەنزیک مزگەوتی «عەبدوڵڵا لوتفی» و لە قوتابخانەی سەرەتایی چوارباخ و ئەیوبییە پێکەوە لە یەک پۆلدا بووین، لە قوتابخانەشدا هاوڕێیەتیمان هێندە بەتین بوو؛ مامۆستای پۆلەکەمان نەیدەهێشت لەسەر کورسییەک پێکەوە بین، چونکە لە کاتی وتنەوەی وانەی مامۆستاکەماندا، وا ڕێک دەکەوت لەگەڵ سەیرکردنی یەکتردا هەردووکمان پێدەکەنیین، تاکوو وای لێ دەهات ئاگامان لە وانەوتنەوەی مامۆستا نەدەما. ڕۆژێکیان هێندە پێکەنیین، بە بۆنەی ئێمەوە؛ تەواوی پۆلەکەمان بە دەستی مامۆستا لێی درا، دواتر مامۆستا من و

یاسینی هێنایە بەر چاوی تەواوی قوتابییەکان (ئەو ساڵانە وا بوو، مامۆستا لێدانی لە پۆلەکاندا بەرامبەر بە قوتابی لە قوتابخانەدا بەکار دەهێنا)، مامۆستا بە یاسینی وت: «هەردوو دەستت درێژ بکە!» پاشان بە دار کەوتە سەر پەنجەکانی یاسین و زۆری لێ دا وەک ئیهانەکردنێک و تێکشکاندنی باری کەسایەتیی دوو منداڵی قۆناغی سەرەتایی. یاسین هەردوو دەستی لە کاتی لێداندا لا نەدەبرد، ئێستەش وێنەکەی لەبەر چاومە، خوێن بە پەنجەکانیدا دەهاتە خوارەوە. ئەوەی من لە یاسینم بینی، زۆر سەرنجی ئازایەتیی ڕاکێشام. کاتێک مامۆستا پێی وت: «بڕۆرەوە شوێنی خۆت!»، یاسین بەو تەمەنە بچووکەی خۆیەوە هەر لەبەردەمی مامۆستادا ڕاوەستابوو. هێندە بەو منداڵییەوە چاونەترس بوو، مامۆستاش سڵی لێ دەکردەوە. دوابەدوای ئەو، منیش هەردوو دەستم بۆ مامۆستا درێژ کرد و بەئارەزووی خۆی تا هێزی تێدا بوو بە دار دەیکێشا بە هەر دە پەنجەکانی دەستمدا، ئازار دەچووە دەروونم، بۆیە بەڵێنم بە مامۆستا دا بەوەی جارێکی تر لە کاتی وانەوتنەوەدا پێنەکەنم و گوێڕایەڵی وانەوتنەوە بم. یاسین چەند ساڵێکی کەم لە من گەورەتر بوو، هەردووکمان یەکترمان تاوانبار دەکرد بەوەی کێ خەتابار بێت. لەبەر ئەم بوێرییانەی یاسین لەنێو نەک پۆلەکەدا بەڵکوو لەنێو قوتابخانەکەشدا، بە منداڵێکی  چاونەترس ناو دەبرا.

لەیادمە لە پۆلی یەکی ناوەندی بووم، مامۆستا عەبدولڕەحمان وانەی پێ دەوتینەوە، لە کاتی وانەوتنەوەدا قوتابییەک لە پشتمەوە بوو، داوای هاوکاریی لێ کردم بەوەی پێنووسەکەی کەوتۆتە خوارەوە و بەلای ژێر پێی مێزەکەی مندا هاتووە، منیش ئاوڕم بۆ دواوە دایەوە و پێنووسەکەم دایەوە دەستی، لە ڕاستیدا هیچ تاوانێک نەبوو، بەڵکوو هاوکاریی هاوڕێ قوتابییەکەم کرد، مامۆستا بانگی کردم بۆ پێشەوەی پۆلەکە و گوێی ڕاکێشام و لاجانگی بەرز کردمەوە و تا هێزی تیا بوو شەقێکی لە دواوە تێ هەڵدام و گونم تەواو ئازاری پێ گەیشت، چونکە پێڵاوی چەرمی نووکدرێژی لەپێدا بوو. من لەتاو ئازاری جەستەمدا نەمدەزانی چی بکەم، وام دەزانی بە سواری فڕۆکەیەکەوەم

و له تەواوی بەرزیی ئاسماندا بۆ سەر زەوی فڕێ دراومەتەوە خوارەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو قوتابییەکانی نێو پۆلەکە بە دەنگی بەرز بە من پێدەکەنین. جگە لەوەش نەیانهێشت بێمەوە بۆ قوتابخانە، وەک بڵێی تاوانێکی زۆر سەختی مرۆییم کردووە، دواتر داوایان لێ کردم بەوەی باوکم یان دایکم سەردانی قوتابخانە بکات بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر تاوانەکەی من کە لە پۆلەکەدا کردوومە. کاتێک چوومەوە بۆ ماڵەوە، نەمدەوێرا ئەو تاوانە سەختەی کە کردوومە؛ بۆ باوکمی بگێڕمەوە و پێی ڕابگەیەنم، بۆ ئەوەی لە بەڕێوەبەری قوتابخانە بپاڕێتەوە و لێم خۆش ببن و جارێکی تر بتوانم لە قوتابخانەدا درێژە بە خوێندن بدەم، ناچار دایکم بە باوکمی ڕاگەیاند و چیرۆکی تاوانە گەورەکەی کە من کردبووم لە قوتابخانەدا؛ بەهێمنی بۆ گێڕایەوە، ئەویش نەیهێشت بەسەرهاتەکە تەواو بکات، بەر هێزی لێدانی قەوارەی دەست و مەچەکی خۆی دام و کەوتە لێدانم و دوو هێندەی شەق وەشاندنەکەی مامۆستا عەبدولڕەحمان ئازاری ناخی دەروونی دام. وا ڕێک کەوت لە ساڵی ١٩٨٤؛ ساڵانی ژیانی پڕ نەهامەتی و دەردەسەری بەڕێکردن و تەمەن بەرەو هەڵکشان دەڕۆشت و لە سەروبەندی دانوستانی نێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و ڕژێمی بەعسدا بوو، ئەو دەمەش تەمەنم بیست و سێ ساڵان دەبوو، ئەو ساڵە (١٩٨٤) لەگەڵ دوو پێشمەرگەی کەرتەکەماندا بە کاری شۆڕش هاتبووینەوە ناو شاری سلێمانی و دانوستان لەئارادا بوو، ئەو مامۆستایەی کە لە پۆلی یەکی ناوەندی بووم و شەقی تێ هەڵدام، لە کۆڵانێکدا بەڕێکەوت دوای ئەو هەموو ساڵە بینیمەوە، داوای هاوکاریم لەو دوو پێشمەرگەیەی کە لەگەڵمدا بوون؛ کرد و ئەوانیش هاتن لەگەڵمدا و چوومە بەردەمی مامۆستا عەبدولڕەحمان، دوای سڵاوکردن، پێم ڕاگەیاند: «مامۆستا، دەمناسیتەوە؟» وتی: «نەخێر!» وتم: «من فڵانە قوتابی بووم، بەبێ هیچ تاوانێک تۆ کەسایەتیی منت بەبەر چاوی تەواوی قوتابییەکانی پۆلەکەمدا شکاند و هەر هەموویان بە من پێدەکەنین، بەڵام ئێستە من بووم بە پێشمەرگە و بەرگری لە مافی تۆی هاوڵاتیی کورد

دەکەم. جا گەر ئەمریکیشت هەیە، من لە خزمەتی تۆدام.» و ناونیشانی کەرت و تیپەکەمان دا پێی کە تیایدا پێشمەرگە بووم. مامۆستام بەجێ هێشت و دڵم پڕ بوو، فرمێسک بە چاومدا هاتە خوارەوە و وەک منداڵ دەگریام، خۆشم نەمدەزانی هۆکاری گریانەکەم بەو تەمەنەوە چی بوو کە لە منداڵیدا لێی دام و نەشدەگریام! ئەو دوو پێشمەرگەیەش کە لەگەڵمدا بوون، ئێستە لە ژیاندا ماون و یەکێکیان لە کوردستان دەژی و ئەوی تریشیان لە هەندەران. ئەو کاتە ژیانی قوتابی زۆر ناڕەحەت بوو، لەو دەمەدا و بگرە ئێستەش لە هەندێک قوتابخانەدا لێدان بۆ تەمبێکردنی قوتابی بەکار دێت. هەر لە تەمەنی منداڵیدا بووین، لە کۆتایی شەستەکاندا، لە زستانێکی سارد و بەستەڵەکدا، پێشتر بەفرێکی زۆر زۆر باریبوو، یاسین بە هەلی زانیبوو بەرەبەیان بە دیواری قوتابخانەکەدا چووبووە نێو قوتابخانە و بە بەفر؛ پەیکەرێکی گەورەی پێشمەرگەی دروست کردبوو. هێندە گەورە دروست کرابوو، بە ئەندازەی باڵای خۆی دەبوو. بەو منداڵییەوە هێندە جوان نەخشەی سەروسیمای پێشمەرگە و چەکەکەی سەرشانی کردبوو، جێی دید و تێڕوانین و پرسیاری زۆر بوو، وەک تابلۆیەکی نەخشینی دەستی نیگارکێشێکی بەناوبانگ و تابلۆیەکی نێو هۆڵی مۆزەخانەیەک. نەخشاندنی دیمەنی ئەو پەیکەرە بەفرینە، لەو فەرشانە دەچوو کە بە دەست چنرابێت و وێنەی شەهیدێکی تێکۆشەری کوردستانی لەسەر نەخشابێت و لە هەموو ماڵێکی هەژاردا هەڵواسرابێت و بە جۆرێک ناخی دەهەژاندیت؛ هیچ پێناسەیەکی لە جوانیدا بۆ نەدەکرا، تەنها وشەی پێشمەرگە نەبێت کە مەرگی خۆی؛ پێش هەموو ئاواتەکانی و حەز و ئارەزووەکانی ژیانی پێش خستووە. ئەو دەمە کاتێک بەیانیان کۆ دەبووینەوە لەنێو قوتابخانەدا، تەواوی قوتابییەکان بەڕیز دەوەستاین و سروودی «ئەی ڕەقیب»یان پێ دەگوتینەوە. دوای سەرنجی زۆری مامۆستاکان، پرسیار کرا بەوەی کێ دروستی کردووە؟ یاسین هێندە ماندوو و سەرمای ببوو، تەواوی جەستەی هەڵدەلەرزی و وەڵامی دایەوە و وتی: «من دروستم کردووە!» بەڕێوەبەری قوتابخانە تەماشای کرد و

وتی: «هەمووتان چەپڵەی بۆ لێبدەن!» هەمووان پێکەوە چەپڵەمان بۆ لێدا و سروودی «ئەی ڕەقیب»مان دەگوتەوە. ئیتر لەو ڕۆژەوە «یاسینە هەتیو» بوو بە قارەمانی نەک قوتابخانە، بەڵکوو لە تەواوی گەڕەکەکاندا باس لەو کارە جوانەی دەکرا کە هەستوسۆزێکی کوردانە لە دەروونی منداڵێکی وەک ئەودا چێنرابوو، ئەو هەستە لە مرۆڤێکی گەورەتر لەوەوە چاوەڕوان دەکرا، نەک لە منداڵێکی وەک یاسینی تەمەن هەشت نۆ ساڵان.

هەر منداڵ بووین، هەر چەندە کوردبوون ئاگای لە منالی و گەورەیی نییە و نایزانێت، کە یاریی چاوشارکێ و ڕاوڕاوێنمان دەکرد، خۆمان لەسەر بەرەنگاربوونەوە ڕادەهێنا، یاریی «پێشمەرگە و جاش و عەسکەر»مان دەکرد، یاسە هەتیو بەخۆڕسک وریا و زیرەک بوو، ئەو لە یارییەکاندا ڕۆڵی پێشمەرگەی دەبینی، بە تفەنگە دارینەکەیەوە دیوارە و دیوار سەربازە بەعسییەکانی ڕاو دەنا، هێندە بەحەماسەتەوە دەنگی تەقەی تفەنگەکەی بە دەمیەوە دەیشیراند، ئارەقەی دەکرد. ئەگەرچی گەمەی شەڕی پێشمەرگە و پیاوانی ڕژێم (ئەمنەکان) مەشقێکی منالانە بوو، بەڵام ئێمە لە گەورەییدا لەگەڵ خۆماندا بردمانەوە بۆ چیاکان. یاسینی هاوڕێم لە ڕێکەوتی ١٩٥٧/١٠/١٨دا لەدایک بووە، کەریم تۆفیقی باوکی پۆلیس بوو، دواتر چووبووە نێو ڕیزی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، چەک و ئەزموونەکەی یاسین وەک نەهامەتی و نەدارییەکەی دەگەڕایەوە بۆ کارەکەی باوکی. باوکی ئەزموونێکی دەوڵەمەندی لە شار و گوندەکانەوە کۆ کردبوویەوە، بە پۆلیسی گوازرابوویەوە بۆ پێنجوێن و دواتریش بۆ سووورداش و گەبە و گولیجە و قەڵادزێ و هەڵشۆ و بنگرد و بارەگای دەبەنە و بێتواتە، جگە لەوەش بەشداریی گرتنی ناحیەی بنگردی کردووە، بۆیە لە هەر شار و شارۆچکە و دێیەکدا پەڕەیەک زیاتری خستبووە سەر کتێبی ژیانی. کەریم تۆفیق لە عەشرەتی جاف و بنەماڵەیەکی ئایینپەروەر بووە و کوێخا سمایلی تەلانیش کە باوەڕپێکراو و ڕیشسپی و پیاوماقوڵی عەشرەتی جاف بوو، لە کەسە نزیکەکانی بوو.

پاشان کەریم تۆفیق بە ڕەزامەندیی خۆی، داوا دەکات وەک پێشمەرگەیەک لە دۆڵی جافایەتیدا بەرگری لە خاک و نیشتمانەکەی بکات. کاتێک بەرەو دۆڵی جافایەتی ملی ڕێگا دەگرێتە بەر، لە ڕێگادا دەکەوێتە بۆسەی دوژمن و پاشان بەدیلی دەبرێت بۆ ڕانیە و دواتریش دەگوێزرێتەوە بۆ زیندانی شاری سلێمانی و پاش چەند مانگێک لە ئەشکەنجەدان، دواتر وەک دەستبەسەرێک ڕەوانەی شاری «فەلوجە» دەکرێت و دوای ئەوەی ئازاد دەکرێت، جارێکی تریش دووبارە لە کۆمەڵکوژی و ڕەشبگیریی ساڵی ١٩٦٣دا لە سەردەمی حوکمڕانیی زەعیم سدیق بێسەروشوێن دەکرێت و پاش چەند ڕۆژێک لە بەتانییەکی خوێناویدا دوای ئەشکەنجەدانێکی زۆر، لەبەردەم دەرگای ماڵەکەیان فڕێی دەدەن. ئەویش چەند ڕۆژێکی کەم بەرگەی ئاسەواری ئەو ئەشکەنجە توندە دەگرێت و گیان لەدەست دەدات و دەبێتە یەکێکی تر لە شەهیدەکانی ڕێگای بەدەستهێنانی مافە ڕەواکانی گەلەکەمان. لەوە بەدواوە لەبەر بێباوکی، «یاسین کەریم تۆفیق» لەنێو هاوڕێیان و منداڵانی گەڕەکدا ناوی «یاسینە هەتیو»ی بەسەردا دادەبڕدرێت.

ڕەعنا خانی دایکی دوای بێسەروشوێنبوونی هاوسەرەکەی، بە خێزانێکی چەند منداڵێکەوە دراوسێمان بوون و لە نزیکەوە مێژووی قارەمانێتیی ئەو ئافرەتە دەزانم. یاسین هەمیشە ورەبەرز بوو، لە خۆی ڕادەبینی و بەوپەڕی خۆبەگەورەییەوە نەیدەهێشت بێباوکیی پێوە دیار بێت و خۆی بە کەسێکی بێباوک بزانێت، واتە لەناو ئاپۆڕەی جەماوەر و لەنێو هاوەڵەکانیدا ڕۆڵی گەورەی دەبینی و لە ڕووخساریدا بەدی نەدەکرا لە نازی باوکایەتی بێبەش بێت. هەمیشە قسەخۆش و سەروزمان شیرین بوو. یاسین هەر لە منداڵییەوە سەرکردە بوو، هەر لە منداڵییەوە پێشمەرگە و شۆڕشگێڕ بوو، دیار بوو بەسەرهاتی بێسەروشوێنکردن و شەهیدکردنی باوکی؛ کاریگەریی زۆری لەسەر دانابوو. دیارە لە زمانی ڕەعنا خانی دایکییەوە چیرۆکەکانی باوکی بیستبووەوە و هەمیشە باسی دەکرد کە باوکیان گرتووە و پاش ماوەیەک لە بەتانییەکیانەوە پێچاوە و لەبەردەم ماڵەکەی خۆیاندا بە جلوبەرگی

خوێناوییەوە فڕێیان داوە. چیرۆکی قوربانیدانی بنەماڵەی یاسین تۆفیق (یاسینە هەتیو) کە دوایی لە شۆڕشی نوێدا بە «مام ئاراس» ناوبانگ دەردەکات، بە شەهیدبوونی باوکی دەست پێ دەکات و بەداخەوە لە شۆڕشی نوێی گەلەکەشماندا مام ئاراس دەبێتە شەهیدی دەستی غەدر و تۆڵەی بە ناهەقی شەڕی براکوژی کە لە ساڵی ١٩٨١دا ئەنجام درا. بەڵام تراژیدیای ئەم خانەوادەیە لە پێناوی کوردستاندا و لە مێژوویەکی پڕ سەروەریی یەکەبەیەکەی ئەندامانی خێزانەکەیان و بنەماڵەکەیانەوە، هەر لە زیندانیکردن و ئەنفالکردنی پتر لە پانزە مرۆڤی گەورە و بچووک و منداڵی شیرەخۆرەوە، تاوەکوو دەگاتە بەتەمەنترین ژن و پیاوی ئەم بنەماڵەیە؛ درێژ دەبێتەوە. دوای شەهیدبوونی باوکی مام ئاراس و گوللەبارانکردنی «مام ئاراس»، زاواکەی (تاهیر جەلال) دەبێتە درێژەپێدەری خەباتی بزووتنەوەی نیشتمانیی گەلی کورد، کە لە زیندانەکانی ڕژێمی بەعسدا لەسێدارە دەدرێت. کاتێک گوێبیستی وشەی «یاسینە هەتیو» دەبم، جوانترین یادەوەریی ئەو قارەمانەم بەبیر دێتەوە و لە چوارچێوەیەکی زێڕیندا لە ئەلبوومی یادەوەرییەکانمدا هەڵواسراون. بەبیرم دێت لە ساڵیادی جەژنی نەورۆزدا، لە گەڕەکی چوارباخ، لەناوەڕاستی گەڕەکەکەدا تەواوی خەڵکی کۆ ببوونەوە و بە بەرزاییەکی گەورە و بەرفراون دارێکی زۆریان کۆ کردبووە و ئافرەتان بە پۆشاکی کوردیی ڕەنگی جۆراوجۆر و لاوانی گەڕەک بە پۆشاکی کوردی و جامانە و فەقیانەی شۆڕی بازوویان، لە چواردەوری ئەو کۆمەڵە زۆرە دارەدا کۆ ببوونەوە و گۆرانیی «ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆز هاتەوە»یان دەچڕی. لەنێوان دایکم و ڕەعنا خانمی دایکی یاسیندا وەستابووم، کە لە هەمان کاتیشدا من پێم دەگوت «دایە ڕەعنا»، لەپڕ یاسین بە دارێکی درێژ بەسەر بەرزیی دارەکەی دەستیەوە بە بڵێسەی ئاگرێکی بەتین و بەوپەڕی جۆشوخرۆشەوە بە دەستەکەی تری نەوتی دەکرد بە دارەکاندا و بە سرووودی نیشتمانی و گۆرانیی «نەورۆز»ەوە گڕی بەر دایە دارەکان. ڕەشبەڵەک و ئاهەنگ و درووشمی «یان کوردستان

یان نەمان» گوێی دوژمنانی کەڕ کردبوو، کڵپەی ئاگر هێندەی نەمابوو ئاسمان بسووتێنێت و ئەستێرەکانیش لە تینی ڕووناکیی ئاگرەکەی لەمەڕ ئاهەنگەکەی ئێمە، شەرم لە ڕووناکی و درەوشانەوەی خۆیان بکەن. ئەو حەشاماتەی لە چواردەوەری گڕوتینی ئاگرەکەدا بوون، هەموو تێکڕا بەگشتی سوپاس و ستایشیان بۆ مەزنی و دڵسۆزی و قارەمانێتیی یاسین دەردەبڕی. یاسە هەتیو بەمنداڵی جگە لەوەی سەرمەشقی ئەو گەمەیە بوو، لە خوێندنگەش شاگردێکی گوێڕایەڵ و چوست و چالاک بوو. یاسە هەتیو کاتێک ڕەعنا خانمی دایکی ئەگەر پەنجا فلسی پێ بدایە، دەچوو شیرینیی سەردەمی منداڵیی وەک کونجی و مەسکەت و لوقمی پێ دەکڕی و دابەشی دەکرد بەسەر هاوڕێکانیدا، ئەمە لە کاتێکدا بە هۆی شەهیدبوونی باوکیانەوە؛ هەژاری ناڕەحەتی کردبوون. ڕەعنا خانمی دایکی هێندە ئافرەتێکی قارەمان بوو، سەری بۆ هیچ نامەردێک دانەدەواند و کاری نان دروستکردنی دەکرد، وەک چۆن هەر پیاوێکی هەژاری خاوەنی چەند ئەندامێکی خێزان، کرێکاری و جووتیاری بۆ بژێویی ژیانی تەواوی ئەندامانی خێزانەکەی دەکات، ڕەعنا خانمیش شەڕی لەگەڵ کێشە و ململانێکان و گرفتەکانی نێو ژیانی دەکرد. ڕەعنا خانم ئافرەتێکی باڵا مامناوەندی گەنمڕەنگی وتەخۆش و خووڕەوشت بەرز بوو. لەیادمە من و یاسین لەدوای تەواوبوونی قوتابخانە، دەچووینە خزمەتی ئەو مەریەمەی کە لەلای مەسیحی مەزن خۆشەویستە، بەڵام مەسیح هێشتا گەورەیی حەزرەتی ڕەعنای بۆ پێناسە نەکراوە، گەر من مەسیح بوومایە، ڕەعنا خانمم لە جێی مەریەم پێ مەزنتر دەبوو و هەر واشە، لە دیدی مندا دایە ڕەعنای دایکی یاسین لە حەزرەتی مەریەم گەورەترە، نانی دروست دەکرد و کێژۆڵە تەمەن نۆ ساڵانێکی قژ هەڵبزرکاوی دەمبەخەندە و پێکەنینیش جووتێ نەعلی لاستیکی دڕاوی لەتەنیشت خۆیەوە دانابوو، ئەویش «مەلیحە» خانی خوشکی مام ئاراس بوو، چەند کولێرەبەڕۆن و نانی تیریی کردبووە سەنگەرێک، دەتگوت ئەو ئافرەتە شۆڕشگێڕانەی ڕۆژئاوای کوردستان و ئەو کیژە نازادرە قارەمانانەی قەندیلن کە شەڕی مان و نەمان

دەکەن لە پێناوی بستێک خاکی کوردستان و ژیانیان پێش مەرگ دەخەن. مەلیحە خانم کیژێکی زۆر جوان بوو، سەرقۆڵی ئەو کراسەی لەبەریدا بوو هێندە ئارەقەی نێوچەوان و گەردنی پێ سڕیبوو، زەرد ببوون و تەڕ ببوون، وەک بڵێی بارانێکی زۆری زستان بارییێت و ئەمیش لەژێر ڕەحمەتی سروشتی بارانبارێندا تەڕ بووبێت. یاسینیش دەستی برد کولێرەیەکی دا بە من و پێکەوە خواردمان. هێندە لەزەتی بۆنوبەرامی کولێرەکانی دایە ڕەعنا لەلام ماوە، بە هەموو خواردنە بەتامەکانی ئەم سەردەمە تامی ئەو کولێرەیەی ڕەعنای دایکی یاسین نادات. یاسین بەهەژاری و بێباوکی گەورە ببوو، ئەویش حەزی دەکرد وەک هەموو مناڵێکی نێو خێزانێک و هەمیشە لە سۆز و خۆشەویستیی باوکی بێبەش نەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یاسین بەو منداڵییەی خۆیەوە ئاسوودەیی ئەوەی پێوە دیار بوو کە خێزانەکەیان خەڵاتێکی گەورەیان بە میللەتەکەیان بەخشیوە، ئەویش شەهیدبوونی باوکی بوو. لەو سەردەمەدا، واتە لە ساڵانی حەفتاکاندا، وشەی: هەتیو، بێوەژن، قەیرەکچ، پیرێژن، کورتەباڵا...؛ ئەم وشانە بۆ تیروتوانج بەکار نەدەهێنران، هێندە ڕێز لە یاسینە هەتیو دەگیرا، هێندە ڕێز لە منداڵێک نەدەگیرا کە باوکی لە ژیاندا مابوو. ڕێزگرتن و پاراستنی شکۆی دراوسێیەتی هێندە کولتوورێکی جوان و بەهێز بوو، کاتێک خێزانێک بیویستایە ژیانی هاوبەش بۆ کچەکەی یان کوڕەکەی پێک بهێنێت، ئەو خێزانە پێی شەرم بوو هاوسەرگیری لەگەڵ خێزانی ماڵە دراوسێکەیدا بکردایە، چونکە وایان دەبینی هەردوو لایان خوشک و برای یەکن. باوک و دایک لەنێو خێزاندا ڕۆڵی کاریگەریان هەبوو لە پەروەردەکردنی ئەندامانی خێزانەکانیان، هەمووان ڕێز و تەبایی لە نێوانیاندا هەبوو. تەواو بە پێچەوانەی ژیانی ئێستا بوو کە درۆکردن زیاترە وەک لە ڕاستیبوون، بێڕێزی و بێ مۆڕاڵی بە ئەندازەیەک تەشەنەی کردووە، هێشتا تاوانەکان نابنە هۆی پێناسەکردنیان و هۆکاری دەرخستنی زیاتریان. ئێمەش ئەو کاتە بە هەمان شێوە بە هۆی تێکەڵبوونی باوکمان بە شۆڕش و کوردایەتییەوە؛ خێزانێکی نەدار بووین و پاش ماوەیەک قۆناغی

سەرەتاییشمان تەواو بوو، ماڵەکەمان گواستەوە بۆ گەڕەکی جوولەکان کە هێندە دوور نەبوو لە گەڕەکی چوارباخەوە و لە ناوەندیی سیروان و لە پۆلی یەکی ناوەندیدا درێژەم بە خوێندن دا و لەوەبەدواوە یاسینم نەدییەوە تاکوو ڕۆژی بوونم بە پێشمەرگە لە شاخ. کۆتایی ساڵی ١٩٧٩ کە چوومە شاخ و بووم بە پێشمەرگە (تەمەنم هەژدە ساڵ بوو)، ناوبانگ و قارەمانێتیی مام ئاراس ببوویە وێردی سەر زاری زۆربەی خەڵک. بەر لەوەی بچمە شاخ و ببمە پێشمەرگە، دەنگدانەوەی «مام ئاراس» لە شار؛ ڕژێمی تۆقاندبوو، منیش بۆ یەکەم جار لە بلەکێ دوای ئەو هەموو بیرەوەرییەی منداڵی و لێکدابڕان، بە دیداری یاسینە هەتیو شاد بوومەوە و فرمێسک بە چاومدا هاتە خوارەوە و ئیتر لەو ڕۆژەوە بیرەوەرییەکانی منداڵیی من و منداڵیی یاسە هەتیو لە چوارچێوەی زێڕینی کونجی ئەلبوومی یادەوەرییەکاندا هەڵواسران و لاپەڕەیەکی نوێی یادەوەریی پڕ کارەساتی خوێناوی و پڕ تراژیدیای نوێی شۆڕشگێڕی و خەبات و کوردایەتی بە ڕووی چارەنووسی بێکۆتا و نادیاردا هەڵدرایەوە و جارێکی تر مێژوویەکی پرسەروەری و مێژوویەکی پیرۆزی هەمیشە زیندووی پڕ غەدر و ترس و تۆقاندن و ژیانی پڕ لە دڵەڕاوکێ بوونەوە ئەزموونێک لە ڕەنج و ماندووبوونی خەباتی ڕۆژگارە سەختەکانی هەوراز و نشێو و گەرمای هاوین و سەرمای شەوانی زستان...

شەوێکی هاوین لەسەر جێگەی تەنهاییمدا ڕاکشابووم، نازانم خەوم لێکەوتبوو یان خەونم دەبینی یان چووبوومە نێو خەڵوەتەوە و بە ئازارەکانی مێژووی ژیانمدا دەچوومەوە و کەوتبوومە قووڵایی بیرکردنەوەی چەندین نەبەردی و قارەمانێتیی ئەو تێکۆشەرانەی بەرگرییان لە خاک و نیشتمان دەکرد، کە تا ئێستەش هەندێکیان گۆڕیان ون و مێژوویان بەنادیاری ماوەتەوە یان مێژوویان چەندین پرسیاری تری لە خۆیدا هەڵگرتووە، جارجارەش نەغمەی بولبول و دەنگی باڵندەکانی ئاسمان و جریوەی چۆلەکەکانی سەر گوێسەبانەی سەربان؛ هێندەی تر جوانییان دەبەخشی بە بیرکردنەوەم و هێندەی تر تامەزرۆی بیرکردنەوەی هاوڕێیان و هاوسەنگەرانم دەبووم کە

له ڕابردوودا بەجێم هێشتوون و ئەوانیش بۆ هەتاهەتایی ماڵئاواییان لە ژیان و خودی خۆم کرد.

بەدەم بیرکردنەوە و چاوی پڕفرمێسکەوە و بەرەو مەنزڵگای شۆڕشگێڕان ورد و درشت هەنگاوی لەسەرخۆم دەنا و تەنها بۆ ماچکردنی کێلی سەر گۆڕەکەی «مام ئاراس»، دوو کاتژمێرم بڕی لە گۆڕستانی سەیواندا. دوای چەندین ساڵ بە دیداری خاتوو «مەلیحەی خوشکی» شەهید مام ئاراس شاد بووم، ئەم شێرەژنە جگە لەوەی باوک و برای شەهید بوون، لەگەڵ ئەوەشدا «تاهیر جەلال»ی هاوسەری لە ژیانێکی کورتی هاوسەریدا بە هەناسەی سارد و ژیانی پڕئازارەوە بۆ دواجار بەجێی دەهێڵێت و شەهید دەکرێت. کاتێک بە دیداری شاد بووم و لە هەوڵی باسکردنی مێژووی ژیانی شەهید مام ئاراس و پرسیاری لەسێدارەدانی شەهید «تاهیر جەلال»ی هاوسەری بووم، بە پێچەوانەی ئەوەی غەمبار بێت، بە ڕووخسارێکی گەشەوە سەری بەرز کردەوە و لەبریی ئەوەی لەسەر ژیانی خۆی و قوربانیدانی بنەماڵەکەی بدوێت، چیرۆکی ئافرەتێکی دراوسێی خۆیانی بۆ گێڕامەوە کە چۆن هاوسەرەکەی لە شەوێکی ساردی زستاندا لەتەنیشت منداڵەکانیەوە لەنێو جێگەدا دەیبەن، بۆ دواجاریش جەستەی شێوێنراوی خوێناویی بۆ دەهێننەوە. ئازایەتی و قارەمانێتیی خاتوو «مەلیحە»ی خوشکی شەهید مام ئاراس لەوەدا بوو، سەرەڕای ئەوەی باوک و برا و هاوسەری شەهید ببوون، بەپێچەوانەوە لە ئاستی مێژووی خەباتگێڕاندا هێشتا خۆی بە کەم دەزانی بەوەی کە ئەوان پێشەنگی شۆڕش و کوردایەتین. کاتێک «تاهیر جەلال»ی هاوسەری سەرقاڵی ڕێکخستن و پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە شۆڕشەوە دەبێت، لە ساڵی ١٩٨٥دا لە تەمەنی (٢٩) ساڵیدا لە بازگەی چەمچەماڵ-کەرکووک دەستگیر دەکرێت و دواتر بەرەو زیندانی «هەیئەی خاسە» و دادگای بەعس (مەحکەمە خاسە)، دادگایی نادادپەروەرانە دەکرێت و لە زیندانی «ئەبو غرێب» لەسێدارە دەدرێت. دوای تێپەڕبوونی هەژدە ساڵ، واتە دوای ڕووخانی ڕژێمی فاشیستی بەغدا، لە گۆڕستانی کەرخی

بەغدا لەگەڵ چەند تێکۆشەرێکی تری وەک شەهیدان بەکر دارتاش و جەباری حاجی ڕەشید تەرمەکانیان دەدۆزرێنەوە و لە مانگی پێنجی ساڵی ٢٠٠٣دا تەرمی پیرۆزیان لە مەراسیمێکی پڕشکۆ دەهێننەوە بۆ شاری سلێمانی و لە گۆڕستانی سەیوان هەر ڕێک لەتەنیشت شەهید مام ئاراسدا بە ئامێزی خاکی دایک دەسپێردرێت. بەپێی ئەو بەڵگەیەی بەردەستم کەوتووە، کاتێک تاهیر جەلال لەنێو ژووری زینداندا دەبێت لە کەرکووک واتە «هەیئەی خاسە» کە ترسناکترین زیندانی ڕژێمی بەعس بووە، جەللادێکی نەخوێندەوار بۆ ترس و دڵەڕاوکێی زیندانەکان بە کێبڵێکەوە و بە هێز و توانای خۆی بە دەرگا ئاسنینەکاندا دەکێشێت و لەنێو چەندین زیندانیانی تری ئەو ژوورەدا بە تاهیر جەلال دەڵێت: «ئێمە زانیاریی زیاترمان لە بارەی تۆوە دەست کەوتووە، بەوەی تاوانباری ‹مخرب[1]› لەناوچوو مام ئاراس خزمتە و تۆش تاوانباریت وەک ئەو!» هەر چەندە زیندانەوانە بەعسییەکە بە سووکایەتی پەیوەندیی ئەوان ئاماژە پێ دەدات، بەڵام شەهید تاهیر بەوپەڕی شانازییەوە دەڵێت: «نەک تەنها خزم، ئەو سەرکردە و پێشەنگمان بووە...»

شەهید «تاهیر جەلال» لەدوای خۆی، جگە لە خاتوو «مەلیحە کەریم تۆفیق»ی هاوسەری، چوار منداڵی چاوگەش و چوار منداڵی چارەنووس نادیاری ئەو سەردەمە بە ناوی (بابان، تابان، تانیا، بەندی) بەجێ دەهێڵێت. خاتوو مەلیحە دەڵێت: پیرۆزترین مێژووی ئەوەیە کە ئەو ڕۆژەی «بەندی» چاوی بە دنیا هەڵدەهێنێت، لەگەڵ یادی چلەی ڕۆژی شەهیدبوونی «تاهیر جەلال»ی باوکیدا بەراورد دەکرێت و دەبێتە یادگارییەکی پیرۆزی مەزن بۆ یادی ڕۆژی لەدایکبوونی بەندی ئەو بنەماڵەیە. سەرگوزەشتەیەکی یەکجار ناخهەژێن و بەئازاری تری ئەم بنەماڵەیە، ئەویش ئەوەیە کە خوشکێکی تری

---

١. وشەی «مخرب» لە عەرەبیدا بە واتای تێکدەر دێت، لە سەردەمی ڕژێمی بەعس لەلایەن دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانیانەوە بە پێشمەرگە دەوترا.

شەهید مام ئاراس؛ خاتوو «سەبریە» کە خوشکی گەورەی مام ئاراسە، بە (١٠) منداڵەوە لە کاتی ئەنفالدا دەستگیر دەکرێت.

یەکێک لە ئازارە سەخت و نەبڕاوەکانی کورد، برینی قووڵی ئەنفالە. ئەنفال دەرکی ئەو تونێلە نەبڕاوەیە کە مرۆڤی کورد پێیدا تێپەڕ دەبێت و ناگاتە هیچ شوێنێک. ئەو برینەیە، سوێ و ئازاری ساڵانەی ڕۆح نوێ دەکاتەوە. ئەو ئازارەیە کە هەمیشە ڕۆحی کوردبوونمان زیندوو دەکاتەوە و خەباتی نوێمان جۆش دەدا و دەرگای بوون و تێکۆشانمان بۆ دەخاتەوە سەرپشت و چەکەرەی لەدایکبوونمان هەزارەها جار شین دەکاتەوە. ئەنفال ماڵێکی پڕ لە ئێسک و پرووسکی بەجێماو و سووتماکی پڕ تاوانە، دەستی ڕەشی زوڵم و ویژدانێکی نەکلۆکی زوڵم و ژانە، ئەنفال دەستی سۆزی «دین» و پژمەی سۆفیی ڕدێن درێژ و زیکری درۆی ڕۆحکێشانە، ئەنفالی ژن و منداڵ و پیر و گیاندارانی نێو بوونێکی پاوانخوازی سوورەتێکی چەپێنراوی درۆی بێویژدانە. ئەم بێویژدانییە گەورە و بچووکی نەفامیوە و تەنانەت منداڵی سەر بێشکەی کردووەتە پێکانی ئامانجەکانی ڕژێم و هەزاران کۆرپەی ساوای لە بیابانەکانی عەرەبیدا زیندەبەچاڵ کردووە. ئەنفال، واتە کوشتن و بڕین و گوللەبارانکردن و زیندەبەچاڵکردن، بەبێ جیاوازی لەنێوان ژن و پیاوی بەساڵاداچوو و گەورە و بچووک و تەنانەت سووتاندنی دار و درەخت و نەهێشتنی ئاژەڵەکان و کوشتنی باڵندەکانیش بە ئاسمانەوە.

کاتێک ئەم ڕەفتارە نامرۆییە دەرهەق بە هاوڵاتییانی سڤیل دەکرێت و تۆڵەی کوشتنی جەللادەکانی ڕژێم لە لوولەی تفەنگی شۆڕشگێڕانەوە ئەنجام دەدرێت لە دۆڵی جافایەتیدا کە زۆرترین بارەگا و هێزی چەند حزبێکی لێ بوو، بەتایبەت مەڵبەندی دوو و سەرکردایەتی و ڕاگەیاندنی یەکێتیی نیشتمانی و زۆرینەی هێزی پێشمەرگەی یەکێتی کە زۆرترین مێژووی پرسەروەرییان لەوێدا نەخشاندبوو، ئەوا خاتوو «سەبریە»ی خوشکی شەهید مام ئاراس بە دە منداڵەوە، لەگەڵ چەندین هاوڵاتیی سڤیلدا دەستگیر دەکرێن. لە سەرەتای دەستگیرکردنی خاتوو سەبریەی خوشکی مام ئاراس،

پاش ئەوەی هاوڵاتییانێکی زۆر لەنێو ژوورێکی بچووکدا بە ناوی ئەنفالەوە زیندانی دەکرێن، سێ منداڵی بچووکی لە تینوویتی و برساندا، لە ماوەی تەنها یەک شەو و ڕۆژدا ڕۆحیان دەردەچێت و کۆتایی بە ژیانیان دێت.

ئەم سەرگوزەشتەیە لە زاری ئافرەتێکی بەساڵاچووی ڕزگارکراوی نێو زیندانەکانی ئەنفالدا ئاماژەی بە تاوانەکانی ڕژێم داوە کە چۆن ئەم خاتوونە بەرەنگاری ئەم هەموو ئازار و ئەشکەنجەیە بووەتەوە کە سێ منداڵی بچووک لە باوەشی خۆیدا دەبنە قوربانیی گەل و شەهید دەبن، ئەمە لە کاتێکدا هاوسەرەکەی (بەکر تەلانی) تێکۆشەرێکی دێرینی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە و لەو کاتەی خانەوادەکەی بە تەواوی منداڵەکانیەوە بەر شاڵاوی ئەنفال دەکەون، بەکر تەلانی لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا بەشداری شەڕەکانی دژ بە ئەنفال دەبێت و لە هەمان کاتیشدا ئەمان دەستگیر دەکرێن.

لێرە و لەوێ ژیاننامەی ناحەزانی کوردمان بەرچاو دەکەوێت کە بێباکانە خۆیان بە دڵسۆز و تێکۆشەری دێرین دەزانن، بۆ هەر ڕەفتار و کردارێکیان سەرانی باڵای پارتە سیاسییەکانی کوردستان دەکەنە گەواهیی کارەکانیان و بەڕوونی پێمان دەڵێن بەبێ ئەوان؛ ڕێوشوێنی دادگا هەڵناگرن و ئامادەی لێپێچینەوەی تاوانەکانیان نابن. ئەوان بە دیوێکی تردا پێمان دەڵێن پێشمەرگە هۆکاری ئەنفال و کارەساتی کیمیابارانی شەهیدانی هەڵەبجە بوون و میللەتیان بەجێ هێشێت و بەگورگانخواردوو دران و ئێمەی دوژمنانی گەلی کوردیش وەک پارێزەر لە خاک و خەڵکدا لە کاتی ئەنفالکردنی هاوڵاتییانی سڤیلی گەورە و بچووکی کوردستاندا ئەوەی توانیمان؛ بەرگریی سەر و ماڵمان کردووە و ڕێنیشاندەر و بەخێوکەری شۆڕشیش بووین. ئەنفالچییەکان دەیانەوێت خۆڵ بکەنە چاوی خەڵکی بەگشتی و پێمان بڵێن ڕزگارکەری کوردستانن... دەکرێت ئەمە بکرێتە خاڵێکی گرنگ بۆ ڕیسواکردنی هەموو ئەوانەی لە ڕابردوودا بەنهێنی و ژێربەژێر سیخوڕییان بۆ ڕژێمە خوێنمژەکانی ناوچەکە کردووە. چیرۆکی بنەماڵەی «یاسینی هاوڕێم»، درێژکراوەی چەندان چیرۆکی تری قوربانیدان

و غەدر و تاوانن بەرامبەر نەتەوەی کورد و مرۆڤایەتی. ئاخر بۆیە من تا ئێستەش تامەزرۆی بیستنی وشەی «یاسە هەتیو»م نەک «مام ئاراس»، تامەزرۆی بیستنی ئەو ناوەم کە مەشخەڵەکەی دەستی بەداگیرساوی گەیاندە دەستی بنەماڵە و هاورێ و هاوشاری و دوای شەهیدبوونیشی؛ هەموو کوردستانیشی رووناک کردەوە. دیارە زۆرن ئەوانەی کە چاوەڕوانی ڕۆژی دادگاییکردنی خۆفرۆشانی گەل و نیشتمان دەکەن؛ کەسوکاری شەهیدان، ئەنفالکراوەکان، زیندانیانی سیاسی و کوردپەروەران و دڵسۆزانی خاک و نەتەوە... دادگاییکردنی تاوانباران، گەڕاندنەوەی شکۆیە بۆ گشت ئەو مافە خوراوانەی لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی ئەم گەلەدا تاکی کورد بە خاکەکەی بەخشین. ڕاپەڕین و دروستبوونی دەسەڵاتی خۆجێیی کورد، ئاهێکی خستەوە نێو دەروونی خەڵکی کوردستان و ڕۆژی گەل لەدایک بوو. هەمووان دەزانین ڕێژەی سیخوڕان و ژمارەیان؛ سەد بەرابەر زیاتر بە ژمارەی پێشمەرگەکانی کە لە شاخ بوون، کەمترین پێشمەرگە و زۆرترین خاکفرۆش لە کوردستاندا بوونیان هەبوو. بەداخەوە لەدوای ڕاپەڕینی سەرتاسەریی ئازادکردنی کوردستان، بە پاساوی سەرکەوتنی ڕاپەڕین و خوێننەڕشتنی کورد بە دەستی کورد، لێبوردنی گشتییان بۆ گشت سیخوڕانی وڵات دەرکرد. گەرچی لە مێژووی دوای ڕاپەڕیندا بۆ خەڵکیان سەلماند کە هیچ بەتەنگ تاکی کوردەوە نایەن، جگە لەوەی دەیانەوێت بۆ مەرامە تایبەتییەکانی خۆیان هەموو لاشەی کورد بکەنە پرد. ئەوی ڕۆژێک خوێنی کوردیان دەپاراست و لە سزای نیشتمانفرۆشێکدا دەوەستان و بێدەنگییان هەڵدەبژارد و لە شەڕی ناوخۆشدا هەزاران ڕۆڵەی وەک مام ئاراس و ڕۆڵەی خەڵکیان کردە سووتەمەنیی دەستکەوتەکانی خۆیان و سەدان شۆڕشگێڕی ماندوونەناسیان گۆڕون کرد، کە ئێستا بە شەهیدی حیزب ناو دەبرێن نەک شەهید لە پێناوی خاک و نیشتماندا.

شەهیدکردنی مامە ڕیشە و حەسەن کوێستانییان حەڵاڵ کرد و لێبوردنی گشتییش بەر تەحسین شاوەیس کەوت کە گەورەترین سیخوڕ و خوێنڕێژ

و بکوژی دەیان سەرکردەی نێو شۆڕش و بکوژی چەندین پێشمەرگەی کۆڵنەدەر بوو، کە بە پلەیەکی بەرزیش خانەنشین کرا. پرسی دادگاییکردنی تاوانباران؛ پرسێکی ئاسان و خۆشدەست نییە بۆ خەڵکی کورد و دادگاکەی، بۆیە دەمەوێت لێرەدا بە هەندێک سەرگوزەشتەی خەباتگێڕاندا بچمەوە و هەر هیچ نەبێت بتوانم ویژدانم بەوە ئاسوودە بکەم کە ئەوەی بینیومە و بیستوومە، وەک لە سەرەتاوە ئاماژەم پێ داوە، لەم پەرتووکەدا بینووسمەوە. پێش ئەوەی ئاماژە بە ڕووداو و کارەساتەکانی کوردکوژیی نێو حیزبەکان و جۆری خەباتی پرسەروەریی ئەو تێکۆشەرانە بدەم کە ئێستە هەندێکیان لە ژیاندا ماون و تەمەن بە بالایاندا هەڵدەدات و هەندێکیشیان بە خوێنی گەشیان ئازادیی سەرتاسەریی کوردستانیان بۆ نەوەی دواڕۆژ دروست کرد، ئاماژە بە هەندێک لەو هاوڕێ و لاوە خوێنگەرمانەی سەردەمی منداڵی و سەردەمی خوێندن لە قوتابخانەدا دەدەم کە هەندێکیان وەک سەربازی ونبوو چارەنووسیان نادیارە.

لە قوتابخانەی چوارباخ و ئەیوبیە، لە یەک قوتابخانەدا و لە دوو زەمەنی جیاوازدا پێکەوە بووین. مامۆستا نووری کە برای مامۆستا تەها بوو، بە هەمان شێوە لە پۆلەکەدا وانەی پێ دەوتینەوە و بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان بوو. قوتابخانەی چوارباخ بەرامبەر بە مزگەوتی عەبدوڵلا لوتفی بوو، ئەوانەی لەیادمن کە لە پۆلی پێنج و شەشی سەرەتاییدا پێکەوە بووین: ڕزگاری شێخ ساڵح، کە ئەویش لە خانەوادەیەکی هەژار و شۆڕشگێڕ بوو، دواتر لە تیپی ٣١ی سلێمانیی یەکێتیی نیشتمانی بوو بە پێشمەرگە و لە ساڵی ١٩٨٦دا گوازرایەوە بۆ مەڵبەندی دوو، شەرەفی ئەندامێتیی پێ سپێردرا و بوو بە ڕابەر سیاسیی تیپی پارێزگاری و ئێستەش لە هۆڵەندا دەژی، ناسراوە بە مامۆستا ڕزگار. پێشڕەو تەها، کوڕی مامۆستا تەها کە لە قوتابخانەی چوارباخ لە پۆلی پێنجی سەرەتایی وانەی پێ دەوتینەوە. پێشڕەو ئەندامی ڕێکخستنی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و دواتر لە تیپی ٥٧ی سەرگرمە بوو بە پێشمەرگە و لە هەڕەتی لاویدا تووشی

نەخۆشیی شێرپەنجە بوو و ماڵئاوایی هەتاهەتایی لە ژیان کرد. ڕزگاری عومەری سەیید عەلی، ئێستە لە ژیاندا ماوە. یاسین شەریف، زیرەکی قوتابخانەکە بوو، هەموو ساڵێک بە پلەی یەکەم دەردەچوو، هیچ زانیارییەکم لەسەر مێژووی ژیانی نییە. هەروەها هەڤاڵ مامۆستا نووری تۆفیق، کە ئەویش لە هەرەتی لاویدا کۆچی دوایی کرد، کە ئامۆزای پێشڕەوی مامۆستا تەها بوو. ڕێبوار فەتاح، چارەنووسی نادیارە. ئازاد خانەقینی لە کارەساتی هەکاری شەهید بوو. ماجیدی پاسۆک، هەروەها زاهیر لە تیپی ٥٥ی قەرەداغ پێشمەرگە بوو. ئاکۆی فەرەجی خەیات شەهید بوو. کەمال ناسرا بوو بە «بە کەماله دان سەگ»، لەناو پارتی دیموکراتی کوردستان بوو بە پێشمەرگە و تەها مەحوی قوتابخانەی تەواو کرد و ئێستە لە سلێمانی پزیشکە. ئەحمەدی حاجی عەبدوڵلا ناسراوە بە ئەحەی حاجی عەبدوڵلا، لەناو یەکێتیدا بوو بە پێشمەرگە. نەریمان، برای «مەریوانه شبر». داوای لێبوردنیش دەکەم بەوەی ناوی سەردەمی هاوڕێیانی قوتابخانەی سەرەتایی و ئەو هاوڕێیانەی گەڕەکم لەیاد نەماوە. ئەمە کورتەیەک لە ژیانی منداڵیی هاوڕێی خۆشەویستم «یاسه هەتیو» و دواتر لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٩دا بووم بە پێشمەرگە و یاسینیش لە ساڵی ١٩٧٨دا ببوو بە پێشمەرگە لەناو یەکێتیی نیشتمانی، بەڵام لە باڵی بزووتنەوەی سۆسیالیست. بەداخەوە کێشە و ململانێی حیزبی هەر لە سەرەتای دروستبوونی حیزبەکانەوە، تاکوو ئێستەش کوردستان ئازاد کراوە و حیزب و حکومەتی هەرێمی کوردستان و پەرلەمان لەئارادایە، کێشە و گرفتەکان ڕوویان لە زیادبوونە نەک کەمکردنەوە. دەمەوێت بە مێژووی ڕووداو و کارەساتی ئەو گیروگرفتانەدا بگەڕێمەوە، کە گێرانەوەیان بوونەتە مایەی سەرئێشان و جگە لە کورد کوشتن، هیچ سوودێکی تری بە میللەتەکەمان نەگەیاندووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی زۆرترین سەرکردە و فەرماندە و تێکۆشەری دێرینی قارەمانی تیا بوونەتە قوربانی.

مستەفا چاوڕەش[1] لە کتێبی «یادەوەرییەکان»یدا دەڵێت:

یەکێتیی نیشتمانی کە ئەوکات لە چەند باڵێک پێک هاتبوو (کۆمەڵە، بزووتنەوە، خەتی گشتی)، لە دروستبوونی یەکێتییەوە لەگەڵ هەموو کارە باشەکان و پێکەوە ئیشکردن، کێشمەکێش هەر هەبوو. پاش گەڕانەوە هەموومان، سەرکردایەتی لەسەر سنوور گەڕایەوە لە سێکوچکەی تورکیاوە، بارەگای سەرکردایەتی لە دۆڵەکۆکە و دوایی دۆڵەنێ و دواتریش لە نێوزەنگ بوو. ئەو کاتەش دکتۆر مەحموود عوسمان و شەمسەدین موفتی هاتبوونەوە، ڕۆژانە کێشە دروست دەبوو، هیلاکی و نەبوونی و هەژاریی پێشمەرگە دیار بوو. برادەرانی بزووتنەوە؛ کاک ڕەسووڵ مامەند و دکتۆر مەحموود عوسمان و هەڤاڵەکانیان، بارەگاکانیان بردە «ئەوبەری شێنێ بۆ دۆڵەتوو و گۆڕەشێر». ئەو بەڕێزانەی سەرکردایەتییان دەکردن، کەمیش نەبوون، ئەوانەی لەبیرمە: (ڕەسووڵ مامەند، دکتۆر مەحموود عوسمان، حاجی ئیبراهیم، سەیید کاکە، قادر جەباری)، هەندێکی تریش بوون. ئەمەش دەنگی دایەوە و بەیانیان دەرکرد و جیابوونەوەی خۆیان ئاشکرا کرد. پاش ئەوەی هەردوو لا هەوڵی جددیی زۆر دەدەن هەریەکە و زۆرترین کادر و پێشمەرگە بەلای خۆیاندا ڕابکێشن و لەگەڵ خۆیاندا بیبەن، لە هەرێمەکانیش هەر بەو شێوەیە بوو، لە «هەرێمی ٣»ی شارباژێڕ، عوسمانی قادر منەوەر بزووتنەوە بوو، بە حوکمی ئەوەی پەیوەندیی باشمان  بە کادر و پێشمەرگەکانی کۆمەڵەوە هەبوون، هەوڵی ئەوەم دەدا هەرێمەکە کێشەی تێ نەکەوێت. ڕەسووڵ مامەندیش وەلامیان بۆ عوسمانی قادر منەوەر ناردبوو بەوەی ڕۆڵی خۆی ببینێت و هێز جیا بکاتەوە، واتە لەناو یەکێتیدا هێزەکان ببنە دوو بەش و هێزێک لەگەڵ خۆی بەرێتە ناو بزووتنەوە...

---

[1]. یادەوەرییەکان، مستەفا چاوڕەش، چاپی یەکەم، چاپخانەی سەردەم، ساڵی ٢٠١٤، (پاشکۆی ژمارە ١٦٠).

پاش ئەوەی مستەفا چاوڕەش داوا لە عوسمانی قادر منەوەر دەکات و دەڵێت: کاک عوسمان، برادەرانی خۆمان لە نێوزەنگن بۆچی پێکەوە نەچین بۆ نێوزەنگ، هەر هیچ نەبێت بتوانین ڕۆڵمان هەبێت لەو جیابوونەوەیەدا، عوسمانیش وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: منیش پێم باشە. لەو دەمەشدا سەرەتای ڕووخانی محەمەدڕەزا شا بوو، هاتوچۆی نێو شارەکان بێ کۆنترۆڵ دەبێت و مستەفاش لەگەڵ عوسمانی قادر منەوەر دەچنە شاری سەردەشت، بۆ ئەوەی بچنە سەرکردایەتی لە نێوزەنگ. لەنێو شاردا هەردوو لا بەڕێکەوت چاویان بە زۆربەی زۆری سەرکردایەتیی بزووتنەوە دەکەوێت و هەر لەوێشدا عوسمانی قادر منەوەر لەگەڵیاندا دەڕوات و مستەفا چاوڕەش بەجێ دێڵێت. دواتر مستەفا چاوڕەش لە ئێران لە شاری سەردەشت نامەیەک بۆ نەوشیروان مستەفا دەنێرێت بەوەی ناتوانم بێم بۆ لاتان بۆ سەرکردایەتی لە نێوزەنگ، چونکە عوسمانی قادر منەوەر لێم جیا بووەتەوە و لەگەڵ برادەرانی سەرکردایەتیی بزووتنەوەدا ڕۆشتووە و منیش دەبێت فریا بکەوم بگەڕێمەوە شارباژێڕ، نەبا عوسمانی قادر منەوەر هێزەکە لەگەڵ خۆیدا ببات. دواتر هەردوو لایان بەجیا دەگەڕێنەوە و «مام ئاراس» کە فەرماندەی کەرتی دوو و جێگری هەرێمی سێی شارباژێڕ بوو، لەگەڵ هێزەکەی عوسمانی قادر منەوەر دەڕوات و دەچێتە ناو بزووتنەوە کە پێشتر یەکێتی بووە لەگەڵ هەرێمەکەی مستەفا چاوڕەش، دواتر دەڵێت: بەداخەوە «مام ئاراس» لە شەڕی ناوخۆدا لە شارەزوور شەهید بوو...[1]

ئەم پەرەگرافانەی سەرەوە، قسە و گێڕانەوەی مستەفا چاوڕەشە کە ئێستا و لە کاتی نووسینەوەی ئەم یادەوەرییەمدا ئەندامی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە، بەڕێزی باس لە ڕاستیی مێژووی چەند ساڵەی خەباتی چەکداریی شاخ دەکات و ئاماژەی ڕاستەقینە بە جۆری

---

١. یادەوەرییەکان، مستەفا چاوڕەش، چاپی یەکەم، چاپخانەی سەردەم، ساڵی ٢٠١٤ (پاشکۆی ژمارە ١٦٠).

جیابوونەوەی ئەو تێکۆشەرانە دەدات کە لەناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا ڕۆڵی کاریگەریان هەبووە. بەڵام لە گێڕانەوەی مێژووی خەباتگێڕاندا، بێڕێزیی بە خەبات و تێکۆشانی هیچ پێشمەرگەیەک و کادر و فەرماندە و سەرکردە و دڵسۆزی شۆڕشگێڕانی کوردی نەکردووە. هەروەها تێکۆشەری دێرینی سەرکردەی ئاڵای شۆڕش؛ پشکۆ نەجمەدین[1]، باس لە کورتەمێژوویەکی جۆری چەککردنی فەرماندە مام ئاراس و پێشمەرگەکانی کەرتەکەی دەکات و بە چ شێوازێک پلانی داڕشتنی چەککردنی مام ئاراس دەکات، «مام ئاراس» لەبەر ئەوەی پێشمەرگەیەکی دەستکەرەوە بوو، سڵی هەموو کارێکی نەگونجاوی لە کاتی هێرشکردندا بەرامبەر لێ دەکرا، بۆیە وتەی «یا الله» بۆ چەککردنی مام ئاراس و پێشمەرگەکانی بووەتە وشەی نهێنی و کاتێک دەڵێن «یا الله»، هەر هەموو پەلاماری تفەنگەکان دەدەن.

مامۆستا پشکۆ نەجمەدین لە کتێبەکەی؛ «ئەزموون و یاد»دا دەڵێت:

من زۆربەی کات لەگەڵ وەهاب و کەرتەکەیدا دەگەڕام و هەڵسوکەوتم دەکرد، ئەگەرچی بە کادرێکی عەسکەریی توند و بەزەبر ناوی ڕۆشتبوو، دیسانیش پیاوێکی ئازا و بزێو و وریا و ڕەوشتبەرز بوو. لە گوندی «پاڕەزان» بووین و هەواڵی کەرتێکی سۆسیالیستمان وەرگرت کە «ئاسۆی قومری»یان لەگەڵدایە و لە گوندێکی دەوروبەری «چوارتا»ن، وەهاب گوتی: دەڕۆین چەکیان دەکەین، ئاسۆی قومری سەر بە موخابەراتە و بەپێی هەواڵی ڕێکخستنەکانی ناوشار؛ دەوڵەت بۆ دەستوەشاندن و ئاژاوە ناردوویەتی. دۆڵ بە دۆڵ و شاخ وەڕێ کەوتین و نیوەشەو گەیشتینە گوندی تایەن. لەنێو گونددا دابەش بووین، پشوومان دا و شیومان خوارد، پێخەفمان هەڵگرت و بۆماڵی خودا. لەو ڕۆژگارانەدا زۆربەی کارەساتەکان لە مزگەوتدا دەقەومان، چونکە جێگەی حەوانەوەی هەمووان بوو.

---

١. ئەزموون و یاد ئاڵای شۆڕش و حیکایەتەکانی زیندان، بەرگی یەکەم و دووەم ساڵی ١٩٧٨-١٩٨٣، پشکۆ نەجمەدین، چاپی یەکەم، ل١٢٨.

سۆسیالیست پێش ئێمە لە مزگەوتدا جێگایان گرتبوو، سڵاومان کرد و پێمان گوتن: ئەمشەو دەمانەوێت پێکەوە بخەوین و هەندێک قسەوباسیش لەسەر چۆنیەتیی ڕێکخستنی کاروبارەکانمان بکەین. ئێمە پلانی خۆمان دانابوو. ئەوان نزیکی (٢٠) چەکدار و ئێمەش بە ژمارە هەر هێندە دەبووین. مام ئاراس و عەبدوڵلا هەمزە لێپرسراویان بوون. وەهاب و من، مام ئاراسمان خستە نێوانی خۆمان و پێشمەرگەکانی دیکەش هەر کەسە و کاری خۆی پێ سپێردرابوو. پاش کەمێک گفتوگۆ و قسەوباس، ئیدی پەرلەی «یا الله» بوو بە دەستپێکی پەلامار و زۆرانبازیی ئەو پێشمەرگانەی پێش چەند چرکەیەک پێکەوە قسانیان دەکرد و بە یەکتربینین گەشابوونەوە، ژیانیان کەوتە سەر پەلەپیتکەی چەکی یەکتر، کارەکە زۆری نەخایاند و تەقەشی تێدا نەکرا و خوێنی تێدا نەڕژا، هەموویانمان چەک کرد و دەستی «ئاسۆ»مان لە پشتەوە شەتەک دا لە جێدا. جگە لە ئاسۆی قومری و نوورە کۆپە، ئەوانی دیکەمان ئازاد کردن. هەر ئەو شەوە بەرەو شارباژێڕ و پاشان «بلەکێ»ی ئەودیوی بناری سورکێو بە دیل و دەستکەوتەوە ڕۆیشتین. پاش چەند ڕۆژێک، بە فەرمانی سەرکردایەتیی یەکێتی؛ چەکەکان بۆ سۆسیالیست گەڕێنرانەوە، ئاسۆی قومرییش کە هیچ گومانێک لەوەدا نەبوو باوەڕپێکراوی موخابەراتە، ئازاد کرا و لە گوڵ کاڵتری پێ نەگوترا. ئاسۆ یەکسەر گەڕایەوە شار و وەکوو دڕندەترین فەرماندەی جاش بوویە بکوژی دەیان پێشمەرگە و خەڵکی بێگوناهـ دەیانگوت: ئەو ڕۆژەی مام ئاراس و مەفرەزەکەی بێ چەک دەگەڕێنەوە بارەگاکەیان لە بلەکێ، هەردوو ڕەحمەتی؛ عوسمانی قادر منەوەرە و مام هێرش سەرگەرمی گفتوگۆ و مشتومڕ دەبن و باس لە هۆکاری کێشە و گرفتەکانی نێوان یەکێتی و سۆسیالیست دەکەن، عوسمان دەڵێت: یەکێتی پاوانخواز و شەڕفرۆشە و هیچ گرووپ و لایەنێکی پێ قبووڵ ناکرێت و شەڕ لەگەڵ ئاسمانیشدا دەکات. مام هێرش دەبێژێت: وا نییە، ئێوە خۆتان پۆخڵەواتن و هێزەکانتان پڕن لە کەسانی گومانلێکراو... دەنگەدەنگی ئەمان تا دێت هەڵدەکشێت و لەپڕ مام ئاراس و کۆمەڵەکەی

خۆیان بە ژووردا دەکەن و... عوسمان دەڵێت: ئەوە چییە؟ ئەی چەکەکانتان کوان؟ مام ئاراس دەڵێت: وەهاب چەکی کردین. عوسمانی قووشقی دەبێت و دەڵێت: ئەمەش خەتای ئێمەیە، هەی مام! مام هێرش و عوسمان، هاوڕێی خۆشەویستی یەکدی بوون و پاشتر هەریەک لە کات و شوێنی جیادا شەهید کران.

مامۆستا پشکۆ نەجمەدین ئەوەی کە خۆی بینویەتی و خودی خۆشی بەشداربووی نێو ئەو چیرۆک و بەسەرهاتەیە، لێ منیش دەمەوێت ئەنگوست بخەمە سەر هەندێک ڕاستی و دروستیی ئەو مێژووە کە زۆر گرنگە لەلام، چونکە ئەم ڕووداو و بەسەرهاتانە بەشێکی گەورە و گرنگی نێو خەباتی ئەو شۆڕشانەن کە لە ڕابردوودا لەلایەن چەندین حیزبەوە کراون و هەریەکەشیان خاوەنی زۆرترین قوربانیدانن. دوو هەفتە دوای ئەوەی «مام ئاراس» و هێزەکەی چەک بکرێن، من بەڕێکەوت لە شارباژێڕدا بووم لە گوندی عازەبان، ئۆتۆمبێلێکی پیکاپی «شۆفرلێت»ی پشت بەتاڵ بە چەند نەفەرێکەوە وەرگەڕابوو و لە نێوانیاندا چەند پێشمەرگەیەکی ناسراوی تیا بوو، یەکێکیان بە ناوی «لەتیف»؛ هەمان پێشمەرگەی هێزەکەی «مام ئاراس» بوو، لەو ڕووداوەدا گیانی لەدەست دابوو و ماڵئاوایی هەتاهەتایی لە ژیان کردبوو. دوو پێشمەرگەی ناسراو، هەردووکیان بە هەمان شێوە لە هێزەکەی «مام ئاراس»دا بوون، واتە سۆسیالیست بوون، یەکێکیان بە ناوی «نەجم هۆنگەرێنی» و ئەوی تریشیان بە ناوی «کەریمی دادە مەنە»، ناسراو بوو بە «دکتۆر چالاک» و هەردووکیان قاچیان شکابوو. بەڵام لە ڕاستیدا نازانم هۆکاری چی بوو لەو کاتەدا لەگەڵ «مام ئاراس»دا نەبوون، دەنا ئەوانیش چەک دەکران و ڕەنگە تووشی ئەو ڕووداوی هاتوچۆیەش نەبوونایە و نە لەتیف کۆچی دوایی بکردایە و نە نەجم هۆنگەرێنی و کەریمی دادە مەنەش (دکتۆر چالاک) قاچیان بشکایە. خەڵکی گوندەکە، بە گەورە و بچووکەوە غەمگین و پەشۆکاو بوون، دەنگی گریان و لەخۆدانی دایکان و خوشکانی کۆچکردووان، تەواوی باڵندەکانی سەر درەختەکانی

گوندی غەمبار کردبوون و تەنانەت مەلەکانیش بەسەر ئاسمانی گوندەکاندا کۆچی گەرمیان و کوێستانیان نەدەکرد. دەنگی گریانی خوشک و دایکانی کۆچکردووان، سەدان ئاوازی غەمگینی لێ دروست دەبوون و فرمێسکی ئازیزان زەویی تەڕ کردبوو، تەمێک بە پانتایی سەر ئاسمانی گوندەکەدا بەری ڕۆژی گرتبوو، لەپڕ باران دەباری و سەر زەوی بۆنی فرمێسکی گرتبوو. هەندێک لە دانیشتووانی گوندەکە بەسەر گوێسەبانەکانی خانووە قوڕینەکانەوە غەمبار و ئەسرین لە چاویاندا قەتیس مابوو و دەگریان، پیاوان لەدەوری تەرمەکاندا پەشۆکاو ببوون، تەرمێک لەژێر ئۆتۆمبێل و تەرمێک لە دووریی چەند مەترێکەوە؛ جۆگەلەیەکی خوێنی دروست کردبوو و منێکی شەکەت و ماندوو نەمدەزانی چی بکەم و چۆن هاوکار بم لەو کارەساتە جەرگبڕە پڕ تراژیدیایە. حاجی محەمەدی ڕدێن سپی بە گۆچانەکەیەوە پرسیاری ئاراستە کردم و وتی: هەتیوە ڕیوەڵە، تۆ چ کارەیت و چی دەکەیت لەم گوندە؟ منیش وتم: من پێشمەرگەی یەکێتیم و دەمەوێت بەرەو سەرکردایەتی بڕۆم... ئەودەم سەرکردایەتی لە ناوزەنگ بوو. حاجی محەمەد بە قوڕگی پڕ گریانەوە و بە دەستە لەرزیوەکەی و گۆچانەکەی دەستیەوە وتی: هەتیوە ڕیوەڵە، دە باشە ساتێک بوەستە! منداڵێکی نارد بەدوای لاوێکدا، دیارە کەسی نزیکی خۆی بوو، پێی وت: ئەم پێشمەرگەیە بەرە با یارمەتیی ئەو دوو پێشمەرگە بریندارە بدات، بەڵام با کەسی ناو ئاوایی نەزانێت، چونکە هەردووکیان بەبرینداری دوو شەوە لەنێو ئەو دۆڵەدا شاردوومانەتەوە. منیش لە ڕووداوی وەرگەڕانی ئەو ئۆتۆمبێلە و کۆچکردنی لەتیف، شەرم تەواو دایگرتبووم کە پێیان بڵێم برسیمە و شەکەت و ماندووبوونم پێوە دیار بوو، تەواو بێهێز بووبووم، چونکە لە شەوی ڕابردووەوە هیچم نەخواردبوو، هیچ شوێنێک نەبووبووە شوێنی حەوانەوەم. کوڕە لاوەکە پێشم کەوت و بە دووریی نیوکاتژمێر ڕێکردن و لە دۆڵێکدا بە دیداری دوو پێشمەرگە بریندارەکە شاد بووم، ئەوانیش بریتی بوون لە «نەجم هۆنگەرێنی» ناسراو بە «خاڵە نەجم» و کەریمی دادە

ـەنە ناسراو بە «دکتۆر چالاک» و هەردووکیان لەبەر ئەوەی پێویستییان
ـە هاوکاریکردن بوو، زۆر خۆشحاڵ بوون و داوایان لەو کوڕە لاوە کرد
ـەوەی دوو هێستریان بۆ پەیدا بکات و دواتر لە گوندەکەی تر تەسلیمی
کەسێکی تری باوەڕپێکراوی خۆیان دەکەنەوە.

لە ڕاستیدا من چەکم پێ نەبوو، ئەوانیش هێندە ئاواتەخوازی ئەوە بوون
کە خۆیان دەرباز بکەن و بگەنە هاوڕێکانیان، واتە کەرتەکەی «مام ئاراس»،
هیچ پرسیارێکیان لێ نەکردم، خاڵە نەجم هۆنگەرێنی تاقمەکەی خۆی دامێ و
تفەنگەکەی بە خۆی بوو، کەریمی دادە مەنەش (دکتۆر چالاک) تاقم و تفەنگی
خۆی بە خۆی بوو، ئەوان بە قاچی شکاوەوە بە سواری هێسترەوە و منیش
شەو و ڕۆژێکە نانم نەخواردووە و گوند بە گوندی شاربازێڕ (بزەنگیان،
گورگەیەر، نۆدێ، چنگیان، کانی ماسی، قەیماسە، موبرە، مامەخەلان،
چاڵەخەزێنە) و بە شاخی سورێندا سەر کەوتین و گەیشتینە بلەکێ. لە
هەریەکێک لەم گوندانەدا دوو هێسترم بۆ پەیدا دەکردن و لە گوندەکەی
تردا تەسلیمم دەکردنەوە و ئەوانیش ڕەوانەی خاوەنەکانیان دەکردنەوە، من
یەکێتی و ئەوانیش بریندار‌ی سۆسیالیست، من بێ چەک و ئەوان چەکدار...

کاتێک گەیشتینە «بلەکێ» بە دیوی ئێراندا، چووینە دیوەخانی کوێخا
مەحموود، لەوێ مام ئاراسم بینی و لەگەڵ هاوەڵەکانی، بریتی بوون: لە
مەحموود محەمەد (خولەی حەمە تاتە) و ڕەئووفە سوور، دیاری، ناوی
باوکی نازانم و ناوی نهێنی بوو، ئاسۆی قومری و نوورەکۆپە کە پێشتر
دەستگیر کرابوون و بە وتەی خۆیان هەڵهاتبوون. ئاسۆی قومری سکاڵای
ئەوەی دەکرد گوایە لەلایەن جەلالییەکانەوە داوای هەزار دیناریان لێ
کردووە و بەو مەرجەش وەهاب ئازادی بکردایە. لەیادمە ئاسۆی قومری
دەیگوت: قومریی دایکم هاتووە بۆ لای وەهابە کەچەڵی جەلالی و داوای
هەزار دیناری لێ کردووم، بۆ ئەوەی بە کەفالەت ئازادم بکەن. منیش وەڵامم
بۆ قومریی دایکم ناردووە (ئەوکات ماڵەکەیان لە باخی شێخ لەتیف بوو)،
گوایە قومریی دایکی ئاسۆ هەژار و نەدار بووە و ئەو برە پارەیەی بۆ

پەیدا نەکراوە بۆ ئەوەی کوڕەکەی ئازاد بکەن و داوای هاوکاریکردنی لە دراوسێ و خەڵکی گەڕەک کردووە، ئەوانیش هاوکارییان کردووە (تەنانەت هەندێک کەس دەیانگوت گوایە سواڵیشی بۆ کردووە) و هەزار دینارەکەی بۆ وەهاب هێناوە و پارەکەیان لە قومریی دایکی ئاسۆ وەرگرتووە و پێیان ڕاگەیاندووە تۆ بگەڕێرەوە و ئێمەش پاش چەند ڕۆژێک ئاسۆ و نوورە کۆپە ئازاد دەکەین و قومرییش گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و دواتر جەلالییەکان بەڵێنەکەیان نەهێناوەتە دی و ئاسۆ و نوورە کۆپەیان ئازاد نەکردووە، تاوەکوو خۆیان ڕایانکردووە و گوند بە گوندەکان ڕێیان کردووە تاکوو گەیشتوونەتەوە بە مام ئاراس. هاوەڵەکانی ئاسۆی قومری کاتێک چیرۆکی خۆدەربازکردن و هاوکاریکردنی دایکی لە دراوسێ و خەڵکی گەڕەک دەگێڕایەوە، هێندە بە حەماسەت و دڵێکی پڕ لە قین وشەکانی لە زار دەهاتنە دەر، هێندەی نەدەمان هەر لەوێدا بڕیاری تەسلیمبوونەوەی خۆی بدات و جارجاریش دەیڕوانییە من و جنێوی بە جەلالییەکان دەدا. کاتێک دوای چەندین جار و بۆ یەکەم جار یاسە هەتیوم (مام ئاراس) بینییەوە، ئیتر چاوم پڕ بوو لە فرمێسک و ناوی یاسە هەتیو بۆ چەند ساڵی نووسینەوەی مێژووم لەبیر چووەوە و ناوی مام ئاراس بووە وێردی سەر زمانم. لە ڕووخساریدا، مێژووی چارەنووسی گەلێکم تێدا بەدی دەکرد. لەو کاتانەوەی من کە تامەزرۆی خوێندنەوەی مێژووی سەرکەوتنەکانی شۆڕشەکەی کوبا بووم، هەر لەو نیگایەدا هەمان پاڵەوانێتیی جیڤارام لە توانا و دڵسۆزی و خەباتگێڕێکی وەک مام ئاراسم دەبینییەوە. لە ڕاستیدا تا ئێستاش من پێم وایە مام ئاراس واتە جیڤارا و جیڤاراش واتە مام ئاراس لە مێژووی شۆڕشی نوێی نەتەوەی کورددا، ئەمەش لێکدانەوەی من بوو. کاتێک بۆ یەکەم جار بە دیداری یاسە هەتیو شاد بوومەوە، من بە چاوی فرمێسکەوە و مام ئاراسی هاوڕێی منداڵیم بەزەردەخەنەوە و بەبەر چاوی هەموو پێشمەرگە چەککراوەکانەوە لەبەرم هەستا و توند باوەشی پێدا کردم و بەداخەوە زەردەخەنەکەی بوو بە گریان و لێواری یەخەی کراسەکەی تەڕ

کردم، کەوتە پرسیار و پێی گوتم: دوای قوتابخانەی سەرەتایی چوارباخ، چیت بەسەر هات؟ و منیش گوتم: ئەو ئاوەی تۆ بۆت ڕشتین، پێی ئێمەشی تەڕ کرد. ئەی پێشینان نەیانگوتووە گەورە ئاو دەڕێژێ و بچووک پێی لێ دەخات، مەگەر یاسین گیان تۆ لە من گەورەتر نیت؟ مام ئاراس وتی: هەتیو، تۆ ئێستەش وا دەزانی منداڵە عەجوولەکانی چوارباخین! دەمت داخە، ئێستە من مام ئاراسم و تۆش شەهاب... وتم: باشە، من هەر یاسە هەتیوەکەم پێ خۆشترە، وەک لە مام ئاراسەکەی ئێستات. ئەویش وەڵامی دامەوە: تۆ ئێستەش بە ئەقڵی منداڵی ڕەفتار دەکەیت، ئێستە ئێمە نوێنەری میللەتێکین و دەبێت گیانی خۆمانیان بۆ فیدا بکەین.

نازناوی مام ئاراس وەک ناوی نهێنیی ئەو بوو لە ڕێکخستنەکانی شار لە سەرەتادا کە ئەم ناوەی ناوی هاوڕێی خۆشەویستی ئاراسی حاجی حسێن بوو، ئەویش کوڕی گەڕەکی چوارباخ بوو، کاتێک مام ئاراس چووە شاخ، ئاراسی حاجی حسێنیش دوای تەواوکردنی کۆلێژی ماف لە زانکۆی بەغدا، دەستبەجێ پەیوەندی دەکات بە مام ئاراس و دەبێتە پێشمەرگە، بەڵام بەداخەوە دوای چل ڕۆژ لە پێشمەرگایەتی؛ شەهید دەبێت، یاسین ئیتر دوای ئەوە بەتەواوی ناوی مام ئاراسی هەڵگرتبوو. مام ئاراس جگە لەوەی فەرماندەیەکی قارەمان و چاونەترسی شاخ بوو، سەرکردەیەکی وریا و چالاکی ڕێکخستنەکانی شار بوو، خاوەنی چەندین چالاکی بوو دژی ڕژێمی بەعس، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەمیشە دەم بە زەردەخەنە و قسەخۆش بوو، گەنجێکی تا بڵێی ڕۆحسووک بوو، خاوەن قسە و بڕیار و کەسایەتیی تایبەت بە خۆی بوو. لەیادمە کاتێک ویستم لەگەڵ ئەواندا بگەڕێمەوە بۆ سەرکردایەتی لە ناوزەنگ و ئەوانیش بە هەمان شێوە دەیانویست بگەڕێنەوە بۆ سەرکردایەتیی حسک کە لە دۆڵەتوو بوو، هەردوو سەرکردایەتی نزیکی یەک و بەرامبەر بە یەک بوون (لە کۆتایی ئەم مێژووەشدا باس لە دووری و نزیکیی هەردوو سەرکردایەتییەکان دەکەم کە چەندە پێکەوە ئاسوودە و تەبا بوون). مام ئاراس زۆر وردبین و لە هەموومان تێگەیشتووتر بوو، پێی

گوتین: «برایان، ئەوەی کە ئێمە لەلایەن برایانی یەکێتییەوە چەک کراوین، نابێت کەس بزانێت و بۆ شانی هەردوولامان جوان نییە.» مەحموود محەمەد (خولەی حەمەتاتە) وەلامی دایەوە و گوتی: «لەگەڵ ڕێزم بۆ کاک شەهاب، مەڵێ برایانی یەکێتی، بڵێ جەلالییەکان.» ئاسۆی قومرییش گوتی: «بڵێ جاش جەلالییەکانی بەکرەجۆ.» مام ئاراس فەرماندەیەک بوو ڕۆڵی سەرکردایەتیی دەبینی و گوتی: «برایان، وەختی ئەو قسانە نییە و تەنها کاتمان لێ کەم دەکاتەوە، ڕێگایەکی دووروودرێژمان لەبەرە...» بۆ ڕۆژی دواتر سەرلەبەیانی بەڕێ کەوتین، بەلام نازانم خاڵە نەجم و دکتۆر چالاک چییان لێ هات، دیار بوو ئەوان بە ئۆتۆمبێل ڕەوانەی نەخۆشخانەکانی ئێرانیان کردبوون.

مام ئاراس بانگی کردمە ئەملاوە و گوتی: «شەهاب گیان، تۆ کە بوویت بە پێشمەرگە، بێگومان لە هەستی دەروونێکی پاکەوە و زوڵم و زۆریت پێ قبووڵ نەکراوە، ئەوەش بووەتە هۆکاری ئەوەی بەرگری لە خاک و نیشتمان و گەلێکی چەوساوەی وەک میللەتی کورد بکەیت...» گوتە شیرینەکانی هاوڕێی خۆشەویستی منداڵیم و ئێستەش لە بلەکێی کوردستانی ڕۆژهەلاتدا، جارێکی تر منی گەڕاندەوە بۆ ئەو منداڵەی لە خێزانێکی هەژاری خۆڕاگر بەرامبەر بە هەموو ئەزموونە ناخۆشەکانی ژیان بەسەر منداڵێکی تەمەن هەشت نۆ سالانی وەک یاسین گیان، کە باوکی لە ڕێی بەرگریکردن لە شەرەفی کورد و خاکی کوردستاندا خوێنی بەخشی و ڕەعنای دایکی یاسە هەتیو، مام ئاراسی شۆڕشگێڕی بەرهەم هانی. دایە ڕەعنای دایکی مام ئاراس، لەو کاتەوەی هاوسەرەکەی تێکۆشەری شاخ و دۆڵ و چیاکانی کوردستان دەبێت، هەمیشە بە ڕووی خۆش و نەفرەت لە دوژمن؛ هاوکاریی تێکۆشەرانی شاخ و شار دەبێت. کاتێک جەستەی خوێناویی هاوسەرەکەی لە کونجی بەر دەرگای ماڵەکەیدا لە توێی بەتانییەوەکەوە فڕێ دەدرێت، ورەی پۆلایین و خۆڕاگریی زیاتر دەبێت و ماڵەکەی دەبێتە حەشارگەی ئەندامانی ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشار. هەر کاتێکیش هێزی پێشمەرگە

بۆ دەستوەشاندن لە دوژمن بهاتنایەتە نێو شار، ڕەعنا خانی دایکی مام ئاراس بە هوتافکێشان و «یان کوردستان یان نەمان» پێش خەڵکی گەڕەک دەکەوت و وڕەی بەرزی دەبەخشییە خەڵکی گەڕەک و پێشمەرگەش بە سروودی نیشتیمانییەوە ڕووبەڕووی دوژمن دەبوونەوە... بەم شێوەیە گەشتەکەمان بەرەو سەرکردایەتی لە «بلەکێ»وە دەستی پێ کرد و لە دۆڵی و دووچۆمان و ئالان و ناوچەی سیوەیل و گەڵەسوورەمان بڕی و تەواو شەکەت و ماندوو ببووین. بەڵام من و مام ئاراس لەبەر ئەوەی هاوڕێی منداڵیی یەکتر و دانیشتووی یەک گەڕەک بووین، بەدەم ڕێگەوە باسمان لە یادەوەرییەکانی ڕابردوومان دەکرد و بێزاری و ماندووبوونمان پێوە دیار نەبوو. ئەوەی زۆر ناڕەحەتی کردبووین، هیچ کەسێکمان چەکمان پێ نەبوو. کاتێک گەیشتینە گوندی بێژوێ، بۆ حەوانەوە و پشوودان ڕوومان لە چەند ماڵێک کرد، من بە ژنەکەم گوت: «نەبێتە ئەرک و ماندووبوون، میوان ڕادەگرن؟» وەڵامی دایەوە و گوتی: «ئێوە چ کارەن؟» مام ئاراسیش لە وەڵامدا گوتی: «ئێمە پێشمەرگەی ئەودیوین...» ژنەکەش گوتی: «ئەی کوا چەکەکانتان؟» هەردووکمان زۆر شەرمەزار بووین و گوتم: «چەکمان لە سەرکردایەتییە» و گوتی: «ترحێو لەم پێشمەرگانە، ئاوا کوردستانی عێراق ڕزگار دەکەن! من ئەقڵم بێت ئێوە قاچاخچین و لێتان قەوماوە، ڕاویان ناون و هێسترەکانتان هەڵهاتوون...» لە ڕاستیدا ئەو قسەیە بۆ ئێمە زۆر ناخۆش بوو، گوتی: «شەهاب گیان، ئەمەش بەزمی کوردایەتی! گەر یەکێتی ئێمەی چەک نەکردایە، ئێمە کارمان بە ئێرە چی دەبوو! خۆ ئەوە کردیشیانین بە قاچاخچی...» منیش دەستم کرد بە پێکەنین و گوتی: «پێم ناڵێیت بە چی پێدەکەنیت؟» منیش گوتم: «مام ئاراس گیان، بە قاچاخچییەکی وەک تۆ پێدەکەنم...» هاوڕێ پێشمەرگەکانی ترمان چووبوونە ماڵان و پشوویان دابوو و خواردنیان بۆ ئامادە کردبوون، ئەوەی کە نانی نەخواردبوو؛ من و مام ئاراس بووین، بەڵام دواتر لە گوندی قەڵەڕەش تووشمان بوو بە ماڵێکەوە، لەوێ پشوومان دا. لە ڕاستیدا هیچ خەبەر و باسی سەرکردایەتیمان دەزانی،

نه خەبەری برادەرانی ئەودیو، چونکە ئێمە لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا بەرەو سەرکردایەتی بەڕێ کەوتبووین. دواتر چووینە ئەشکان و بێوران و شەوێک لە قولەهەرمێ نەخۆشخانەی شۆڕشی لێ بوو، شەومان ڕۆژ کردەوە، بەرەو زەڵێ و شێنێ کۆتاییمان بە گەشتەکە هێنا. سەرکردایەتیی یەکێتی لە ناوزەنگ بوو، سەرکردایەتیی سۆسیالیست (حسک) لە دۆڵەتوو بوو، بە مام ئاراسم گوت: «من دەچم بۆ ناوزەنگ و تۆش کارەکانی خۆت جێبەجێ بکە.» دیار بوو ئەو ماوەیە ئێمە بەڕێوە بووین، سۆسیالیست و یەکێتی ڕێک کەوتبوون و هەواڵی ئەوەیان پێ گەیشتبوو بەوەی بگەڕێنەوە بۆ دیوی کوردستانی باشوور و لەوێ چەکەکانیان وەربگرنەوە. مام ئاراس گوتی: «ئێمە بەو حاڵە گەیشتووینەتە ئێرە، جارێکی تر بگەڕێینەوە هەر وا ئاسان نییە!» لەسەر داواکاریی مام ئاراس، بۆ هەفتەیەک لەگەڵیاندا مامەوە. من و مام ئاراس و خولەی حەمەتاتە و ڕەئووفە سوور و ئاسۆی قومری و نوورە کۆپە لە خێمەیەکدا دەخەوتین. لەوبەریشمانەوە چەند خێمەیەکی تری لێ بوو، لە ناویاندا ئافرەتێک بە ناوی «زەکیە» تیایدا دەژیا، کورتەباڵایەکی قسەخۆش و خڕپلانە بوو. منیش دواتر بە مام ئاراسم گوت دەچم بۆ ناوزەنگ. نامەیەکی دامێ بە تیپ بەسترابوو و گوتی: «کە چوویتە ئەوبەر، بیدە بە مەلا بەختیار.» پێشمەرگە خووڕەوشتی بەرز بوو، من نەمدەزانی نامەکەی مام ئاراس چیی تیایە، پاشان ئەوە کاری من نەبوو بیکەمەوە. کە گەیشتمە لای مەلا بەختیار، لە خێمەیەکدا بوو، دەستێ جلی خاکیی مەیلەوسەوزی کاڵی کەتافیی لەبەردا بوو. منیش هەموو ئەو ڕووداو و بەسەرهاتەی هاتنی نەچم هۆنگەرێنی و کەریمی دادە مەنە و هاتنی خۆمانم بۆ گێڕایەوە، مەلا بەختیار گوتی: «حسک چۆن دەبینی؟» منیش گوتم: «هێزی پێشمەرگە هەمیشە گیانی خۆی بەخت دەکات و قوربانی دەدات، ‹حسک›یش بە قوربانیدانی شەهیدەکانیان چەک پەیدا دەکەن و بەرگری دەکەن.» ئەویش لە وەڵامدا گوتی: «هیچ گەلێک بەبێ قوربانیدان، سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت...» پاش دوو ڕۆژ لە سەرکردایەتی لە ناوزەنگ، لە بەرنامەدا بوو بگەڕێمەوە بۆ

ـاربازێڕ و بۆ چاوپێکەوتنی مام ئاراس گەڕامەوە بۆ دۆڵەتوو و شەوێک
ـای مام ئاراس ڕۆژمان کردەوە و ئەوەی کە ڕاسپاردەی ئەوان بوو؛ نامەکە
ـو، گەیاندبوومە شوێنی خۆی و ئەوەشی لەگەڵ مەلا بەختیاردا باسمان
کرد، بۆ مام ئاراسم شی کردەوە و زۆر زۆری پێ خۆش بوو، تەنانەت مام
ئاراس پێی ڕاگەیاندم و گوتی: «ئەوەی تۆ لەگەڵ مەلا بەختیاردا گوتووتە،
ـلنیام لەوەی کە هەندێک پێشمەرگەی سۆسیالیست (حسک) بەو شێوەیەی
تۆ وەسفی ئێمەی بکردایە.»

بۆ سبەی مام ئاراس و مەحموود محەمەد (خولەی حەمەتاتە) و ڕەئووفە
سور و نوورە کۆپە و ئاسۆی قومری و دوو پێشمەرگەی تری لێ بوو
یەکەم جارم بوو بە دیداریان شاد بم، ناویان «کاروانی حەسەن تەیارە» و
«ئەنوەرە سووری ئاسنگەر» بوون و بەداخەوە پاش ماوەیەک بیستمەوە
گوایە هەردووکیان شەهید بوون. پێش ئەوەی بەجێیان بهێڵم، مام ئاراس
کەمێک زویر دیار بوو، منیش گوتم دەڕۆمەوە بۆ شاربازێڕ، بەڵام ناڕەحەتم
بەوەی ڕووخسارت باش نایەتە بەر چاوم... مام ئاراس ناڕازیی بەرامبەر
بە ئاسۆی قومری و نوورە کۆپە دەردەبڕی و دیار بوو حەزی نەدەکرد
لای من باسی بکات و منیش بە ڕووخسارێکی گرژ و بەغەمبارییەوە بەجێم
هێشتن. چۆن لەگەڵ مام ئاراس و هاوەڵەکانیدا لە بلەکێیەوە بەڕێ کەوتین
تا گەیشتینە دۆڵەتوو، بە هەمان ڕێگادا بەتەنیا و بەپێ گەڕامەوە و چەند
جارێکیش بە ئۆتۆمبێل، تاوەکوو گەیشتمەوە بلەکێ و لەوێشەوە بۆ چاڵە
خەزێنەی سەر سنووری کوردستانی باشوور. کاتێک چوومەوە ئەوێ،
دووبارە بە هەمان شێوە لە کوێوە نەجم هۆنگەرێنی (خاڵە نەجم) و کەریمی
دادە مەنە (دکتۆر چالاک) کە هەردووکیانم لە شاربازێڕەوە هێنابوون
بۆ بلەکێ، بەو ڕێگایەدا گەڕامەوە بۆ گوندی عازەبان لە شاربازێڕ. لە
گوندی عازەبان شەهید سەلاحی موهەندیس لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک بۆ
حەوانەوە و پشوودان دانیشتبوون و هەروەها بۆ ئەوەی تاریک دابێت و
بچنەوە ناو گوندەکە. لە ڕاستیدا من نامەیەکم پێ بوو دەبوو بەئەمانەتەوە

بمبردایەتەوە بۆ شار، یادی بەخێر و ڕۆحی شاد بێت سەلاحی موهەندیس پلانی گەڕانەوەی بۆ دانام چۆن بگەڕێمەوە و ئاگاداریشی کردم بەوەی بەرەبەیان بەئاگادارییەوە لە گوندی خەراجیانەوە بچمەوە شار، چونکە ملازم موحسین زۆر جار لەوێدا بۆسە بۆ پێشمەرگە و دۆست و لایەنگران و کادرانی شۆڕش دادەنێ و تەنانەت بەدیلییش شەهیدیان دەکات. منیش بەوپەڕی ڕێز و گوێڕایەڵییەوە ڕێنماییەکانی شەهید سەلاحی موهەندیسم وەرگرت و تاکوو گەیشتمە گوندی خەراجیان و لەوێشەوە پەڕیمەوە ئەوبەر بەرەو گەڕەکی جوولەکان. بۆ پشوودان و ترسی ژیانم، ماڵی لەعلیی پوورم کە وەک بنەماڵەی حەمە ئاشەوان و کەسایەتییەکی ناودار و لە کتێبی «یادی سلێمانی»دا ناو دەبرێت کە یەکەم کەس بووە لە گەڕەکی جوولەکان ئاشی هاڕینی گەنمی هەبووە و یارمەتیی چەکدارەکانی خولەپیزەی داوە و هاوکاریی زۆرینەی خەڵکی نەدار و هەژاری کردووە؛ لەو گەڕەکەدا بوون. ماڵی لەعلیی پوورم چەند منداڵێکی بچووکی هەبوون، تەنها بۆ یەک کاتژمێر مۆڵەتی دام لەوێ بم و لە ماوەی ئەو یەک کاتژمێرەدا فرمێسک بە چاوانیدا دەهاتە خوارەوە، بە چاوێکی بۆ من دەگریا و بە چاوەکەی تریشی لە منداڵەکانی دەترسا، نەبا من لەوێدا بگیرێم و ئەوانیش بێتاوان لەناو ببرێن. لەبەر ئەوەی کاتێک بووم بە پێشمەرگە، هێشتا مۆڵەتی سەربازیم ساڵێکی مابوو، بەڵام ئەو کاتەی کە هاتبوومەوە؛ ئەو مۆڵەتەم نەمابوو، دەبوو خۆم زیاتر بپارێزم. بۆ شەوی دواتر بەنهێنی چوومەوە بۆ ماڵەوە، بەدزییەوە بە دیواری حەوشەی ماڵەکەماندا سەر کەوتم و خۆم کرد بە ماڵدا، بینیم دایکم و جەمیلەی خوشکم پێکەوە نوێژیان دەکرد و دوعایان بۆ من دەکرد. کاتێک لە نوێژ بوونەوە و منیان بینی، دایکم بە چاوی سووری پڕگریانەوە باوەشی پیا کردم و گوتی: «برۆ، لێرە مەبە!» ئەو ڕژێمە بە جۆرێک ترس و تۆقاندنی خستبووە نێو دەروونی تاک بە تاکی ئەو میللەتە ستەمدیدەیە، دایک ڕۆڵەی خۆی لە ماڵەکەی خۆی دەردەکرد بۆ ئەوەی ژیانی پارێزراو بێت. پاش ئەوەی نامەکەم بەئەمانەتەوە گەیاندە دەستی ڕەزاق لە ڕێکخستنە

نهێنییەکانی ناوشار، بەنیاز بووم شەوێک لەگەڵ تەواوی ئەندامانی خێزانەکەماندا بمێنمەوە و دواتر بگەڕێمەوە بۆ ناو هێزی پێشمەرگە. بێستوونی سدیق سوارە لەگەڵ ئەوەی خزمایەتیمان هەبوو، دراوسێشمان بوو، ئەویش پێشتر لە ساڵی ١٩٧٩دا لە زیندانەکانی ڕژێمدا بۆ ماوەی بیست ساڵ حوکمی بەسەردا سەپێنرابوو، دواتر بەر لێبوردنی گشتی کەوتبوو و لە ڕابردوودا ماڵیان لە گەڕەکی باخی شێخ لەتیف بوو و دراوسێی ماڵی ئاسۆی قومری ببوو، بەڕێکەوت چاوم پێی کەوت و گوتی: ئاسۆی قومری منی بینیوە و هەواڵی تۆی لێ پرسیوم، منیش پێم گوتووە: دوێنێ بیستوومە کە هاتووەتەوە. منیش بێئاگا و زۆر شادمان بووم بەوەی ئاسۆی قومری لە شاردایە، بە مەزندەی خۆم  وای بۆ دەچووم کە ئەویش وەک من بە کارێکی شۆڕش گەڕابێتەوە. دوای ئەوەش هەواڵم پێ گەیشت چەند جارێک چووە بۆ ماڵی خۆمان و منیش بە دایکمم گوت: بۆ سبەی دەگەڕێمەوە بۆ شارباژێڕ و بۆ لای هاوڕێیانی پێشمەرگە. گەر دەیەوێت بمبینێت، شوێنی خۆم بۆ دیاری کرد. بۆ سبەی ئاسۆی قومری هێندە عەوداڵی بینینی من بوو، لەپێش مندا لە شوێنی دیاریکراودا ئامادە بوو. من هێندە بە حەماسەت و خۆشحاڵییەوە بەرەو ڕووی چووم و ویستم هەواڵی مام ئاراس و هاوڕێکانی لێ بپرسم، بەڵام بەداخەوە ئەو بەپێچەوانەوە، لەگەڵ نوورە کۆپەی هاوڕێی دەمانچەیان لێ دەرهێنام و گوتیان: «دەست هەڵبڕە!» و نوورە کۆپەش لە دواوە دەستی بەستمەوە و لە ڕێگاش پێش ئەوەی بگەینە «دائیرەی ئەمن»، گوتی: «خەمت نەبێت، لەبەر ئەوەی هاوڕێی دێرینی مام ئاراسیت، هێندەت بۆ تێناچێنم کە لەسێدارە بدرێیت...»

من ئەو کارە نابەجێیەی بەسەرمدا هات، وەک خەونێک دەهاتە پێش چاوم. خۆ لە ڕاستیدا خەون نەبوو، بەڵام جێی پرسیاری زۆر بوو، شۆڕشگێڕێک ڕۆژانێک بووبێت ویستبێتی گیانی خۆی لە پێناوی هاوڕێ و هاوسەنگەران و میللەتەکەیدا بەخت بکات، لە بارودۆخی ئێستەدا بەپێچەوانەوە، پێشمەرگە وەک نێچیرێک بە قوڕگی شێرێکی دڕندەدا بکات. من چەند مانگێک لەمەوپێش

حیزبەکەیم بەرز و پیرۆز لە ناوزەنگ لای مەلا بەختیار نرخاند، بەڵام بەپێچەوانەوە ڕادەستی ڕژێمێکی دیکتاتۆرم دەکات. من دەڵێم «ئاسۆی قومری» لە تۆڵەی ئەوەی دایکی ماڵە و ماڵ سواڵی بۆ دەکرد، تاکوو ئەو هەزار دینارەی تێکۆشەری دێرین و فەرماندە وەهاب کە ناسراو بوو بە «وەهابە کەچەڵ» بۆ ئازادکردن و بڕوا و متمانەی ئاسۆی قومری لە داهاتوودا داوای «هەزار دینار»ی لێ کردبوو، لەبەر ئەوە بوو بە پیاوی ڕژێم، چونکە ئەو ڕووداوە بە جۆرێک ئازاری ناخ و دەروونی ئاسۆی قومریی دابوو، هەمیشە دەیگوت ئەو ئازارەی لە ناخ و دەروونی دایکمدایە، دەبێت هەرگیزاوهەرگیز لەیادم نەچێتەوە... لە سلێمانیدا منیش یەکەم کەس بووم بە دەستی ئاسۆی قومری ڕاپێچی کونجی زیندانەکانی ڕژێم کرام و بۆ ماوەی بیست ساڵ حوکم درام.

## حسک و بەدیلگرتنی نەوشیروان مستەفا

کاتێک لە مێژوو ورد دەبینەوە، دەبینین زۆربەی کارەسات و ڕووداوە جەرگبڕەکان؛ لە دەرئەنجامی کێشە و ململانێی بەرژەوەندیی حیزبەکاندا بووە. هێندەی قوربانیدان لە سەردەمی شەڕی کورد کوشتن و لایەنی هێزە سیاسییەکاندا بووە، نیو هێندە لە شەڕی دژ بە ڕژێمی بەعسدا نەبووە. دیل و کوشتن و زیندانیکردن و بێڕێزی و ئازار و ئەشکەنجەدان لە سەردەمی شەڕی ناوخۆ، بەتایبەت شەڕەکانی بەرەی جود، کە حیزبی سۆسیالیست (حسک) و پارتی دیموکراتی کوردستان (پارتی) و حیزبی شیوعی عێراق (ح. ش. ع) و پارتی سۆسیالیستی کورد (پاسۆک)؛ کە بەرەی «جود»یان پێک هێنابوو دژ بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. برایەکم بە چەند ساڵێک لە من منداڵتر بوو و پێشمەرگەی حیزبی شیوعی بوو، نارەزایی دەربڕیبوو و گوتبووی من برایەکم بە ناوی «شەهاب» پێشمەرگەی یەکێتییە، چۆن دەستم دەچێتە خوێنی براکەم. داوای کردبوو بەوەی دوور بخرێتەوە لە

چالاکییەکانی ڕۆژانەی هێزی پێشمەرگەی حیزبەکەی ئەنجامی دەگەیەنێت و گواسترابووەوە بۆ سورێن.

هەر لە بارەی ناشرینییەکانی شەڕی براکوژییەوە، لە تۆمارێکی ڤیدیۆییدا «مەلیحە کەریم» خوشکی مام ئاراس بۆ ساڵیادی شەهیدبوونی براکەی بەدەم گریانەوە دەڵێت: تەنها ئەوانە لە ئازار و زامی شەڕی براکوژی دەگەن، کە پریشکی ئەو ئاگرە تا سەر ئێسقان جەستە و دەروونی سووتاندوون. بۆیە شەڕی ناوخۆ هێندە قێزەوەنە، هەر چی سیفەتێکی ناشرینی هەیە بیدەیتە پاڵی؛ هێشتا قابیلیەتی.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم باسی نموونەیەکی تری هەڵە و تاوانەکانی شەڕی کوردکوژەی نێوان یەکتر بکەم، ئەویش شەهیدکردنی جەزای عەلی کاتب[1]، نەوشیروان مستەفا دەڵێت:

هەر چەندە خەڵکی کوردستان بەباشی کەسایەتیی عوسمانی قالە منەوەر دەناسن و بە فەرماندەیەکی شارەزای ناو دەبەن، عوسمانی قالە منەوەر کابرایەکی وریا بووە و زۆر زوو بۆنی مەترسیی کردووە...

نەوشیروان مستەفا لە کتێبەکەیدا (پەنجەکان یەکتری دەشکێنن) باسی ئەوە دەکات کە پێشمەرگەیەک فیشەکی لە دەست دەردەچێت و چەند پێشمەرگەیەک بریندار دەکات و جەزای عەلی کاتبیش دەچێت بەهانایانەوە بۆ گوێزانەوەی برینداەکان. عوسمانی قالە منەوەر ئۆتۆمبێلەکەی خۆی دەدات بە جەزای عەلی کاتب و لە کاتی گواستنەوەیاندا لە شارباژێڕ، ئاوات قارەمانی لەو سنوورەدا دەبێت و گوایە چەند ڕۆژێک لەوەوپێش چەند پێشمەرگەیەکی تیپی ٣٧ی شارباژێڕ چەند چەکێکی کەرتەکە دەفڕێنن و لای عوسمانی قالە منەوەر دەبنە پێشمەرگە و ئاوات قارەمانیش داوای چەکەکان دەکاتەوە و عوسمانی قالە منەوەریش وەڵامی ئاوات بەناشرینی دەداتەوە، لەو کاتەشدا

---

[1]. پەنجەکان یەکتری دەشکێنن، نەوشیروان مستەفا، چاپی یەکەم، چاپخانە و بڵاوکردنەوەی postfach210231Berlin، ١٩٩٧.

جەزای عەلی کاتب  بە ئۆتۆمبێلەکەی عوسمان بریندارەکان دەگوێزێتەوە و پێشمەرگەکانی ئاوات قارەمانی کە ئۆتۆمبێلەکە دەبینین بە عوسمانی قالە منەوەر، تێدەگەن و دەستڕێژییان لێ دەکەن و جەزای عەلی کاتب شەهید دەبێت و چەند پێشمەرگەیەکی یەکێتییش شەهید و بریندار دەبن. یەکێک لە ناویاندا، سیروان مەولوود ناوێک دەبێت کە چوار فیشەکی بەر دەکەوێت و شەهید نابێت، دواتر لە کەرتی ئێمەدا، واتە کەرتی سێی ئەزمەڕ، تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون درێژەی بە خەباتی سیاسی و پێشمەرگایەتی دا. ئەمانە هەر هەموو کارەسات و ڕووداوی نێو شەڕی کوردکوژەن، جۆری ململانێ و گیروگرفتەکانی هێزە سیاسییەکان زیاتر ڕووبەڕووی هێزی پێشمەرگە دەبوونەوە و بەرپرسەکانیش هەر کاتێک چاویان بە یەک بکەوتایە، ڕێزیان لە یەک دەگرت و لە کاتی دوورکەوتنەوە و دوورەپەرێزدا پلانیان بۆ لەناوبردنی یەکتر دادەنا و هێزی پێشمەرگەیان تێوە دەگلاند. لە ئەنجامی شەڕی براکوژی، سنوورەکانی ئازادکراوی ژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگە تا دەهات تەسکتر دەبوونەوە و هێزە سیاسییەکان لە بارودۆخێکی خراپدا بوون و ڕۆژانەش چەندین پێشمەرگەی کوردستان شەهید دەبوون.

## دیلکردنی نەوشیروان مستەفا

کاتێک نەوشیروان مستەفا؛ سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان دەبێت، وەک خۆی دەڵێت بە کارێکی تایبەت بۆ دیدەنی دایک و خوشک و براکەی دەچێتە شارەزوور و لە گوندی قەویلە لە ماڵێک میوان دەبێت و چاوەڕوان دەبێت کارە تایبەتەکەی مەیسەر بێت. هێزی پێشمەرگەی حیزبی سۆسیالیست (حسک) لەو سنوورەدا دەبن و هەواڵیان پێ دەگات بە سەرپەرشتیی «ملازم تایەر»، بەرپرسێکی سۆسیالیست بە شێوەی میوانداری بانگی دەکەن و دوای هەندێک گفتوگۆ و دوای نانخواردن ویستم

ئیزنیان لێ وەربگرم و بڕۆم، ملازم تایەر گوتی نەختێکی تر ڕاوەستە و چووە دەرەوە، خولەی حەمە تاتە هاتە ژوورەوە و تفەنگەکەی من بە دیوارەکەدا هەڵواسرابوو، دەستی دایە و بردی، ئیتر تێگەیشتم... ملازم تایەر پیاوێکی بەئەدەب بوو، شەرمی دەکرد بڵێت ڕاست و ڕەوان تۆ گیراویت، هەندێ منجەمنجی کرد، بەگیرم هێنا، ئاخرییەکەی گوتی برادەران حەز دەکەن لەگەڵیاندا بمێنیتەوە، من ئیتر نائومێد بووم لێیان (هەمان سەرچاوەی پێشوو)... بەم جۆرەی نەوشیروان مستەفا خۆی باسی دەکات، وەک دیلێک لەلای سەرکردایەتیی سۆسیالیست دەستبەسەر دەبێت و پاش ماوەیەک ئازاد دەبێت و دەگەڕێتەوە نێو سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

بەڵام وەک هەندێک لەو پێشمەرگانەی لەگەڵ مام ئاراسدا بوون لە گرتنی نەوشیروان مستەفادا؛ باسی دەکەن، لە مانگی ٢ی ساڵی ١٩٨١دا دوای چەند شەڕ و پێکدادانێک لەنێوان هێزەکانی یەکێتی و سۆسیالیست لە بەرزنجە، نەوشیروان مستەفا بەدیلی دەکەوێتە دەست هێزەکانی سۆسیالیست کە مام ئاراس فەرماندەیان دەبێت. لەو کاتەدا هەندێک لە پێشمەرگەکانی سۆسیالیست داوا دەکەن لە مام ئاراس کە دەستبەجێ نەوشیروان مستەفا بکوژن، مام ئاراس ڕێگا نادات، دەڵێت: «ئەو دیلە، دیل کوشتن لەگەڵ ئەخلاقی بەرزی پێشمەرگەدا یەک ناگرێتەوە. لە هەمان کاتدا ئەو سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانە، ناکرێت ئێمە بۆ خەباتی نەتەوەیەک چەک بکەینە شانمان، بەڵام دەستمان بە خوێنی سەرکردەیەکی کورد سوور بکەین!» بۆیە دەبیات ڕادەستی سەرکردایەتیی حزبی سۆسیالیستی دەکات. لە ماوەی ئەو بیست و سێ ڕۆژەی لەلای سۆسیالیست دەبێت، بەڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات. مام ئاراس بە سروشتی خۆی کەسێکی بەڕێز بوو، بۆیە دەڵێن چەند جارێک خواردنی بۆ هێناوە. تەنانەت ڕۆژی ئازادکردنیشی، بە دەستی خۆی چەکەکەی دەکاتەوە شانی و پارچەیەک «جگەرەی ڕۆسمەن»ی ئەو کاتەی دەداتێ، جگەرەی ڕۆسمەن و دیمۆری و جمهوری لە سالانی شەست و حەفتاکاندا هەبوون و نەوشیروان مستەفاش حەزی زۆری بە کێشانی

جگەرەی ڕۆسمەن هەبوو، چونکە جگەرەکێشێکی سەرسەخت بوو. ئەوەشی لە بارەی سووکایەتیکردن بە نەوشیروان مستەفا لەلایەن مام ئاراسەوە دەگوترێت، هیچ بنەمایەکی نییە.

ڕاستیی ئەوەی گوایە مام ئاراس بەزۆر سەمای بە نەوشیروان مستەفا کردووە، ناڕاستگۆیی و بوختانە و مام ئاراس کەسێکی بەڕێز و شۆڕشگێڕێکی دڵسۆز و پابەند بووە بە ڕەوشتی سیاسی و پێشمەرگایەتی و دابونەریتی کوردەواری. ئەوەی هەیە، ڕووداوێکە لەو کاتەدا ڕوو دەدات کە نەوشیروان مستەفا لای سۆسیالیست دەبێت، پێشمەرگەکانی سۆسیالیست لەگەڵ خۆیان دایدەنێن و پێکەوە دەبن لە یەک ماڵدا. شەوێک هەمووان دەکەونە قسەی خۆش و گێڕانەوەی یادەوەری، یەکێک لەو پێشمەرگانەش بە ناوی شەهید مەلا نووری دەڵێت: کاک نەوشیروان، تۆ بۆ قسەیەکمان بۆ ناکەیت؟ ئەویش بەبێزارییەکەوە دەڵێت: خۆ سەماتان بۆ ناکەم! لەو کاتەشدا پێشمەرگەیەک لەبەر خۆیەوە دەڵێت: خۆ خراپ نییە! ئەمە هەموو ڕووداوەکەیە، تەنها قسەی نەوشیروان خۆی بووە و کاردانەوەیەک بووە و دەنا هیچ ڕووی نەداوە. دوابەدوای ئازادبوونی نەوشیروان مستەفا و گەڕانەوەی بۆ نێو یەکێتی و شەڕی بەرەی جود، شەڕی کوردکوشتن هەر لەئارادا بوو. یەکێتی لە سنوورەکانی خۆیدا ڕێی بە هێزی پێشمەرگەی سۆسیالیست نەدەدا و بە هەمان شێوە سۆسیالیست ڕێی بە هێزی پێشمەرگەی یەکێتی لە سنوورەکانی خۆی نەدەدا کار و چالاکییەکانیان بکەن و بۆ لەناوبردنی یەکتر؛ بۆسەیان بۆ یەکتر دادەنا، لە زاری یەکێک لە ڕزگاربووی نێو کارەساتێکی جەرگبڕی نێو گوندی سۆیلەمیش، ئەو کارەساتە بووە هۆکاری شەهیدبوونی مام ئاراس و هاوەڵەکانی.

# کارەساتی سۆیلەمیش و
# شەهیدبوونی مام ئاراس و هاوڕێکانی

سەرلەبەیانیی ڕۆژی ١٩٨١/١٠/٧ کە هاوکات دەبێت لەگەڵ یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان، مام ئاراس لە مەسەکان و گردی شەریف دەبێت، لەگەڵ جەباری عەلی عەوێز نامەیەک دەنێرێت بۆ سەرکردایەتی (محەمەدی حاجی مەحموود) و دەڵێت: بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک دەچینە ناوچەی شارباژێڕ و دەوروپشتی سلێمانی و دەگەڕێینەوە... لە پاشنیوەڕۆ کە دەگەنە گردی شەریف، لەوێ چاویان دەکەوێت بە مەفرەزەیەکی شەهید «یوسفە لچە»ی پاسۆک، لەوێش قەناعەت بە هەندێک پێشمەرگەی ئەوان دەکات، سێ لە پێشمەرگەکانی پاسۆکیش لەگەڵ خۆی دەبات، بەڵام شەهید یوسف پێی خۆش نابێت، بۆیە لە کاتی ماڵئاوایی، شەهید یوسف بە پێشمەرگەکانی تری دەڵێت: باش ماچی هەڤاڵەکانتان بکەن، چونکە جارێکی تر نایانبیننەوە... بەڵام مام ئاراس بڕوای وا دەبێت کە هەرگیز یەکێتی تەقە لەو ناکات، چونکە لە ڕووی بۆچوونی سیاسییەوە مام ئاراسیش لە هەندێک شتدا هاوڕا بوو لەگەڵیاندا، بەتایبەتی لە بارەی ڕەسووڵ مامەند و دکتۆر مەحموود، ئەویش دکتۆر مەحموودی پێ باشتر بوو، لە هەمان کاتیشدا ئەو بە مەبەستی ئاشتی دەچێتە ناوچەکە، بە هیچ جۆرێک پلانی شەڕی نەبوو لەگەڵ یەکێتی. هەر لە بارەی ئامانجی جەولەکەشیانەوە، تێکۆشەری دێرین و جێگری فەرماندەی کەرتی حیزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان (حسک)؛ شێخ ئومێد، ڕزگاربووی نێو ئەو ڕووداوەیە و لە هۆڵەندا دەژی و دەڵێت: ئێمە وەک هێزی پێشمەرگەی حیزبی سۆسیالیست لە کۆبوونەوەیەکی فەرمی و ڕای گشتی و تاکەکەسی، مام ئاراس داواکاریی خۆی بۆ هەموو هێزەکە دەربڕی لە کۆبوونەوەکەدا، بە شێوەیەکی زۆر دیموکراتیخواز و ئازادیخوازانە پێشنیاری خۆی و حیزبی خستە بەردەم

ئامادەبووان، بەوەی بچن لە گوندەکانی شارباژێڕ بوونی هێزی پێشمەرگەی حیزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان بۆ تەواوی دانیشتووانی گوندەکە ڕوون بکەنەوە. ئەوە ڕوون بکەنەوە بەوەی ئەوان جگە لەوەی دژ بە حوکمڕانی دەوڵەتی بەعسن، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگای ئاشتی و برایەتی لەگەڵ حیزبەکانی تردا دەگرنە بەر کە دژ بە ڕژێمی بەعس خەبات دەکەن. ئەوانیش وەک هێزی سیاسی و سەربازیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کە لە ناوچە و گوندەکانی شارباژێڕدا ڕۆڵی کاریگەریان هەیە و مام ئاراسی گوتوویەتی: ئێمە بە مەبەستی ئاشتی و تەبایی دەچینە ئەوێ و درێژە بە خەباتی سیاسیی خۆمان دەدەین و هەوڵیش دەدەین بتوانین لەگەڵ هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان پێکەوە چالاکییەکی مەزن دژ بە ڕژێمی بەعس ئەنجام بدەین. شێخ ئومێد دەڵێت: ئەو کاتەش هەرێمی سێی شارباژێڕ بوو، لە گوندی «قاجر» دوای کۆبوونەوەکە چەند پێشمەرگەیەک ئامادەیی خۆی دەربڕی و بەڕێ کەوتین. دوای ماندووبوونێکی و زۆر و برسێتی هێندەی تر بێهێزی کردبووین و ئەوەش بووە هۆکاری ئەوەی لە شاتوان واتە: (مەسەکان، ناوگردان، بییەڕەشکە) لە ماڵی حاجی ئەحمەد کە ڕیشسپیی ئاوایی شاتوان بوو و لە هەمان کاتیشدا خەزووری شەهید دلێر جافی یەکێتی بوو، بۆ حەوانەوە و پشوودان؛ ژەمێک نانمان خوارد. من لێرەدا سەرنج و تێبینیم بۆ ئەو مەبەستە هەیە، گەر مام ئاراس ڕووخسارێکی جوان و ڕەفتارێکی مەردانە و دڵسۆزێکی ئەندازەبەدەر نەبووایە، چۆن مام ئاراس فەرماندەیەکی حیزبی سۆسیالیست، خۆشەویستی و شەرەفمەندێتیی لەنێو بنەماڵەی حاجی ئەحمەددا جێی خۆی کردبووەوە؟ ئەوان خەزووری شەهید دلێر جافی یەکێتی و ئەمانیش سۆسیالیست؟ دواتر لە شاتوان وەک پیشەی هەمیشەیی، هێزی پێشمەرگەی کوردستان بۆ هاتوچۆکردنیان لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی تر بە تراکتۆر ماوەی نێوان گوندەکانیان دەبڕی، لە شاتوان تراکتۆرێک بۆ هێزەکەی مام ئاراس ئامادە دەکەن و بۆ ئەوەی بەرەو «موانەکان» بڕۆن، ئەوانەی نزیکی گوندەکانی کانیپانکەن، لەوێشەوە

بەرنەوە گوندەکانی شارباژێڕ. هەر هەمان ڕۆژ بەڕێ دەکەون و نزیکی مەرلەئێوارە دەگەنە نێوان هەردوو گوندی سۆیلەمیش لە قەزای شارەزوور، بەڵام پێش ئەوەی بگەنە گوندی «سۆیلەمیش»، هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کە شەوکەتی حاجی مشیر و حامیدی حاجی غالی و عومەر عەزیز فەرماندەیان دەبن، بەسەر گردەکانی سنووری گوندەکەدا دامەزرابوون و لەناو گوندەکەشدا هێزکی تری یەکێتیی تیا بوو. پێشوەخت هەر هەموو گوندەکان تا دەگەیشتە دەربەندیخان و سورێن و هەورامان، هەموو حیزبی سۆسیالسیتی یەکگرتووی کوردستان (حسک) بە مەبەستی کار و چالاکییەکانیان جەولەیان تیا دەکرد. بەڵام پێش چەند ڕۆژێک مام ئاراس کەسێک ئاگادار دەکاتەوە بەوەی ڕێنیشاندەر و ڕێنماییکەر و شایەتحاڵی ئەوە بێت کە پێیان ڕابگەیەنێت بەوەی هێزی پێشمەرگەی کام حیزب لەوێدا بێت و ئایا چەکدار لەو سنوورەدا هەیە! بەڵام کەسی باوەڕپێکراو خیانەت دەکات و دەڵێت: گوندی سۆیلەمیش چەکداری تیا نییە. ئیدی مام ئاراس و هێزەکەی بە تراکتۆرێک دەگەنە ئەوێ و کاتێک مام ئاراس بەسەر یاڵەکانەوە چەکدار دەبینێت و داوا لە پێشمەرگەکانی دەکات کە هەر هەموو لە تراکتۆرەکە دابەزن، هێزەکەی یەکێتی لەناو دێوە دەکەونە تەقەکردن لە هێزەکەی سۆسیالیست کە لە دوو تراکتۆردا دەبن بەرەو ناو دێی سۆیلەمیش دێن، هەر لەناو تراکتۆرەکەدا دوو لە پێشمەرگەکانی سۆسیالیست شەهید دەبن. وەک خەڵکی گوندەکە باسی دەکەن کە خۆیان ڕووداوەکەیان بینیوە، شەڕێکی قورس لەنێوان ئەم دوو هێزەدا تاوەکوو تاریکایی ئێوارە بەردەوام دەبێت. هەندێک لە پێشمەرگەکانی سۆسیالیست هەڵدێن و ڕزگاریان دەبێت، لەوانەش: (جەباری عەلی عەوێز، عەلی چەلەبی، کامەرانی سەعە چەتە، ڕزگاری کەریم باقی، نەورۆزی سەموون، عەتای وەستا مەحموود)، لە پێشمەرگەکانی پاسۆک: (عومەری مام توفیق، بابە ڕەسووڵ، کەماله سوور، فەتاح قرگەیی، شێخ ئومێد). هەر چی ئەوانی ترە دوای شەڕێکی بەرگریکردن، مام ئاراسیش تا دوا فیشەکی نێو مەخزەنی

کلاشینکۆفەکەی بەرگری لە مان و نەمان لە خۆی و هێزەکەی دەکات. کاتێکیش فیشەکی پێ نامێنێت، تفەنگەکەی خۆیانی تێ دەگرێت و دواتر بەبێ تفەنگ بەدیل دەگیرێت و چەند پێشمەرگەیەکی تری هێزەکەشی بەدیل دەگیرێن و چەند پێشمەرگەیەکیش لەو شەڕەدا شەهید دەبن. مام ئاراس و چوار پێشمەرگەی تر کە دووانیان بریندار دەبن، بەدیلی دەکەونە دەست هێزەکانی یەکێتی. یەکێک لە پێشمەرگە دیلە برینداره‌کان بە ناوی «محەمەد عەزیز» کە ناسراوە بە «حەمەی عەزە کەچەڵ»، کە بەرگریی زۆر لە مام ئاراس دەکات و بریندار دەبێت، بەئازارەوە هەندێک جنێو دەدات، دەستبەجێ لەوێدا لەبەر چاوی خەڵکی ئاوایی شەهیدی دەکەن. هەر بەو ئێوارەیە خەڵکی «گوند تەرمی»، هەر سێ پێشمەرگە شەهیدەکەی سۆسیالیست لە خوارئاوای سۆیلەمیش بەخاک دەسپێرن. هەر چی مام ئاراس و سێ پێشمەرگەی تر دەبێت، بەدیلی دەکەونە دەستی هێزەکانی یەکێتی. خەڵکی گوندەکە تکای زۆر دەکەن کە نەیانکوژن، بەتایبەت مام ئاراس کە فەرماندەیەکی ناسراو و خۆشەویستی خەڵکی ناوچەکە بوو، ئەوانیش بەڵێن دەدەن بە خەڵکی گوندەکە کە هیچیان لێ ناکەن، بەڵام بەداخەوە ڕاستگۆ نابن لەگەڵ گفتی خۆیان، هەر ئەو شەوە دەڕۆن بەرەو گوندی «تەپەکەل»، لەوێ دادگایەکی مەیدانی دادەنێن بۆیان و لەسەر برووسکەی نەوشیروان مستەفا[1] بڕیاری شەهیدکردنیان بۆ دەدەن. دیارە محەمەدی حاجی مەحموود دەبێت زانیاریی تەواوی هەبێت لە بارەی فەرمانی شەهیدکردنی مام ئاراس لەلایەن نەوشیروان مستەفاوە، چونکە ئەو خۆی جگە لەوەی فەرماندەی ناوچەکە بووە، هاوڕێ و دۆستی نزیکی شەوکەتی حاجی موشیر و حامیدی حاجی غالی بووە، بۆیە دەڵێت:

---

[1] ڕۆژژمێری پێشمەرگەیەک ١٩٧٦-١٩٩٦، محەمەدی حاجی مەحموود، بەرگی دووەم، چاپخانە و ئۆفسێتی دیلان، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل١٧٨.

بەڵام بە پێچەوانەی زانیاریی کتێبی «ڕۆژژمێری پێشمەرگەیەک»ی محەمەدی حاجی مەحموود، هەندێک لە فەرماندەکانی یەکێتی و بەشداربووی نێو ئەو کارەساتە لە دواییدا باسیان دەکرد، لەسەر برووسکەی نەوشیروان مستەفا؛ ئێمە شەهیدمان نەکردن... بەڵام لە زاری شایەتحاڵی زیندووانی نێو گوندەکە و شێخ ئومێد کە یەکێکە لەو تێکۆشەرانەی ڕزگاربووی نێو ئەو کارەساتە جەرگبڕە، تەواوی مێژووەکە دەگێڕنەوە، لە گریمانەیەکیشدا بە بروسکەی نەوشیروان مستەفا ئەو دیلانە شەهید نەکراون، بەڵام مێژووی شەڕی کورد کوشتن بە مێژوویەکی خوێناوی و بەرژەوەندیی حیزبەکان و قوربانیدانی نەوەی ئەم میللەتە باس دەکرێت و نکۆڵییش لەو مێژووە ناکرێت دوژمنانی گەلی کوردی پێ شاد دەبێت.

بۆیە لە بەرەبەیانیی ڕۆژی ١٩٨١/١٠/٨دا کە هاوکاتە لەگەڵ یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان، دوای ئەوەی خەڵکی گوند نانی بەیانیی جەژن دەبەن بۆ مام ئاراس و هاوڕێکانی، وەک دەڵێن پێشمەرگەکان پێیان دەڵێن بۆ نانەکە خەسار دەکەن، ئێمە دەتانکوژین، ناهێڵن نمەکی نانی ئەو جەژنە بکەن... مخابن، دوور لە هەموو عورفێکی ئایینی کە لەلای موسڵمانان پیرۆزە، لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قورباندا مام ئاراسی هاوڕێم و سێ پێشمەرگەکەی تر بە دەستی هێزەکانی یەکێتی دەبنە کۆچی قوربانیی شۆڕش. بۆیە لەو کارەساتە پڕ لە ئازارە، (مام ئاراس و حەمەی عەزە کەچەڵ و لەتیفی سالە گاکوژ و بەرزان عومەر خراپەیی و خالیدی حاجی کەریم بێکراس و فارسی مەلا گوروون و عومەر گەڕەدێی) شەهید دەبن. مام ئاراس ساتەوەختی شەهیدبوونی؛ لاوێکی تازەپێگەیشتوو بوو، ئەو تەنها بیست و چوار ساڵ تەمەنی بوو، مێژوویەکی پڕ لە شکۆی بۆ خۆی نووسییەوە، هەموو ئەوانەشی بەشدار بوون لەبەردەم ئەو تاوانەی دژ بە ئەو کرا، ڕۆژێک دێت زبڵدانی مێژووش ئامادە نییە بیانگرێتە خۆی.

## ئایا مام ئاراس عاشق بوو؟

بەپێی مێژووی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و بیروبۆچوونەکانی، بەڵێ مام ئاراس عاشق بوو، سەرەتا عاشقی نیشتمان و خاکی کوردستان بوو، ئەوەش ببووە هۆکاری ئەوەی بەرامبەرەکەی عاشق بە خودی مام ئاراس بێت، لە ئەنجامی هەڵسوکەوت و ڕەفتار و خووڕەوشتی بەرزی و دڵسۆزیی مام ئاراس بۆ نیشتمانەکەی. کیژە جوانێکی گوندی گەڕەدێی ناوچەی شارباژێڕ، نەک عاشقی ئازایەتی و خووڕەوشت بەرزی و نیشتمانپەروەریی فەرماندەی لێهاتوو مام ئاراس بوو، بەڵکوو مام ئاراسی بە بەشێکی گرنگی مێژووی خەباتی نەتەوایەتی لە عەشقی خۆیدا پێناسە دەکرد و خۆشی دەویست و تەمەننای دەکرد مام ئاراسی نیشتمانپەروەر؛ هاوڕێ و هاوسەری ژیانی بێت. ئەم دوو مرۆڤە، جگە لەوەی عەشقی خاک و نیشتمان بوون، لەگەڵ ئەوەشدا دوو خۆشەویستی پاک و بێگەردی یەکتر بوون. بۆیە هەر کات مام ئاراس و هێزەکەی بۆ کار و چالاکییەکانی شۆڕش ڕوویان لە گوندەکانی شارباژێڕ بکردایە، مام ئاراس دەچووەماڵی دڵخوازەکەی و ئەو دڵخوازەی پەیمانی پێکەوەژیانی هەمیشەییان بە یەکتر دووبارە دەکردەوە.

مام ئاراس پێش ئەوەی خۆی و هاوەڵەکانی بکەونە بۆسەی هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بە هاوسەنگەرەکانی دەڵێت: «برایان، کاتێک چووینە شارباژێڕ، یەکەم ڕۆژی جەژن لە گوندی گەڕەدێ لە ماڵی مام حەسەن (حەسەن دووکەڵ) نان دەخوێن...» ماڵی مام حەسەن ئەو ماڵەیە کە مام ئاراس بەنیاز بوو هاوسەرگیری لەگەڵ کیژەکەیاندا بکات و هەردووکیان وەک هاوسەر پێشمەرگە بن و تا ئەو کاتەی شەهید دەبن؛ پێشمەرگەی کوردستان بن. ئەو بەڵێنەی دابوو بە هاوڕێ و هاوسەنگەرانی کە بە دیداری یەکتر شاد بن و نانی سەرلەبەیانیی یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان لەوێ بخۆن. من وەک کەسێکی ئازادیخوازی لیبراڵ و سیکۆلار، بیرکردنەوەی جیاوازم هەیە و ڕێز لە پیرۆزییەکانی مرۆڤ دەگرم، بۆیە لێرەدا بە هۆی

دیلکردن و گوللەبارانکردنی مام ئاراس کە دەکەویتە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان، ئەو جەژنەی موسڵمانان باسی پێکەوەژیان و ئاشتی و لەخۆبوردەیی و گەردنئازایی و جەژنی حەجکردن و بەحاجیبوون و داوای لێبوردن لە خوداوەند و لێخۆشبوون لە تاوان و گوناهکردن دەناسرێت. بۆیە کاتێک باس لە جەژنی قوربان دەکرێت، واتە ئەو کاتەی حەزرەتی ئیبراهیم لە خەونیدا ئیسماعیلی کوڕی سەر دەبڕێت و دواتر بۆ کوڕەکەی دەگێڕێتەوە کە شەوی ڕابردوو خەوی پێوە بینیوە و ئیسماعیلی کوڕیشی دەڵێت فەرمایشتەکەت بەجێ بهێنە و سەرم ببڕە... بە گێڕانەوەی ئەو سەرگوزەشتەیە، کاتێک حەزرەتی ئیبراهیم چەقۆ بە ملی کوڕەکەیدا دێنێت، چەقۆکە کول دەبێت و کوڕەکەی بۆ سەر نابڕێت و خوداوەند بە فریشتەکانیدا مەڕێکیان بۆ ناردووە و ئیبراهیم سەری دەبڕێت و ئیتر ئەو ڕۆژە بە جەژنی قوربان یاد دەکرێتەوە. مام ئاراسیش لە مێژووی شۆڕشی نوێدا وەک ئیسماعیلی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیم بۆ قوربانی دەبرێت، بەڵام بەپێچەوانەوە چەقۆی کول بە گەردنیدا نابرێت و ئەوانە لەبریی چەقۆی کول، گوللەی نێو لوولەی تفەنگەکانیانی ئاڕاستە دەکەن. گەر موسڵمان بوونایە، دەبووایە لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قورباندا کە ڕۆژی ئاشتبوونەوە و پێکەوەژیان و ڕۆژی لێبوردن بۆ بەرامبەرە، دەبوو دواکارییەکانی خوداوەندیان جێبەجێ بکردایە و مام ئاراسیان وەک هەر شەهید دەکرد، دەبوو دوای جەژنی قوربان شەهیدیان بکردایە. مام ئاراس تێکۆشەر و قارەمانی ناو حیزبی «سۆسیالیست» بوو، گوللەبارانکردنی مام ئاراس و ڕووداوەکانی تری؛ هاوشێوەی ئەم ڕووداوەن، مێژوویەکی ڕەش و تاڵی نێو شەڕی براکوژین، زۆرن ئەوانەی ئاگاداری گوللەبارانکردنی مام ئاراسن، وەک چاودێرێکی بێ هەڵوێست بێدەنگییان لەو مێژووە پڕ غەدرە کردووە، چونکە شەڕەکانی براکوژیی شاخ لەسەر چەند هۆکارێک بوون: هەر حیزبێک خۆی دەیویست ببێت بە حاکم لەناو خەڵکدا و هەر خۆی ناوچەیەک قۆرخ بکات بۆ خۆی، ڕێگا بە خەڵکانی دیکە نەدات. ئەمە بوو مەسەلەکە، ئەگینا ئەگەر ململانێکان شەریفانە بوونایە، ئەم هەموو

چیرۆکە غەمناک و پڕ لە گومانەی دروست نەدەکرد، ڕەنگە بڵێم ئەم کتێبەی منیش بە جۆرێکی تر باسی مێژووی دەگێڕایەوە. من بەش بە حاڵی خۆم سەردەمی بەرەی کوردستانیم بە شەریفانە دەزانی، ململانێ هەر هەبوو، حیزبەکان کامیان دڵسۆزتر بوون، دەستێک زیاتری لە دوژمن بوەشاندایە نەک بۆسە و چاڵ بۆ یەکتر هەڵبکەنێت. بەداخەوە دەڵێم ئەو کاتەی شەڕی ناوخۆ کە لە شاخ دەکران، هەموو سەرکردایەتیی حیزبە کوردییەکان لە سنوورەکەدا بوون. هەمووی لە سەرچنارەوە تاوەکوو کانی گۆمە نابێت. خڕی ناوزەنگ، بێدەلان، نۆکان، گۆڕەشێر، قاسمەڕەش، ئەمانە بە هەر هەموویەوە یەک دوو شیو بوون و بەقەدەر سەرچنار تا کانی گۆمە دەبوو. من ئێستاش دەپرسم: باشە، ئەم سەرکردانە بۆچی نەدەچوونە سەر یەکتری؟ ئەی پاسەوانەکانیان بۆ نەدەچوون یەکتر بکوژن؟ گومرگیان بەیەکەوە بوو، بەیەکەوە دەیانخواردەوە، کۆبوونەوەیان دەکرد، دواتر بە برووسکەی ژێربەژێر و بە «جفرە» کوڕی ئەم میللەتەیان دەدا بە کوشت. ئا ئەمەیە کارەساتی بە ئاکام نەگەیشتنی خەونی سەد ساڵەی میللەتی کورد! من هەندێک لە سەرکردایەتیی کورد بە بەرپرس دەزانم و کەمیشیان بە بێتاوان دەزانم، چونکە ئەگەر تیایاندا بووایە بێتاوان بێت، ڕۆژێک لە ڕۆژان هەڵوێستێکی دەبوو. کەسێکمان نەبینی بڵێت ئەوا من هەڵوێستێکم وەرگرت و وازم لە پێشمەرگایەتی هێنا، وازم لە سەرکردایەتیی ئەو حیزبە هێنا لەبەر ئەو هەڵوێستانە! زۆریان بەشی خۆی پریشکی بەر کەوتووە، تەنانەت هیچ کەسێکم نەبینی بڵێت با لەپای ئەو هەموو غەدر و تاوانە، بەتەنها وشەیەک داوای لێبوردن لە خانەوادەی ئەو شەهیدانە بکەین کە بە هۆی خۆپەرستی و یەکتر قبووڵنەکردن لە شەڕی ناوخۆدا بوونە قوربانی. بۆیە لە کۆتایی گێڕانەوەی ئەم یادەوەرییە تاڵەدا دەڵێم گەر مام ئاراس بۆ چەند مانگێک زیندان بووایە و لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قورباندا شەهیدیان نەکردایە، بێگومان ئێستە لە بەڕێوەبردنی کاری حیزبیدا ئەندامێکی پلە باڵای ئەو حیزبە یان کەسایەتییەکی گرنگ و کاریگەر دەبوو لەنێو پرۆسەی سیاسی

لە هەرێمی کوردستان. سەد مخابن بۆ ئەو مرۆڤە جوان و مەزن و ئەو تێکۆشەرە قارەمان و خووڕەوشت بەرز و نیشتمانپەروەرە بووە قوربانیی نێو شەڕی کوردکوشتن، بۆ هەندێک مەرامی تایبەت و کردنەوەی ئەو گرێ دەروونییانەی هەندێک لە سەرکردە بە تۆڵە و ڕق و خوێنڕشتن دەیکەنەوە. بەڵێ، «یاسە هەتیو»ی هاوڕێم بوو بە قوربانی، خوێنی گەشی ئەو لاوە بیست و چوار ساڵە بەنێو کۆڵانە باریکەکانی گوندەکەدا و بەبەردەم ماڵ بە ماڵی گوندەکەدا بەخوڕ دەچوو و دواتر تێکەڵ بەو ڕووبارە گەورەیە بوو کە بە خوێنی شەهیدانی کوردستان دروست بوو.

## ئاسۆی قومری لەنێو حیزبی سۆسیالیستی کوردستاندا (حسک)

چۆن لە خەباتی گەلاندا پاڵەوانی ئەفسووناوی سەر هەڵدەدەن و لە پێناوی شۆڕش و بەرخودانەکاندا گەردن لە چەقۆ دەسوون، ئاواش لەبەرامبەر خائین و خۆفرۆشاندا دەبنە مەزەی مێژوویەکی ڕەش و وەکوو کەسانێکی قێزەوەن و بوودەڵە؛ ناوبانگ دەردەکەن. لێرەوە بە پێویستی دەزانم وەکوو مشتێک لە خەرواری خیانەتی بەکرێگیراواندا، ئاماژە بە یەکێک لە داردەستە پیاوکوژەکانی ڕژێمی بەعس بدەم کە ئەویش «ئاسۆی قومری»یە.

ئاسۆی قومری، ئەو ئەڵقەلەگوێیەی بێ دەستپاراستن لە نامەردایەتی، هاوڵاتییانی شاری سلێمانیی هەراسان کردبوو. چاوساغی دوژمن و هەڵکوتانە سەر ماڵان و دەستدرێژیکردنە سەر گەنجان و داوێنپیسی و باج و سەرانە وەرگرتن بووە سیمایەکی دیاری کەسایەتیی ناپاکی و سیخوڕی و نەفسنزم و چۆکدادەری خیانەتکار بوو. لەوانەشە ئێستا لای هەندێک مێژووی پڕخیانەتی فۆرمات کرابێ و بە جوامێرانە ناسرابێت و دوور نییە مووچەی شەهیدانەی پێشمەرگەشی بۆ بڕابێتەوە! ئاسۆ لە گەڕەکی باخی شێخ لەتیف لە شاری سلێمانی، لە داوێنی ئافرەتێکی لەڕ و لاواز کە ناوی

قومری بوو، هاتە دونیاوە. لە کۆشی خێزانێکی هەژار و نەدار، کە زۆر جار هاوکاری و یارمەتیی خەڵکی فریایان دەکەوتن و کەلێنێکی بۆ ژیان پڕ دەکردەوە. ئاسۆ وەک منالێک هاتە دنیاوە، وەکوو خەسلەتی هەر منالێکی تر، نە تاوانی دەزانی و نە لە چەمکی تاوانیش تێدەگەیشت و لەنێو ژیانێکی پڕ لە گیروگرفت و کێشمەکێشدا ئاسۆ گەورە بوو. لاوێکی پێچەوانەی دایکی، کەلەگەت و باڵابەرز و گەنمڕەنگ. لە کاتی سەربازیدا بوو بە «ئینزیبات» و بە کلاوێکی سوورەوە؛ خۆی و تفەنگەکەی زۆر جار لەبەردەم مزگەوتی گەورەی سلێمانی ڕادەوەستا، لەوێ ئەرک و فەرمانی سەربازیی بەجێ دەگەیاند و بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار، ئاسۆی لاو بە ناوی دایکیەوە بانگ دەکرا، هەر بۆیە بە «ئاسۆی قومری» ناسرابوو.

پاش ئەوەی «مام ئاراس» چەند ساڵێکی کەمی دوای پێشمەرگەی مەفرەزە سەرەتاییەکانی شاخ؛ پەیوەندیی بە شۆڕشی نوێی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان باڵی بزووتنەوەی سۆسیالیست دەکات، واتە لە ساڵی ١٩٧٨دا تفەنگی پێشمەرگایەتی لە شان دەکات و دواتر وەک هێزێکی سەرەکی جیا دەبنەوە لە یەکێتی و دەبێتە حیزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان (حسیک) و دواتر دەبنەوە بە حیزبی سۆسیالیستی کوردستان (حسک). ئاسۆی قومرییش کاتێک «سۆسیالیست» دروست دەبێت، ڕوو لە شاخ دەکات و لەنێو «حسک»دا دەبێتە پێشمەرگە.

وەک پێشتر ئاماژەم پێ دا، ئاسۆی قومری لەنێو هێزەکەی مام ئاراسدا وەک پێشمەرگە ڕۆڵی خۆی دەبینی، تاوەکوو ئەو کاتەی لەلایەن هێزەکەی «وەهاب»ەوە چەک دەکرێن. ئاسۆی قومری لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٠دا خۆی ڕادەستی دوژمن کردەوە و بوو بە گەورەسیخوڕێکی گوێلەمشتی بەڕێوەبەری ئاسایشی بەعس (مودیر ئەمن)ی سلێمانی و ڕەنگە بۆ ڕادەستبوونی بە ڕژێمەوە، پاساوی خۆی هەبووبێت، بەڵام هێشتا ئەمە ناکاتە ئەوەی کە لە هەموو کارێکی نامرۆڤانەی خۆیدا و بێ گوێدانە هیچ بەهایەکی ئەخلاقی بکەوێتە پەلاماردانی سەدان ڕۆڵەی شار و ڕادەستی

ڕژێمی بەعسیان بکات. نەک هەر ئەوە، بەڵکوو بە جۆرێک تاوان بخاتە ئەستۆی هەندێک لە هاوڵاتییانی سڤیل و ڕەوانەی پەتی سێدارە بکرێن. خیانەتی ئاسۆی قومری هێندە سنووری بەزاندبوو کە پتر لە «بیست و پێنج» لاوی خوێنگەرم و دڵسۆزی شارەکەمانی بە دەستی خۆی خەڵتانی خوێن کردبوو و شەهیدی کردبوون، جگە لەوانەی بەنهێنی شەهیدی دەکردن و تەرمەکانی سەرەونگوم دەکردن. لەبەر ئەوە ئاسۆی قومری بووە جێی باوەڕ و متمانەی گەورەی «مودیر ئەمن» و پیاوکوژانی بەعس و زۆر جاریش ڕۆڵی ئەفسەر و دادوەری لێکۆڵینەوەی دەبینی لە کاتی لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەدانی زیندانیانی «ئەمن» و لە چۆنێتیی ئەشکەنجەداندا سەرپشک کرابوو. ئاسۆی قومری سەرانەوەرگرتنی لە بازرگانان و دەوڵەمەند و دووکانداران و کاسبکاران و قوتابیانی قوتابخانەکان فەرمانبەران ببووە خەسڵەتی نامەردانەی، هەر کەسێکیش سەرپێچیی ویست و حەز و ئارەزووەکانی ئەوی بکردایە، بەئاسانی تۆمەت و تاوانی ئەوتۆی بۆ دەخوڵقاند، دەبووە مایەی سەرخواردنی، یان دەبووە دەردەسەری و ملکەچی و سەرئێشەیەکی گەورە، دواجار ئەو کەسە ناچار دەبوو بە سەرانەیەکی زۆر لەوەی داوای دەکرد، لە تەونی جاڵجاڵۆکەیی ئاسۆی قومریی سیخوڕ ڕزگاری بێت. لەو کرداری خیانەتکارانەیەی قێزەوەنتر ئەوە بوو گەلێک جار دەمانچە و نارنجۆک (ڕومانە) و بەیاننامەی سیاسیی حیزبەکانی کوردستانی دەکرد بە ماڵ بەسەر گەنجانەوە و بە تۆمەتی کاری ڕێکخراوەیی ڕادەستی ئاغاکانی ئاسایشی (ئەمن)ی سلێمانی دەکردن، پاشان بە پارەیەکی خەیاڵی ئازادی دەکردن. ئاسۆی قومری لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٠دا تەسلیم بە ڕژێم بووەوە و بەتەواوی کەوتە کاری خراپە. ئاسۆی قومری یەکەم تاوان و یەکەم دیاری کە پێشکەشی ڕژێمی کرد و یەکەم کەسیش لە سلێمانیدا منی دەستگیر کرد و ڕەوانەی زیندانی «ئەمن»ی سلێمانیی کردم.

بە کوردی و بەکورتی: غەدر و خیانەت لای ئاسۆی قومری ببووە کاسپی بۆ خۆدەوڵەمەندکردن. هەموو ئەو سەروەت و پارانەی پەیدای دەکردن، لە

ڕێگای سەرسەرێتی و داوێنپیسی و بەدڕەوشتیدا خەرجی دەکرد و هەندێک جار شەوانی سووری بۆ «ئەمنەکان»یش دەسازاند. یەکێک لە ئاکارەکانی، وریاییەکی لەڕادەبەدەری هەبوو و لە ئاکامی ڕەفتارە دزێوەکانیدا متمانەی بە کەس نەبوو، گومانی لە هەموو کەس دەکرد، هەمیشە گوێقولاخ و بەهەست بوو، ئەمەش ببووە هۆکاری ئەوەی کە ساڵانێکی زۆری خزمەتی لە دیوەخانی غەدر و خیانەتدا درێژە بکێشێت.

یەکێک لە کەسە نزیک و جێی متمانەکانی ئاسۆی قومری، هاوڕێکەی (نووره کۆپە) بوو کە بڕوای تەواوی پێی هەبوو. «نووره کۆپە» بە ڕاستی و دروستی نازانم باوکی ناوی چی بوو، گەنجێکی کورتەباڵای سمێڵ شۆڕی دەمبەخەندە و پێکەنین بوو. بەبەردەوامی و لە نارەحەتترین کاتەکانی ژیانیدا، تەنها بۆ ساتێکی کەمیش ڕووخساری گرژ نەدەبوو، هەمیشە دڵخۆش و دەستبڵاو بوو.

لە بەشەکانی پێشووی لاپەڕەکانی ئەم پەرتووکەمدا، باسم لە هەندێک کەسایەتی و پێشمەرگایەتیی نێو حیزبی سۆسیالیست (حسک) کردووە، کە سەرکردایەتییەکەیان لە دۆڵەتوو بوو، نزیک سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ناوزەنگ، ئەو دەمەش نووره کۆپە لەگەڵ ئاسۆی قومریدا پێشمەرگەی سۆسیالیست (حسک) بوون و هەندێک زانیاریم لەسەر ژیانیان هەیە. نووره کۆپە بە هیچ شێوەیەک گوێی بە پارە و ماڵی دنیا نەدەدا، هەمیشە ڕەنگی ڕەشی هەڵدەبژارد و تەنانەت لە ماوەی ژیانی سیخوڕیدا لەگەڵ ئاسۆی قومری، هەمیشە سەرتاپای جلوبەرگی ڕەشی لەبەر دەکرد، بەڵام کاتێک مرۆڤێک بەو جۆرە بەبێ گوێدانە سەروەت و سامان و هیچ گیروگرفتێک و هەمیشە لە ساتەکانی ژیانیدا بەو شێوەیە دڵخۆش بێت و پێچەوانەی ڕاستییەکان و دژ بە گەلەکەی ببێت بە سیخوڕ و مرۆڤکوژ و خوێنڕێژ، ئەوە دەردەخات ئەم زاتە تەواو گەمژە و گێل و نەفامە، دەنا بۆچی دەبێت کار و کردەوەی لەو جۆرە هەڵبژێرێت کە مەترسیدارترین ڕەفتاری دڕندانەی مرۆڤە بەرامبەر مرۆڤەکانی دەوروبەری. نووره کۆپە و ئاسۆی قومری هاوڕێی

گیانیبەگیانیی یەکتر بوون، ئاسۆی قومری زۆر زۆری خۆش دەویست و جگە لەوەی هاوڕێی منداڵیی یەکتر بوون، لە سەردەمی پێشمەرگایەتیشدا تاوەکوو ئەو کاتەی من وەک میوانێک و هاوکارێکی برینـدارەکانیان و دوای چەککردنی هێزەکەی مام ئاراس و گەڕانەوەیان لە شارباژێڕەوە و دواتر بۆ بلەکێ و سەرکردایەتییان لە دۆڵەتوو لەگەڵیاندا بووم، هەردووکیان هەمیشە پێکەوە دەگەڕان و پێکەوە لەژێر خێمەیەکدا دەخەوتن.

لەیادمە ئەو کاتەی لەلای هاوڕێی دێرینم مام ئاراس لە دۆڵەتوو میوان بووم، شەوێک بە ڕادیۆیەکی مام ئاراس گوێم لە گۆرانییەکی فارسی دەگرت و نوورە کۆپەش نەخەوتبوو، هاتە لامەوە و لەخۆیەوە پێدەکەنی. منیش پرسیارم لێ کرد بەوەی من سەیری فیلمێکی کۆمێدی ناکەم و ئەم گۆرانییە فارسییەش ئاوازێکی ناخەژێنە، دەبێت هۆکاری ئەم پێکەنینەی تۆ چی بێت؟ لە وەڵامدا گوتی: خۆشم نازانم پێکەنینم بە چی دێت! ئەرێ ئێمە بۆچی هاتووین لەم شاخەدا دەژیین؟ منیش لە وەڵامدا گوتم: من دەزانم بۆچی هاتووم بۆ ئەم شاخە، ئەی تۆ بۆ نازانیت بۆچی هاتوویت بۆ نێو ئەم ژیانە ترسناک و ژیانە زەحمەتە؟ بەپێکەنینەوە بەتەنها بەجێی هێشتم و دوور کەوتەوە و خۆی کرد بە خێمەکەیدا و منیش بەتەنها گوێبیستی ئاوازەکە بووم و ئیرەج گۆرانیی دەچڕی. ئێستەش نەمزانی مەبەستی پێکەنین و پرسیارەکەی نوورە کۆپە چی بوو! ئاسۆی قومری و نوورە کۆپەی هاوڕێی منداڵی و پێشمەرگایەتیی هێندە بەتین و متمانەپێکراوی یەکتر بوون، تەنانەت هەردووکیان بەیەکیشەوە گەڕانەوە بۆ ناو ڕژێمی بەعسی فاشی و هەردووکیان هاوخیانەت و هاوبکوژ و هاوجەللاد و هاوجاش بوون. هاوشێوەی ئاسۆی قومریی هاوڕێی، ئەویش دەستی لە غەدر و خیانەتکاری نەدەپاراست. یەکێکی تر لە هاوڕێکانیان «فەرەجە شەل» بوو، ئەویش یەکێک بوو لەوانەی پاسەوانێکی گوێڕایەڵ و متمانەپێکراوی ئاسۆی قومری بوو. فەرەج لە سەرەتاوە شەل نەبوو، دوای ئەوەی خۆی و نوورە کۆپە و ئاسۆی قومری کەوتبوونە بۆسەی هێزی پێشمەرگەوە و دەستڕێژیی گوللەیان لێ کرابوو، فەرەج قاچی بریندار ببوو. چەندین جاری تر لە

شەڕ و بۆسەی پێشمەرگەدا بریندار و دەرباز بووبوون. ملشۆڕیی فەرەج، متمانەی لەلای پیاوانی ئاسایشی (ئەمن)ی سلێمانی بۆ پەیدا کرابوو، لەبەر ئەوە گەلێک جار پاسەوانێتیی ئەوانیشی پێ دەسپێردرا و بە هیچ شێوەیەک کەمتەرخەمیی نەنواند لە خیانەتکردن و گرتن و ئازاردانی خەڵکی بێتاوانی شارەکە و زیندانیکردنیان لە ئاسایشی سلێمانی. لە ساڵی١٩٩١دا و لە کاتی ڕاپەڕینی گەلەکەمان و ڕزگارکردنی سەرتاسەریی کوردستان، ناوبراو لە ئاسایشی سلێمانی لەلایەن جەماوەر و هێزی پێشمەرگە و بەرەی گەلەوە زیندانی کرابوو، پاشان ڕەوانەی زیندانی قەڵاچوالان کرابوو. پێشتر لەلایەن خەڵکییەوە لایەکی برۆ و سمێڵی تاشرابوو. بەداخەوە ئەو هەموو ڕەفتارە ناشرینانە و خیانەتانەی فەرەج دەرهەق بە خەڵکی کوردستان کردبوونی، «فەرەج» ئازاد کرابوو، ناشزانم هۆی ئازادبوونەکەی لەبەر چی و چۆن بوو! بەهەرحاڵ، دوای ڕامالینی دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێمی بەعس و پرۆسەی ئازادکردنی کوردستان، شەقامی بۆ تەخت دەبێت و خۆی دەخزێنێتە نێو یەکێک لە هێزەکانی پێشمەرگەی حیزبەکانی کوردستان و من بۆخۆم لە ساڵی ١٩٩٥دا لە کاتی سەفەرکردنم بۆ هەندەران و لە سەردانێکمدا بۆ شاری دهۆک، لەوێ چاوم پێی کەوت...

## مامۆستا پێشڕەو، یاخییەکی شۆڕشگێڕی نێو زیندان

ئەستەمە ئازاری شەوێکی زیندان، بە کتێبێک و بە باسێکی چەند کاتژمێرێک و نووسینێکی کورت پێناسە بکرێت. ناتوانم جەستەی شەلاڵە لە خوێن و ئەشکەنجە و تەزیویی ناو زیندان و نەبەردیی تێکۆشەران لەیاد بکەم و ڕۆحم بە فەرامۆشی؛ ئۆقرە ناگرێت. لە ڕاستیدا من هیچی تر نیم جگە لە مرۆڤێکی سادە و هەژاری کورد نەبێت، ئەوەی کردوومە، هەستکردنم بووە بەوەی دژی فاشیەت و شۆڤێنیەتی عەرەبی خەباتم کردووە و ئەوانەشی لەم ڕێگەیەدا لەگەڵیاندا ژیام و خەم و خەبات و

خوێنم لەگەڵدا بەش کردوون، وەک خۆیان کە هەن باسیان دەکەم، نە کەم و نە زیاد و نە بیروڕای سیاسیی خۆشمی بەسەردا دەسەپێنم و نە خۆشم دەکەم بە پاڵەوانی مێژوویی.

لە کوردستانی ژێر دەسەڵاتی بەعسدا و لەنێو زیندانەکانیاندا جۆرێک ژیانی دیکەی جیاواز لە ژیانی دەرەوەی زیندان بوونی هەبوو، کە ئەستەمە لەبیری بکەم و تا ئەمڕۆش بەدومەوەیە. لەوێدا لەناو زیندانەکاندا، دڵەڕاوکێ و کردنەوەی دەرگای ئەستووری ئاسنینی ژوورە بچووکەکانی پڕ لە زیندانکراوانی ڕەنگزەرد و جەستەی لاواز و دەست لە دواوە شەتەکدراوت دەبینی. لەخەو ڕاچڵەکاندنیان، خەوتنی بەکۆمەڵی و پۆشاکی دڕاوی پڕ لە ئەسپێ، بۆنی سەتڵی میزکردنی نێو ژووری زیندان و هاوار و ناڵەی منداڵ و پیرەمێردان و شەونخوونی و برسێتی و نادیارکردنی چارەنووسی مرۆڤەکان... هەموو ئەمانە وێنە و بۆنی ئەو ڕۆژگارەی ژیانم بوون. ڕۆژانێک بوو ڕژێمی دیکتاتۆری بەعسی فاشی بە ناوی عەدالەت و نیشتمانپارێزییەوە، ئەشکەنجەی تێکۆشەرانی دەدا و ورەیانی تاقی دەکردەوە و دەیویست بیانکاتە زمانلێدەر لەسەر دراوسێ و کەسوکاری تێکۆشەران و هاوڕێکانیان.

شێوازەکانی ئەشکەنجەدان؛ ترسناک و مرۆڤشکێنەر بوو، وەک هەڵواسینی قورسایی بە شوێنی تایبەتیی ئەندامی جەستەی مرۆڤدا (بۆ نموونە ئەندامی نێرینەی) و هەڵگرتنی بوتڵ بەزۆر و هەڵواسین لە دواوە و چەندەها شێوازی ئەشکەنجەی تر، هەموو ئەمانە لە دواییدا بوونە هۆی نەخۆشیی گەورەی کوشندە و بەربوونی خوێن و ئاوسانی لەش و هەوکردنی ناوسک و داڕزانی جەستەی کەسی ئەشکەنجەدراو، زۆریان بەو هۆیەوە گیانیان لەدەست دەدا و چارەنووسیان نادیار دەبوو. ئەگەری زیاتری ئازار و ئەشکەنجەدانی زیندانەکان لە هەڵمەتبردنی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر بارەگا و بازگەکانی ڕژێم، بەتایبەت دەستوەشاندن لە چەکدارانی ڕژێم لەناو شارەکاندا، ڕقوکینەی زیاتری هەڵدەگرت و ئەشکەنجە و ڕەشبگیری زیادی دەکرد، ژووری زیندانەکان پڕ دەبوون لە مرۆڤی بێتاوان

و نیشتمانپەروەران و  پیاوانی ڕژێمیش زیاتر خەڵات دەکران. پێم وایە پێویستە گێڕانەوەی مێژووی خەباتگێڕان، چی لە شاخ و چی لە کونجی زیندانەکاندا بێت، بۆ ئەوەی داهاتووی ئەم گەلە ستەمدیدەیە بخرێتە ڕوو، ئەوەش ئەرکێکی نیشتمانی و نەتەوایەتییە کە باس بکرێن.

لە یەکەم ڕۆژی دەستگیرکردنم و زیندانیکردنم لە بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی لەلایەن «ئاسۆی قومری» و «نووره کۆپە«وە، پێش ئەوەی بە چەند سەد مەترێک بگەینە شوێنی دیاریکراوی ئەوان (دائیرەی ئەمن)، چاویان بەستمەوە و لە دەرگای سەرەکیدا بە سێ پێپلیکانەدا سەریان خستم و دواتر کردمیان بە ژوورێکدا، لەوێدا چاویان کردمەوە و ئاسۆی قومری گوتی: «ئەمە ئەو کەسەیە سێ ڕۆژە بەدوایدا دەگەڕێین و با میوان بێت لەلاتان، بەڵام نانی باشی بدەنێ و برسییەتی!» پێشتر لە کاتی دەستگیرکردنمدا هەردووکیان پێیان ڕاگەیاندم لەبەر ئەوەی هاوڕێی «مام ئاراس»یت، وات بۆ تێناچێنین کە لەسێدارە بدرێیت! ئەو قسەیەش ئەوەی لە ناخمدا وروورژاند بەوەی مام ئاراس مرۆڤێکی دڵسۆز و هاوڕێ و دۆست بوو، کاتێک بەرپرس و دەسەڵاتی سیاسی و حیزبی و تێکۆشەرێکی خۆنەویست بوو لەناو هێزی پێشمەرگەدا، جێی سەرنج بوو بۆ من. شەهید مام ئاراس لە ژیانی منداڵیدا هەمیشە دەمبەخەندە و پێکەنین و قسەخۆش بوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە تەمەنی ژیانی پێشمەرگایەتییشدا هەر چەندە غەدر و ستەمی زۆری لێ کرابوو، بەڵام مرۆڤێکی بەئەمەک و دڵسۆز و میهرەبان و لێبوردە بووە، ئەمەش ئەو پرسیارە دروست دەکات شۆڕشگێڕێکی وەک مام ئاراس چەندە بەتوانا و کاریگەریی لەنێو دڵی مرۆڤە باشەکان و تەنانەت خراپەکانیش هێشتا هەر ماوە! لە سەرەتادا کەسێک هات خۆی پێ ناساندم، وتی: «من ‹مفەوەز› کەمالم، وەک تۆ کوردم و گەر تۆش هاوکاریم بکەیت، دەتوانم ڕزگارت بکەم لەم کێشەیە. برای شیرینم، بۆ ساتێک پشووی خۆت بدە و گەر برسییشتە با خواردنت بۆ ئامادە بکەن. گەر جگەرەکێشیت، ئەوا پاکەت و چەرخ لەسەر مێزەکەدایە. من دەڕۆم  و بەجێت دەهێڵم و دوای نیوکاتژمێر دێمەوە لات،

خۆشت بیرێک لە گەنجیتی و ژیانی خۆت بکەرەوە، هەموو ڕاستییەکی خۆت بخەرە بەر دەستمان، لە کوێ پێشمەرگە بوویت و سەر بە چی حیزبێک بوویت و بۆ هاتوویتەوە بۆ شار و کێت کووشتووە؟ گەر ڕاستییش نەڵێیت و ناڕاستگۆییمان (درۆ)مان لەگەڵدا بکەیت، ئێمە هەموو شتێکی تۆ لە سەرەتاوە دەزانین و لەناو کام حیزبدا تێکدەر بوویت، بەڵام دەمانەوێت لە زاری خۆتەوە گوێبیستی وەڵامەکانت بین!» بۆ مێردمنداڵێکی وەکوو من زۆر قورس و گران بوو، نە لە تەمەندا هێندە گەورە بووم و نە ئەزموونی سیاسیی ڕێکخستنەکانی شار و خەباتی چەکداری و تەنانەت تێکەڵبوون بە کۆمەڵگە بووم کە بتوانم دروست وەڵام بدەمەوە. هەر مرۆڤێک ژیانی ڕابردووی هەرزەکارانەی تەمەن حەڤدە و هەژدە ساڵانەی خۆی بهێنێتەوە پێش چاوی خۆی، ئاخۆ لەو تەمەنە کەمە بێئەزموونەدا بخرێتە بەردەم دامودەزگایەکی تۆقێنەری حیزبی بەعسی لەو جۆرە، دەبێت ئەو مێردمنداڵە باری دەروونیی چیی بەسەردا بێت و وەڵامی پرسیارکردنی بەرپرسەکانیان چی بێت! چۆن بتوانرێت لەو گرفتە گەورەیە خۆی ڕزگار بکات و سەرکەوتن بەدەست بهێنێت! لەو خەیاڵە ناخۆش و لێکدانەوەیەدا لەپڕ چاوم بە لێڵی و دوو تارمایی کەوت، ئاخۆ ئەمانە بە ڕاست مرۆڤن بەرامبەر بە من وەستاون یان هەر ئەو ترسەیە کە هەر چی کەسێک ڕوو لەوێ بکات و تووشی دڵەڕاوکێ دەبێت؟ کەمال پشتدەری «مفەوەز»ی بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی بوو، گوتی: «دەڵێی چی؟ بیرت لە ژیانی گەنجی و دایک و باوک و خوشک و براکانت کردەوە و گەیشتیتە ئەو ئاکامەی ئەوانیش بە خۆتەوە سەرقاڵ نەکەیت؟» من دەمزانی ئەو دەیەوێت بە کۆتایی ژیانی من و گرتنی دایک و باوکم و خوشک و براکانم لە ئاسۆی قومری و نوورە کۆپە، خەڵاتی باشتری پێ ببەخشرێت و پۆستی باڵاتری پێ بدرێت. ئەمە ڕاستیی وتووێژی «مفەوەز» کەمال پشتدەریی لێکۆڵەری «ئەمن»ی سلێمانی بوو. تارماییەکەی کەمال، کەسێکی باڵابەرز و ورگ زلێکی شۆڕ و بەپێکەنین بوو و گوتی: «جەلال تاڵەبانی؛ تێکدەری وەک تۆی هەبێت، حاڵیان جوان

دەبێت. دەڵێی چی؟ دەتەوێت پاداشتت بکەین و ژیانێکی ئاسوودە لەگەڵ خانەوادەکەتدا بژییت و هەر چی داواکارییەکەت هەیە و گەر خوێنەواریت هەیە؛ بۆمان بنووسە و لەسەر مێزەکە بۆمان دابنێ تاوەکوو بۆت جێبەجێ بکەین. گەر ڕاستییش نەڵێیت، ئەوا پشووی ئێمە درێژە و ژیانی تۆش کورتە لەلامان» و جارێکی تر بەجێیان هێشتم!

لێکدانەوەی زۆرم هەبوو بۆ پرسیارەکانیان، گەر ڕاستی لەسەر خۆم بڵێم، ئەوا خۆم تیا دەچم! گەر ڕاستییش لەسەر ئەو فەرمانەی جێبەجێم کردووە و چاوم بە کاکە ڕەزاق کەوتووە و هەندێ نامەی تایبەتم پێ داوە و ئەویش هەر چی کارێکی ڕێکخستنی ناوشاری بە نووسراو بۆ ئامادە کردبێتم و لە کاتی گەڕانەوەمدا لەگەڵ خۆمدا بیبەمەوە بۆ ناو هێزی پێشمەرگە، ئەوا ڕەنگە بە هۆی کاکە ڕەزاقەوە زۆرێک لە ڕێکخستنەکانی ناوشار تووشی گیروگرفت و گرتن و زیندانیکردن ببن! ڕەزاق ئەندامێکی ڕێکخستنی نێو شار بوو، پاش ئازادبوونم لە زیندانی «ئەبو غرێب» و دووبارە بوونم بە پێشمەرگە؛ لە ژیاندا مابوو، بەڵام لە ئێستەدا هیچ هەواڵێکی نازانم! داوام لێ کردن بەوەی ماندووم و کەمێک پشوو بدەم. دوای کاتژمێرێک، بە ڕاڕەوێکی باریکدا و بەچاوبەستراوی کردیانم بە ژوورێکدا کە زیاتر لە قەبارەی ژوورەکە زیندانکراوی تیا بوو. هێندەی نەبرد دیسانەوە بەچاوبەستراوی بردیانمەوە بۆ لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوە و پێیان ڕاگەیاندم بەوەی «کێم کوشتووە؟»، منیش بێدەنگ بووم لە ئاستی وەڵامدانەوەدا، لەپڕ بە چەند کەسێکەوە هێندەی هێز و توانایان تیا بوو تەواوی جەستەی لاوازم ئەشکەنجە درا و دڕندانە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردم تا بێهۆش کەوتم. بۆ جاری دووەم گەڕاندیانمەوە نێو ژوورەکەی زیندانییەکانی تێدا بوو. دواتر زانیم چیرۆکی من و ئەشکەنجە و زیندان دەستی پێ کرد...

ئەوەی کە زیاتر باری دەروونیی ئازار دەداین، لەگەڵ تاریک و ڕوونیی سەرلەبەیانیان بە کێبڵ و دەنگی بەرز و جنێو خەبەریان دەکردینەوە، پاشان بەڕیز ڕایاندەگرتین بۆ کاتی سەرئاو و دەموچاوشتن. هەریەک لە زیندانییەک

دەبووایە کێبڵێکی بەتوندی پیا بکێشرایە و دەبووایە بۆ ماوەی یەک خولەک تەواو بووایە. گەر لە یەک خولەک زیاتری پێ بچووایە، ئەو کێبڵەکەی دەبوو بە دووان و سیان. ئەمە زۆر بەدڕەفتارانە بوو، مرۆڤێک بەتەنها خولەکێک بتوانێت سەرئاو و ڕووخساری خۆی بشتبایە. لەنێو ئەم ژوورەی زینداندا، زیندانییەکی زۆری تێدا بوو، ئەوەی لەیادمە «ئاراس عەبدولڕەحمان» بوو کە ناسراو بە شەهید «مامۆستا پێشڕەو» و هەروەها «بەهادین محەمەدئەمین» ناسراو بە «بەهە کوێر» و سەلام عەبدولڕەحمان و لەتیف ئەحمەد حەمە و سەباحە ڕەش کە لەدوای ڕاپەڕین و ئازادکردنی کوردستان بووە بەرپرسی ئاسایش، هەروەها عەلی عەبدوڵا، شەهید هیوا فایەق فەرەج، حسێن ئەرکەوازی، عەدنان کەریم و شەفیق خەڵکی خانەقین بوو، هەروەها منداڵێکی تەمەن پانزە ساڵان خەڵکی قەڵادزێ و «عیزەدینی موزەمید» و چەند کەسانێکی تر کە نایانناسم و ناویانم لەیاد نەماوە. بەڵام پێویستە سەرەتا باسی ئەو قارەمانەی زیندان بکەم، کە مامۆستا پێشڕەوە. مامۆستا پێشڕەو لە ساڵی ١٩٥٧دا لە شاری سلێمانیدا لەنێو خێزانێکی زەحمەتکێش لەدایک بووە، لە ساڵی ١٩٦٣دا خراوەتە قوتابخانە و قوتابییەکی زیرەک بووە و قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی کشتوکاڵی سلێمانیی تەواو کردووە. پاش هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول و سەرەتای سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێ بە ڕابەرایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و لە ساڵی ١٩٧٦دا پەیوەندیی کردووە بە ڕێکخستنە سەرەتاییەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان. مامۆستا پێشڕەو مرۆڤێکی زۆر دڵسۆز و بەتوانا بووە لەنێو ڕێکخستنەکاندا و هەمیشە بەدڵسۆزییەوە کارەکانی شۆڕشی جێبەجێ کردووە و چەندین خەڵکی ڕۆشنبیر و پێشمەرگەی قارەمان لەسەر دەستی مامۆستا پێشڕەو دروست بوون، چەندان هاتوونەتە ناو ڕێکخستنەکانەوە و کاریگەرییان لەسەر گەشەسەندنی شۆڕش هەبووە و دژایەتیی ڕژێمی بەعسیان کردووە و لە ئەنجامی زۆریی چالاکی و کاری ڕێکخستنی ناوشار، لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە دەناسرێت و گومانی لێ دەکرێت و هەوڵی گرتنی دەدرێت. پێش

ئەوەی دەستگیر بکرێت، لە ساڵی ١٩٧٧دا ڕوو لە چیا سەختەکانی کوردستان دەکات و پەیوەندی دەکات بە هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە لەناو یەکێتی، لەگەڵ برا و هاوسەنگەرانی دەبێت بە پێشمەرگەیەکی پارتیزانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران. مامۆستا پێشڕەو دژ بە خەڵکی خراپ بوو و هەمیشە بە چاوی نزمەوە سەیری سیخوڕ و خۆفرۆشانی گەلەکەی کردووە، هەمیشە لە دژی شەڕی براکوژی بوو، بەردەوام ڕێگر بووە لە شەڕی کوردکوشتن، ئەمە جگە لەوەی مرۆڤێکی زۆر هێمن و سەرەڕای ئەوەی پێشمەرگەی پارتیزانی شاخ بووە، لەگەڵ ئەوەشدا چالاکیی چەکدارانەی ناوشاری بەلاوە زۆر گرنگ بووە، چونکە پێی وا بوو دوژمن گەر لە شارەکاندا دەستی لێ بوەشێنرێت، کاریگەریی زیاتر دەبێت و ترس و دڵەڕاوکێ لە دڵی دوژمندا دەچێنێت. هەر بۆیە مامۆستا پێشڕەو بڕیار دەدات خەباتی شاخ بگوێزێتەوە بۆ شار و هەفتەیەک لە شاخ و مانگێک لە شار، بەو شێوەیە درێژە بە خەباتی خۆی دەدات. ئەمە هەستی مرۆڤپەروەرانەی مامۆستا پێشڕەو بووە، هیچ کات لەگەڵ مرۆڤ کوشتندا نەبووە، بەڵام ڕەفتاری دڕندانەی بەعسی داگیرکەر، زوڵم و ناهەقی بەرامبەر بە میللەت و هەر تاکێکی کورد، کاریگەریی لە پێشمەرگە و شۆڕش کردبوو کە دەستیان لێ بوەشێنن و بە سزای گەل و شۆڕشیان بگەیەنن. هەر بۆ ئەو مەبەستەش مامۆستا پێشڕەو بە دەیان چالاکیی ناوشاری ئەنجام داوە، بۆ چەواشەکردنی ڕژێمی فاشی و پاراستنی ژیانی خۆی لە دوژمن و فرسەتی لێ نەهێنن، هەر چەندە من لە خودی خۆیم نەبیستبووە، بەڵام هاوڕێکانی باسی دەکەن و دەڵێن زۆربەی زۆری شەوانیش لە گۆڕستانەکاندا خەوتووە و شەوی ڕۆژ کردۆتەوە، کە ئەمەش پیشەی زۆری ئەو پێشمەرگانە بوو کە چالاکیی ناو شاریان ئەنجام دەدا، چونکە ڕژێم هیچ کات بیری لەوە نەدەکردەوە پێشمەرگە خۆی لەنێو گۆڕستانەکاندا حەشار بدات، دوای ماوەیەکی زۆر ڕژێم بەو کارانەی زانیبوو، ئیتر بۆسەیان لەنێو گۆڕستانەکانیشدا دادەنا و چەندین پێشمەرگەش دەستگیر کران و شەهید بوون. لەناو هێزی پێشمەرگەدا

چالاکییەکی ناوشاری مامۆستا پێشڕەو کە دەنگی دابووەوە، ئەویش ئەوە بوو دوای ئەوەی یەکێک لە دوژمنە هەرە تاوانبارەکانی بەعسی بە سزای گەل و شۆڕش گەیاندبوو، چەکدارەکانی ڕژێمیش پێی دەزانن و شوێنی ڕووداوەکە کۆنترۆڵ دەکەن. دوای بەرگرییەکی جوامێرانە، مامۆستا پێشڕەو خۆی نادات بەدەستەوە و ڕوو لە مزگەوتی گەورە دەکات و لەژێر ئاوەڕۆی شوێنی حەوزی دەستنوێژگرتن ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە، تاوەکوو دوژمن لە شوێنی چالاکییەکەدا پەرشوبڵاوەی لێ دەکەن، دواتر خۆی دەرباز دەکات. ئەمەی مامۆستا پێشڕەو کردوویەتی، بەبیری کەم مرۆڤدا دێت بۆ خۆقوتارکردن و خۆئامادەکردنەوە بۆ دەستوەشاندنێکی تر لە دوژمن. ڕژێمی بەعس پێی وا بوو گەر ڕەفتاری ناشرین و بێڕێزی بە کەسوکاری پێشمەرگە بکات، کۆڵیان لە شۆڕش پێ دەدات. بۆ ئەو مەبەستە بڕیارێکیان دەرکرد، ئەوەی کوڕی یان کچی پێشمەرگەیە، خانەوادەکانیان دەستگیر بکرێن. دوای ڕەشبگیرییەکی زۆری ناو شار، زۆربەی زۆری ئەندامانی خانەوادەی مامۆستا پێشڕەو بەر دەکەون و گەورە و بچووکی بنەماڵەکەیان ڕاپێچی زیندانەکانی «ئەمن»ی سلێمانی دەکەن. مامۆستا پێشڕەو لەدوای دەرچوونی خولی دووەمی کادران کە لە ساڵی ١٩٨٠دا دەستی پێ کرد، بوو بە ڕابەرسیاسیی کەرتی شارەزووری هەرێمی یەک و پاشان لەبەر لێهاتوویی بەجێهێنانی کارەکانی و دڵسۆزیی بۆ خەڵکی گوندەکان و هاریکاریکردن و تەبایی لەنێو ڕیزەکانی پێشمەرگە و شۆڕش، جارێکی تر شەرەفی ئەندامێتیی پێ دەسپێردرێ و دەبێت بە ئەندام ناوچەی سلێمانی، ئیتر لێرەوە چیرۆک و بەسەرهاتی تێکۆشەرانی خەڵکی زەحمەتکێش دەست پێ دەکات.

گەر وردتر لەو مێژووە بڕوانین، تێدەگەین چەند زوڵممان لە کەسە تێکۆشەرەکانی گەلەکەمان کردووە! کێ بوون و چییان لێ هات و کەوتنە کوێوە؟ ئێستا دۆخی ژیان و کەسوکاریان چۆنە؟ چۆن باسیان دەکەین و کێن ئەوانەی باس دەکرێن؟ وەک زیندانییەک بەرنامەی «ئەو ڕۆژانەی ئەمرۆیان

دروست کرد» کە بەرنامەیەکی مێژوویی پڕ زانیاریی ورد و نهێنیی نێو زیندانەکانە دەبینم و بۆم گرنگە، هەموو جارێکیش ئەم بەرنامەیە ئاشنام دەکاتەوە بە کەلەپچە و کێبڵ و کارەبا و شتگەلێکی تری ئازاردانی دەروونی و جەستەیی، دەچمەوە نێو باوەشی پڕ حەسرەتی هاوڕێ و برا ئازیزەکانم کە تێیاندا بۆ من مامۆستا پێشڕەو یەکێکە لەو مێژووەی کە ناتوانم بۆ تەنها چرکەیەکی چاو نووقاندنیشم نەیبینم و هەمیشە کار و کردەوەکانی لەبەر چاومە و سەرتاپای جەستە و ویژدانی گرتووم! پێش ئەوەی مامۆستا پێشڕەو لە زینداندا ببینم، وەک شایەتحاڵێکی مێژوویی پڕ سەروەریی ئەو تێکۆشەرانەی لەنێو ژوورێکی بچووکدا خزابوون، جگە لە ئازار و ئەشکەنجەدانی تاک بە تاکی زیندانییەکان کە زۆرترین ترس و تۆقاندنی دەخستە نێو دڵی مرۆڤەوە، لەو زیندانە بچکۆلانەدا جگە لە پەنجەرەیەک؛ هیچی تری تیا نەدەبینرا، مامۆستا پێشڕەو وانەی شۆڕش و خەباتی نەتەوایەتیی لەو ژوورە بچووکەدا بە تەواوی زیندانەکان دەوتەوە. کاتێک زیندانییەک بۆ ئەشکەنجەدان ببرایە، بەزەردەخەنەوە پێی ڕادەگەیاند زۆر ئاساییە خۆت لەسێدارە بدرێیت، بەڵام هاوڕێکانی ڕێکخستنەکانی نێو شار بۆ ئەم شوێنە نەبرێن و تا بۆت دەکرێت خۆڕاگر بیت. دەیگوت ئەوەی کە دەبێتە مایەی سەربەرزیی ژیان، ئەوەیە کە چۆک بە هێزی مەچەک و بازووی جەللادەکاندا دابێنیت. ئەمە خۆی لە خۆیدا ورەیەکی بەرز و پۆلایین بوو بۆ تاک بە تاکی زیندانییەکانی نێو ئەو ژوورەی کە ڕۆژانە سات و کاتی بۆ نەبوو، هەردەم دەبوو خۆت ئامادە بکردایە بۆ هەڵواسینی سەربەرەوخوار و دەستی لەپشت بەستراو. ئەوەی بووەتە مایەی سەرسوڕمانم و من بەم تەمەنەشمەوە تاکوو ئێستە لەیادم ناچێتەوە، شکۆمەندیی مامۆستا پێشڕەو بوو بەرامبەر بە ملازم موحسینی جەللاد و داروودەستە تاوانبارەکەی. لە هەمان کاتیشدا مامۆستا پێشڕەو لەگەڵ ئەوەی قوتابخانەیەکی شۆڕش بوو، سەرکردەیەکی بوێری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو، ڕەفتارە جوان و هەمیشەییەکانی شەهید خاڵە شەهابی سەرکردەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لەودا دەبینرا و هەردەم خۆی

به بچووک دەزانی لەبەردەم تیکۆشەران و هاوسەنگەرانیدا. کاتێک پیاوێکی بەتەمەنیان بە ناوی «حاجی محەمەد» بە دەست بەستراوی و کەلەپچەوە خزاندە نێو ژوورەکەی ئێمە، لەتەنیشت دەرگاکەدا سەتڵێکی میزی تیا دانرابوو، دەبوو هەمووان لەو سەتڵەدا میزیان بکردایە و حاجی محەمەدیش لەسەر شیوعیبوون دەستگیر کرابوو و پێش ئەوەی ببرێت بۆ ئەشکەنجەدان، لەتەنیشت سەتڵی میزکردنەکەدا ڕاکشابوو. جوانترین سیفەتی سەرکردەی نێو زیندان «مامۆستا پێشڕەو» ئەوە بوو کە لە هەڵواسین و ئەشکەنجەدان تازە هێنابوویانەوە و جەستەی خوێنی لێ دەچۆڕا، لەگەڵ ئەوەشدا داوای لە حاجی محەمەد دەکرد لەتەنیشت سەتڵی میزەکەدا نەخەوێت، مامۆستا پێشڕەو خۆی چووە ئەو شوێنەوە و بەوپەڕی سەربەرزییەوە هەردوو قاچە خوێناوییەکەی لێ درێژ کرد. هێندەی پێنەچوو دەنگی دەرگای ئاسنین تەواوی زیندانییانی هەراسان کرد و حاجی محەمەدیان بردەوە بۆ هەڵواسین و پێیان ڕاگەیاندبوو بەوەی دەبێت بچێتە ناو ئەو بوتڵەوە، بەڵام حاجی محەمەد سەربەرزانە بە جەللادەکانی ڕاگەیاندبوو لەو بوتڵەدا جێم نابێتەوە، گەر بوتڵەکەی ئێوە لە مندا جێی دەبێتەوە، ئەوا من دەتوانم جێی بکەمەوە، بەڵام دڵنیا بن نایەڵم ئەو بوتڵە لە جەستەی هاوڕێکانمدا جێی بۆ بکرێتەوە. کاتێک حاجی محەمەدیان بەبوراوەیی هێنایەوە نێو ژووری زیندانەکە، جگە لە مامۆستا پێشڕەو؛ کەسی تر نەیاندەوێرا بچن بەهانایەوە و سەد مخابن مامۆستا پێشڕەوی (ئاراس عەبدولڕەحمان) سەرکردەی شار و شاخ و سەرکردەی نێو زیندان، سەری حاجی محەمەدی خستە سەر ڕانی و لەنێو ژووری زینداندا حاجی گیانی لەدەست دا و شەهید بوو.

کاتێک بۆ لێپرسینەوە و لێکۆڵینەوەی زیاتر منیان ڕەوانەی هەواڵگیری (ئیستخبارات) کرد، کە ئەوسا بەرامبەر بە بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی، لەتەنیشت قوتابخانەی فریشتەی کچان بوو، ئیتر من لە هاوڕێ زیندانییەکانم دابڕام، لێکدابڕان ئازارێکی قووڵی لەبیرنەکراوە و بەتایبەت لەو کاتەدا بۆ من خەمێکی زۆر زۆر بوو، تەنانەت بڕیاری لەسێدارەدانیشم لەگەڵ شۆڕشگێڕە

یاخیبووەکانی نێو زینداندا بوو. ژوورەکانی «ئیستخبارات» پێچەوانەی ژوورەکانی «ئەمن» بوو، چونکە ژووری تاکەکەسی (ئینفراد)ی بوون و درێژییان تەنها دوو مەتر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا پەنجەرەی تێدا نەبوو، هەمیشە گڵۆپی ژوورەکە داگیرسابوو، ئازار و ئەشکەنجەدانی زیندانی لەوێدا زۆر ترسناک و وشەی نەشیاو و جنێوی سەیر و بازاڕی بەکار دەهێنرا، وەک: خوشکت دەگێم، دایکت حیزە، جەلال تاڵەبانی دایکت دەگێت، کورد هەمووی حیز و قەرەجن، ژن و خوشک و دایکت دێنم بەبەر چاوی خۆتەوە دەیگێم... ئەمە و لە پڕ و ناکاودا ئامێرێکی باریکی بچووک (شۆرتی) کارەبایان پێ بوو، کارەبایان لە سەرتاپای جەستەوە لێ دەدایت و تەزوو و ئازارێکی سەخت بە جەستەدا دەهات و زۆر جاریش دەبووە هۆی ئەوەی بۆ چەند خولەکێک ببورێیتەوە و بێئاگا بیت لە ژیان. لێکۆڵینەوەکانیان هەندێک جار سەرلەبەیانیان بوو، هەندێک جاریش شەوان. ئەو ڕۆژانەی بەیانیان ئازار و ئەشکەنجەیان دەدام، باشتر بوو لە ئازار و ئەشکەنجەدانی شەوان، چونکە ئەو شەوانە بۆ هەڵواسین و ئازار و ئەشکەنجە بەر کێبڵ و شەق و بۆکس بدرامایە، دواتر لەبەر ئازاری جەستەیی شەو تا بەیانی خەوم لێنەدەکەوت و بەیانیانیش بە دەنگی بەرز و جنێودان دەهاتنە سەرمان. بەم شێوەیە چوار مانگم بەسەر برد و دواتر ڕەوانەی «هەیئەی خاسە» کرام لە شاری کەرکووک، کە ترسناکترین زیندانی ڕژێمی بەعس بوو و زۆرترین کەس لەوێدا لەژێر ئازار و ئەشکەنجەدا گیانیان لەدەست دەدا. «هەیئەی خاسە» سەر بە «مەنزوومەی شمالی»ی ئیستخباراتی گشتیی ڕژێم بوو، دواتر ڕەوانەی دادگای شۆڕش لە بەغداد کرام و بۆ ماوەی بیست ساڵ حوکم درام. پاش سێ ساڵ ژیانی نێو زیندان، مامۆستا پێشڕەو و هەندێک لە هاوەڵە زیندانییەکانم نەبینییەوە و زۆر جاریش لە زیندانی «ئەبو غرێب»دا کاتێک لەلایەن خانەوادە و هاوڕێکانمانەوە کە سەردانیان دەکردین بۆ زیندان، هەواڵی هەندێک لە هاوەڵە زیندانییەکانمان پێ دەگەشت کە هەندێکیان بەرەو زیندانی موسڵ دەبران. زیندانی موسڵ یەکێکە لەو زیندانە بەدناوانەی بە قەسابخانەکەی موسڵ ناو دەبرا، هەر چی مرۆڤێک

بۆ ئەو زیندانە ببرایە، پەتی سێدارەی لەمل دەکرا و ئیعدام دەکرا، ئەوەش ببووە هۆی ئەوەی بە «قەسابخانەکەی موسڵ» ناو دەبرا.

سەددام وەک دیکتاتۆرێک لە بۆنەکانی دامەزراندنی حیزب و زۆر جاریش بەپێی میزاجی کەسیی خۆی و هەندێک جاریش بۆ بەتاڵکردنەوەی زیندان و پڕکردنەوەی لە ڕۆژی دووهەمدا، بەفەرمی لێبوردنی دەردەکرد. یاسای لێبوردن هەر بەناو یاسا بوو، دەنا هیچ بنەمایەکی یاسایی نەبوو، وەک چۆن ئەشکەنجە و زیندانە ترسناکەکانی کۆی عێراق؛ هیچ بنەمایەکی یاسایی نەبوو، جگە لە دەزگایەک نەبێت پڕی بوو لە مرۆڤی دەروون نەخۆش و چەورە و شەقاوە و تاوانبار کە بە ناوی یاسا؛ خەڵکی ئازادیخوازیان دەستگیر دەکرد و بەرەو چارەنووسی نادیار دەیانفڕاندن. سەددامیش بەپێی باری دەروونیی خۆی، وەک خۆی دەیگوت یاسا وەک لاستیک وایە، بەئارەزووی خۆمان ڕایدەکێشین، لێبوردن (عفوات)ی دەردەکرد و لە تەنیشتیەوە هەزارانیشی دەکوشت، بەم جۆرە لێبوردنی گشتیی (عفو عام) بۆ تەواوی زیندانییە سیاسییەکانی حوکمدراو و حوکمنەدراو و ژووری سێدارە ڕاگەیەنرا و من لەوەدا بەر لێبوردی گشتی (عفو عام) کەوتم. بیرم دێت تەواوی زیندانییەکانیان بەکۆمەڵ لە گۆڕەپانەکەدا کۆ کردەوە و لەلایەن دەستوپێوەندەکانیانەوە پێیان ڕاگەیاندین کە سەددام حسێن بەڕەحمە و ئێوەش هەڵەتان لە ژیانی خۆتاندا کردووە و لێتان دەبورێت و ئازادتان دەکەین، جارێکی تر لە ژیانی خۆتاندا هەڵەکانتان دووبارە نەکەنەوە و دوای جەلال تاڵەبانی و مەسعوود بارزانیی تێکدەر نەکەون! سەیروسەمەرەیە مرۆڤ بەرگری لە خاک و زمان و کولتووری خۆی بکات و دواتریش بە هەڵەکار و تاوانبار پێناسە بکرێت! ئەمە بیرکردنەوەی تەواوی ڕژێمە دیکتاتۆرەکانی جیهانە بەرامبەر بە گەلانی مافخوراو. دوای چاوەڕوانییەکی زۆر، هەندێک لە زیندانەکانی تریان تێکەڵ بە ئێمە کرد کە لە زیندانەکانی تری بەغداد هێنابوویان، هەندێکی تریش کە چاوەڕێی لە ژووری سێدارەدا بوون، وەک: مامۆستا پێشڕەو، مەلا کەمال، بەهە کوێر، کاک ماجید و سەباح و چوار ئافرەتیشیان لەگەڵدا بوون، کە لە

ژووری سێدارەدا چاوەڕوانی ئیعدام بوون و ئەوانیش ئازاد بوون. دیارە دوای چەند ساڵ، «مامۆستا پێشڕەو» و «بەهادین و مەلا کەمال» لە شوێن و زەمەنێکی تردا شەهید دەبن.

پاش ئەوەی لە زیندانی ئەبو غریب ئازاد کرام، بۆ ماوەی مانگێک لەنێو خانەوادەکەمدا بووم و دووبارە پەیوەندیم کردەوە بە هێزی پێشمەرگەوە. مامۆستا پێشڕەو بۆ جارێکی تر و وەفایەک بۆ هاوڕێ زیندانەکانی کە لەژێر ئازار و ئەشکەنجەدا گیانیان لەدەست دابوو و بۆ ئەو هاوڕێیانەی بە گوریس لە ژووری قەسابخانەکانی ڕژێمی پێشووی ڕووخاوی سەددام حسێن خنکێنرابوون و بۆ بەرگریکردن لە خاک و نیشتمانەکەی و درێژەدان بە خەباتی سیاسی؛ دەچێتەوە شاخە بڵندەکانی کوردستان و ژیانی سەخت هەڵدەبژێرێتەوە. مامۆستا پێشڕەو و من، دووبارە چەکی شەرەفی پێشمەرگایەتی لە شان دەکەین. مامۆستا پێشڕەو لەلایەن هەڤاڵ مام جەلال؛ سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتمانی و نەوشیروان مستەفا؛ کەسی بەرپرسی دووەمی ناو یەکێتیی نیشتمانی و سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەران، خەڵاتی شۆڕشگێڕانە دەکرێت و چاوەڕوانی ئەوە دەکەن لە کۆبوونەوەیەکی گشتیی سەرتاسەریی هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، مامۆستا پێشڕەو وەک فەرماندەیەکی ڤارەمانی ئەو سەردەمە؛ شەرەفی ئەندامێتی و بەرپرسیارێتی و بڕوا و متمانەی گەورەی پێ بسپێردرێت. سەد مخابن، وەک کادرێکی زیرەک و چالاک، وەک پێشمەرگەیەکی خاوەن بڕوا بۆ ئاشتبوونەوە و سوڵحێکی عەشایەریی ئەو دەڤەرە کە بە بڕیاری شۆڕش و سەرکردایەتی نێردرابوو، لەو جۆرە سوڵحەش سەرکردایەتی و شۆڕش زۆریان ئەنجام دابوو، پاشان دیاردەیەکی دێرینی نێو کۆمەڵگەی کوردەوارییە و بەتایبەت خەڵکی عەشایەر و خەڵکی گوندەکان لە کوردستانی باشووردا پابەندن بە هەموو بڕیار و دانیشتنەکان، بەتایبەت زۆریان لەلایەن ڕیشسپییەکانەوە دەکران و پێیان دەگوترا «ڕیشسپیی ئاوایی». پێشمەرگەی فەرماندە و دڵسۆز و تێکۆشەر مامۆستا پێشڕەو، مامۆستای قوتابییەکانی

نێو زیندان، بە دەستی چەکدارەکانی ڕژێم لە ڕێکەوتی ١٩٨٤/٧/٦دا شەهید دەبێت و دەچێتە ڕیزی کاروانی نەمرانەوە و بکوژانی تا ئەمڕۆ نەک هەر سزا نەدراون، بەڵکوو بە مووچەی باش لەلایەن حکومەت و زلحزبێکی دێرینی کوردییەوە پاداشت کراون. پارتی

ئەگەرچی شەهید مامۆستا پێشڕەو لە ڕابردووشدا دوو جاری تر زیندانی کرابوو و لەبەر خۆڕاگری هیچی نەدرکاندووە و ئازاد کراوە، ئێستەش پیری بە باڵای ئەو مرۆڤە جوانانەدا هەڵدەدات و چارەنووسیش هەروەک خۆیەتی و کەسانی تر لە ڕەنج و ماندووبوون و بەرهەمی خوێنی گەشی شەهیدەکان و پێشمەرگەی دێرین و زیندانی سیاسی دەخوات. بەداخەوەم  کە نەمتوانیوە وەک پێویست باس لە خەباتی سیاسی و پێشمەرگایەتی و دڵسۆزی و وەفاداریی ئەم کەڵەپیاوە قارەمانە؛ شەهید ئاراس عەبدولڕەحمان (مامۆستا پێشڕەو) بکەم. بە ڕای من و زۆرێک لە شۆڕشگێڕەکان و فەرماندە و سەرکردەکان، بە سەدان لاپەڕە و تەنانەت بە کتێبخانەیەک ناتوانێت باس لە ڕابردووی مێژووی پڕ سەروەریی ئەم تێکۆشەرە قارەمانە بکات. سەد حەیف بۆ ئەو مرۆڤە مەزنانە گیانی خۆیان بەخت کرد! ئەوەی بووەتە جێی سەرنج و تێبینی بۆ من، شەهیدانەکەی ناگاتە نیوەی خانەنشینیی کۆنەسیخوڕێکیش! ئەمەیە گەمەی سیاسی و سیاسی پیشەکان، بۆ خۆقایمکردن و دەستبردن و تۆکمەکردنێکی زیاتر، نەک گەڕانەوە بۆ ڕابردووی مێژووی پڕ سەروەری، ئەمەش بەجێهێشتنی ڕاستی و جوانییەکانە کە لەمڕۆدا ئەوان لە ناویدا ناشرین بوون و ناهێڵن کەسێک تێیدا بەجوانی بمێنێتەوە! بەدڵنیاییەوە ئەمە دوا چەکی ڕۆچوون و داخزانی دەسەڵاتدارانی سیاسی و حیزبییە بۆ ناو زبڵدانێک کە تێیدا بۆگەن دەکەن و بیر ناچنەوە. بێگومان خەڵکی جوان و دڵسۆز و سەرکردەی ڕاستەقینەشمان هەیە بۆ ئەوەی لەو زۆرینەیەی دروست بووە؛ بیکەینە نموونە، بەلام بەداخەوە دەسەڵاتی زۆرینە بەو ئاقارەدا کار دەکات و دەیەوێت مێژووی جوانی شاخ پەردەپۆش و بن بەرد و ناشرین بکات، لە پێناو نەگەڕانەوە بۆ ڕاستییەکان و دەرنەخستنی کەسایەتییەکانیان...

## سەرکەوتنی بەردەوامی بەرەنگاربوونەوە و شۆڕش

شریقەی هەور و هەورەبرووسکە و لێزمەبارانی زستان و کاتێکی درەنگوەخت بوو، لەدوای تەواوبوونی خوێندن لە قوتابخانە، بەبرسێتییەوە وەک هەموو مندالە هەژارەکان بەرەو مالەوە دەڕۆشتمەوە، باران لە سەر و چاوەکانمدا چۆڕاوگەی بەستبوو، لەبەردەم دەرگا ڕزیوە کۆنەکەی خانووەکەماندا گوێبیستی یەکەم نەعرەتەی ترس لە هۆشیارکردنەوەی ستەم و هەستکردن بە بەرپرسیارێتی و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەرکی سەرشانم بەو دەنگە ناقولا و ترسناکە نێرینەیەی قورعان خوێنە دینییەکە بووم کە دایکم هەمیشە دەیوت دەبێت ئاگاتان لە مەلای خاوەن مالەکەمان بێت و هەر کاتێکیش لە هەر شوێنێکدا بینیتان، دەبێت هەردوو دەستی زیارەت بکەن و ماچی بکەن، چونکە قورعان لە سنگیدایە و خوا دەتانپارێزێت. ئێمە لە خانووە گلینە دوو ژوورەکەی مەلادا کرێنشین بووین. دایکم کە لە بنەمالەیەکی ئایینپەروەر و لەژێر ڕکێفی توندڕەوانەی پیاوسالاریدا چاوی بە دنیا هەلهێنابوو و پەروەردە کرابوو، هەمیشە لە کاتی ڕێنماییەکانیدا ترسی لە دل و دەروونماندا چاندبوو، هێندە باسی گۆڕ و جنۆکە و ئازاری دۆزەخی بۆ دەکردین. لەگەل چاو کەوتنم بە مەلای خاوەن مالەکەمان، هەردوو دەستیم ماچ دەکرد، لەگەل یەکەم دەست ماچکردنی مەلای خاوەن مال، دەستەکەی تری درێژ دەکرد بۆ ماچکردن. جاری وا هەبوو ئەوەندە خۆی بە پیرۆز و مەزن و لەخواترس و موسلمان دەزانی، هێندەی نەدەما دەستی بکردایە بە چاومدا، ئەو ڕەفتارانەش جۆرێکە لە کۆیلەبوون، بۆچی دەبێت من دەستی کەسێک پیرۆز بکەم و ماچی بکەم؟ لەو جۆرە دەست ماچکردنە، چی جۆرە واتایەک دەبەخشێت؟ گەر ڕێزداریی مرۆڤ بۆ بەرامبەر بەو جۆرە بێت، کەواتە تۆ کەسێک پیرۆز دەکەیت بەبێ ئەوەی لە ناخی بگەیت! پیرۆزییەکان زۆر بوون دایکم باسی لێوە دەکردن، کەعبە و موسلمان؛ ئەم دوو وشەیە هەمیشە لەسەر زاری دایکم بوو بۆ ئێمە. کە مندال بووم، زۆرم حەز دەکرد

ـە واتای کەعبە و ئیسلام بگەم و بزانم ئیسلامی ڕاستەقینە لە کوێوە سەری هەڵداوە و پرسیاری زۆرم ئاڕاستەی دایکم دەکرد، بەڵام دایکم لە بنەماڵەیەکی ئایینپەروەر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەتوانی وەک پێویست باسی مێژووی ئیسلام و کەعبە و شێخ و مەلام بۆ بکات. نەک بێوەڵامیی دایکم لە ئاستی ئەو پرسیارانەدا، تەنانەت بە ئێستەشەوە زۆربەی موسڵمانان لە چەمکی ڕاستەقینەی ئایین و ئیسلام نەگەیشتوون و تەنانەت لە کاتی نوێژکردن و قورئان خوێندندا ئایەتەکان بەهەڵە دەخوێنن و بگرە زۆرینەی مەلاکانیش لە چەمکی دەقەکانی قورئان وەک پێویست نەگەیشتوون، جگە لەوەی لە زهنی خۆیاندایە و دەیڵێنەوە بەبێ ئەوەی تێگەیشتنیان بۆ ئەو چەمکە هەبێت، تەنها ترس و تۆقاندن لە دڵ و دەروونی منداڵەکاندا دەچێنن. هەڵبەتە پێناسەی ئایین و ئیسلام پێدەچێت پەیوەندیی بە زیندانیکردن و خەباتی سیاسی و پێشمەرگایەتیی ڕۆژگارە سەختەکانی منەوە نەبێت، لێ سەرزەنشتکردن و بێڕێزیکردن بە دایکم بە هۆی دواکەوتنی یەک مانگ کرێی خانوویەکی داڕزاوی گڵینەی خاوەن مەلایەکی قورئان خوێن و لەخواترس، لە نووسینی یادەوەرییەکانمدا پێویستی کرد و منی تێکەڵ بە چەمکی قورئان و کەعبە و ئیسلام کردووە، نامەوێت بێمەوە سەر ئایین، چونکە دەقەکانی قورئان یەک لەدوای یەکی تری ئایینەکان دێن و ئایینی ئیسلامیش یەکتاپەرستییە و ئایینێکی نەگۆڕە و بۆ هیچ کەسێک نەهاتووە دەستکاریی بکات و باسی گۆڕانکاریی ئایین لە ئیسلامدا بکرێت و دوای ئایینی ئیسلام، ئایینەکانی تر پووچەڵ دەکرێنەوە. دایکم بەو شێوەیە پەروەردەی کردبووین، هەموو ئەندامەکانی نێو خێزانەکەمان بە گەورە و بچووکەوە نوێژمان بکردایە و سەرەڕای ئەوەی باوکیشم لە خێزانێکی ئایینپەروەردا چاوی بە دنیا هەڵهێناوە و باپیرم واتە باوکی باوکم، لەخواترس و کەسایەتییەکی ناودار و بە بنەماڵەی «سەیید مەجید ئیسماعیل» ناسراون. ئێستەش لەیادمە کاتێک باوکم ماڵئاوایی لە ژیان کرد و بۆ هەتاهەتایی بەجێی هێشتین، زۆربەی مەلا و ئایینپەروەران و خزم و هاوڕێیانی باوکم پێیان دەوتین کە باوکمان

«ئەهلی بەهەشتە» و خودا بردوویەتەوە بۆ بەهەشت. کاتێکیش من ئەو پرسیارەم دەکرد: ئاخۆ باوکم هۆکاری چییە «ئەهلی بەهەشتە» و چۆن خەڵکی ئایینپەروەر و ئیسلام حوکمی دوارۆژ دەدات کێ بەهەشتییە و کێش دۆزەخییە؟ لە وەڵامدا پێیان دەوتم بەوەی باوکم سەرلەبەیانی لە کاتی نوێژکردندا لەسەر بەرماڵەکەی مردووە، پاشان باوکمان لە بنەماڵەی «سەیید مەجید ئیسماعیل» بووە و هەمیشە پابەند بووە بە ڕینماییەکانی ئایین و ئەرکەکانی وەک نوێژکردن و ڕۆژووگرتن، بە ڕاستی و دروستی جێبەجێ کردووە. کاتێک تەمەنم چواردە ساڵان بوو، باوکم دەیبردم بۆ مزگەوت و بەتایبەت ڕۆژانی هەینی نوێژی بەکۆمەڵ (نوێژی جەماعەت)مان دەکرد. شەوێکی ڕەمەزان لەدوای نوێژکردن، چەند دەروێشێکی قژدرێژ کە قژیان ڕەنگی مەیلەوسوور دەیڕوانی، دواتر بۆم دەرکەوت بە «خەنە» جوانکارییان لە قژیاندا دەکرد، خەنە بەوە دەوترێت لە دێرزەمانەوە ئافرەتان بۆ جوانکاری و گۆڕینی ڕەنگی قژیان بەکاریان دەهێنا، بەڵام هەندێک لە دەروێش و سۆفی و مەلا و موسڵمانان خەنەیان بۆ ڕەنگ و جوانکاریی پرچە درێژەکانیان بەکار دەهێنا. کاریگەریی خێزانەکەمان لە ڕوانگەی پابەندبوون بە ئایین و ئیسلامەوە، منی پەلکێشی نێو دەروێش و زکر و خەڵوەت کردبوو. هەموو ڕۆژانی هەینی لەدوای تەواوبوونی نوێژی بەکۆمەڵ (جەماعەت)، بە شمشێرەکەوە خۆم لەگەڵ دەروێشەکاندا تێکەڵ بە خەڵوەت و شینی حەسەن و حسێن لەنێو گۆڕەپانی مزگەوتەکەدا و دەنگی دەف و زکر و لەخۆدان خەڵکی لەنێو بازنەیەکدا کۆ دەکردەوە و منی مێردمنداڵیش بە شمشێرێکەوە سەرتاپای جەستەم خوێناوی دەکرد، ڕۆژێکیان هێندەم بە شمشێر لە جەستەی خۆم دابوو، ئازار و ئەشکەنجە ئارامیی لێ بڕیبووم، هەندێک جاریش لە ناخی خۆمدا ڕووبەڕووی پرسیاری بێ وەڵام دەبوومەوە، ئاخۆ خواپەرستی دەبێت بەو شێوەیە بێت، جەستەی خۆتی بۆ خەڵتانخوێن بکەیت؟ مەلا چۆن دەبێت بڕیار لەسەر چارەنووسی داهاتووی مرۆڤ بدات و باس لە ژیانی ئێستا و داهاتووی زیندووبوونەوەی مرۆڤ بۆ دنیایەکی

ـر بكات؟ هەر چی جارێک مەلای خاوەن خانووە قورە داڕزیوەکەمان بۆ
کرێ وەرگرتن بهاتایە، پێی دەوتین نابێت تەنها بۆ ڕۆژێکیش پارەکە دوا
ـکەیت، لەبەر ئەوەی گوناحە و خواش ناتانخاتە بەهەشت و بە ئاگری
ـۆزەخ دەتانسووتێنێت و هەر کاتێکیش بچن بۆ «حەج» و بە دیداری کەعبە
شاد بن، خوا لێتان قبووڵ ناکات. کەعبە ئەو شوێنەیە کە تەواوی موسڵمانان
تەمەننا دەکەن بە دیداری شاد بن و پەردەی ڕەشی چواردەوری زیارەت
بکەن و ماچی بکەن. کەعبە پێی دەوترێت «بەیتی حەرام»، لەبەر ئەوەی
خوا شەڕ و کوشتاری تێدا قەدەغە (حەرام) کردووە، بەڵام بەپێچەوانەوە،
ئەو وڵاتەی لە ئێستەدا «کەعبە»ی لێیە، بەبێ ڕێزگرتن لە یاسا، لێکۆڵینەوە
و لێپرسینەوە لەگەڵ تاوانباراندا دەکرێت و بە شمشێری دووفاقیی ئیسلام؛
سەری دەپەڕێنرێت.

مەبەستی سەرەکیی من، لێکۆڵینەوە نییە لە ئیسلام و ئایینپەروەران،
بەڵکوو مەبەستی من تەنها ئەوەیە ئایا ئەوەی پێی دەوترێت مەلا و شێخ، یان
پێی دەوترێت موسڵمانی قورئان خوێن و لەخواترس، ئەمانە هەر هەموویان
«تەمسیلی» ئیسلام دەکەن؟ یاخود ئایینی ئیسلام بۆخۆی مانای پێکەوەژیان
و لێبووردەیی دەبەخشێت؟ گەر ئایینی ئیسلام بەو شێوەیە مانابەخشە،
هۆکاری چییە زۆربەی ئایینپەروەران هێندە توندڕەوانە ڕەفتار و مامەڵە
لەگەڵ بەرامبەرەکەیاندا دەکەن؟ کە بزووتنەوە ئیسلامییەکان لە شەڕەکاندا
دیلەکانیان سەر دەبڕی و نموونەی شەڕی گوندی خێڵی حەمە لە ساڵی
٢٠٠١دا لەلایەن «ئەنسارولئیسلام»، بە ڕابەرایەتیی مەلا کرێکار لەگەڵ
هێزی پێشمەرگەی یەکێتیدا ڕووی دا و لەو شەڕەدا چەند پێشمەرگەیەکی
یەکێتی کەوتبوونە بۆسەی چەکدارەکانی مەلا کرێکار و پاش شەهیدبوون
و گرتنی پتر لە چل پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەلایەن
هێزە ئیسلامییەکەی مەلا کرێکاری ڕابەری «ئەنسارولئیسلام»، تەواوی
دیلەکان سەر دەبڕن و زۆریشیان بەزیندوویی چاو و دەست و قاچیان
دەبڕن و چاویان دەردەهێنن، پاشان بۆ ترس و تۆقاندنی خەڵکی سڤیل و

هێزی پێشمەرگە، بە گرتەڤیدیۆیەک لاشەی شەهیدەکان بڵاو دەکەنەوە. لە ئێستەشدا مەلا کرێکاری ڕابەری «ئەنسارولئیسلام» لە وڵاتی نەرویج دەژی، وەک خۆی کە پێیان دەڵێت صەلیبییەکان، صەلیب بەو واتایە دێت کە عیسای مەسیحی پێ لە خاچ دراوە، ئیدیعا و تەمسیلی ئیسلام دەکات و بانگەواز بۆ حیزبی ئیسلامی دەکات، ئەم بانگەوازە دوو شتی زۆر جیاوازە، ڕابەرێکی حیزبی ئیسلامی لەنێو وڵاتێکی صەلیبیدا دەژی و باوەڕی لەخاچدانی عیسای پێ ناکرێت و خەڵکەکەی بە کافر دەزانێت و لەگەڵ ئەوەشدا بە سیستم و دەستوور و یاسای ئەو وڵاتە منداڵەکانی پەروەردە دەکات و لەگەڵیاندا دەژی! ئایا ئیسلام بەو شێوەیە پەیامی خۆی ڕادەگەیەنێت و دیلی نێو شەڕەکان سەر ببڕێت و لاشەی کوژراوەکان پارچە پارچە بکرێت؟ خۆ ئەگەر بەو شێوەیە بێت، ئەم کار و ڕەفتارانە بە کارێکی توندڕەوانە و نامرۆییانە پێناسە دەکرێت. ئەگەر ئیسلامیش بەم شێوەیە پەیامی توندڕەوانەی خۆی ئاڕاستەی خەڵکی بەگشتی ناکات، کەواتە ئەو حیزب و گرووپە ئیسلامییانە؛ تیرۆرست و بەکرێگیراوی وڵاتانی تری ئیسلامیی تیرۆرستانن. تاوان و ڕەفتاری توندڕەوانەی زۆری تری بزووتنەوە ئیسلامییەکان، لەگەڵ ئەو پێناسەیەی ئیسلام کە خێزانەکەمان منیان تیا پەروەردە کردووە، ژیان و گوزەرانێکی زۆر جیاواز بوو، دوو لێکدانەوەم بۆ ئەو مەبەستەش هەیە، یەکێک لە سەرەتای جیاوازییەکان بۆ من لەوە دەستی پێ کرد کە باوکم بە هۆی شۆڕش و کوردایەتییەوە زیندان کرا و ئێمەش بە هۆی خراپیی باری گوزەرانمان، تەنها کرێی یەک مانگی ئەو خانووە داڕووخاوەی کە ئێمەی تێدا کرێنشین بووین؛ دوا کەوتبوو، نیوەی کەلوپەلی نێو ژوورەکەمانی فڕێ دابووە بەر دەرگا و بارانبارینی ئەو کاتەش تەواوی کەلوپەلەکانی تەڕ کردبوون، پاشان بە ئێمەی ڕادەگەیاند دەبێت بڕۆن لەم خانووەدا، ئەو دەمەش دایکم دۆش دامابوو، لە غەمی زینداکردنی باوکمان و نانەسکەی ئێمەدا بوو، مەلای خاوەن خانووە داڕووخاوەکەش دەینەڕاند و زۆر بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد و بە دایکمی دەوت: «پیاوەکەت شۆڕش و

پێشمەرگایەتیی بۆ من نەکردووە! هەتا کرێی خانووەکەم نەدەنێ، نایەڵم
ێرەدا بژین و دەبێت بە زووترین کات بڕۆن و دوور بکەونەوە. من ناتوانم
ڕەشەخێزانێک بەخۆڕایی ڕابگرم!» بۆیە ستەمی دۆخ و ژیانمان بۆ بژێوی
و دابینکردنی کرێی خانووە قوڕەکەی تێیدا دەژیاین، دوای خوێندنگە کاری
دەستگێڕیم دەکرد.

دوای ژیانی دوو ساڵی پڕ لە ئازار و ئەشکەنجەی نێو زیندان و ئازادبوونم
لە بەندیخانەی ئەبو غرێب، بۆ ماوەی کەمتر لە مانگێکی دوای ئازادبوونم؛
پەیوەندیم کردەوە بە هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە
کەرتی سێی ئەزمەڕ، تیپی (٤٧)ی پیرەمەگروون، عەبدولڕەحمان سیتەکی
فەرماندەی کەرت بوو. لەو سەردەمەدا بۆ ئەوەی پێشمەرگە و ماڵە
پێشمەرگە لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە ئاشکرا نەبن، عەبدولڕەحمان سیتەکی
نازناوی «کەریم»ی لێ نام. ناوی ڕاستەقینەی: عەبدولڕەحمان حەمە عەلی،
ناسراو بە «ڕەحمان سیتەکی»، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥١ لە گوندی سیتەک
لە ناوچەی شارباژێڕ، لە ژیانی هاوسەریدا لەو کاتەدا خاوەنی حەوت منداڵ
دەبێت لە ساڵی ١٩٧٩دا، لەگەڵ شێخ دارا جەلال حەفید و عومەر حاجی شێخ
کەریم کەڵەکنی پەیوەندییان کردووە بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە.
سەرەتای دەستپێکردنی پێشمەرگایەتیی لە گوندی سیتەک و دواتر مانەوەیان
لە بلەکێ بە میوانداریتیی تایەری عەلی والی بەگ و عوسمانی قادر منەوەر سەر
بە حیزبی سۆسیال (حسک)، پاشان بەرەو گوندی تووژەڵە و زەڵێ سەردانی
هەڤاڵی کۆچکردوو مام جەلال دەکەن و پاش ماوەیەکی کەم بارەگایان لە
شێنێ دروست دەکەن کە شەهید کاکەبراشیان لەگەڵدا دەبێت، دواتر لەگەڵ
جەلالی حاجی مەحموود ناسراو بە «عەباس سیتەکی» یەک دەگرنەوە و
دەبێتە سەرەتای هەنگاونان و دەستپێکردنیان بە خەباتی چەکداریی شاخ.
لەبەر ئەوەی عەبدولڕەحمان سیتەکی لە بنەماڵەیەکی ناسراوی گوندی سیتەک
و لە شارباژێڕدا پەیوەندی و خزمایەتی و تێکەڵاوییەکی کۆمەڵایەتیی باشی
زۆریان هەبووە، لەو کاتەدا بیستوو دوو پێشمەرگە لە گوندی سیتەکەوە

پەیوەندییان پێوە دەکەن بە ناوی: هەژار عەبدولڕەحمان سیتەکی، ئەحمەد ئامە خولە ناسراو بە «شەهاب»، قاسم کەریم ئەحمەد، جەمال حەسەن سیتەکی، یاسین کوێخا ڕەحیم، محەمەد قادر شەمەیی ناسراو بە «بێکەس»، کەریم شێخ سەبری، جەزا سالح ئاغا سیتەک، یاسین واحید، عەزیز سەعید سیتەکی، مارف محەمەد عارف، ئەحمەد شێخ سەبری، ناوی هەندێکیانم لەیاد نەماوە. لە کاتی دروستکردن و بەرفراوانکردنی هەرێمەکان؛ لە «شێنێ» دەگوازرێنەوە بۆ دۆڵی باڵەیان یان باڵەکایەتی، بۆ ئەو گوندەی قادر خەباتی لێ بوو، گوندی یەنزێ و لێژێ، لەوێ بارەگای هەرێمی حەوت کە بە شێخ دارا سپێردرابوو؛ سەرپەرشتیی بکات و هەڤاڵ قادر خەبات وەک جێگری هەرێم و هەڤاڵ کوێستانییش ڕابەرسیاسیی هەرێمی حەوت لەو دەڤەرەدا. لە سەرەتای خەباتی پێشمەرگایەتیی عەبدولڕەحمان سیتەکی و یەکەم چالاکی لە ساڵی ١٩٧٩دا، بە شەڕی گرتنی زنجیرە چیاکانی قەسرێ و گەلاڵە و چۆمان کە ئەوکات زۆربەی زۆری بنکە و بازگە سەربازییەکانی ڕژێمی بەعسی لێ بوو، دەست پێ دەکات و دواتر دەگوازرێتەوە بۆ سنووری هەرێمی چوار، تاوەکوو ڕێکخستنەوەی تیپەکان. لە ساڵی ١٩٨١دا عەبدولڕەحمان سیتەکی دەبێتە فەرماندەی کەرتی سێی ئەزمەڕ لە تیپی چل و حەوتی پیرەمەگروون، ئەو دەمەش ئاوات قارەمانی؛ سەرتیپی چل و حەوتی پیرەمەگروون دەبێت. لەنێو کەرتی سێی ئەزمەڕ، بە پۆلێک پێشمەرگەی قارەمانی خۆنەویست ئاشنا بووم. عەباس سیتەکی کە هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ عەبدولڕەحمان سیتەکی بوو، وەک جێگری فەرماندەی کەرت ڕۆڵی کاریگەری هەبوو، تێکۆشەرێکی یەکجار بەجەرگ هێمن و دڵسۆز بوو. عومەر حەسەن ناسراو بە «عومەر عەرەب»، تێکۆشەرێکی بێئەندازە قارەمان و خۆنەویست بوو. پاشان نەوزادی عەبەی تەقێ و سەلاح چاوزەق، دوو پێشمەرگەی دێرینی نێو کەرتەکە بوون و لە زۆربەی زۆری چالاکییەکاندا بەشدار دەبوون. عەلی حەمە غەریب ناسراو بە «عەلی سوور»، هیوا قلیاسانی، ئەردەڵانی ئیسماعیل عارف، بەختیاری حاجی محەمەد ئەمین، سەلامە ڕەش، مامە تالە، بەکر سیتەکی،

ـەوزاد قلیاسانی، ڕزگار قلیاسانی، لوقمانی سدیق سوارە، عەبدوڵڵای سدیق سوارە، مامۆستا لەتیف، تۆفیق ناسراو بە شەهید «هونەر»، کامەرانی مەلا مەزهەر ناسراو بە شەهید «کرمانج»، وەستا لەتیف سوورە قەڵاتی، بەکری حاجی فارس و چەند پێشمەرگەیەک ناویانم لەیاد نەماوە. کەرتی سێی ئەزمەڕ، کەرتێکی چالاک و بە دەیان چالاکیی ناوشار و گرتنی ڕەبایەکانی سەر سنوورەکانی نێو ناوچەی ئازادکراو. یەکێکی تر لە چالاکییەکانی کەرتی سێی ئەزمەڕ، لە شەوێکدا بە دەنگی ئاربیجی و نارنجۆک ئەنداز و بیکەیسی و بە ورەی پۆڵایینی هێزی پێشمەرگەی کەرتەکە، لەنێو شاری سلێمانیدا بۆ ماوەی پتر لە دوو کاتژمێر هێرش کرایە سەر «حامیە»کە، لەو کاتەدا جێی حەوانەوەی سەربازیی بازگەکان و زیندانی «ئینزیبات» و دابەشبوونی هێزی سەربازی و بنکەیەکی بەرفراوانی جبەخانەیەکی چەندین چەکی جۆراوجۆر بوو، چەند ئۆتۆمبێلێک و چەندین چەکی قورس سووتێنران و تەقێنرانەوە. کەرتی سێی ئەزمەڕ کە عەبدولڕەحمان سیتەکی فەرماندەی کەرتەکە بوو، ڕۆژانە بە دەیان لاوی دڵسۆز و خوێنگەرمی پڕ لە هەستی نیشتمانی و نەتەوایەتی ڕوویان لێ دەکرد و دەبوونە پێشمەرگە لە کەرتەکەدا. پاش ماوەیەک بە بڕیاری سەرکردایەتی، عەبدولڕەحمان سیتەکی گوازرایەوە بۆ تیپی (٣٧)ی شاربازێڕ و دەبێتە فەرماندەی یەکی کەرتی تیپەکە و پاشان لەساڵی ١٩٨٦دا لەگەڵ ڕێکخستنی تیپی پارێزگاری کە سەر بە سەرکردایەتی بوو، عەبدولڕەحمان سیتەکی دەبێتە سەرتیپی پارێزگاریی بارەگاکانی هەڤاڵ مام جەلال لە دۆڵی جافایەتی و هەریەک لە فەرماندە شەهید سالاری حاجی دەروێش فەرماندەی کەرت دەبێت و پاش ئەوەی بە تۆمەتی ئاڵای شۆڕش دەستبەسەر دەکرێت، دواتر ئەردەڵانی ئیسماعیل عارف وەک جێگری فەرماندەی کەرت ئەو ئەرکەی پێ دەسپێردرێ. شەهید حەمە سوورەبانی، شەهید حەمەومین، شەهید عەباس سیتەکی، مامۆستا کەمال تاماس، عومەری قادر گوڵەباخ لە دۆڵی جافایەتی؛ درێژە بە خەباتی سیاسی و پێشمەرگایەتییان دەدەن.

## چەند ڕۆژێک لە سلێمانی بۆ کوشتنی
## ملازم محسین، خۆمان حەشار دابوو

کەم کەس هەیە ناوی «مولازم موحسین»ی نەبیستبێت کە لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە نێردرابووە کوردستان، زۆر دڕندانە زوڵمی بەرامبەر بە خەڵکی شاری سلێمانی دەکرد، مولازم موحسین بەو شێوەیە ناوی پەیدا کردبوو. بە ڕەگەز عەرەب و خەڵکی فەلەستین بوو، دەمەوێت لێرەدا بچمە ناوەرۆکی باسەکەوە و پرسیار دروست بکەم: ئاخۆ مولازم موحسین دوای ئەو هەموو تاوانەی کە لە کوردستان ئەنجامی دا؛ لەلایەن تێکۆشەران بە سزای گەل و شۆڕش گەیەنرا، یاخود هەر لە ژیاندا ماوە و یان وەک چۆن هەر کەسێک لە دایک دەبێت و دواجار دەمرێت؟

بۆ ئەو مەبەستەش لە ساڵی ٢٠١٦دا لە چەند گرتە ڤیدۆیەکدا و لە چەندین ماڵپەڕ و تۆڕە کۆمەلایەتییەکان هەواڵی کوشتنی مولازم موحسین لەلایەن تێکۆشەرانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان بلاو کرایەوە، بەبێ هیچ دەستکاریکردنێک دەقی هەواڵەکە لێرەدا دەخەمە بەر دیدی خوێنەر و دواتر سەرنج و تێبینی و چەواشەکاری و گەمەی سیاسی و بەهەڵە نووسینەوەی مێژووی لەسەر دەدەم. کۆسرەت ڕەسووڵ عەلی؛ جێگری یەکەمی سکرتێری یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، لەدوای ڕاپەڕین و وەرگرتنی سەرۆکایەتیی دووەم کابینەی هەرێمی کوردستان لەپاڵ دەرهێنانی نەوت لە شیواشۆک، بیر لە تۆڵەکردنەوە لە مولازم موحسین دەکاتەوە. کۆسرەت ڕەسووڵ تیمێکی تایبەت لە کەسانی دڵسۆز و متمانەپێکراوی خۆی بۆ دۆزینەوە و بەسزاگەیاندنی مولازم موحسین دروست دەکات. تیمەکە جگە لە چەند کوردێک، کۆمەڵێک عەرەبیش لەخۆ دەگرێت. ئەم تیمە کە پەیامی مەرگ و دەستگیرکردنی مولازم موحسینیان پێیە، دەست بە شوێنکەوتنی ئەو جەللادەی بەعس دەکەن و دەگەنە کۆمەڵێک زانیاریی باوەڕپێکراو، لەوانە مولازم موحسین دوای ئەوەی لە سلێمانی گوێزرایەوە،

به بڕیاری سەرکردایەتیی بەعس نێردرا بۆ کەرکووک، تاوەکوو پرۆسەی ئازادی لە ساڵی ٢٠٠٣دا لە ئەمنی کەڕامە کاری دەکرد، پلەی تاکوو موقەدەم بەرز بوویەوە، دواتر بۆ بەغداد هەڵهاتووە، بەڵام لەناکاو لە بەغداد ون دەبێت و بەرەو سووریا دەڕوات، بەڵام لە ساڵی ٢٠١١ بە هۆی ڕاپەڕین و شۆڕشی خەڵکی دژی حکومەتی بەشار ئەسەد، مولازم موحسین لەم وڵاتە شوێنی لەق دەبێت و ڕوو لە ئیمارات دەکات، تا دوای ١٣ سیانزە ساڵ هیچ کەس سۆراخی مولازم موحسینی جەللادەکەی بەعس نازانێ. کۆسرەت ڕەسووڵ بۆ دۆزینەوەی شوێنی سەددام حسێن، لە ڕێگەی کۆمەڵێک سەرۆکهۆزی عەرەبی تکریت سەرکەوتوو دەبێت و بەپێی کۆمەڵێک بەڵگەنامەی تەلەڤزیۆنیی کۆسرەت ڕەسووڵ، ئەڵقەی یەکەمی دۆزینەوەی شوێنی سەددام حسێن و دەستگیرکردنی ناوبراو دەبێت لە حەشارگەیەک لە ناوچەیەکی دوورەدەست، لەناکاو زانیاریی باوەڕپێکراو دەگاتە تیمەکەی کۆسرەت ڕەسووڵ کە مولازم موحسین لە یەمەنە، بۆ ماوەیەکی زۆر چاودێری کراوە، ڕۆژی یەکشەممە، ٢٠١٦/١٠/٢٣ مولازم موحسین دەکوژن و بە سزای گەل و شۆڕشی دەگەیەنن.

بەڵام دارای حاجی برایمی چەرمەگا، کە لە سەردەمی ڕژێمی بەعسدا مستەشاری فەوجی سووک (فەوجی خەفیفە) و کە خۆشی باسی دەکات بە بنەماڵە پەیوەندییان لەگەڵ حیزبی بەعسدا هەبووە، ئەو هەواڵە ڕەت دەکاتەوە کە گوایە مولازم موحسین کوژرابێت و چۆنیەتیی کوشتنەکەی مولازم موحسین لەلایەن تیمەکەی کۆسرەت ڕەسووڵەوە بە هەواڵێکی ناڕاستی پێناسە دەکات. لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٢/٢٩دا لە بەرنامەیەکی تەلەڤزیۆنیی کەناڵی ڕووداو کە سەر بە حیزبی پارتی دیموکراتی کوردسانە، دارای حاجی برایمی چەرمەگا دەڵێت: مولازم موحسین هاوڕێمە و پەیوەندی و دۆستایەتیمان لە ئێستەدا هەیە و دەشڵێت: هەواڵی دەزانم و نەشکوژراوە و لە ژیاندا ماوە. مولازم موحسین، خوێنڕێژ و بکوژی چەندین لە تێکۆشەرەکانی گەلەکەمانە. دارای حاجی برایمی چەرمەگا، زۆر بەڕوونی و بێ سڵەمینەوە لە کەناڵێکی

کوردییەوە شانازی بە بوونی هاوڕێیەتی و دۆستایەتیی مولازم موحسینی خوێنمژ دەکات و دەمانخاتە نێو گومانێکی قووڵ و سەرنجڕاکێشەوە کە تێیدا پێویستی بە بەدواچوون و وردبینیی دروست و بڕیاری هەڵوێستێکی توندە بۆ هەمووان.

مولازم موحسین چەندین هاوڵاتیی حیزبی و ناحیزبیی لەسەر شەقامەکانی شار و لەنێو ماڵەکاندا بەبەر چاوی خانەوادە و هاوڕێیان و لە تەواوی کووچە و کۆڵانەکانی شار شەهید کردووە، بێڕێزی و سووکایەتیی بە چەندین ماڵە تێکۆشەری شاخ و شار کردووە، دەستدرێژیی کردۆتە سەر ژن و کچانی شارەکە، لە یادەکانی و لە کاتی خۆپیشاندانەکانی هەشتاکاندا بە هیچ شێوەیەک دەستی لە ژن و منداڵ و پیر و پیاو نەپاراستووە، بە هەزارەها شێوەی ناشایستە و نەگونجاو ئازاری زیندانییانی داوە، پرسیارەکە لێرەوە دەست پێ دەکات: باشە کەسێک بەو جۆرە هەڵسوکەوتی لەگەڵ هاوڵاتی و هاوشارییەکانتدا کردبێت، گریمان بە دۆخێکی نەخوازراو و زەمەنێکی تێپەڕیو لە سەرشۆڕی، لە ئێستەدا دارای حاجی برایمی چەرمەگا چۆن دەتوانی پەیوەندیی لەگەڵ مولازم موحسیندا هەبێت و بەبەردەوامی لە پەیوەندیکردن لەگەڵی و سڵ لەو هەموو خوێن و قوربانییانە نەکەیتەوە و دڵت بەو دایکە جەرگسووتاوانە نەسووتێ و شەرم نەتگرێ! بەڕاستی ئەم وتانە پەلکێشی هەندێک شتی کۆنکرێتیمان دەکات. گەر سەرنج بدەین، نەک دەستی، بگرە شتی تریشی کەوتۆتە نێوان و چنگیان لەیەک نابێتەوە، دیارە نایەوێت باس لەو بابەتە بکات و دەیباتەوە بۆ هێزی ناوچەگەری، بە جۆرێک خۆی دەردەخات کە لە بوێرییەوە بووبێت و بێمنەت لووت لە بابەتەکە دەژەنێ، دەنا دڕندەیەک چۆن و لەبەرچی دەبێتە هاوڕێی گیانیبەگیانی و ئەوەندە ساڵە بێدەنگیت لێی کردووە، بۆ ئەم کاتە بە سپۆنسەری هێزێکی دوورەدەست لە کورد بای باڵی خۆت دەدەی و ئاگر بەر دەدەیتە دڵی هەزاران ماڵە شەهید و قوربانی! بەئاشکراش پێمان دەڵێیت دەتوانم دەنگێکی زۆر لە ناوچەی بەعسنشینەکانی عێراقدا مسۆگەر بکەم، لە کاتێکدا ئەوەی

تۆی خستۆتە باوەشی ئەم هەوڵە «سەربەخۆییە» وەک شەڕیکی سیاسی، بوونی خۆت و دۆخەکەی بۆ سەربەخۆبوونی کورد هان دەدا، کە لێرەدا دەبێتەوە بە پرسیارێکی گەورەتر لە بوونی بەدگومانی و بێئومێدیی خەڵک و ئامانجەکەی لە گرتنەدەستی دەسەڵاتدا.

بۆیە باشترە هاوکێشەی دوو فاقیی دوژمندۆستی و کوردبوون لە مۆراڵی سیاسیی حیزبێکی وەک بەعس پەروەردەدا بۆ کورد مەخوڵقێنە، شەرمێک لەو قوربانییانە بکەرەوە کە بە دەستی بەعسی فاشی ئەنفال کران تەنها بە هۆکاری کوردبوون، ڕەش و سپییان بەتێکەڵی زیندەبەچاڵ کرد، ئەو بەعسییە چەکبەدەستانە بوون کە سەرشۆڕ بکەی بۆیان و لە سایە و سێبەریاندا وەک سەرشۆڕێک بژی. میللەتی کورد لە مێژووی سیاسیی ناوچەکەدا خاوەنی قوربانییەکی زۆری بێوێنەی نەگوتراوە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا و بەردەوام لە سەنگەری بەخشیندا، بەرامبەر جوانییەکانی مرۆڤبوون هەتا ئێستاش دەجەنگێ و قوربانی دەدات.

بۆ ئەو مەبەستەش دەمەوێت چیرۆکێکی مێژوویی بخەمە بەر چاوی خوێنەران، کە ئەمە یەکێکە لەو هەزاران چیرۆکەی بوونە بەرهەمی ئەوەی ئێستا چەکدارەکانی سەر بە ڕژێمی بەعسی لەناوچوو، بەبێ سڵەمینەوە و بە پشتیوانیی هێزی چەکداری ڕژێم بەعسیئاسا، شەرم نەکەن کە لە ڕابردوودا چ کارە بوون!

لە ساڵی ١٩٨٣دا کاتێک لە قەسابخانەی ئەبو غرێب بە لێبووردنی گشتی ئازاد کرام و جارێکی تر پەیوەندیم کردەوە بە هێزی پێشمەرگە، ئەو چیرۆکە تراژدییانەم بۆ هاوسەنگەرانم دەگێڕایەوە کە لە زیندانەکانی ڕژێمی بەعسدا چەند نارەحەتیان دەکردین و بە هەموو شێوەیەک ئەشکەنجەیان دەداین، چیرۆکی ئەو پێشمەرگەیەم بۆ دەگێڕانەوە کە بەبرینداری لە یەکێک لە شەڕەکانی هێزی پێشمەرگە و چەکدارەکانی ڕژێمی بەعسدا فیشەکی لێ دەبڕێت و بەدیلی دەستگیر دەکرێت و هێنابوویانە لای ئێمە ڕۆژانە بەو برینداریییەوە ئازاریان دەدا و ئەویش قارەمانانە جگە لەوەی بەڵگەیان

لەسەر بوو کە پێشمەرگەیە، هیچی تری نەدەدرکاند، تاوەکوو ئەوەی خێزانەکەیان دەهێنا و بەبەر چاوی ئێمەوە بێڕێزییان پێ دەکرد و ئازاری دەروونیی ئەو پێشمەرگەیان دەدا، بۆ ئەوەی زانیاری لەسەر شوێن و جێی حەوانەوەی هێزی پێشمەرگە و ڕێکخستنەکانی ناوشار بدات، باسی ئەوەم بۆ دەکردن کە ڕۆژێک پتر لە پەنجا زیندانی بووین و خودی مولازم موحسین بە دەست و چاوی بەستراوەوە، بە کێبڵ تەواوی جەستەمانی بریندار دەکرد، باسی بوتڵ پێهەڵگرتن و کارەباڵێدان و هەر چی ڕەفتاری دڕندانەیە بەرامبەر بە ئێمەی زیندانییانیان دەکرد. مولازم موحسین کاتێک ئێواران سەرخۆش دەبوو، بە دار و بۆکس و شەقتێهەڵدان لە ئێمە، دەیگوت: نانی زۆرم خواردووە و ئەمەش جۆرێکە لە وەرزش بۆ ئەوەی خواردنەکەم هەزم بێت، باسی ئەو تاوانبارەم دەکرد کە چەندە ڕق و کینەی لە «ئاسۆی دەلاک» بوو، تاکوو شەهیدیان کرد، ئەمانە و زۆری تر کە نەمدەتوانی ئەو ژیانە سەختە لەیاد بکەم و ڕۆژانە بە بیرکردنەوەیان؛ ئازاری دەروونیی دەدام.

مولازم موحسین چەندین جار هەوڵی کوشتنی دەدرا و زۆر جاریش کەوتبووە بۆسەی هێزی پێشمەرگەوە، لە هەمان ساڵدا چوار پێشمەرگەی کەرتەکەمان بڕیاری چوونەوە شار و کوشتنی «مولازم محسین»مان دا، عومەر عەرەب بەرپرسی ئێمە و بەرپرسی نەخشە و پلانی سزادانی مولازم موحسین بوو، سەلاح حاجی عەلی (سەلاح چاوزەق)، ئەردەلانی ئیسماعیل عارف، بەندە شەهاب کەریم. بە چوار چەکی جۆری کلاشینکۆف، بە هاوکاریی بەرپرسی شانەکانی ڕێکخستنی ناوشار مامۆستا حەمەعەلی، بۆ چەند ڕۆژێک لە شاری سلێمانی خۆمان حەشار دا، لەلایەن بەرپرسی شانەکانی ڕێکخستن، گەڕان بەدوای مولازم موحسین و شوێنی دیاریکراوی شەقامی سەرەکیی بەردەم مزگەوتی گەورەی سلێمانی بوو، بەڵام مولازم موحسین لە شوێنی دیاریکراو نەمابوو.

ناچار بڕیارێکی خێرا و بەپەلەمان دا کە چالاکییەک ئەنجام بدەین، لە کاتی

گەڕانەوەماندا لە شەقامێکی پشتی مزگەوتی گەورە، نزیک گەڕەکی کانی ئاسکان لەناو حەشامەتێکی زۆر و ڕژێم دڵنیا بکەینەوە لەوەی دەتوانین لە شوێنێکی وادا دەست لە هێزەکانیان بوەشێنین و دڵنیایان بکەینەوە کە ناتوانن بە ویستی خۆیان ئازاری خەڵکی بدەن، بۆیە توانیمان ئەفسەر و سەربازێکی ڕژێم بێ دوودڵی بە سزای گەل و شۆڕش بگەیەنین. بەداخەوە چەند ڕۆژێک لەناو شاری سلێمانیدا بۆ کوشتنی مولازم موحسین خۆمان حەشار دا، بەڵام شانسێکی گەورەی هەبوو تووشمان نەدەبوو بە تووشیەوە و ئەو تاوانبارە بە سزای شۆڕش بگەیەنین و لەکۆڵ خەڵکی شاری سلێمانیی بکەینەوە. ئێستەش دوای ئەو هەموو تاوانانەی لەلایەن مولازم موحسینەوە دەرهەق بە لاوان و گەورە و بچووکی شارەکەمان دەکرا، بەشانازییەوە باس لە پیرۆزی و هاوڕێیەتی و پەیوەندیی دۆستایەتیی نێوان دارای حاجی برایمی چەرمەگا و مولازم موحسین دەکرێت بەبێ ئەوەی هیچ حیزبێک داوای لێ بکات شوێنی ئەو تاوانبارە لەلایەن دارای حاجی برایمی چەرمەگاوە دەستنیشان بکرێت و کۆتایی بەم جۆرە پیاهەڵدان و بێمنەتییەش بهێنرێت.

## دارای سەعدی بەگ خۆی شەهید کردووە و قەوانە بەتاڵەکان بۆنی بارووتیان لێ دەهات

پاش چەندین ساڵ ژیانی دنیای غوربەتم، ئەوەیە کە نەمتوانیوە لەگەڵیدا بگونجێم و بە ئەقڵی ئێرەش لەگەڵ بەرامبەرەکەمدا وەک پێویست مامەڵە بکەم، لەبەر ئەوەی ئەستەمە بە ئەقڵی بەجێماوی وڵاتەکەم بتوانم وەریانبگرم و لەلام ئاسایی بێت، چونکە من لەو سۆزەوە دەڕوانمە چەمکی نیشتمان و نەتەوەکەم، هەر ئەوەش بووەتە هۆکاری ئەوەی زۆر شتم لەلا نامۆ بێت، دڵنیام لەوەی غەریبی؛ مرۆڤی نیشتمانپەروەر و دڵسۆز دەکوژێت، لەو ساتەدا غەریبی خاک بووم و لە ئێستەشدا غەریبی ناو جەستەی خۆمم و غەریبی گیانم دەخوات... لە هەموو ساتێک و لەگەڵ هەموو چرکەیەکدا غەریبی

ڕووبەڕووم دەبێتەوە، ئێمەی خۆڕسک بە ئازار و دواجاریش بەئازارەوە سەر دەنێینەوە، زۆر جار هەوڵ دەدەم لەو ئازارە خۆم بەدوور بگرم، لێ زۆر زەحمەتە بۆ من کاتێک لە ڕابردوودا لەگەڵ کۆمەڵێک تێکۆشەر و دڵسۆز و خەمخۆری خاک و نیشتمانپەروەردا تەمەنی لاوێتیی خۆم لەگەڵیاندا لە پیرۆزترین بیروباوەڕ و ناخۆشترین ژیانی سەختی شاخدا بەسەر بردبێت و لەیادیان بکەم، لێ قەدەر و بارودۆخی ژیانی سیاسی و ئابووریی وڵاتەکەم، من و سەدان هەزارانی تری وەک منی دووچاری ژیانی دنیای غوربەت کرد.

ئەوەی زۆر ناخی هەژاندووم و هەمیشە ناتوانم لەیادیان بکەم، چیرۆک و بەسەرهات و ژیانی پڕ لە تراژیدیای ئەو هاوسەنگەرانەیە کە ڕۆژانێک بووە خۆیان بە خزمەتکاری گەلەکەیان زانیوە و خوێنی خۆیان لە پێناوی باوەڕی پیرۆزیاندا بەخشیوە. لەو تێکۆشەرانەی یەکێتیی نیشتمانی لە سنووری تیپی (٤٧)ی پیرەمەگروون، مەڵبەندی دوو، لە گوندی توووەسپیی نزیک شاری سلێمانی لە دۆڵەڕووت کە هەموو گوندەکانی ئەو دەڤەرە لەیەکەوە نزیکن و هێزی پێشمەرگە بەبەردەوامی لەو سنوورەدا هەبووە، دارای سەعدی بەگ و ئازاد باپیر؛ دوو پێشمەرگەی قارەمانی تیپەکەن و بە کاری تایبەت دەچنە گوندی «توووەسپی»، ئەو گوندەش زۆر نزیک دەبێت لە شاری سلێمانییەوە، ڕژێمی بەعس هەمیشە هێزی سەربازی و چەکدارەکانی لەو دەڤەرەدا بڵاو دەکردەوە و بۆسەیان بۆ هێزی پێشمەرگە دادەنا و کۆپتەری سەربازیی بە ئاسمانی گوندەکاندا بۆ ئاشکراکردنی هێزی پێشمەرگە دەگەڕان، بەبەردەوامی سیخوڕەکانی هەواڵیان بە دامودەزگاکانی ڕژێم دەگەیاند، لە هەواڵێکی سیخوڕیدا ڕژێم پێی زانیبوو هێزی پێشمەرگە لە چەند گوندێکی دۆڵەڕووتدا بڵاو بوونەتەوە، پاشان دارای سەعدی بەگ لەو کاتەدا دایک و خوشک و برای بۆ چاوپێکەوتن و بەدیدارشادبوونی دێنە گوندی توووەسپی. ڕژێمی بەعس بناغەی خۆی لە تەواوی شار و شارۆچکەکانی کوردستاندا داکوتابوو، زۆر بەئاسانی بە هێزی سەربازی و ئاسمانی پەی بە پێشمەرگە دەبرد، هێزێکی سەربازیی یەکجار زۆر و چەند

کۆپتەرێکی سەربازی بە ئاسمانەوە چواردەوری گوندی تووەسپی ئابڵوقە دەدەن و داوا لە هەردوو تێکۆشەری دێرین؛ دارای سەعدی بەگ و ئازاد باپیر دەکەن خۆیان ڕادەستی هێزەکانی ڕژێم بکەن، بەڵام ئەمان هەڕەشە و گوڕەشە و هێرشکردنە سەریان بەهەند وەرناگرن و هەردووکیان بڕیار دەدەن تاکوو دوا تنۆکی خوێن لە جەستەیاندا مابێت، بەرگری لە خۆیان و شەرەفی پێشمەرگایەتی و نەتەوەکەیان بکەن. بۆ چەند کاتژمێرێک هێزی دوژمن مۆڵەتیان پێ دەدەن کە چەکەکانیان فڕێ بدەن و خۆیان ڕادەستی ئەوان بکەن، بەڵام بێدەنگیی دارای سەعدی بەگ و ئازاد باپیر، هێندەی تر ڕقوکینە دەخاتە نێو دەروونی ئەفسەرەکان و سەرباز و سیخوڕەکان و ناچار دەبن بە هێزێکی پڕ چەکی سەربازییەوە و هێزی ئاسمانی، ئەو خانووەی کە هەردووکیانی تیا دەبن، بە کۆپتەر بۆردوومانی دەکەن و سەربازەکانی دوژمن هێرش دەکەنە سەریان و تەنها دوو پێشمەرگەی کۆڵنەدەر بە کەمترین فیشەکی نێو مەخزەنەکانی قەدیان لە شەڕێکی سەختی حەوت کاتژمێریدا بەرگری لە خۆیان دەکەن. تێکۆشەری ڕۆژگارە سەختەکان؛ ئازاد باپیر، کاتێک فیشەکی پێ نامێنێت، بەدیل دەگیرێت و دوای ماوەیەکی زۆری ئازار و ئەشکەنجەی زیندان، چارەنووس ژیانی زیاتری پێ دەبەخشێت و بە لێبووردنی گشتی لە زیندان ئازاد دەکرێت. پێشمەرگەی قارەمان دارای سەعدی بەگ هەتا دوا بەرگریکردن و شەڕێکی سەخت، بڕیار دەدات فیشەکێک بە خۆی بهێڵێت و دواتر لوولەی تفەنگەکەی ئاڕاستەی سەری خۆی دەکات و بە فیشەکێک کۆتایی بە ژیانی سەربەرزانەی خۆی دەهێنێت و دەچێتە ڕیزی کاروانی نەمرانەوە. ورەی پۆڵایینی شەهید دارای سەعدی بەگ و قارەمانێتی و خۆنەویستیی ئەو تێکۆشەرە، کاریگەریی گەورەی لەسەر هێزی پێشمەرگە دروست کردبوو، بارەگاکانی هێزی پێشمەرگە و زۆربەی زۆری دانیشتووانی گوندەکان، وێنە و پۆستەری شەهید دارای سەعدی بەگیان بە دیواریماڵەکانیاندا هەڵواسیبوو، شێوەی وێنە و پۆستەرەکان بە ڕەنگی سوور، دڵۆپێک خوێن بە نێوچەوانیەوە

نەخشێنرابوو، تەواوی پێشمەرگەکانی هێزی کەرت و تیپەکان وێنەی خۆیان و شەهید دارای سەعدی بەگ لەنێو گیرفانیاندا بوو، کە هەر کاتێک شەهید بوونایە، بۆیان بکرێت بە پۆستەر و بۆ مێژوو بڵاو بکرێنەوە. ئەو سەردەمە وا بوو، هەر پێشمەرگەیەک شەهید بووایە، پۆستەریان بۆ بڵاو دەکردەوە. پۆستەر بەو واتایە دێت وێنەی شەهیدەکە و ناو و نازناوی لەو داستانەی تیا شەهید بووایە، بۆ مێژوو بۆی بڵاو دەکرایەوە. کاتێک دایک و خوشک و برای شەهید «دارای سەعدی بەگ» بۆ دیدەنیی هاتبوونە گوندی توووەسپی لە دۆڵەڕووت، بە چاوی خۆیان هەڵوێستی جوامێرانەی شەهید دارای سەعدی بەگی کوڕیان و قارەمانێتیی تێکۆشەری دڵسۆز ئازاد باپیر و خەڵکی گوندەکە دەبینن، ئەوپەڕی شانازی بە خۆیانەوە دەکەن.

بۆ زیندووڕاگرتنی مێژووی ئەم دوو قارەمانە و تەواوی ڕووداوەکەش لەلایەن دانیشتووانی گوندەکە، برایەکی شەهید دارای سەعدی بەگ کە لەو کاتەدا لەوێ ئامادە بووە و دەڵێت: «کاتێک ئێمە بۆ دیدەنیی براکەم چووینە گوندی توووەسپی، ئافرەتێک بە دەنگی بەرزەوە هاواری دەکرد: ‹ئاگادار بن، جاش هات! جاش هات! با ئەو دوو پێشمەرگەیە زوو خۆیان ڕزگار بکەن و دوور بکەونەوە لە دێکە!› لەو دەمەدا من منداڵ بووم، ئێستەش لەیادمە بەتەنیشت دارای برامەوە خەوتبووم، زۆر حەزم لە چەک و پێشمەرگە و ناوی شۆڕش دەکرد و خەونم پێوە دەبینین، کاتێک گوێمان لە دەنگی دانیشتووانی دێکە و هاوار هاوار و دەنگی چەکدارەکانی ڕژێم بوو، دارای برام زۆر ئازایانە ڕاپەڕی و پێڵاوە لاستیکەکانی هەر بەدەم ڕێگاوە لەپێ کرد، بێ سڵکردنەوە و لەسەرخۆ، هەندێک جاریش بەخێرایی، لە گوندەکە دەرچوو. کۆپتەر بە ئاسمانەوە تەواوی ماڵەکانی بۆردوومان دەکرد، بەتایبەت ئەو ماڵەی ئێمە و دارای برامی تیا بوو، گەورە و بچووکی نەدەپاراست و تەنانەت لە پێشدا مزگەوت و کانیی ژنانی گڕ تێ بەر دا و بە سەدان سەرباز و چەکداری ڕژێم؛ چواردەوری گوندەکەیان دابوو، نەیاندەهێشت هیچ کەسێک لە دانیشتووانی گوندەکە بچێتە دەرەوە و

کەسیش بێتە ناو ئاواییەوە، دەنگی ئاربیجی و گوللە هاوەن و دۆشکە گوێی تەواوی دانیشتووانی دێکەی تاساندبوو، شەڕێکی سەخت و گەورە لەنێوان چەکدارانی ڕژێم و دارای برام و ئازاد باپیر بەرپابوو. دوای کەمێک، بێدەنگی و ئارامی باڵی کێشا بەسەر گوندەکەدا، لەپڕ لەلایەن چەند چەکدارێکەوە بوو بە دەستڕێژیی تەقە و من و دایکم و برا و خوشکەکانم و ماڵی خانەخوێش دوعامان دەکرد کە ئەو دوو پێشمەرگەیە هیچیان لێ نەیەت و سەلامەت بن. بەڕاستی ڕۆژێکی یەکجار ناخۆش و بەتایبەت لەبەر چاوی خۆتدا ئەو هەموو چەکدارانە ڕووبەڕووی دوو پێشمەرگەی قارەمان ببنەوە! هەر ئەوەندەم لە توانا بوو و پێم کرا وتم: ‹زۆر شەرمەزارییە بۆ ئێوە ئەو هەموو چەکدارە بەو شێوە دڕندەیە بەر بوونەتە خەڵکی دێکە و بە خوێنی سەری دوو پێشمەرگەی کوردی نیشتمانپەروەر تینون، ئەوان خەمخۆری گەل و نیشتمانن، کوردی ڕاستەقینەن و ئێوەش سیخوڕ و خۆفرۆش و نیشانەی بێغیرەتییە بۆ ئێوە!› زۆر زۆر زەحمەت بوو بۆ من بەبەر چاوی خۆم و دایک و خوشک و براکانم، دوو برام لە شەڕێکی دڕندانەی لەو جۆرەدا ببینم. پێش شەڕەکە لە بەرەبەیاندا بە دەنگی مەل و بلبولی نێو باخی دێکە بەخەبەر هاتم و چووبوومە قووڵایی بیرکردنەوەیەکی دووردوودرێژ، بە خەیاڵی خۆم منیش وەکوو کاکە دارای برام پێشمەرگە بووم کە خەونی ئەوپەڕی ئازادیم بوو، بە دەنگی گۆرانی و چەپڵەلێدان و دەنگی فیشەکی چەکدارەکان لە دنیای خەیاڵ و خەونی ئازادیمدا دابڕام و هێندەی پێنەچوو چەند سمێڵ شۆڕێک بەدەم کلک بادان و بەدەم پێکەنینەوە بەرەوڕوومان هاتن و چەند چەکدارێکی تر لەبەر دەرگا و هەندێکیشیان خۆیان کرد بەو ماڵەی کە ئێمەی تیا بووین. بەخۆشحاڵییەوە بۆ خاوەن ماڵەکەیان دەگێڕایەوە کە ئەو دوو پێشمەرگەیە سێ چەکداریان لێ کوشتووین و دووانیشیان بریندار کردووە، بەڵام هێزەکەمان پێشمەرگەیەکیان فیشەکی پێ نەمابوو؛ بەدیل گرتووە و ئەوی تریشیان پێش ئەوەی فیشەکی لێ ببڕێت، بە دوا فیشەک سەری خۆی هەڵتەکاندووە. بە زۆرەملی و قسەی ناشرین خواردنیان بە خاوەن ماڵەکە

دروست کرد و بێشەرمانە دەستیان کرد بە نانخواردن و دواتر بەدەم پێکەنینەوە دێکەیان بەجێ هێشت و بەکلکبادانەوە گەڕانەوە لای ئاغاکانیان.
براکەی ترم لەگەڵ لە چاو ونبوونی جاشەکان، بەرەو شوێنی شەڕەکە ڕایکرد و لەو سەرەوە کە گەڕایەوە، لەگەڵ خۆیدا هەندێک قەوانی فیشەکی بەتاڵی هێنایەوە و پێی وتین: دارای برامان خۆی شەهید کردووە و قەوانە بەتاڵەکانیش بۆنی بارووتیان لێ دەهات، بۆنی نەبەزین و سەربەرزی و شەهادەتیان لێ دەهات...»

ڕژێمی بەعس هەمیشە لە هەوڵی دەستوەشاندن بوو لە هێزی پێشمەرگەی کوردستان، بە یەک چاو دەیڕوانییە حیزبەکان و هەموویانی بە دوژمنی سەرەکیی خۆی دەزانی و کوردیشی بە بێگانە دەزانی لە خاک و نیشتمانەکەی خۆیدا، تەنانەت ئەو سیخوڕ و چەکدارە کوردانەی کە هاوکاری بوون و هەمیشە لە شەڕی دژ بە هێزی پێشمەرگەدا بەکاری دەهێنان و پێش سەربازەکانی خۆیانی دەخست و لەگەڵ ئەوەشدا بە دوژمنی خۆی دەزانی، لەبەر ئەوەی بە زمانی کوردی دەئاخاوتن و سڵی هەرە گەورەی لە هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوو، بۆیە هەمیشە سەربازگەی گەورەی لەنزیک گوندەکانی سنووری ئازادکراوی هێزی پێشمەرگە دروست دەکرد و بایەخی گەورەی پێ دەدان، بەتایبەتییش سەربازگەیەکی دروست کردبوو بە ناوی سەربازگەی «سارداو»، ئەم سەربازگەیە کۆنترۆڵی زۆربەی گوندەکانی دۆڵەڕووتی کردبوو، هێزێکی سەربازیی تایبەت و تەقەمەنییەکی زۆری تیا بوو، دوو بازگەی (سەیتەرە) لێ بوو، هەر کەسێک بچووایە بۆ سەردانی ئەو گوندانە و تەنانەت دانیشتووانی گوندەکان کە ڕۆژانە هاتوچۆیان دەکرد، لەوێدا پشکنینان بۆ دەکرا، هیچ ڕێیەکی تر نەبوو لە سلێمانییەوە بۆ گوندەکانی دۆڵەڕووت، دەبووایە بەو بازگە سەربازگەییەدا تێپەڕ بوویتایە، چەند ڕێیەکی تر هەبوو، بەڵام قاچاخ (قەدەغە) بوون و هەر چی کەسێک لەو ڕێیەدا بەر چاویان بکەوتایە، دووچاری گرفتی گەورە دەبوو و تاوانی پێشمەرگە (مخەریب)یان دەخستە پاڵی و ڕادەستی

امودەزگا داپڵۆسینەرەکانی خۆیانیان دەکرد. بۆیە هێزی پێشمەرگەش بە هۆی ئەو سەربازگەیەوە، دووچاری زۆرترین شەڕ دەبوو و پێشمەرگەشی لێ شەهید دەکران. لە ساڵی ١٩٨٤دا کاتێک هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان گوێبیستی دانوستان بوو لەگەڵ حکومەتی عێراقیدا، بەڵام هێشتا بەفەرمی دانوستان نەکرابوو، شەڕی هێزی پێشمەرگە و ڕژێم هەر بەردەوام بوو، تیپی ئێمە تیپی (٤٧) پیرەمەگروون، تووشی شەڕێکی زۆر سەخت بووین، ئەو کاتەش ئاوات قارەمانی سەرتیپی ئێمە بوو.

ئاوات قارەمانی[١] لە کتێبی «ڕێگا باریکەکان»دا باسی لەم شەڕە کردووە و بەم شێوەیە ئاماژەی بە سەرکەوتنی هێزی پێشمەرگە و شکستی دوژمن کردووە:

ڕژێمی تۆتالیتاری عێراق لە گەرمەی گفتوگۆی ساڵی ١٩٨٣-١٩٨٤دا چەند بەرنامە و نەخشەی نهێنیی دانابوو بۆ تیرۆرکردنی ئەندامانی سەرکردایەتی و فەرماندەکانی «ی. ن. ک.»، کەرتی شەهید «سەلاح» ڕوو دەکەنە «کانی بەردینە»، ئەم گوندە نزیک شاری سلێمانییە و لەنزیک گوندی کانی سپیکە و نزیک گوندی «تووە سپی»یە کە دارای سەعدی بەگ تێدا خۆی شەهید کرد. کەرتی شەهید سەلاح شەو لەوێ دەمێننەوە، بە هۆی جاسووسەوە ئەو هەواڵە دەگاتە «شێخ جەعفەر»ی پارێزگاری سلێمانی، ئەویش بە هۆی فرسەتی گفتوگۆوە هێزێکی گەورە لە سوپا و جاش بە هاوکاریی هێلیکۆپتەر دەنێرێتە سەر گوندەکە. بەیانییەکەی پێشمەرگەکان لە خەو هەڵدەستن، دەبینن چواردەوری گوندەکەیان لێ گیراوە، منیش پێش ڕۆژێک داوام لە عبدول ڕەحمان سیتەکی؛ فەرماندەی کەرتەکەم کردبوو، بەوەی بچمە یەکێک لە گوندەکانی دۆڵەڕووت بۆ دیدەنیی چەند ئەندامێکی خێزانەکەمان، چونکە ڕێی هاتوچۆکردنی هاوڵاتییان بۆ سنووری هێزی پێشمەرگە؛

[١]. ڕێگا باریکەکان، ئاوات قارەمانی، ڕۆمانەیاداشت، بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە، ٢٠٠٦، ل٣٩١.

هەندێک ئاسانکاریی تیا بەدی دەکرا، لەبەر ئەوەی دەنگۆی دانوستان (مفاوەزات) لەلایەن یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و ڕژێمی بەعس لەئارادا بوو. عەبدولڕەحمان سیتەکی هاوکاریی کردم و منیش بۆ ڕۆژی دواتر لە گوندی خەمزە بەرەو دۆڵەڕووت بەڕێ کەوتم و بۆ چاوپێکەوتنی هەندێک لە ئەندامانی خێزانەکەم، خۆم گەیاندە گوندی کانی گۆران. لەو دەمەشدا پۆل پۆل لە گەنجانی سلێمانی و شار و شارۆچکەکانەوە ڕوویان لە هێزی پێشمەرگە دەکرد بۆ ئەوەی ببن بە پێشمەرگە، منیش بۆ ئەوەی بە دیداری خانەوادەکەم شاد بم، بەپێچەوانەوە تووشی ئەو شەڕە بووم. ئەو گەنجانەی کە ڕوویان لە کەرتەکانی تیپی (٤٧)ی پیرەمەگروون دەکرد، ژمارەیەکی یەکجار زۆر بوون. پێش دەنگۆی بڵاوکردنەوەی دانوستانی یەکێتی و میری (ڕژێمی بەعس)، کەرتی ئێمە تەنها لە بیست و پێنج پێشمەرگە تێپەڕی نەدەکرد و تەواوی تیپی (٤٧)ی پیرەمەگروون کە پێک هاتبوو لە پێنج کەرت، بەئاستەم دەگەیشتە (١٥٠) پێشمەرگە، بەڵام بە هۆی دەنگۆی دانوستانەوە، هیچ کەرتێکی تیپەکان لە (٥٠) پێشمەرگە کەمتر نەبوو، بگرە هەندێک کەرتی پێشمەرگە هێندە زۆر بوون، نەک چەکی کلاشینکۆف و ژێرسێ و بڕنەو بەشی نەدەکرد، تەنانەت وامان لێ هاتبوو جگە لە هاوکاریی گوندەکان کە یارمەتیی خۆراک و پێخەف و سووتەمەنی بۆ خۆراک دروستکردن دەکراین، لەگەڵ ئەوەشدا لە شار و شارۆچکەکانیشەوە هاوکاری و یارمەتیمان بەدەست دەگەیشت. بەبەردەوامی ڕۆژانە لە شارەکانەوە خەڵکانێکی زۆر ڕوویان لە کەرت و تیپەکان دەکرد، بۆ ئەوەی ببنە پێشمەرگە. ئەو کاتەی بە بڕیاری «شێخ جەعفەر»ی پارێزگاری سلێمانی ئەو هێرشە گەورەیەی کرایە سەرمان، کۆپتەرەکان تەواوی سەر چیا و گردەکانی دەوروپشتی گوندەکانی دۆڵەڕووتی بۆردوومان دەکرد، منیش لە گوندی کانی گۆران بووم لەگەڵ هەندێک پێشمەرگەی جیاوازی کەرتەکان و چەند پێشمەرگەیەکی تازە لە سەرەتای دەستپێکردنی دانوستاندا هاتبوون؛ لەگەڵ ئێمەدا بوون. ئێمە بەدەم تەقەکردنەوە و کۆپتەریش بەسەر سەرمانەوە بۆردوومانی دەکرد، ئەو چەند

پێشمەرگەیە تەواو ترس کەوتبووە نێو دەروونیان، ناهەقیان نەبوو، شەڕ و هێرشی گەورەی سەربازی و بۆردوومانی کۆپتەری سەربازیی ڕژێمێکی دڕندەی وەک بەعسیان نەدیبوو، لەگەڵ ڕێزم بۆ هەموو خەباتگێڕێک، ناویان لێ نابوون پێشمەرگەی مفاوەزات. یەکێکیان ناوی «بەرزان» بوو، نامەوێت ناو و نازناوی تەواوی بنووسم، نەبا ببێتە هۆی بێڕێزیکردن بە کەسایەتییەکان، لە ترسی گیانی خۆی هاواری دەکرد: «کوڕینە، خۆتان بەکوشت مەدەن، لە دواییدا شمشاڵێکی شوکرولای باباتان بۆ لێدەدەن!» شوکرولای بابان، دەنگێکی گڕ و خۆش و بە ئاوازی شمشاڵێکی ناسکەوە کاروانی شەهیدانیان بۆ مێژوو تۆمار دەکرد و لە ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستاندا دەخوێنرایەوە. لەگەڵ «بەرزان» هاواری کرد و بە دەنگی بەرز چەند جارێک ئەو ڕستەیەی دووبارە دەکردەوە: «کوڕینە، خۆتان بەکوشت مەدەن!» ئەم قسەیە هیچ دوودڵییەک و کاریگەرییەکی ئەوتۆی بۆ ئێمە نەبوو، بەڵام چەند پێشمەرگەیەکی وەک ئاماژەم پێ دا پێشمەرگەی مفاوەزاتیان لێ ناو نابوون، چەکەکانیان شاردبووەوە و ڕایانکردبوو و لە گردەکەدا هاتبوونە خوارەوە. دوای چەند کاتژمێرێک شەڕ کۆتایی هات و ئەو قسەیەی کە بەرزان کردبووی، دەنگێکی زۆری لەنێو کەرتەکان و خەڵکی دێکاندا دایەوە و لە کۆبوونەوەیەکی کاتیدا ئاوات قارەمانی بانگی کرد و پێی وت: «تۆ کەسێکی ترسنۆک و بێ بیروباوەڕیت، دەبێت بۆ ماوەی بیست و چوار کاتژمێر ئەم سنوورە بەجێ بهێڵیت!»

## هەڵەکانی دانوستانی یەکێتیی نیشتمانی و حیزبی بەعس

هۆکاری چی بوو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دانوستانی لەگەڵ ڕژێمی حیزبی بەعسدا کرد؟ هەڵە و کەموکوڕییەکانی دانوستان چی بوون کە بووە هۆی زۆرترین کێشە و ململانێ لەنێو سەرکردایەتی و ڕێکخستنەکان و ڕیزەکانی نێو هێزی پێشمەرگەی کەرت و تیپەکان؟ بۆ ئەو مەبەستەش دەبێت ئەو بەڵگانە بۆ دیدی خوێنەر ڕوون و ئاشکرا بێت، کێ بوون ئەوانەی لە ئاستی بەرپرسیارێتیدا بالادەست بوون وەک سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی و... هتد، کە بەشدار بوون لە سەرەتا و کۆتایی و نهێنییەکانی دانوستان و دەستپێکردنەوەی شەڕی نێوان هێزی پێشمەرگەی یەکێتی و ڕژێمی حیزبی بەعس، بڕوانە کتێبی: خولانەوە لەناو بازنەدا[1]:

لەوەتی دەوڵەتی عێراق دامەزراوە، جووڵانەوەی کورد چەندین جار کەوتۆتە گفتوگۆ لەگەڵ دەسەڵاتی عێراقی، بەڵام هەتا ئێستا هیچ کام لەو گفتوگۆیانە نەخراونەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. هەر لەبەر ئەوەش هەموو جار کە گفتوگۆ دەست پێ دەکات، وەکوو ئەوە وایە لە نووکەوە دەست پێ بکات، چونکە ئەمان هیچ ئاگادارییەکی تەواویان لەسەر ڕەوتی گفتوگۆکانی پێشوو نییە: گفتوگۆکە چۆن دەستی پێ کرد؟ کێ بوون لایەنەکانی؟ کێ بوون ئەندامەکانی؟ ناکۆکییەکانیان چی بوون؟ بۆچی گفتوگۆکە سەری نەگرت؟ هەڵەکانی لایەنی کوردی چی بوون؟ ئەم پرسیارانە و دەیان پرسیاری تر، بێ وەڵام دێنە گۆڕێ. سەرەتا دەمەوێت بەکورتی دانوستان یان گفتوگۆ بۆ خوێنەر ڕوون بکەمەوە:

لە بنەڕەتدا دانوستان یان گفتوگۆ، لە زمانی ئینگلیزیدا بەگوێرەی جۆرەکانی پێی دەڵێن: Negotiation, Talk, Dialok

---

[1]. خولانەوە لەناو بازنەدا، نەوشیروان مستەفا، چاپی دووەم، چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاوەدانیی کوردستان، ١٩٩٩، ل٥.

لە عەرەبیدا: مفاوضە، محادثات، مباحثات، حوار

لە فارسیدا: مذاکرە

لە کوردییشدا: مفاوەزات، وتوویژ، دانوسەن یان دانوستان

گفتوگۆ، هونەرێکی بەرزی دیپلۆماسی و بەڕێوەبردنی ململانێیە بۆ چارسەرکردنی کێشە و ناکۆکی لەنێوان کەسانی ناتەبا، دامەزراوی ئابووری، ڕێکخراوی سیاسی، گەلان، دەوڵەتاندا. بەڵام ئەوەی جێگەی داخە، سیاسییەکانی کورد بەگشتی و سەرکردەکانی بەتایبەتی، لەم هونەرەدا کۆڵەوارن. دوور ناکەومەوە لە باسەکەم، مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٣ بڕیار درا گفتوگۆ دەست پێ بکرێت، ئەگەرچی هەر لە سەرەتای گفتوگۆوە «طارق عەزیز» هەڕەشەی کردووە و بەعس هیچ پرۆژەیەکی سیاسیی نەبووە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەگەڵ یەکێتی یان هیچ لایەکی تر، بەوەی حیزبی بەعس لە سەرەتای ساڵی هەشتاکانەوە بڕیاری دابوو بۆ ئەوەی جووڵانەوەی کورد لەناو ببات و هەموو دێهاتەکانی کوردستان وێران بکات. جگە لەوەی نەوشیروان مستەفا دەڵێت: هەر لە سەردەمی شێخ مەحموود و نوێنەرەکانی لەگەڵ ئینگلیز، لەگەڵ تورکیای کەمالی، لەگەڵ حکومەتی تازە دامەزراوی عێراق، گفتوگۆکانی ساڵی ١٩٣٠ی سەرانی کورد لەگەڵ ئەمیر غازی وەلیعەهد و دواتر لەگەڵ نوێنەری مەندوبی سامی بەریتانی و جێگری سەرۆکوەزیرانی عێراق؛ جەعفەر عەسکەری، تا دەگاتە دانوستانی ساڵی ١٩٩١ لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا، بە چەندین قۆناغی جیاواز و ناڕاستگۆیی بەرامبەر بە سەرانی بەرپرسانی کورد، بە ئەزموونێکی لاواز باس دەکات.

دەمەوێت پێشنیار و بیروبۆچوون و ئەزموونی سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان (مام جەلال) سەبارەت بە گفتوگۆی نێوان یەکێتی و بەعس بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی نەوشیروان مستەفا بخەمە ڕوو. کاتێک «سەددام حسێن» بۆ پێشەکیی دەستپێکردنی گفتوگۆ (دانوستان) داوا دەکات: دەبێت لە سەرەتاوە مام جەلال خودی خۆی بێت بۆ بەغداد، بۆ

گفتوگۆ و چاوپێکەوتنی سەددام حسێن، ئەم باسەش کەوتبووە بەر گوێی خەڵکی کوردستان و کۆمەڵێک لە پیاوماقوڵەکانی خۆشناوەتی هاتبوون بۆ بینینی «مام جەلال» و پرسیاریان کردبوو بەوەی گرەنتیی چی هەیە مام دەچێت بۆ بەغداد؟ یان گرەنتیی چی هەیە «مام جەلال» بەبێ گرفت بگەڕێتەوە؟ لە وەڵامدا مام جەلال ئاماژەی پێ دابوو کە هیچ گرەنتی و بەڵێنێک نییە کە دووچاری کێشە و گرفت نەبێت و بەسەلامەتی بگەڕێتەوە. پاش ئەوە پیاوماقوڵانی خۆشناوەتی بە «مام جەلال» ڕادەگەیەنن و دەڵین: چاوەڕێی چی لە «سەددام حسێن» دەکەیت؟ مام جەلالیش دەڵێت: هیچ! ڕەنگە سەددام حسێن دەمانچەکەی دەربهێنێت گوللەیەک بنێت بە سەرمەوە، یاخود دەمانچەکەی خۆیم بەدیاری پێشکەش بکات. هەردوو کارەکەی لێ دەوەشێتەوە.

نەوشیروان مستەفا ئاماژە بە چوونی «وەفدی» یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەکات کە پێک هاتبوون لە: مام جەلال، فەرەیدوون عەبدولقادر، عومەر عەبدوڵڵا، مەلا بەختیار، د. خدر مەعصوم، عومەر عەزیز. کۆبوونەوە لە بەغداد دەستی پێ کرد. سەرکردایەتیی یەکێتی دەسەڵاتی دا بەم وەفدە کە ئەگەر لەگەڵ وەفدی حکومەتی بەعس گەیشتنە ڕێککەوتن، بێ ئەوەی پێویست بە گەڕانەوەیان لە بەغداد بۆ سلێمانی بکات بۆ کۆبوونەوەی سەرکردایەتی، واتە پرس و ڕای سەرکردایەتی وەربگرن، ڕێککەوتنەکەی نێوان ڕژێمی بەعس و یەکێتی سەبارەت بە چارەنووسی گەلی کورد کە ئەگەر لەسەر چوارچێوەی گشتیی مەسەلەکان پێک هاتن؛ ئیمزا بکرێت، بەڵام مام جەلال لە وەڵامدا دەڵێت: «دەستیشم لە بنا ببڕنەوە، ڕێککەوتن ئیمزا ناکەم!» نەوشیروان مستەفاش دەڵێت: «کەواتە بۆ دەچیت بۆ بەغداد؟»، مام جەلالیش لە وەڵامدا دەڵێت: «ئێوە بەزۆر دەمنێرن!»

مەلا بەختیار ئەندامی نێو گفتوگۆی یەکێتی و ڕژێمی بەعس بووە کە چەند جارێک لەگەڵ مام جەلال و ئەندامانی تری وتووێژ، لەگەڵ ئەندامانی ڕژێمی بەعس چاوی بە «سەددام حسێن» کەوتووە. لە گێڕانەوەی یادەوەرییەکانیدا

و چاوپێکەوتنی کەناڵی ڕووداو، سەبارەت بە گفتوگۆی نێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و ڕژێمی حیزبی بەعسدا دەڵێت: ئێمە پێشتر تێدەگەیشتین بەوەی کە شاری کەرکووک نادرێت بە کورد لەلایەن سەددام حسێنەوە، لە مفاوەزاتیش تێدەگەیشتین کە شاری کەرکووکمان نادرێتێ، هەروەها تاکوو سەددام حسێنیش بمابایە؛ نەدەبوو بیر لەوە بکەینەوە شاری کەرکووکمان پێ بدرێت، پاشان ئێمە باش تێگەیشتبووین بەوەی سەددام حسێن هیچ مافێکی دیموکراسیی ئێمە نادات، چونکە خۆی فاشی بوو، نەدەکرا فاشیەت بۆ عێراق و دیموکراسی بۆ کوردستان بێت.

مەلا بەختیار باس لە ڕۆڵی «مام جەلال» دەکات و دەڵێت: من مام جەلالم لەوپەڕی ئازایەتی لە گفتوگۆکەدا دەبینی و لە یەکەم بینینماندا، مام جەلال بە «سەددام حسێن»ی وت ئێمە هاتووین دیموکراسی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمیی ڕاستەقینە بۆ کوردستان بەدی بهێنین، ئەگەر پێتان داین، ئەوا لەگەڵتاندا ڕێک دەکەوین، ئەگەر پێتان نەداین، ئەوا دەچینەوە بۆ شاخەکان، چیمان کردووە بەرامبەرتان؛ ئەوا بەردەوام دەبین. سەددام حسێن لە وەڵامدا بە «مام جەلال»ی وت «كلام شجاع» (قسەیەکی ئازایانەیە). پاشان سەددام حسێن بە مام جەلالی ڕاگەیاندووە ئێوە بە کەمترین چەک شەڕتان لەگەڵدا کردووین، ئەوە نیشانەی ئازایەتی بووە، شەڕکردنتان لەگەڵ ئێراندا ئازایەتی بووە، هاتنیشتان بۆ لای ئێمە لە بەغداد هەر ئازایەتی بووە و ئەم قسانەشت بەرامبەر بە من کە دەیکەیت؛ هەر ئازایەتییە!

هەروەها مەلا بەختیار دەڵێت: مام جەلال بڕوای بە «مفاوەزات» نەبوو، بەڵام ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بڕیاری «مفاوەزات»یان دابوو، هەر لەم بارەیەوە فەریدوون عەبدولقادر دەڵێت: ئێمە واتە یەکێتی، لەگەڵ بەرەی «جود»دا بارودۆخمان خراپ بووە و چەند جارێکیش هەوڵمان داوە ڕێک بکەوین، بەڵام نەگەیشتووینەتە ئەنجام، واتە لەو کاتەدا یەکێتیی نیشتمانی لەگەڵ بەرەی جوددا دژ بە یەکتر لە شەڕدا بوون، پاشان لەو کاتەشدا ئێران کە لەگەڵ عێراقدا دەجەنگی، بەرە بەرە هێزی سەربازیی ئێران لە سنووری

کوردستاندا دەهاتنە پێش و سنووری ئازادکراوی هێزی پێشمەرگە تەسکتر دەبوونەوە. هەروەها ئاماژە بە هەڕەشەوگوڕەشەی ڕژێمی بەعس دەدات کە لە ڕێگەی حیزبی دیموکراتی ئێرانەوە هەواڵیان بۆ ناردوون بەوەی گەر لەشکری سەربازیی عێراق تووشی گرفت بێت و شکست بهێنێت، ئەوا ئێمە تۆڵەتان لێ دەکەینەوە و ئێوەش بە تاوانبار دەزانین، دواتر فەرەیدوون عەبدولقادر دەڵێت: لەو کاتەدا ئێمە لە بارودۆخێکی ئاڵۆز و خراپدا بووین و ماندوو بووین، پێویستیشمان بە پشوودان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا وتووێژ بەشێکە لە سەنگەرەکانی خەبات، لێرەدا دەبێت ڕەچاوی ئەوە بکەین خودی سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەڤاڵ «مام جەلال»ی کۆچکردوو، بڕوا و متمانەی بە پەیمان و بەڵێنی ڕژێمی بەعس نەبووە، بەڵام لەبەر ئەوەی هەڤاڵ «مام جەلال» هەمیشە گوێبیستی بەرامبەر و لەگەڵ کۆی دەنگی ئەندامانی مەکتەبی سیاسیدا بووە، بۆ مێژوو ئەو ئەرکەی خستۆتە ئەستۆی خۆی و بڕیاری دانوستانی داوە کە بچێتە بەغداد و چاوی بە ترسناکترین ڕژێمی دیکتاتۆری عێراق؛ سەددام حسێن و ئەندامانی ڕژێمی بەعس بکەوێت. ئەگەرچی «مەلا بەختیار»یش پێشنیاری ئەوەی کردووە هەرگیز نەدەبوو ئێمە بیر لەوە بکەینەوە شاری کەرکووکمان پێ بدرێت، پاشان ئێمە باش باش تێگەیشتبووین بەوەی سەددام حسێن هیچ مافێکی دیموکراسیی ئێمە نادات، چونکە خۆی فاشی بوو، نەدەکرا فاشیەت بۆ عێراق و دیموکراسی بۆ کوردستان بێت.

ئەم بۆچوونانەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانی، هەر هەموو ڕاست و دروست بوون و بڕیارێکی ترسناکیش بوون، بەتایبەت کە هەڤاڵ «مام جەلال» دەڵێت: «دوور نییە سەددام حسێن بە دەمانچەکەی خۆی بمکوژێت!»

بەڵام «نەوشیروان مستەفا»ی کۆچکردوو لە پەرتووکەکەیدا دەڵێت:

کە وەفدەکەمان ڕۆشت بۆ بەغداد، وا ڕێک کەوتین هەموو ڕۆژێ لە هەواڵی خۆیان ئاگادارمان بکەن. چەند ڕۆژێ هیچ هەواڵێکیان نەبوو، من

زۆر ترسام شتێکیان لێ بەسەر هاتبێت. بۆ ئەوەی هەواڵیان بزانم، بە هۆی بنکەکەی دیموکراتەوە، واتە حیزبی دیموکراتی ئێران، برووسکەیەکم بۆ ناردن، وەڵامیان دامەوە کە ڕەوتی ڕووداوەکان باش دەڕوات، توومەز هۆی بێدەنگییەکەیان ئەوە بوو بە خۆشیدا کەوتبوون نەک شتی تر، هەر شەوەی یەکێ لە کاربەدەستە زلەکان میوانداریی کردبوون. گەورەکاربەدەستانی بەعس لە میوانداریدا لاسایی نەریتە خێڵەکییە کۆنەکانی عەرەبی دەکەنەوە.

لێرەدا بۆچوونە جیاوازەکان دەست پێ دەکات، کاتێک «فەرەیدوون عەبدولقادر» دەڵێت: «لەو کاتەدا ئێمە لە بارودۆخێکی ئاڵۆز و خراپدا بووین و ماندوو بووین، پێویستیشمان بە پشوودان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا وتوویژ بەشێکە لە سەنگەرەکانی خەبات.» هێشتا لێکدانەوەکەی فەرەیدوون عەبدولقادر لاوازیی پێوە دەبینرێت و کاتێکیش دەڵێت: «چەند جارێک هەوڵمان داوە لەگەڵ ‹بەرەی جود›دا ڕێک بکەوین، بەڵام ئەوان نەیانویستووە، ئەوەش بووەتە هۆکاری ئەوەی بڕوایان بە دانوستان بووە.» کەواتە ماندووبوون و پشوودانی سەرکردایەتی بووەتە هۆی ئەوەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دانوستان لەگەڵ دڕندەترین و دیکتاتۆرترین حکومەتدا بکات. ڕاستە پێشمەرگە و سەرکردایەتی لە بارودۆخێکی ناهەمواردا بوون و زۆرترین ماندووبوونیان پێوە دیار بووە، بەڵام نەدەبوو سەرکردایەتیی تەواوی حیزبەکان سەرقاڵی شەڕ و یەکتر کوشتن بوونایە، بۆ نموونە هێندەی حیزبەکان لە هەوڵی تێکشکاندن و کوشتن و خوێنڕشتنی پێشمەرگەی کوردستان بوون، هێندە سەرقاڵی ئەنجامدانی چالاکی و شەڕی دژ بە دوژمنی گەلی کورد نەبوون، هەندێک لە حیزبەکان چۆکیان بۆ دەوڵەتی ئێرانی بە ناو جمهوری ئیسلامدا دابوو. کاتێکیش باس لە ئاڵۆزی و ناهەمواریی بارودۆخی سیاسی دەکرێت، لێبوردەیی بەرامبەر بە یەک؛ باشترین هۆکاری ئاشتبوونەوە و لێکتێگەیشتن دەبوو، بۆیە نەدەبوو سەرکردایەتی بیری لەوە بکردایەتەوە کە ناوچەی سنووری ئازادکراوی هێزی پێشمەرگە تەسکتر دەبوونەوە و پاشان ماندووبوون بە هێزی پێشمەرگەوە دیار بووە. لە ڕاستیدا ئەو سەردەمە

ئێمە وەک پێشمەرگەی سەربازی و سیاسی، هیچ کات ماندووبوونمان بەخۆمانەوە نەدەبینی و بگرە سەرکردایەتییش هیچ پرس و ڕایەکی بە هێزی پێشمەرگەوە نەبووە سەبارەت بە جۆری دانوستانکردن لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا، وەک چۆن سکرتێری گشتیی یەکێتی؛ هەڤاڵ مام جەلال دەڵێت: من هیچ بڕوا و متمانەم بە سەددام حسێن نییە و ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بەزۆر دەمنێرن بۆ بەغداد و دانوستان!

بۆ ئەوەی زیاتر بچینە قووڵایی چۆنیەتیی دەستپێکردنی دانوستان (مفاوەزات) لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا، دەبینین تەواوی ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی پێکەوە بڕیاری دانوستانیان داوە، تەنها ئەوەی کە ناڕازی بووە؛ هەڤاڵ مام جەلال بووە، کە هەمووان دژی بڕیارەکەی بوون و زەختیان لێ کردووە. کەواتە مام جەلال هەستی بە ماندوویێتی و لاوازبوونی شۆڕش نەبووە، بەڵکوو ئەوانەی هانیان داوە بۆ دانوستان؛ ماندوو بوون و هەستیان بە لاوازی و نەبوونی سەرکەوتنی شۆڕش بووە. لە ئێستەشدا هەندێک لە سیاسەتمەداران لە کۆبوونەوەی ڕۆژنامەوانی و بۆچوونی خەباتی سیاسیدا دەڵێن: ئێمە لە وتە و بڕیار و ڕێبازەکەی مام دەرناچین، کە ڕۆژانیکیش بووە مام لەگەڵ ئەوەدا نەبووە دەست بخاتە نێو دەستی سەددام حسێنی دیکتاتۆر و هەر ئەمانیش بوون لە ڕابردووی خەباتی سیاسیی ڕۆژگارە سەختەکاندا پێداگرییان لە چوونی مام جەلال کردووە بۆ بەغداد و دانوستانکردن.

لەگەڵ بەردەوامیی تیروتوانجی کۆمەڵایەتی و ڕەخنەی سیاسیی «بەرەی جود»، ڕۆژانە چەندین وتاری ڕەخنەگرانە بڵاو دەکرانەوە و وێنەی نەوشیروان مستەفا لەگەڵ وەفدێکدا شانبەشانی عەلی حەسەن مەجید بەزەردەخەنەوە دەرکەوت و بووە مایەی تێبینیی زیاتری نووسینەکانی ئەم ساڵانەی دوای ڕاپەڕین، کە نەوشیروان مستەفا لە نووسینەکەیدا دەڵێت:

بۆ هەواڵپرسینی وەفدەکەمان و بێدەنگییان، دواتر بۆم دەرکەوت بە خۆشی خۆیاندا کەوتبوون، پرسیاریش ئەوەیە: ئایا سیاسەتمەدارێکی وەک مام جەلال دەبێت پێشوازییەکی ئەوتۆی لێ نەکرێت کە ڕۆژانە

بەرپرسانی ئەندامانی ڕژێمی بەعس میوانداریی نەکەن؟ یان سەرۆک خێڵ و عەشرەتەکانی عەرەب نەچنە میوانداریی؟ خۆ ئەگەر مام جەلالیش ئەوەی پێ ناخۆش بووبێت، بەلام دابونەریتی کولتووری گەلێکی وەک کورد، ڕێگە بە خۆدوورخستنەوەی چاوپێکەوتنێکی لەو جۆرە نادات. بۆ وەلامێکی ڕاستەقینەش، کاتێکیش نەوشیروان مستەفا خودی خۆی وەک ئەندامێک بەشداریی وەفدی دانوستانی کردووە، ئایا لە هۆتێلێکی ئاسایی میوانداری کراوە و چاوپێکەوتنی لەگەڵدا کراوە؟ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆ هەر مەبەستێک دانوستانی کردبێت، بێگومان بۆ بەرژەوەندیی گەلی کورد و بەرژەوەندیی حیزبەکەی بووە و بە هەمان شێوە حیزبی بەعسیش بۆ بەرژەوەندیی خۆی و لاوازکردنی شۆڕشەکانی گەلی کورد بووە، بەتایبەت ڕژێمی بەعسی عێراق لەو سەردەمەدا لە شەڕێکی سەختی خوێناوی بوو لەگەڵ بەناو جمهوری ئیسلامیی ئێراندا. بەلام بەداخەوە «بەرەی جود» کە پێک هاتبوون لە «پارتی دیموکراتی کوردستان» و حیزبی «سۆسیالیست» و حیزبی «شیوعیی عێراق»، هەمیشە لە هەوڵی تێکدانی شێوازی گفتوگۆ و بڵاوکردنەوەی وتاری پێچەوانەی ئاشتیخوازانە بەرامبەر بە یەکێتی و کار و چالاکی لە سنوورەکانی یەکێتی و دەستوەشاندن لە سەربازگە و کوشتنی سەربازی عێراقی، بۆ تێکدانی گفتوگۆی نێوان حکومەتی عێراقی و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

ئێمە وەک پێشمەرگەش لە نزیکەوە ئاگاداری ڕووداوەکانی دانوستان بووین، بەتایبەت هێزی پێشمەرگەی یەکێتی لە سنووری سلێمانی و ڕانیە و هەولێر و کۆیە و کەرکووک و گەرمیان بەتەنها بەرامبەر بە حیزبی بەعس دەجەنگی و لە مەیداندا خەباتی دەکرد، بەلام تەنها وەک سەربازێکی نێو هەندێک لەو گەمە سیاسییانە بووین، ڕاستە لە تەمەنێکی کەمدا پێشمەرگە بووم، بەلام درکم بە نەخشە و پلانی نەیارانی یەکێتی دەکرد و تێوەگلانمان لە شەڕی ئێران کە بەرژەوەندیی حیزبی بەعسی تیا بوو، نەدەبوو ئەوە بکەین، چونکە ئێمە لەگەڵ «بەرەی جود»دا ناکۆک بووین

و هەندێک لە سنوورەکانی هێزی پێشمەرگە بە دەست «بەرەی جود»ەوە بوو. پاشان جگە لەوەی سنووری سووریا و تورکیامان لێ داخرابوو، تەنها سنوورێکی ئازادکراوی تەسکمان بەدەستەوە مابوو، ئەویش زۆر جار لەژێر بۆردوومانکردنی فڕۆکە و ڕاجیمە و هێرشی سەربازیی حیزبی بەعسەوە بوو، نەدەبوو ڕێی ئێران لە خۆمان دابخەین و شەڕیان لەگەڵدا بکەین.

ئەمەی کە من دەینووسم، لەو کاتەدا ئاستی وشیاریی ڕامیاریم هێندە بەرز نەبوو تاوەکوو لە هەندێک فڕوفێڵ و تێوەگلان تێبگەم، بەڵام جگە لەوەی دەچێتە خانەی زانیارییەوە، وەک مێژووش باسیان لێوە دەکەم، بەتایبەت ڕووداوەکانی بزووتنەوەی کورد لە باشووری کوردستاندا هێندە زۆرن تەنانەت ناتوانرێت بە چەندین کتێب هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت، ناشتوانرێت وەک مێژوو پشت ببەسرێت بە گێڕانەوەی مێژوو لەلایەن هەندێک کەسانەوە، چونکە کەسانێک هەن لە ڕابردوودا لەگەڵ ڕێزمدا چەند مانگێک هاوشانی تێکۆشەرە نەبەردەکان خەباتیان کردووە و دەستی نووسینیان هەیە و بەبێ زانیاریی تەواو، بە پێنووسە کولەکانیان، پێش ئەوەی باس لە خەبات و گیانفیداکاران بکەن و شکست و هەڵە و کەموکوڕییەکانی سەرانی بەرپرسان بخەنە ڕوو، سەرەتا بە شانوباڵی هەندێک لە سەرکردەکان هەڵدەدەن کە زۆرترینیان بێئاگایی خۆیان لە تاوان و بەرژەوەندیی خۆیان دوورەپەرێز دەگرن، بەڵام کاتێک باس لە جوامێرییان بکرێت، ڕاستەوخۆ بەبێ شەرم و بە دوور لە ئەخلاقی سیاسی، یەکەم کەس پاڵەوانی هەموو ڕووداوەکانی نێو چیرۆکەکان دەبن. بە ئێستەشەوە زۆر جار بەرپرسێک دەردەکەوێت باس لە گێڕانەوەی مێژووی قوربانیدان و قارەمانێتیی نێو جەنگەکان دەکات، زۆر بەخێرایی چیرۆکی بزنەکەی سەر گوێسەبانەی تەویلەی ماڵە گوندنشینەکان و چیرۆکی تیتلە و بیبلەی سەردەمی منداڵیم بەبیر دێتەوە، کە دایە و داپیرەکان لە شەواندا بۆ خەولێخستنی منداڵەکانیان دەیانگێڕایەوە، لە دەمارەکانی مێشکمدا ڤایرۆسێک دروست دەکەن و چیتر هێندەی نامێنێت خوێن لە شادەمارەکانی جەستەمدا بوەستێت. کاتێک من

باس لە دانوستان دەکەم، هێندە گرنگ نییە بۆ نووسینەکەم ئاخۆ ڕێنمایی خوێنەر بکەم دانوستان بە چی واتایەک پێناسە و هەڵسەنگاندنی بۆ دەکرێت، چونکە مرۆڤی ئێستە و نەوەی ئێستە هێندە ئاستی هۆشیارییان بەرزە، زۆر بەخێرایی بە ڕابردووی مێژوودا دەچێتەوە و لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی لەسەر دەکات، کەواتە ناکرێت و نابێت ناڕاستگۆ بین بەرامبەر بە هاوڵاتییان و نەوەی نوێ[1].

هۆکاری دانوستانی «ی. ن. ک.» لە سەرەتای سەرهەڵدانەوەی شۆڕشی نوێی گەلەکەمانەوە لە ئەنجامی بڕوانەبوون و ڕانەهاتنی سەرانی سیاسیی ئەوسای حیزبە سیاسییەکان بە پێکەوەژیانی دیموکراتییانە و یەکتری قبووڵنەکردن و زاڵی گیانی تۆڵەسەندنەوەی عەشایەرییانە و دەستکەوتی تایبەتی و دەستی داگیرکەران... هتد، شانبەشانی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش، شەڕوشۆڕی ناوخۆش ئاوێتەی شۆڕشەکە بوو. بەلای کەمی دەبوو لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕی ناڕەوای عێراق و ئێران، شەڕوشۆڕە ناوخۆکان کۆتاییان پێ بهێنرایە، بۆ قۆستنەوەی ئەو هەلە لە خزمەتی پەرەپێدانی زیاتری شۆڕش و ڕاکێشانی سەرنج و سۆزی جەماوەر بەلای خۆیاندا، بۆ ئەوەی ببێتە جێی ئەمەل و ئومێدی خەڵک و لە سەرەنجامدا بارودۆخەکە بەلای بەهێزبوونی باسکی شۆڕش و شکستی دوژمن بشکابایەوە، کە تاکە ڕێگای ڕزگاریی جەماوەریش بوو لە دەستی زوڵم و دیکتاتۆریەت.

کەچی دەبینین پێچەوانەی جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە نیشتمانییە و دابینکردنی پێویستیی سەرکەوتنی شۆڕش کە خۆی لە یەکێتیی ڕیزەکانی گەلدا دەدۆزییەوە، شەڕوشۆڕە ناوخۆکان (کە مایەی بێزاریی خەڵک و هۆی گەشەنەکردنی شۆڕش بوون) ڕۆژبەڕۆژ زیاتر پەرەیان دەسەند، تاکوو لە سەرەتای هەشتاکان بەدواوە، هاوزەمان لەگەڵ پەرەسەندنی شەڕی ناڕەوای

---

[1]. یەکێتی و ململانێ، کاکل ئەحمەد، چاپی یەکەم، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١١، ل٦٥.

داگیرکەراندا، گەیشتە چلەپۆپەی یەکتری کوشتن و هەوڵی یەکتری قڕکردن.
لەوەش ناهەموارتر ئەوە بوو بۆ ئەوەی زەفەر بە یەکتری ببەن و بتوانن لایەکەی دیکەی بەرامبەریان باشتر ببەزێنن، هەوڵ دەدرا سوود لە توانای دوژمنەکانیش وەربگرن، یان بە واتایەکی دیکە: جاشایەتی و نۆکەرایەتیی دوژمنەکانیشیان لە ڕقی یەکتر قبووڵ دەکرد لەجیاتیی ئاشتەوایی و یەکگرتن، بێگومان ئەوەش دەبووە هۆی بەلاڕێدابردنی زیاتری ئامانجە بنەڕەتییەکانی شۆڕش، لە پێناو دەستکەوتی تایبەتی و تاکڕەویی حزبایەتی و خۆسەپاندنی دیکتاتۆرانە، باشترین قبووڵکردن و سوودوەرگرتن لە جاشایەتی و شانازیکردن بە تاوانەکانیانەوە. تەواوی خەڵکی کوردستان ئاگاداری ئەو شانازییەن کە مستەشاری «فەوجی خەفیفە» و ئامر مەفرەزەی خاسەی ئیستخباراتی ڕژێمی بەعس؛ «تەحسین شاوەیس» دەڵێت: «من هیچ پەشیمان نیم لەوەی کە مامە ڕیشەم کوشت و گۆڕبەگۆڕم کرد». تێکۆشەری دێرینی فەرماندە؛ نەجمەدین شوکر ناسراو بە «مامە ڕیشە»، فەرماندەی کەرتی چواری جەباری تیپی پەنجا و حەوتی سەرگرمە بوو، لە ساڵی ١٩٨٥/١/٢٤دا بە پلانی ئیستخباراتی عەسکەری لەگەڵ دوو پێشمەرگەدا بە ناوی سەردار حەمە شەریف و موحسین مەجید سوڵتا شەهید بوون. واتە ئەو جۆرە دانوستانە زۆرتر لە ئەنجامی قووڵبوونەوەی شەڕی ناڕەوای ناوخۆ بەناچاری بیری لێ کرایەوە، بۆ ئەوەی بەلای کەمی هەوڵ بدرێت یەکێ لە تەرەفەکانی شەڕکردن، لە ئەنجامی گەیشتن بە جۆرێک لە جۆرەکانی ڕێککەوتنی بێ تەرەف بکرێت. هێندە نەبوو دانوستانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەستی پێ کردبوو، ڕژێمی بەعس بە جۆرێک پێناسەی پێشمەرگەی لە ڕاگەیاندنەکانیەوە کردبوو، گوایە هەر کاتێک لە کاتی شەڕدا سەربازێکی عێراقی بەدیل بگیرێت، ئەوا بەبێ هیچ لێپرسینەوەیەک و هیچ پرنسیپێک، دڕندانە لووت و گوێی دەبڕین، «ئەمانە دڕندەن و بە شاخەکانەوە دەژین»! ئەوەش ببووە هۆی ترساندن و تۆقاندنی سەربازەکانی عێراقی و لە کاتی جەنگەکاندا زیاتر دەست بوەشێنن و تاکوو لە توانایاندا بێت بجەنگن

و خۆیان نەدەن بەدەستەوە. ڕژێمی بەعسی عێراق باشترین سوودی لە دانوستان وەرگرت و یەکێتیی نیشتمانییش گەورەترین هەڵەی مێژوویی سیاسیی کرد کە دانوستانی لەگەڵ ڕژێمدا کرد، چونکە هەمیشە سەددام حسێن و تەواوی دەستوپێوەندەکانی، میللەتی کوردی بە میوان دەزانی لەسەر خاکی کوردستان و هیچ کاتێکیش بە چاوی هاوڵاتی نەیدەڕوانییە گەلی کورد، پاشان زۆر کات حیزب ستراتیجێتیی نەبووە و جگە لە هەڵپەی خێرای، نەیزانیوە داوای چی دەکات، چونکە حیزب دەیویست بە بیرکردنەوە و ئەقڵیەتی خۆی، ڕژێمێکی دیکتاتۆری خاوەن سەدان قەسابخانە و زیندانی لەسێدارەدان بکاتە دیموکراسی و داوای مافی چارەنووسی گەلی کوردی لێ بکات[1].

لەگەڵ ئەوەی بەعس نەک دوژمنی یەکێتی بوو، دوژمنی تەواوی حیزب و شۆڕشەکانی کورد بوو. پاشان بۆ ناشرینکردنی یەکێتی لە کاتی دانوستاندا، چەند ئۆتۆمبێلێک و چەندین جۆری چەکی کلاشینکۆف و دەمانچەی بەدیاری دەنارده سەرکردایەتیی یەکێتی و ئەوەش دەبووە هۆی زویربوون و نارەزایی دەربڕینی ڕێکخستەناکانی ناوشار و دەرەوەی وڵات و دڵی هاوڵاتییانی دەڕەنجاند، ڕۆژانەش خەڵکی بەگشتی لە دڵەڕاوکێ و ساردبوونەوەدا بوون.

---

١. یەکێتی و ململانێ، کاکل ئەحمەد، چاپی یەکەم، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١١، ل٦٥.

## نەوشیروان مستەفا:
## ئێمە نەماننناردووە بەدوای کەسدا تاکوو ببێت بە پێشمەرگە

ناتوانم بڵێم یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەرنامەی نەبووە لە کاتی گفتوگۆدا، بەڵام کاتێک «پەکەکە» لەگەڵ تورکیادا بڕیاری شەڕڕاگرتنی دەدا و چالاکیی نەدەکرد، ڕێی بە گەریلاکانی خۆی نەدەدا بچنەوە نێو شارەکان، بەڵام یەکێتی خاوەنی بەرنامەیەکی تۆکمە و دەرکردنی بڕیارەکانی نەبوو، وەک پێشووتر باسم لێوە کردووە، ڕژێمی بەعس ڕۆژانە چەندین پێشمەرگەی شەهید دەکرد و پێشمەرگەش بە چەکەوە بەناو شارەکاندا دەسووڕانەوە و تووشی هەڵە و کەموکوڕی دەبوون، هۆکاری سەرەکییش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خودی بەرپرسەکان تاوانبار بوون و پێشمەرگەش چاویان لەوان دەکرد و دەچوونەوە ناو شارەکان. زۆر بەرپرس هەبوو وای لێ هاتبوو خۆی و تەواوی هێزەکەی دەبردەوە ناوشار و سەرقاڵی میوان و میوانداری دەبوون. هەندێک پێشمەرگە گرەویان لەسەر دەمانچەی لاقەدی کوشتنی «نائب ضابط»ی سەرباز و پۆلیسەکان دەکرد، دەیانکوشتن و دەمانچەکانیان دەفرۆشتن، کە زۆریان کورد بوون و کەسوکاری پێشمەرگە بوون و هەندێکیشیان سەر بە ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشار بوون. هەندێک پێشمەرگەش تووشی هەڵەی گەورە دەبوون و زۆر جاریش دەبووە هۆی تەقەکردن لەنێو شارەکاندا. ئەم جۆرە کارانەش پێشووتر ڕەفتاری پێشمەرگە نەبوون و ئەو خەڵکەی شەوانی ساردی زستان و بەر بەفر و باران هاوکاریی پێشمەرگەیان دەکرد و ئاواتەخواز بوون ڕۆژێک لە ڕۆژان پێشمەرگە بە ڕۆژی ڕووناک ببینن، وایان لێ هاتبوو بە ناوی پێشمەرگە نائومێدییان پێوە دیار دەبوو. پێشمەرگە هەبوون ژیانی هاوسەریی پێک دەهێنا، بە تاقم و تفەنگ و هێزی کەرتەکەی؛ شایی و ڕەشبەڵەکی دەکرد و تەنانەت مانگی هەنگوینیی لە شاردا دەکرد. ئاخر زۆر زەحمەتە پێشمەرگەیەک لە شاخ بە

پوورزەوانە و پێڵاوی لاستیکەوە و دواتر بە چەکەکەی شانیەوە بۆ پێڵاوی چەرمی گلاسییەوە لەنێو جەماوەردا دەربکەوێت و شەوانیش بە بیجامەوە لەماڵەوە بنووێت، ئەوەش ببووە هۆکاری شەهیدکردن و دەستگیرکردنی زۆرینەیان. گەر بەوردی سەرنج بدەینە تاوانەکانی جۆری شەهیدکردنی پێشمەرگەکان لە کاتی دانوستاندا، دەبینین خوێندنەوەی وردودرشتی دەوێت و شۆڕش ببووە دوژمنی جاشەکان نەک دوژمنی ڕژێمی بەعس. ئەوانەی کە شەهید دەبوون، زیاتر بە دەستی جاشەکان شەهید دەبوون و لە خانەی تۆڵەسەندنەوەدا بوون. ئەو جاشانەش زیاتر دۆست و لایەنگرانی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون، دەستوەشادن و شەڕەکانیش زیاترینیان لە دووڕیانی تاسلوجە و سلێمانی بوون و ملازم سەیید کەریم و هاوەڵەکانی و چەندین پێشمەرگەی یەکێتی لەو دووڕیانەدا کەوتنە بۆسەی جاشەکانەوە و شەهید کران.

نامەیەکی زۆری نارەزایی ڕێکخستنەکان و کۆبوونەوەی نهێنی ڕووبەڕووی سەرکردایەتی دەبووەوە و لەو کاتەشدا نەوشیروان مستەفا لەدوای هەڤاڵ مام جەلال بەرپرسی دووەمی یەکێتی و سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەران بوو، بەفەرمی ڕایگەیاند ئێمە هیچ بەرپرسیارێتییەک ناگرینە ئەستۆی خۆمان و بەزۆریش نەماناردووە بەدوای کەسدا ببێت بە پێشمەرگە. ئەو وتەیەی نەوشیروان مستەفا بووە وێردی سەر زاری ڕۆژانەی پێشمەرگەکان و ڕۆژبەڕۆژ کاردانەوەی خراپی لێ دەکەوتەوە، تا وای لێ هات نەوشیروان مستەفا کەوتە کۆکردنەوەی هێزی پێشمەرگەی کەرت و تیپەکان و شێوازی وتارەکەی بە جۆرێک باس کرد دواتر هێزی پێشمەرگە پشوویەکیان بە دەرووندا هات و ئەهوەن بوونەوە.

## لیژنەی تەنسیقی یەکێتی و بەعس لە شارەکاندا

بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرک و کارەکانی حیزب و هێزی پێشمەرگە و بەتایبەت چارەسەرکردنی نەخۆش و بریندارەکان، لەنێو ڕژێمی بەعس و یەکێتیدا «لیژنەی تەنسیق» پێک هێنرا و ئاوات عەبدولغەفوور بووە «لیژنەی تەنسیق» لە سلێمانی و مەفرەزەیەک پێک هێنرا بۆ لێپرسینەوە و لێکۆڵینەوە و ڕێگرتن لەو پێشمەرگانەی بەبێ ئاگاداری بەرپرسەکانیان دەچنەوە ناو شارەکان. وەهاب بۆ ئەو مەبەستە دەستنیشان کرا، بەڵام هێشتا مەفرەزەکەی وەهاب نەیدەتوانی ڕێ لە هاتوچۆکردنی هەندێک پێشمەرگە بگرێت کە سەربەخۆ دەهاتنەوە نێو شار و تەنانەت تووشی کێشە دەبوون. ڕژێمی بەعس تەواو کۆنترۆڵی خۆی کردبوو و هەموو تاوانەکانی بە چەکدارە کوردەکانی خۆی دەکرد، واتە شەڕی خۆی بە کورد لە دژی کورد دەکرد. ڕۆژانە ئەندامەکانی نێو ڕێکخستنەکانی دەستگیر دەکرد و لە کاتی گفتوگۆکردنیشدا بڕیاری بەسەربازبوونی هاوڵاتییانی دەدا و داوای دەکرد ئەو کەسانەی لە تەمەنی سەربازیدان، دەبێت ببنە سەرباز و لەنێو شارەکاندا دەیان مەفرەزەی بڵاو دەکردەوە و ئەو هاوڵاتییانەی نەچووبوون بۆ سەربازی؛ دەستگیری دەکردن و زیندانەکانی پڕ بوون لە پێشمەرگە و ئەندامانی ڕێکخستن و سەربازی هەڵاتوو. لەگەڵ ئەوەشدا گفتوگۆ لەئارادا بوو و ئاوات عەبدولغەفوور لە سلێمانی بەرپرسی «لیژنەی تەنسیق» بوو و وەهابیش مەفرەزەکەی لە سلێمانیدا بوو، بەبەر چاوی خەڵک و لیژنەی تەنسیق و وەهابەوە، زیندانەکان ڕۆژانە بە پێشمەرگە و دۆست و لایەنگرانی شۆڕش و سەربازی هەڵاتوو پڕ دەکران، لە هەمان کاتیشدا وەفدی دانوستان کە وەک ئاماژەم بە ناوەکانیان دابوو کە ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی بوون، لە هاتوچۆکردندا بوون و لە بەغداد لەگەڵ سەرانی بەعسدا وتووێژیان دەکرد، ناشرینترین و قێزەوەنترین ڕەفتاری بەعس لەوەدا بوو لە کاتی گفتوگۆدا ڕەشبگیریی دەکرد و دەبووە هۆی ناشرینبوونی یەکێتی

و ساردبوونەوەی سۆز و خۆشەویستیی هاولاتییان. جگە لەوەی ڕژێمی بەعس لەنێو شار و شارۆچکەکان پێشمەرگەی تیرۆر دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا مەفرەزە تایبەتەکانی خۆی دەناردە گوندەکانی سنووری ئازادکراوی هێزی پێشمەرگە و سەربازی هەلاتووی دەستگیر دەکرد. ئێمە وەک کەرتی پێنجی شەهید هاوڕێ جەبار، تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون، لە قەیوانەوە بۆ دۆڵەڕووت بە تراکتۆرێک بەڕێ کەوتین، لە کەڵکی قەیوان کە لەدامێنی زنجیرەچیای قوتەی دوو برا کە بەسەر گوندی خەمزەدا دەڕوانێت و لەگەڵ چیای ئەزمڕدا یەک دەگرنەوە و ڕێیەکی سەختی بەردەلانی بوو، لە دیوی دۆڵەڕووتەوە بەو ڕێیە سەختەدا سەر دەکەوتیت کە پێی دەوترا کەڵکی قەیوان و شۆڕ دەبوویتەوە بە دیوی ئەودیودا دەچوویتە گۆندی قەیوان، من و تۆفیق ناوسراو بە «هونەر»؛ فەرماندەی مەفرەزەکەمان بوو، دواتر لە ڕێی ناوتاقان شەهید بوو، لەگەڵ ئازاد کەرکووکی ئێستە لە ژیاندا ماوە؛ لە پێشەوەی تراکتۆرەکە دانیشتبووین و لەسەر شاخەکە تایەیەکی ڕاستی تراکتۆرەکە دەرچوو، ئەوانەی لە پێشەوە دانیشتبووین، خۆمان هەڵدایە خوارەوە و تراکتۆرەکە لەسەر شاخەکەوە بە عەرەبانەکەی پشتیەوە کە پڕ بوو لە پێشمەرگە، تل بووەوە و کەوتە خوارەوە، یانزە پێشمەرگەمان بریندار بوون.

ئەو پێشمەرگانەی کە بریندار بوون و ناوەکانیانم لەیاد ماوە: ئەردەلانی ئیسماعیل عارف، لوقمانی سدیق سوارە، عەبدوڵلای سدیق سوارە؛ دواتر لە سلێمانی دەستگیر کرا و لەسێدارە درا، مام کاوە، دڵشاد پوورزای لوقمانی سدیق سوارە، هەندێک پێشمەرگەی تر ناویانم لەیاد نەماوە، ئەم بریندارانە ڕەوانەی نەخۆشخانەی سلێمانی کران، منیش شەوانە لەگەڵ سێ پێشمەرگەی تردا چاودێریمان دەکردن نەبا تووشی کێشە و گرفت بن. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا لیژنەی تەنسیق و مەفرەزەکەی وەهاب ئاگادار بوون بەوەی تووشی ئەو کارەساتە بووین و زۆر جاریش وەهاب سەردانی دەکردین، شەوێک لەپڕ چەند چەکدارێکی ڕژێم هاتنە لام و داوای ئەوەیان

کرد که دەیانەوێت شەو لەگەڵماندا بمێننەوە و مەبەستیان خراپ بوو، بەڵام من بە زووترین کات هەواڵم بۆ فەرماندەی کەرتەکەمان؛ عومەر حەسەن ناسراو بە «عومەر عەرەب» نارد و ئەویش بەخێرایی داوای گواستنەوەی بریندارەکانی کرد و بریندارەکانمان بەرەو نەخۆشخانەی سووورداش برد.

بۆ سبەی فەرماندەی کەرتەکەمان عومەر حەسەن (عومەر عەرەب) و سەلاحی حاجی عەلی ناسراو بە «سەلاح چاوزەق» جێگری فەرماندەی کەرتەکەمان، هەرسێکمان گەڕاینەوە بۆ سلێمانی بۆ هەندێک کاری تایبەت، لە نیوەڕۆخوانێکدا لە ماڵی مستەفا حەسەن ناسراو بە «مچە سوور» لە گەڕەکی مەجید بەگ کە ئەندامی «ئیختیالاتی» ناوشار و ڕێکخستنە نهێنییەکان بوو، پێش نانخواردن بە نیوکاتژمێر هەواڵی شەهیدبوونی پێشمەرگەیەکی کەرتەکەمان؛ «بەکری حاجی فارس»مان پێ گەیشت کە بەفەرمی لەلایەن ئاوات عەبدولغەفوور لیژنەی تەنسیق نێردرابوو کە لە نەخۆشخانەی سلێمانی چارەسەر بکرێت، لە ڕاستیدا کاریگەریی کردە سەر هەمووان و هەرسێکمان دەستمان کرد بە گریان و بڕیارمان دا دەبێت لە هەمان کات و ساتدا تۆڵەی ئەو تێکۆشەرە قارەمانە بکەینەوە. دواتر باسی جۆری شەهیدکردنی دەکەم. فەرماندەی کەرتەکەمان داوای لە خاوەن ماڵەکە کرد و وتی: «نەبێتە ئەرک نانەکەمان بۆ دانێن، بەڵام تکایە لای مەبەن!» ئەوانیش سفرەیان ڕاخست و نانی نیوەڕۆیان بۆ ئامادە کردین و پێمان ڕاگەیاندن یەک کاتژمێری تر دێینەوە، با ئەو خواردنە لە شوێنی خۆی بێت. هەرسێکمان لە ماڵ بەدەر کەوتین و بەرەو منەزەمەی جەیشی شەعبیی «شەهید عوسمان» لەلایەن خەڵکییەوە بە تۆپیو عوسمان ناو دەبرا، لەسەر شەقامی تووی مەلیک و فلکەی سجن بەڕێ کەوتین، لەبەردەم منەزەمەکەی جەیشی شەعبیی «شەهید عوسمان» سێ چەکداری بە ڕەگەز عەرەبی سەر بە ڕژێم؛ پاسەوانیی بارەگاکەیان دەکرد و لەگەڵ چووینە بەردەمیان و بەبێ هیچ پرسیارێک دەستپێشخەری گوللەمان لێ کردن و لەبریی ئەو تاوانەی دەرهەق بە تێکۆشەری دێرینی کەرتەکەمان شەهید «بەکری

حاجی فارس» کرابوو، بە سزای شۆڕشمان گەیاند و چەکەکانیانمان هێنا و گەڕاینەوە بۆ ماڵەکە و خواردنەکە سارد ببووەوە، دواتر فەرماندەی کەرتەکەمان داوی لێبوردنی کرد کە وتبووی ئەو خواردنە ناخۆین تاکوو تۆڵەی شەهیدبوونی بەکری حاجی فارس نەکەینەوە، تەنها لەبەر ڕێزی ماڵەکە یەکی پەرداخێک ئاومان خواردەوە و بەخەمناکی ماڵئاواییمان لە خانەخوێ کرد. بە ئێستەشەوە خۆم بە هەڵە نازانم کە تۆڵەی شەهید بەکری حاجی فارسمان کردووەتەوە، چونکە ئێمە بە کاری تایبەتی کەرت و شۆڕش و سەرقاڵی هەندێک لە بریندارەکانمان بووین، بەڵام چەکدارەکانی ڕژێم فرسەتیان لە پێشمەرگەکانمان دەهێنا و شەهیدیان دەکردن.

## دەرکەوتنی مام جەلال لە ئاهەنگی نەورۆز لە سووورداش

گفتوگۆی نێوان یەکێتی و بەعس بەردەوامە و وەفدی مەکتەبی سیاسی بەردەوام لە گفتوگۆدان و کێشە و ململانێی حیزبەکانی تر و شەڕی پێشمەرگە و چەکدارەکانی ڕژێم ڕۆژانە لە پەرەسەندندا بوون، بۆ ئەوەی یەکێتی بە خەڵکی کوردستان بەگشتی ڕابگەیەنێت بەوەی گفتوگۆی نێوان یەکێتی و بەعس لە بەرژەوەندیی میللەت و ماف و داخوازییەکانیەتی. لە ئاهەنگی نەورۆزدا لە سورداش، بە ئامادەبوونی هەزاران کەس و تەواوی بەرپرس و زۆرترین هێزی پێشمەرگە، مام جەلال تازە لە بەغداد گەڕابووەوە و وتارێکی مێژوویی ئاڕاستەی جەماوەر کرد. پێشتر کەرتی ئێمە لە سنووری پیرەمەگروون بووین و ئاگاداریان کردین بەوەی ئاهەنگێکی زۆر گەورە لە سووورداش بە بۆنەی ساڵیادی نەورۆزەوە ساز دەکرێت، نزیکەی ٣٥ پێشمەرگە دەبووین؛ بۆ پاراستن و سەلامەتیی خەڵکی لەسەر شەقامی سەرەکیی سلێمانی و سووورداش لە گوندی سوسێ ئامادە بووین و لە هەموو خولەکێکدا بە دەیان ئۆتۆمبێل و سەدان هاوڵاتی بەرەو سووورداش بەڕێ دەکەوتن. ئۆتۆمبێلێکی سەربازیی پشت بەتاڵ دۆشکەیەکی بە سەرەوە بوو و چەند ئۆتۆمبێلێکی جام

ڕەش هەندێک ئەفسەری تیا بوو، ئێمە ڕێگەمان نەدان بەرەو سووورداش بڕۆن، بەڵام دوای پەیوەندیکردنمان بە لێپرسراوەکانمان؛ ئاگاداریان کردین ڕێیان بدەین. پاش چەند کاتژمێرێک، تەواوی هێزی کەرتەکەمان بەرەو سووورداش بەڕێ کەوتین و مام جەلال لەنێو ئاپۆرەی جەماوەردا بەدەر کەوت و وتاری سەبارەت بە مێژووی گەلی کورد ئاڕاستەی جەماوەر دەکرد. هەر لەو ئاهەنگەدا لە خودی نەوشیروان مستەفاوە تا دەگاتە تەواوی بەرپرسانی یەکێتی؛ لەوێ ئامادە بوون و خەڵکیش بە چاوپێکەوتنیان خۆشحاڵ دەبوون، لەپڕ هاژەهاژێکی یەکجار زۆر و خەڵکێکی زۆر بەدوی یەکدا دەکەوتن و ئێمەش نەماندەزانی چییە و چی ڕووی داوە، پاش چەند خولەکێک زۆربەی زۆری خەڵکی هەموو تێکڕا و بەگشتی هاواریان دەکرد: «بە هێزی مامە ڕیشە، جاش دەکەین بە شیشا! بە هێزی ڕیشە، هەر چی جاشە گدیشە!»

خەڵکی کوردستان مامە ڕیشەیان یەکجار خۆش دەویست و ناو و ناوبانگێکی یەکجار زۆری پەیدا کردبوو، تەنانەت لەنێو سەربازە عێراقییەکانیش بە «الرجل الحديدي» ناسرابوو. من بە هەموو ژیانم ئاهەنگی لەو جۆرە پڕ حەشامەتەم نەبینیبوو، پێشمەرگە لە هەموو شوێنێکەوە بانگ دەکرا و هەموو جۆرە خواردەمەنییەک و شیرینییەکی پێشکەش دەکرا. من و پێشمەرگەیەک پێکەوە چاودێریمان دەکرد، سێ کیژۆڵە ڕووبەڕوومان بوونەوە و پاش ئەوەی خۆیان پێ ناساندین خەڵکی کەرکووکن، من لەو کاتەدا جگەرەم دەکێشا، یەکێکیان وتی: زۆر خۆشحاڵین کە پێشمەرگەمان لە نزیکەوە بینی و قسەتان لەگەڵدا دەکەین، زەحمەت نەبێت جگەرەیەکم دەدەیتێ؟ منیش پێم ڕاگەیاند بەوەی ئایا جگەرەکێشیت؟ وتی: نەخێر، هەر حەز دەکەم شتێکی پێشمەرگەم وەک دیارییەک لا بێت و هەڵیدەگرم و دەڵێم ئەوە دیاریی پێشمەرگەیە، چونکە ئێوە جگە لەو چەکەی بە شانتانەوەیە، هیچی ترتان پێ نییە تاوەکوو داواتان لێ بکەم بمدەنێ و دڵنیاش بە ئەو جگەرەیە بەدیاری هەڵدەگرم... خەڵکی کوردستان تامەزرۆی بیستنی هەواڵی خۆش و کۆتاییهێنان بە شەڕ و کوردیش وەک هەموو گەلانی تری جیهان

سەربەست و ئازاد بێت، بەداخەوە چەکدارە تێکدەرەکانی ڕژێم خەریکی بۆسەنانەوە و شەهیدکردنی پێشمەرگە و تێکدانی دانوستانی نێوان یەکێتی و حکومەت بوون، هەواڵێکی ناخۆشی زۆر جەرگبڕمان پێ گەیشت کە ملازم سەیید کەریم کەوتۆتە بۆسەی چەکدارەکانی ڕژێم و لەگەڵ دوو پێشمەرگەدا شەهیدیان کردووە. کاتێک سەیید کەریم دەوێت لە سلێمانییەوە بگەڕێتەوە بۆ سووررداش، پێش چەند کاتژمێرێک لە تاسلۆجە چەند پێشمەرگەیەک لەگەڵ جاشەکانی تاسلۆجە دووچاری شەڕ ببوون و لەنێو ئۆتۆمبیلێکدا هەموو جاشەکانیان کوشتبوون و ئۆتۆمبیلەکەشیان گڕی گرتبوو و هەر هەموویان سوتابوون[1]، سەیید کەریمیش لەگەڵ دوو پێشمەرگەی تر؛ نەهرۆ عەبدوڵلا سەلیم و سەلاح خۆشناو، ڕۆژی ١٥ی ئەیلوولی ١٩٨٤ بە ئۆتۆمبێل لە سلێمانییەوە گەڕابووەوە سووررداش، ئاگای لەوە نابێت لەو نزیکانە هەندێک جاش کوژراون، لە شوێنی ڕووداوەکەدا چەکدارەکانی تاسلۆجە بۆ تۆڵەسەندنەوە بۆسەیەک دادەنێن و سەیید کەریم و نەهرۆ عەبدوڵلا سەلیم و سەلاح خۆشناو دەکەونە بۆسەکەو شەهیدیان دەکەن. سەیید کەریم خەڵکی هەودیان بوو، بە ناوی باوکیەوە ناو نرابوو، چونکە ئەم هێشتا لە سکی دایکیدا بووە کە باوکی مردووە. دوای ڕێککەوتنی ئازار چووبووە «الكلية العسكرية» و ببوو بە ئەفسەر و لە ساڵی١٩٧٤دا چووبووە ڕیزی شۆڕشەوە. لە هێزی سەفیندا ببووە فەرماندەی بەتالیۆن لە شۆڕشی نوێی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا. هەروەها پێشمەرگەی سەرەتایی بووە و چەندین لێپرسراوێتیی بەرزی وەرگرتووە. بەم شێوەیە پتر لە ساڵێکی خایاند، تاوەکوو گەیشتە ڕادەی ئەوەی کە تەواوی ئەندامانی ڕێکخستن و هێزی پێشمەرگە و خەڵکی کوردستان ناڕازی بوون و لەو گەمە سیاسییەی ڕژێمی بەعس دەیکرد، تێگەیشتبوون و نائومێدی بە خەڵکی کوردستانەوە دیار بوو.

---

١. خولانەوە لەناو بازنەدا، نەوشیروان مستەفا، چاپی دووەم، چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاوەدانیی کوردستان، ١٩٩٩، ل٧٩.

## کۆتاییهێنان بە گفتوگۆ و بڕیاری شەڕکردن

ڕۆژی ٢٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٥، تێکۆشەری دێرینی فەرماندە؛ مامە ڕیشە و هاوەڵەکانی بە دەستی چەند چەکدارێکی بەعس بە پلانی «ئیستخباراتی عەسکەری» لەلایەن تەحسین شاوەیس شەهید دەکرێن. تەحسین شاوەیس سەرۆکجاش و بەرپرسی مەفرەزە خاسە و دۆست و لایەنگری پارتی دیموکراتی کوردستانە و دەستی سوورە بە شەهیدکردنی دەیان پێشمەرگە و هاوڵاتیی سڤیل. پاش ئەوەی دەیەوێت بە مەبەستی دەستهەڵگرتن لە تاوان؛ گورزێکی گەورە لە ڕژێمی بەعس بوەشێنێت و بێتە بەرەی گەلەوە، دانوستان لەگەڵ مامە ڕیشە دەکات تاوەکوو بڕوا و متمانەی زیاتری پێ ببەخشێت. چەندین وەفدی عەشایەری پەیوەندی لەگەڵ مامە ڕیشەدا دەکەن و ڕژێمی بەعسیش هاوکار و یارمەتیدەری تەحسین شاوەیس بوو، تاوەکوو ئەوەی گەیشتە ئەو ڕادەیەی ئیتر بگەنە ئەنجامی کۆتایی و چاوپێکەوتن. تەحسین شاوەیس بە پلانی ئیستخباراتی عەسکەری، مامە ڕیشە لەگەڵ هەردوو تێکۆشەری دێرین؛ سەردار حەمە شەریف و موحسین مەجید سەلیم شەهید دەکەن. دوای شەهیدکردنی مامە ڕیشە و هاوەڵەکانی، پێشمەرگە هیچ پرنسیپێکیان نەما و ڕێکخستنەکانی ناوشار بەنهێنی لە تۆڵەی مامە ڕیشە؛ کەوتنەوە چالاکی و هێزی پێشمەرگەی کەرت و تیپەکان سەربەخۆ کەوتنەوە چالاکی و هەریەکە لە سنووری خۆیاندا لە تۆڵەی مامە ڕیشە و ئەو پێشمەرگانەی دووچاری زیندانی و شەهید کرابوون، دەستیان لە دوژمن دەوەشاند، کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی هیچ ئیلتیزاماتێک نەما و یەکێتیی نیشتمانی بەیاننامەیەکی دەرکرد و بڕیاری شەڕی ڕاگەیاند.

لەو کاتەدا ئێمە لە گوندی گاپیلۆن بووین، «سەربەستی جیهاز» بە جفرە هەواڵی سەرکردایەتی و مەڵبەند و تیپەکانی پێ دەگەیشت و ئەویش سەرووی

خۆی ئاگادار دەکردەوە. بڕیاری گرتنی ڕەبییەکانی و بارەگاکانی زنجیرە چیاکانی دابان، هەلاج درا و تەواوی هێزی پێشمەرگە لە دەستپێکردنەوەی شەڕ ئاگادار کرانەوە[1]. گرتنی زنجیرەچیای دابان، هەلاج، قەرەتیکە؛ بەگوێرەی پلانی ڕێکوپێک ئەنجام درا. مەکتەبی عەسکەریی یەکێتی ئەرکی ئەو شەڕەی گرتە ئەستۆی خۆی. پێشمەرگەکانی مەڵبەندی یەک کە بریتی بوون لە تیپەکانی ٥١ی گەرمیان و ٥٣ی شێروانە، ٥٥ی قەرەداغ، ٥٧ی سەرگرمە، ١٥ی هەورامان و ١١ی شارەزوور، بە فەرمانی هەڤاڵ جەبار فەرمان؛ لێپرسراوی مەڵبەند بەشێک لە پاککردنەوەی ئەو زنجیرەشاخەیان پێ سپێردرا. مەڵبەندی دوو بریتی بوو لە تیپی ٢١ی کەرکووک، تیپی ٢٥ی خاڵخالان، تیپی ٣٧ی شارباژێڕ، تیپی ٣٣ی سلێمانی، تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون؛ بەشێکی تری ئەو شاخەیان پێ سپێردرا. هەموو هێزەکان لەلایەن هەڤاڵ ملازم عومەر عەبدوڵڵا؛ لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری سەرپەرشتی دەکرا. تیپی ٩٣ی کۆیە سەر بە مەڵبەندی چوار، بە فەرماندەی هەڤاڵ ڕەهبەر سەیید ئیبراهیم، گرتنی جادەی گشتیی چوارقوڕنە سلێمانیی پێ سپێردرا، بۆ ئەوەی لە کاتی دەستپێکردنی شەڕ، هێزەکانی فیرقەی ٢٤ کە بارەگاکەیان لە چوارقوڕنە بوو، نەتوانن بەئاسانی بەهانای شەڕ بێن. ئەو نەخشە و پلانەی سەرکردایەتی بەوردی جێبەجێ کرا، لە ١٩٨٥/٢/١٤دا هێزەکان لە هەموو لایەکەوە پەلاماریان دەست پێ کرد، هەر زوو چەکدارەکانی ڕژێمیان شکاند و ئەو شوێنانە ئازاد کران پاش ئەوەی دوژمن بە دەیان کەسی لێ کوژرا و زیاتر لە ٩٠ جەیشی شەعبی بەدیل گیران. ئەو ڕۆژە زۆر زۆر سارد بوو، بەفرێکی یەکجار زۆر باریبوو، ڕێگا بەستبووی، کاتێک پێشمەرگە بە چیای دابان-هەلاج سەر دەکەوت؛ زۆربەیان هەڵدەخلیسکان. شەهیدکردنی ئەو تێکۆشەرانەی لە ئەنجامی گفتوگۆدا شەهید کرابوون، کاریگەریی زۆر

---

[1]. قەندیل بەغدای هەژاند، شەهید ڕێباز، بەشی یەکەم و دووەم، چاپخانەی پەیوەند، ٢٠٠٨، ل٣١٥.

ناخۆشی کردبووه سەر هێزی پێشمەرگە و زۆر بەتوورەییەوە لە هەوڵی گرتنی ئەو زنجیرەچیایەدا بوون کە بنکە و بارەگا و ڕەبییەکانی ڕژێمی پێوە بوو، بەتایبەت گرتنی «مقەڕ فەوج»ی شەدەڵە و هەموو ئەو ڕەبییانەی لە شەدەڵەدا بوون. زۆر بەداخەوە بۆ ئەو کەسانەی لە کاتی «مفاوەزاتدا» دەهاتن و دەبوون بە پێشمەرگە و زۆریان کە زانییان شەڕ دەست پێ دەکاتەوە، چەکەکانیان لە گوندەکاندا بەجێ دەهێشت و دەڕۆشتنەوە، تەنانەت پیشەی هەندێکیان بە چەکەوە وێنەگرتن بوو، کە ئێستە زۆریان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بە ناوی پێشمەرگەی دێرینەوە ئەو وێنانە بڵاو دەکەنەوە و مێژوو دەشێوێنن و هەریەک بەپێی خۆی باس لە گێڕانەوەی مێژوو دەکات کە تەنها لە کاتی گفتوگۆدا پێشمەرگە بوون و دوای کۆتاییهێنان بە گفتوگۆ و دەستپێکردنەوەی شەڕ، تاقم و تفەنگەکانیان فڕێ دەدا و کەسیش نەیدەبینینەوە، زۆر بەداخیشەوە بۆ ئەو تێکۆشەرە نەبەردانەی لە گفتوگۆدا ژیانیان بەخشی و شەهید بوون و ئەو ڕێکخستنانەی ناوشار هەندێکیان دەستنیشان کران و دەستگیر کران و لەسێدارە دران.

## بمکوژن، بەڵام بەجێم مەهێڵن!

زەمەنێک هەموومان ئاسۆیەک لە بەردەمماندا بوو، ڕووناکییەک بوو بۆ ڕزگاریی گەلی کورد لە ستەم و چەوساندنەوە، بۆ ئازادی و بەختەوەری و بەدەستهێنانی خۆشییەکانی ژیان بە سەربەرزی و کەرامەتەوە، هەموو ئەمانە هانی دەداین بەدوای ژیانی شایستەدا بگەڕێین، بەدوای چەمسەرەکانی کوانووی بەرهەمهێنانی ئەو جیهانەدا دەگەڕاین، ئەویش شۆڕش و مەدرەسەکەی کە پێشمەرگایەتی بوو، چالاکیی گورزوەشاندن بوو، ڕزگاریی بست بە بستی خاکی کوردستان بوو، گورزی کاریگەر و وەڵامدانەوەی ئازایانەی دژ بە زاڵبوون بەسەر ئاسمان و ئاووهەوای کوردستاندا بوو. پیاوان و ژنانی ئەو بوارە زۆر کەم بوون، بەڵام جار جارە

بالانسی هێزیان بەو کەمییەش یەکسان دەکردەوە و دوژمنیان دەتاساند.

دەبێت ئەوە بڵێین: هەر چەندە لە چیاکان گورز و بەرەنگاری زۆر بوون، بەڵام گورزەکانی شار و شارۆچکەکان؛ دوژمنی پتر تووشی سەرلێوەشایی و ترس و تۆقاندن دەکرد، ئەم ستایلە لە گیانی بەرەنگاریی سەرکردایەتیی شۆڕشی نوێ هەستی پێ کرد و هەر زوو تواناکانی خۆیان خستە گەڕ و نەک شەقامەکان، بەڵکوو دەبێت هەموو کووچە و کۆڵانەکان و هەر جێگایەک دوژمن تیایدا پشووی بدایە، لەوێدا هەڵمەت و دەنگی تفەنگەکان زیاتر و زیاتر بکرێت. لەلایەن بەرپرسی ڕێکخستنی کەرتەکەمانەوە کە ئیلتیزامی بە ڕابەرسیاسی و تیپ و نەوشیروان مستەفاوە هەبوو، تۆفیق ناسراو بە «هونەر» بە نامەیەکی فەرمیی هەریەک لە فەرماندەی کەرتەکەمان؛ عومەر حەسەن ناسراو بە «عومەر عەرەب» و بەندە؛ شەهاب کەریم و جێگری کەرتەکەمان؛ سەلاحی حاجی عەلی ناسراو بە «سەلاح چاوزەق»، لەلایەن سکرتێری گشتیی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان؛ نەوشیروان مستەفا بانگ کراین.

ڕۆژی دواتر هەرسێکمان لە گوندی باڵخ کە نزیکی ناحیەی کارێزەیە و لەدوای کارێزەی کۆن، یەکەم گوندە کە هەمیشە لە کاتی شەڕەکاندا دووچاری زۆرترین کارەسات دەبوو و هەمیشە لەلایەن ڕژێمەوە تۆپباران دەکرا و خەڵکێکی خۆڕاگر و دڵسۆز بوون، لە بەری دۆڵێ بەڕێ کەوتین و بۆ ڕۆژی دواتر لە بەرگەڵوو چاومان بە نەوشیروان مستەفا کەوت، پاش کەمێک بێدەنگی و تێڕوانینی بۆ ئێمە، زۆر بەخێرایی و هەندێک تووڕەبوونی پێوە دیار بوو، پێی ڕاگەیاندین و وتی: عومەر پێشمەرگەیەکی ئازا و قارەمانە و جێی بڕوا و متمانەی ئێمەیە، ئەویش ئێوەی دەستنیشان کردووە لە دڵسۆزی و ئازایەتیدا. لە ڕێکخستنەکانی ناوشارەوە هەواڵی ئەفسەرێکمان پێ گەیشتووە، خۆی و پاسەوانەکانی غەدرێکی زۆر لە کاسبکاران و هاوڵاتییان دەکەن، غەدرکردنیشیان لە خەڵکی؛ ڕۆژانە دووبارە دەکرێنەوە، گەر دەتوانن لە ماوەی ئەم هەفتەیەدا ئەو تاوانبارە لەکۆڵ خەڵکی

بکەنەوە. پاشان ڕایگەیاند ئێمە دەتوانین ئەوە بە ئەندامانی ڕێکخستنەکانی ناوشار بکەین، بەڵام بۆ پاراستن و سەلامەتیی ڕێکخستنەکان، هێزی پێشمەرگە بە باشتر دەزانین ئەو گرفتە لەکۆڵ خەڵکی کاسبکار و هاوڵاتییان بکاتەوە. عومەر عەرەبیش وتی: بەڵێ کاک نەوشیروان، دڵنیا بە هەوڵی باش دەدەین بۆ ئەنجامدانی کارەکە. پاش گەڕانەوەمان، بۆ ڕۆژی دواتر عومەر عەرەب پێی ڕاگەیاندین: زۆر شەرمە ئەو کارە بەئەنجام نەگەیەنین کە پێمان سپێردراوە. لەو کاتەشدا بۆ دووەم جار بوو ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستان باسی ژیاننامەی شەهید مامۆستا پێشڕەوی دەکرد، عومەر عەرەب وتی: بە گۆڕی شەهید مامۆستا پێشڕەو، دەبێت تۆڵەتان لە تەواوی سیخوڕەکان بکەمەوە! هەرسێکمان بڕیارمان دا پشت بەیەک ببەستین و لە فەرمانی یەکتر دەرنەچین، ئەوە پێشنیاری عومەر عەرەب فەرماندەی کەرتەکەمان بوو. پاشان سێ دەمانچەمان پێ بوو، پێی وتین: «لە دەرەوەی ئەم دانیشتنە تایبەتییەی هەرسێکماندا، لە هەر شوێنێکی تر قسە ببیسرێت، ئەوا بە دەمانچەکەی خۆی دەیکوژینەوە! کامیشتان توانای ئەو کارەتان نییە، ئێستە دەتوانێت بڵێت ئامادەییم تیا نییە و ئەو کارەم پێ ناکرێت!» دوای بڕیاردان و پێکەوە ژیان و پێکەوە مردن، بەرەو سلێمانی بەڕێ کەوتین. من هیچ کاتێک ناتوانم و هەرگیز گوێی خۆم لەو حازرخۆرانەدا کەڕ ناکەم کە پێیان وایە بەردی بناغەی ئەو هەرێمە ئازادەی کوردستان لەخۆڕا هاتووەتە دی. تاکوو لە ژیانمدا مابم و هەناسەش لە سییەکانمدا هاتوچۆ بکەن، ڕەفتاری جوان و سیمای ئەو هاوڕێیانەم لە دیدەمدا غافڵ نابن کە لە سەنگەرەکانی ڕووبەڕووبوونەوە و بەرگریدا پێشبڕکێی مان و نەمانی ژیانیان دەکرد. ئەم ئازادییەی ئێستە، بەرهەمی شەڕی دەستەویەخەی پێشمەرگەی هەموو حیزبەکانە لەگەڵ مەرگدا. ئەو کاتەی مەرگ یەخەی دەگرتین، ئێمە نەدەترساین و مەرگمان ڕاو دەنا و پێمان دەوت: «ئەی مەرگ، تۆمان بینی چەندە ترسنۆک بوویت لەبەردەم شالاوی هەڵۆئاسای هاوڕێ شەهیدەکانماندا! بۆچی ئیتر ئێمە بەردەوام نەبین؟» پێشمەرگە

سووتەمەنی و کاراکتەری سەرەکیی ئەنجامدانی چالاکییەکانی شۆڕش بوو دژ بە دامودەزگاکانی دەسەڵاتی داگیرکەری بەعس لە سەردەمی داگیرکاریدا، هەر خەسڵەتێکیش و کارێکی ناشازیش لە تاکێکی پێشمەرگەدا ڕووی دابێت، ناکرێت گشتگیر بکرێت بە باڵای کۆی هێزی پێشمەرگەدا. هەر هەڵە و کەموکورییەک گەر لە چەندایەتیدا ڕووی دابێت، گوناح و تاوانە بکرێت بە باڵای چۆنایەتیی هێزە پڕ لە دیسپلینەکەی هێزی پێشمەرگەدا. هەر پەڵەیەکی ناشازییش بوونی هەبووبێت لە ڕەفتاری پێشمەرگە لە سەردەمی شاخدا، بۆ هەڵسوکەوتی تایبەتیی کەسەکە دەگەڕێتەوە نەک کۆی هێزە سەرەکییەکە کە ناوی پێشمەرگە بوو.

لە ئەمڕۆدا لە کۆمەڵگاکەماندا کەمینەیەک لە خەڵکی هەلپەرستی چاوچنۆکی بێباری چاو لە کیسە و گیرفان لە دنیای خەیاڵ و لە بەرژەوەندیی تاکەکەسیدا دەژین و ئەوەندەی بیروهۆشیان لای گیرفانیان هەیە، ئەوەندە بیروهۆشیان لەلای گەلەکەیاندا نەماوە و هەر ئەو کەمینەیەشن خەباتی ئێمەی پێشمەرگەیان قورس و ڕەزاگران کردووە لەلای زۆرینەی کۆمەڵگە. حەیف ئەوانەی ڕۆژانێک خەباتیان لە پێناوی مافی چارەنووسی گەلەکەیان کرد و سنگی خۆیان لە سەنگەری شەرەفەوە دەنا بە گوللەی دوژمنەوە، هەندێک لەو بە ناو تێکۆشەرانە لە کۆتاییدا بەپێچەوانەوە لە سەنگەری نەیارانی حیزب و شۆڕشەوە لوولەی تفەنگەکانیان پێچەوانە دەکردەوە و ئاراستەی سنگی هاوڕێ پێشمەرگەکانیان دەکرد. ئەگەرچی ئەم بەسەرهاتە نە چیرۆکە و نە ڕۆمانە، بەڵکوو ڕیالیزمی سەردەمی شۆڕشە و گەر بۆ نەوەی دوای شۆڕشی باس نەکەم و لە ئێستەدا نەیگێڕمەوە، ڕەنگە نەوەکانی دواتر لە زمانی کەسانی دوور لە ڕووداوەکە ڕاستیی ئەم داستانە ببیستن و هیچ دووریش نییە ترش و خوێی ناڕاستگۆیی پێوە بکەن. وەک باسم کرد لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٠دا لەلایەن سیخوڕ و چڵکاوخۆری ڕژێمی بەعس؛ ئاسۆی قومری دەستگیر کرام و لە ساڵی ١٩٨٢ بە لێبوردنی گشتی بۆ چەند مانگێک دوا خرام و لە ساڵی ١٩٨٣ لە قەسابخانەکەی ئەبو غرێب ئازاد بووم. پاش ئازادبوونم، لە هەمان ساڵدا پەیوەندیم کردەوە

به ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگە و لە کەرتی ٣ی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون کە عەبدول ڕەحمان سیتەکی فەرماندەی کەرتەکەمان بوو، جارێکی تر چەکی شەڕەفم کردەوە شان و بوومەوە بە پێشمەرگە. ئەو دەمە عەباس سیتەکی جێگری فەرماندەی کەرت و تێکۆشەرێکی خۆنەویست بوو. مەخابن، عەباس سیتەکی لەدوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ی ئازادکردنی کوردستان، لە ڕووداوێکدا بە بیانوویەکی بێبەڵگە لە غیابی سکرتێری گشتیی یەکێتی «هەڤاڵ مام جەلال»دا کە لە دەرەوەی وڵات بوو، بە فەرمانی نەوشیروان مستەفا؛ کاراکتەری گوللەبارانکردنەکەی جەبار فەرمان بوو.

ناسینی من بۆ عومەر عەرەب، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٣ و پێشتر لە ساڵی ١٩٧٨دا پەیوەندیی هەبوو بە ڕێکخستنەکانی ناوشار، ئەودەم عومەر عەرەب فەرماندەی مەفرەزە بوو لە کەرتەکەدا و بە هەمان شێوە نەوزادی عەبەی تەقێ فەرماندەی مەفرەزە بوو، بۆ هەر کەرتێک هەبوو دوو فەرماندەی مەفرەزەی هەبێت. دواتر پێش ئەنجامدانی ئەو کارەی نەوشیروان مستەفا بەفەرمی پێی ڕاگەیاندبووین ئەنجامی بدەین، عومەر عەرەب کرا بە فەرماندەی کەرتی پێنجی شەهید هاوڕێ جەبار. دیارە لەناو شۆڕشدا کێشە و ململانێ بەهەمیشەیی هەبووە و زۆر جار گەیشتۆتە ئاستی زویربوون و تێکشکاندنی باری کەسێتی یان لێکدابڕان لە شۆڕش و تەسلیمبوونەوە بە ڕژێمی بەعس، کە عومەر عەرەب یەکێک بوو لەو تێکۆشەرە قارەمانە بێوێنە و بێ ئەندازە دڵسۆز و چاونەترسانە. بەداخەوە عومەر عەرەب بەرەو هەڵدێر و ساردبوونەوە لە شۆڕش و خەباتکردن چوو کە ئاماژەم پێ داوە، ئەگەرچی هەندێک لە پێشمەرگە دێرینەکان لە گێڕانەوەی یادەوەرییەکانیاندا باسیان لە ڕاستییەکان کردووە و تەنانەت نەوشیروان مستەفاش لە کتێبی «خولانەوە لەناو بازنەدا» باسی لە تەسلیمبوونەوەی عومەر عەرەب کردووە و دەڵێت: پاش تەسلیمبوونەوەی بە ڕژێمی بەعس، لوولەی تفەنگی ئاراستەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەکرد. لە داهاتوودا بەدوورودرێژی باسی ژیانی سیاسی و پێشمەرگایەتی و باری کۆمەڵایەتی

و هۆکاری بەرەو هەڵدێر و دوورکەوتنەوەیان لە شۆڕشی هەریەک لەم تێکۆشەرانە و بەسەرهاتی ڕاستەقینەی نێو ئەو شۆڕشە دەکەم کە بە پلانی خۆفرۆشان سەدان قوربانیی لێ دەکەوتەوە.

کاتێک لە زینداندا کادر و تێکۆشەری دێرینی فەرماندە؛ ئاراس عەبدول ڕەحمان ناسراو بە مامۆستا پێشڕەو لەناو شاری سلێمانی شەهید بوو، پێشتریش هاوڕێ جەباری برازای شەهید سەلاحی موهەندیس کە فەرماندەی کەرتێکی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون بوو، لە گوندی باوەگێلی نزیک گەڕەکی قادسیەی دۆڕاوی بەعس شەهید بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژانە هەواڵی دەیان تێکۆشەری قارەمانی کەرت و تیپەکانی تری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانمان بەشەهیدکراوی یان بەدەستبەسەری لەلایەن حیزب و ڕێکخراوەکانی تری کوردستانەوە پێ دەگەیشت، ئەمانە هەر هەمووی زیانێکی گەورە بوو لە گەلەکەمان دەدرا.

دوای بەرپەرچ و ململانێی هەندێک لە بەرپرس و فەرماندەی نێو کەرت و تیپەکان و مەڵبەندەکان کە زیاترینیان هەوڵدان بوون بۆ پۆست و ئاستی پلەی بەرز، بەتایبەتی کەرتی ئێمە و تیپەکانی ئێمە لەو جۆرە گرفتانەیان زۆر بوو، هەر چەندە عومەر عەرەب لە ڕابردوودا وەک باسم کردووە بە هۆی ناتەبایی و ئیرەیی و تێکشکاندنی باری کەسایەتیی؛ تووشی کێشەیەک ببوو، ئەودەم دڵی بریندار کرابوو، بەردەوام بیری لێ دەکردەوە و وای لێ دەکرد چالاکیی زۆر گەورە و لە شوێنی ترسناکدا بکات کە زۆربەی دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێمی بەعسی لێوە نزیک بوو. هەوڵدانی عومەر عەرەب بۆ مەسئولیەت کە بە هەقی خۆی دەزانی و کێشمەکێش و ململانێی بەرپرسان و پێشمەرگەی دەورووپشتی، هەمیشە عومەر عەرەبی پەراوێز خستبوو لە کەرتەکە و بەتایبەت مافی خۆی بوو کە لە ئاستی پلەی بەرزدا ئەو مافەی پێ ڕەوا بێت. دوای ئەوەی زۆر بیرم لە ڕەفتار و کار و کردەوەی شەهید مامۆستا پێشڕەو دەکردەوە، کە چۆن لە زینداندا هەمیشە وەک کادرێکی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان مامەڵەی دەکرد و وانەکانی کۆمەڵەی پێ

دەوتینەوە، بیرم لەو هاورێیانەم دەکردەوە کە چۆن لەلایەن مولازم موحسینی بە ڕەگەز عەرەبی فەلەستینی و کەمال پشدەریی سیخوڕی بەعس کە چۆن خشتی سووری بە گونی خۆم و هاورێکانمدا هەڵدەواسی و بوتڵیان بە کۆمی زیندانەکان هەڵدەگرت و تیروتوانجی کۆمەڵایەتی و بێنرخترین وتەی ناشرینیان بەرامبەر دەکردین، هەموو ئەمانە منی خستە قووڵایی بیرکردنەوە و وای لێ کردم بیر لە تۆڵەسەندەوەی هاورێکانم بکەم، بەتایبەت شەهیدکردنی مامۆستا پێشڕەو و هاوڕێ جەبار، ئەم وێنانە بەنرخانەی شەهیدان ئارامیی لەبەر هەڵگرتبووم، عومەر عەرەب هێندە نەبوو ژیانی هاوسەرگیریی پێک هێنابوو لەگەڵ خوشکی یەکێک لە پێشمەرگەی کەرتەکەمان. جگە لەو پێشنیارەی سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەران؛ نەوشیروان مستەفا ئاراستەی کردبووین، هەرسێکمان بڕیارمان دا جگە لەوە، چەند چالاکییەکی تر ئەنجام بدەین. عومەر عەرەب ماڵی مامی لە گەڕەکی زەرگەتەی شاری سلێمانی بوو، هەرسێکمان لە ماڵی مامی عومەر عەرەبماینەوە، شەو تا درەنگانێک سەرقاڵی نەخشە و پلان و جۆری ئەنجامدانی چالاکییەکە بووین، خێزانەکەی عومەر عەرەب ئەویش بە ئێمەوە ماندوو ببوو و لە ترس و دڵەڕاوکێدا بوو. بۆ سبەی کاتژمێری هەشتی بەیانی لە گەڕەکی زەرگەتەوە، واتە لە ماڵی مامی عومەر عەرەبەوە چووین بۆ سەنتەری شار و چووینە ئەو شوێنەی بۆمان دەستنیشان کرابوو کە ئەو ئەفسەرە و پاسەوانەکانی باج و سەرانەیان لە خەڵکی وەردەگرت، ئەویش بازاڕی بەر حەوزە وشکەکە بوو. ئەو بازاڕە لە دێرزەمانەوە هەیە و تەواوی کاسبکاران و دووکاندارەکان یەکتریان دەناسی، کاسبکاری هەمەچەشنەی هەر لە ئاڵتوونچی و پۆشاک فرۆشتن و بەرگدروو و چێشتخانە و سەراج و مەزادخانەی کۆنی سلێمانییش لەنێو ئەو بازاڕەدایە و بە دیوێکی تردا شەقامێک لە مزگەوتی گەورەوە ڕاستەوخۆ بەرەو خوار دەبێتەوە و کۆمەڵێک کاسبکاری ئاسنگەر و میوە فرۆش و دارتاش و «حەمامی سوورەت»ی لێ بوو، هەرسێکمان سۆراغی ئەو ئەفسەرەمان دەکرد، بەڵام ئەو ڕۆژە بەدەر نەکەوتبوو و نەهاتبووە ناو

بازاڕەکە، ناچار زۆر ماندوو بووین و سڵیشمان دەکردەوە، چونکە ئێمە پێشمەرگەی شاخ بووین و ڕووخسارمان ماندووبوونی پێوە دیار بوو. سەلاح چاوزەق دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: «ئەوە بۆ نەچینە سەر ‹مەخفەرەی پۆلیسەکان›! با بچینە سەریان و تەقەیان لێ بکەین!» بەڵام عومەر عەرەب لەبەر ئەوەی فەرماندەی کەرت و سەلاح چاوزەقیش جێگری بوو، وەڵامی دایەوە و وتی: «تۆ لە گاڵتەوگەپی خۆت ناکەویت، من وەڵامی چی بە کاک نەوشیروان و ڕێکخستنەکانی ناوشار بدەمەوە! دەشزانم ناوەندی کۆمەڵە و مەکتەبی عەسکەری بێئاگان نین لەم مەسەلەیە. کاکە ناسەلاحی چاوجوان، ئێمە سەرقاڵی چین و تۆش نوکتەمان بۆ دەڵێیت!» ئەو ڕۆژە بەنائومێدی گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام نەچووین بۆ ماڵی مامی عومەر عەرەب، بەڵکوو چووین بۆ ماڵی حسێن کە برا گەورەمە و شەو تا درەنگ مشتومڕمان بوو لەسەر ئەوەی بۆ ڕۆژی داهاتوو چی بکەین و چۆن بتوانین ئەو کارە ئەنجام بدەین! خێزانەکەی عومەر عەرەب وەک باسم کرد هێندە نەبوو هاوسەرگیرییان کردبوو، ئەویش لە شاردا بوو، شەو درەنگ لەگەڵ عومەر عەرەب چووینەوە بۆ ماڵی مامی، چونکە خێزانەکەی لەوێ بوو، بۆ ڕۆژی دواتر دوو پێشمەرگەی باوەڕپێکراوی نێو کەرتەکەمان بە ناوی کامەران مەحموود ناسراو بە «کامەرانی خولە سمێڵ» و محەمەد شێخ حەسەن ناسراو بە «حەمە بچکۆل» ئەوانیش بە کاری تایبەت هاتبوونەوە ناوشار و باوەڕپێکراوی خۆمان بوون و ئاگاداری شوێنی مانەوەمان بوبوون، لە بابەتەکانی تردا بە بەڵگە و دیکۆمێنت چەند ڕاستییەک دەخەمە ڕوو، باس لە چۆنیەتیی گوللەبارانکردنی هەریەک لەم هاوڕێیانەم دەکەم[١].

---

١. گوللەبارانکردنی هەریەک لەم هاوسەنگەرانە، بە تاوانبارکردنی بێبەڵگەی دژ بە شۆڕش، سەلاحی حاجی عەلی (سەلاح چاوزەق) لە گوندی سوورەدێی قەندیل گوللەباران کران. محەمەد شێخ حەسەن (حەمە بچکۆل) بە هەمان بەسەرهاتی سەلاح چاوزەق گوللەباران کرا، کامەران مەحموود (کامەرانی خولە سمێڵ) لە بەسەرهاتێکدا و پێش زەماوەندا کوژرا.

پاش بیروبۆچوونێکی زۆر، گەیشتینە ئەو ئەنجامەی سەلاح چاوزەق و کامەرانی خولە سمێل و حەمە بچکۆل و بەندە، بۆ دەستوەشاندن لە ڕژێمی بەعس جارێکی تر چووینەوە ناو شاری سلێمانی و عومەر عەرەب بە بڕیاری هەمووومان لەگەڵماندا ئامادە نەبوو. چەند شوێنێکی گشتیی نێو سەنتەری سلێمانی گەڕاین، وەک: شەقامی کاوە، شەقامی خانەقا، شەقامی بەر سینەما سیروان، مزگەوتی گەورە، شەقامی مەولەوی، شەقامی پیرەمێرد. زۆر چالاکی هەبوون بەئەنجامی بگەیەنین، بەڵام دەبووە مایەی شەهیدبوونی هەریەکەمان، دوور نەبوو کەسیشمان دەرباز بین! ناچار بەنائومێدی گەڕاینەوە بۆماڵەوە. عومەر عەرەب بۆ جاری دووەم پێی ڕاگەیاندین: «من چی وەڵامی مەکتەبی عەسکەری و ناوەندی کۆمەڵە بدەمەوە؟ گەر بێتوو لەم ماوە کورتەدا و لەم یەک دوو ڕۆژەدا چالاکی نەکەین و پاشان ئەوەی پێمان ڕاسپێردراوە جێبەجێی نەکەین، حەیامان دەچێت!» لە ڕاستیدا عومەر عەرەب لە دڵسۆزیی خۆی و هاوسەنگەرەکانی و ئەم زوڵمەی لە تاک بە تاکی گەلی کورد دەکرا، دەویست بە هەر چی جۆرێک بێت یەکەم دەست لە دوژمن بوەشێنێت و چیتر کەسانی تری سەر بە ڕژێم نەوێرن لاسایی داروودەستەکانی بەعس بکەنەوە و باج و سەرانە لە کاسبکاران و غەدر لە هاوڵاتییان بکەن، لە لایەکی تریشەوە پەیمان و بڕیاردان بە کەسێکی وەک نەوشیروان مستەفا وا ئاسان نەبوو، چونکە سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو، پاشان سەرکردەیەکی ناسراو بوو. دواتر عومەر عەرەب هەڵچوونێکی خێرای لێ بەدەر کەوت و وتی: «ئێوە هەمووتان ترسنۆکن، ئەگەر هەر بۆ ترساندنی بەعسییەکان تەقەشتان بە ئاسماندا بکردایە، نەدەبوو بەبێ ئەنجام بگەڕێنەوە! من خۆم سبەی بەتەنها دەچمە ناوشار و خۆم دەزانم چی دەکەم!» بۆ مێژوو دەڵێم، عومەر عەرەب هێندە دڵسۆز و تێکۆشەرێکی چاونەترس و خۆنەویست بوو، هەر بڕیارێکی بدایە؛ بەئەنجامی دەگەیاند. منیش وەڵامم دایەوە و وتم: «کاک عومەر، تۆ هەر چی بڵێیت؛ بە مافی خۆت و خۆمان و هەموو

تاکی نێو کۆمەڵگەکەمانی دەزانین، بەڵام چالاکییەک بکرێت و هاوڕێکانمانی تیا شەهید بکرێت، نەکردنی باشترە. دەستوەشاندن لە دوژمن وا باشترە سەرکەوتوو بین و کەمترین زیانی گیانبەختیمان تیا بێت. گەر یەکێک لە هاوڕێکانمان بکوژرێت، ئەو چالاکییە هیچ مانایەک نابەخشێت و هەتا لە ژیاندا مابین ئەو ئازارەمان لە دڵدا دەرناچێت!» بۆ سبەی، سەرلەبەیانی عومەر عەرەب پێی وتم: «ئێمە سێ پێشمەرگەین، واز لەم قسانە بهێنە. بزانم فس فس پاڵەوان، تۆ چیمان بۆ دەکەیت!» من زۆر ناڕەحەت بووم، هەر چەندە لە کاتی وادا دەبێت سەبرت هەبێت و ئارام بیت، چونکە مەبەستی عومەر عەرەب بێڕێزیکردن نەبوو بە هاوسەنگەرەکانیەوە، بەڵکوو هەر چەندە فەرماندەشمان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤێکی بەسەلیقە و سادە و هاوڕێپەرست بوو. دوای وتەکانی ئەو، منیش ئەم جارەیان لەگەڵ هەر یەک لە حەمە بچکۆل و کامەرانی خولە سمێڵ کاتژمێر هەشتی سەرلەبەیانی چووینە ناو شارەوە و زۆر گەڕاین بۆ چالاکیی گەورە، هیچمان دەست نەکەوت، چالاکیی گچکەی بێنرخ هەبوو بەئەنجامی بگەیەنین، بەڵام وەک باسم کرد ئێمە دەمانویست چالاکییەک بکەین دەنگدانەوەی زۆری هەبێت. لە گەڕانەوەماندا بۆ ماڵەوە، سەربازێکمان بینی تفەنگێکی پێ بوو، هەرکە چووینە بەردەمی و دەمانچەمان لێ دەرهێنا، وەک چۆن مەڕ لەبەردەم گورگدا سست دەبێت و ئەژنۆی دەشکێت، بەو جۆرەش ئەویش تف لە گەروویدا وشک بوو، بەبێ هیچ هەڵوێستەیەک تفەنگەکەی داینێ و لەگەڵ ئەوەشدا لەکۆڵمان نەدەبووەوە و بە زمانی عەرەبی پێی دەوتین: «یان بمکوژن، یاخود با لەگەڵتاندا بێم!» بەگریانەوە پێی دەوتین: «لەسێدارەم دەدەن!» هەر چەندە من حەزم بەو کارە نەدەکرد و خۆشم نازانم چۆن بوو ڕووبەڕووی سەربازێکی بێدەسەڵات ببوومەوە، زۆریشم بەزەیی پێدا هاتەوە و تفەنگەکەم دایەوە دەستی، کامەرانی خولە سمێڵ و حەمە بچکۆل زۆر تووڕە بوون و وتیان: «دوێنێت لەبیر چوو عومەر چیی پێ کردین؟» منیش وتم ئێوە بۆ تفەنگێک ماڵی مرۆڤێک کاول دەکەن، کێ دەڵێت ئەم

سەربازە لە من و ئێوە زیاتر ڕقوکینەی لە بەعس نییە؟ هەرکە چووینە ماڵەوە، عومەر عەرەب دەستی کردەوە بە پێکەنین و وتی: «کاکە شەهابمان چالاکییەکی کردووە لە ئیزاعەی گەلی کوردستانەوە خوێنراوەتەوە، کاک نەوشیروان مستەفا و مەکتەبی عەسکەری سەریان سوڕماوە لەو چالاکییە گەورەیە و سوپاسنامەیان بۆ ناردووە!» ناچار وتم باشە کاک عومەر ئێمە ترسنۆکین، بەڵکوو بێیت لەگەڵماندا و کارێک ئەنجام بدەین مەکتەبی عەسکەری لێمان ڕازی بن. شەو تا بەیانی بەدەم ئەو قسەیەوە دەتلامەوە و لەگەڵ ئەوەشدا لە هەر ماڵێکدا دەستنیشان بکرایانایە و ڕژێم ئاگاداری جێی حەوانەوە و خۆشاردنەوەمان بووایە، ئەوا ئەو خانووەی بەسەردا گڕ تێ بەر دەدایین و دەیسووتاند. پاشان گەڕانمان بەدوای چالاکیدا لەنێو شاردا هەر وا ئاسان نەبوو، بەڵکوو زەحمەت و دڵێکی گەورەی دەویست بە دەمانچەوە لەنێو شاردا بسووڕێیتەوە و لە شاخیش هاتبیتە خوارەوە. بەهەرحاڵ، بۆ ڕۆژی داهاتوو عومەر عەرەب و سەلاح چاوزەق و بەندە چووینە نێو بازاڕ و بە هەمان شێوە زۆر گەڕاین، پاشان چووینە دووکانێک کە پەیوەندیی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانەوە هەبوو و لە ڕێکخستنەکانی ناوشاردا کاری دەکرد، وتی: «گەر کەمێک ئارامتان بێت، ئەفسەرێک لەگەڵ چوار پاسەواندا هەموو ڕۆژێک دێنە ئێرە و لەگەڵ ئەوەشدا جنێوی ناشرین دەدەن!» دیار بوو ئامانجەکەمان هاتە دی کە چەند ڕۆژێک بوو ئێمە بەدوایاندا دەگەڕاین و ئەوانەن کە پێمان ڕاگەیەنرابوو لەلایەن نەوشیروان مستەفاوە کە لەکۆڵ خەڵکیان بکەینەوە. بە چەند خولەکێک پێش ئەوەی ئەوان بێن، چووین گوێنییەکمان کڕی بۆ ئەوەی تفەنگی پاسەوانەکانی تێ بکەین. لە شوێن و کاتی دیاریکراودا ئامادە بووین، ئەویش بەر دووکانێکی زەڕەنگەرێک بوو، بەرامبەرەکەشی دووکانی سەراجێک بوو کیفی دەمانچە و جۆری سیلاحی دروست دەکرد. زۆر بەخێرایی بەرنامەی ئەنجامدانی جۆری چالاکییەکەمان داڕشت و دوای تەواوبوونی کارەکە، بە زووترین کات پێناسەی گیرفانیان و تفەنگ و دەمانچەکانیان بخەینە نێو گوێنییەکە و

خۆمان دەرباز بکەین لە شوێنی ئەنجامدانی کارەکە. بەڵام زۆر جار مرۆڤ ئەگەرچی بەرنامە و نەخشە و پلان دادەڕێژێ، لەگەڵ ئەوەشدا نابێتە خاوەن ئەو بەرنامەیە و نەخشەیەکی تر دەکێشرێت. عومەر عەرەب وتی: «ئەوا ئەو زاڵمە لەگەڵ پاسەوانەکانیدا هاتن، من دەچمە بەردەمیان و ئێوەش ئەملا و ئەولای لێ بگرن و هیچ مەکەن هەتا لە منەوە تەقە دروست دەبێت!» کاتێک بەرەو ڕوومان هاتن، یەکسەر عومەر عەرەب چووە بەردەمیان و لوولەی دەمانچەکەی ئاراستەی نێوچەوانی ئەفسەرەکە کرد و تەقە دروست بوو، ئێمە سێ کەس بووین و ئەوان چوار، لە ماوەی کەمترین خولەکدا بە سزای گەل و شۆڕشمان گەیاندن، بەڵام یەکێکیان بەبرینداری خۆی کرد بە دووکانی سەراجەکەدا و دەنگی هەناسە و نووزەی لێوە دەهات و هێشتا ڕۆحی تێدا مابوو. ئەفسەرەکە هەر زۆر زوو ڕۆحی دەرچوو، دوو پاسەوانەکەی تر بەتەنیشت یەکەوە خوێنی لاشەیان جۆگەلەیەکی باریکی لەنێو گوزەری حەوزە وشکەکەدا دروست کردبوو. لە چەندین دووکانی ئەو گوزەرەدا کە سەر بە ڕژێمی بەعس بوون، تەقەمان لێ دەکرا. بە دیوی مەزادخانەکەدا ئەو سەردەمە مەخفەری پۆلیسی لێ بوو، چواردەوریان بە تەقە گرتین. بە دیوێکی تری شوێنی کارەکەمان کە چێشتخانە و دووکانی خواردەمەنی و پۆشاکی ژنان و بەرگدرووی لێ بوو، تەقەمان لێ دەکرا. عومەر عەرەب فیشەک بە خوار سکیەوە تیغی کردبوو و خوێنی لێ دەهات، بریندار بووبوو و کراسێکی سپیی لەبەردا بوو، خوێنی لێ دەچۆڕی و جێی برینداریيەکەی بە کراسە سپییەکەوە دیار بوو دەستێکی لەسەر برینەکەی بوو، بە دەستەکەی تری بە دەمانچە تەقەی دەکرد. خەڵکی بە جۆرێک لەو گوزەردا سەریان لێ تێک چووبوو، هەریەک بە لایەکدا ڕایاندەکرد و هاواریان دەکرد: «قڵیشایەوە!» منیش خۆم کرد بە دووکانی سەراجەکەدا و تفەنگی پاسەوان و پێناسەکەی لە گیرفاندا دەربکەم، هێشتا ئەو پاسەوانە لەسەردەم کەوتبوو و ڕۆحی تێدا مابوو. جگە لە تفەنگەکەی، دەمانچەیەکیشی پێ بوو ئێمە پێمان نەزانیبوو، فیشەکێکی پێوە نام و بەر سمتم کەوت و حەوزی

سمتمی شکاند. هەر ئەوەندەم بە خۆ زانی، زەوی وەک کارەبای لەسەر بێت؛ گرتمی و لەپڕێکدا قاچم نوشتایەوە و کەوتم و هەستامەوە تاکوو بەردەوام بم لە ڕۆشتن. بەڵام دواتر قاچم لە دوام نەدەهات، ئیتر زانیم کە خراپ پێکراوم و ئێسکی حەوزی سمتم دەرپەڕیبوو و خوێنێکی زۆری لێ دەهات. عومەر عەرەبی تێکۆشەری دێرینی فەرماندە و سەلاح چاوزەقی تێکۆشەری دێرینی فەرماندە، ئەگەرچی عومەر خۆشی بریندار ببوو، ئەوەی کە لەگەڵماندا ساغ بوو؛ تەنها سەلاح بوو، بەڵام هەردووکیان بە ڕەوشتی شۆڕشگێڕییەوە ئامادەی خۆبەکوشتدان بوون بۆ دەربازبوونم لەو ساتە قورس و خوێناوییە سەختەدا کە ئەستەمە لە ئێستەدا بەباشی وەبیر خۆمی بهێنمەوە و باوەڕ بە بوونی ئەو مرۆڤە ڕەوشتبەرزانە بکەم کە بە جۆرێک لە هەندێک بەرپرسەکانی ئێستا و شۆڕشگێڕەکانی ئەوسادا دەیبینم، ئەوان بۆ مەرگێکی ئاسوودە و سەربەرزی دەژیان و ئەمانیش بۆ ژیانێکی پڕ لە ئارەزوو دەمرن.

کاتێک کە بریندار کرام، دەمانچەکەم لە دەست پەڕی و دوو یەدەکی پڕ فیشەکیش لە گیرفانمدا بوو، بەڵام سەلاح چاوزەق زۆر قارەمانانە دەمانچەکەی هەڵگرتمەوە و لەگەڵ عومەر عەرەبدا پێناسەی گیرفانی ئەفسەر و پاسەوانەکان و چەکەکانیان هەڵگرتەوە و لەنێو گوێنەکەیاندا نابوو و بەردەوام تەقەیان کەم تا زۆر دەکرد. هەندێک لەو دووکاندارانەی نێو گوزەرەکەش کە تەقەیان لێ دەکردین، لەدوای ڕاپەڕینی سەرتاسەری ئازادکردنی کوردستان و ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس، بوونەتە دڵسۆز و قارەمانی هەندێک لە حیزبەکان.

من هەستم دەکرد تووشی خوێنبەربوون بووم، چاوم تاریک بوو، لێوم وشک هەڵهاتبوو، تفم بۆ قووت نەدەچوو، هاوارم دەکرد: «عومەر بمکوژە و بەجێم مەهێڵە»، چونکە ماوەیەکی کەم بوو لە زیندان هاتبوومە دەرەوە، پاشان ناویشم لەوێ هەبوو کە بۆچی و لەسەر چی زیندان و حوکم دراوم، ئەو ڕۆژانەم بەبیر دەهاتەوە کە سەرەوخوار هەڵیاندەواسیم و هەموو

ئازار و ئەشکەنجەی زیندانی دائیرەی ئەمنم بەبیر دەهاتەوە. دووبارە داوام لێ کردەوە کە بمکوژێت، چونکە تەواوی دوکانەکان داخرابوون و هەندێکیشیان بەدانەخراوی بەجێیان هێشتبوو، خوێن بەو گوزەرەدا دەچووە خوارێ و تەواوی ڕێگاکانمان لێ داخرابوو. عومەر جارێکی تر لوولەی تفەنگەکەی خستە سەر سەرم و دووبارە پەنجەی نەنا بە پەلەپیتکەکەدا و نەیکوشتم، لەپڕ سێ کەس بەڕاکردن بەرەو ڕوومان هاتن و سەلاح تەقەی بە ئاسمان و کۆڵانەکاندا دەکرد و گوێنییەکەی هەر بە دەستەوە بوو، عومەریش ڕووی تفەنگەکەی کردەوە ئەو سێ کەسە، وتی: «ئێمە پێشمەرگەین، هاوکاریمان بکەن!» مرۆڤی قارەمان لە هەموو شوێنێکدا قارەمانێتیی خۆی دەنوێنێت، هەرسێکیان دەستیان گرتم و بەدوای خۆیاندا ڕایانکێشام و بەرەو گەرماوی سوورەتیان بردم. ئەو ناوە هەمووی ئاسنگەر و دارتاش و دوکانی جۆراوجۆری لێ بوو، من لەتاو وردە ئاسن و بزمار و تەنەکەی فڕێدراوی دوکانەکان کە دەچوو بە لەشمدا لە کاتی ڕاکێشانمدا، ئازاری فیشەکم لەبیر چووبۆوە. دواتر ئۆتۆمبێلێکی جۆری تویۆتا لەو کاتەدا بەڕێکەوت ئامادە بوو، منیان تێ کرد و شۆفێرەکە وتی: «من ناوێرم سایەقی بکەم!» سویچی ئۆتۆمبێلەکەی دایە دەستی عومەر و منیان خستە دواوە و بەرەو لای ساحەی ترابیەکە بەڕێ کەوتن. ماڵی نەوزادی عەبەی تەقێ لەوێ بوو کە ئەویش پێشتر لە کەرتی سێی ئەزمەڕ فەرماندەی مەفرەزە بوو، دواتر بە بڕیاری نەوشیروان مستەفا کرا بە فەرماندەی کەرت، منیان لەوێ دانا و ڕێکخستنی ناوشاریان ئاگادار کردەوە. من هەر ئەوەندەم گوێ لێ بوو برینپێچێک وتی: «پێویستی بە خوێنە، گەر فریای نەکەون ئەوا شەهید دەبێت!» دەرزییەکیان لێ دام و دوای ماوەیەک بەدەم هاوارەوە هۆشم هاتەوە. ئەوەندە ئازارم هەبوو، مردنم بە ئاوات دەخواست. لە دواییدا پێیان ڕاگەیاندم بەوەی هاوڕێیەکی نووریی برام شۆفێرێکی پەیدا کردبوو هاوڕێی خۆی و برای پێشمەرگەیەک بوو بە ناوی بەرزان، لای وەهابی سەرتیپ بوو، شۆفێرەکە بۆ مێژوو ناوی دەبەم، ناوی سۆران حەمەسەعی

بوو، دواجار ئەویش بوو بە پێشمەرگە و ئێستەش لە ژیاندا ماوە، تاکوو ماوەیەکیش لە وڵاتی هۆڵەندا دەژیا. پاش دەربازبوونم لە شاری سلێمانی، ڕەوانەی ئێران کرام بۆ نەخۆشخانەیەکی شاری ڕەزاییە (ئورمیە)، کە ئەو کاتە حیزبی سۆسیالیست و پارتی دیموکراتی کوردستان ڕێککەوتننامەیان لەگەڵ ئێراندا هەبوو. لە ڕاستیدا حیزبی سۆسیالیست (حسک) هاوکاریی ئەو پێشمەرگانەی دەکرد کە بۆ پێویستیی چارەسەر دەچوونە ئێران و منیش بە نامەی فەرمیی حیزبی سۆسیالیست (حسک) ڕەوانەی ئێران کرام. دوای نەشتەرگەری و ئازارێکی جەستەیی زۆر، قاچی ڕاستم چوار سەنتیمەتر کورتی هێناوە، هەردوو قاچم دەماری سەرەکیی بڕا و نێوان ئێسکی قاچم بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر یەک شیش بەند بوو کە ئەویش پلاتینە، بەڵام بەردەوام جەستەم ئازاری هەبوو.

## نەوشیروان مستەفا:
## گەر پێشمەرگایەتیتان پێ ناکرێت، بۆ ئابڕووی حیزبەکەتان دەبەن؟

دوای گەڕانەوەم لە تیمارستانی شاری ڕەزاییە (ئورمیە) لە ئێران و باشتربوونی باری تەندروستیم و درێژەپێدان بە خەباتی پێشمەرگایەتیم، دواتر داوای تفەنگێکم کرد، نەک لەو تفەنگ و دەمانچانەی کە لە ئەنجامی ئەو چالاکییەدا تێیدا بریندار کرام، بەڵکوو هەر تفەنگێک بێت بیکەمە شانم، چونکە پێشمەرگە لە شاخ بە تفەنگەکەیەوە ناوی پێشمەرگەی لێ دەنرا، خۆ ئەگەر دارێکم بە دەستەوە بووایە، لەگەڵ ڕێزمدا بۆ شوان، ڕەنگەی ناوی شوانی مەڕوماڵات یان ڕێبوارێکی لەپڕ دەرکەوتووی نێو گوندێکم لێ بنرایە، بۆیە بە هەقی خۆم زانی داوای تفەنگێک بکەم لە کەرتەکەمدا و وەک فەرماندەی مەفرەزەیەکیش بەرگریم لە خۆم پێ بکردایە. کاتێک بەدواچوونم کرد لە ڕەنج و ماندووبوون و ئازاری جەستەیی و ترسی دەستگیرکردنم بەبرینداری، بەداخەوە هەر چی بڵێم هەر ڕووی خۆم دەگرێتەوە، چونکە

ناتوانم کەسانێک بە ناشایستە بزانم کە ڕۆژانێک بووە لە خۆشەویستی و دڵسۆزیدا بۆ یەکتر و بۆ شۆڕشەکەمان، گرەومان لەسەر مەرگی خۆمان بۆ یەکتر کردووە. تفەنگێک نەبوو بیکمە شانم و ماوەیەک بەبرینداری و بەبێ چەک مامەوە.

پاش ئەوەی ئەو چالاکییەی ئێمە بە جوانترین و ڕازاوەترین وشەی ڕێزمانی و بە دەنگی زوڵاڵی «فەرهاد سەنگاوی» بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەردەوام لەگەڵ دەستپێکردنی ئیزاعەی دەنگی گەلی کوردستان، ئەو چالاکییە بە مەزنترین و سەرکەوتووترین چالاکی باس دەکرا، تەنانەت ناوی ئەفسەرەکە و پاسەوانەکانی کە بە سزای گەل و شۆڕش گەیەنراون؛ دەهات. بە ناوی هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون، مەڵبەندی دوو؛ دەخوێنرایەوە. پاش ئەوەی بۆ جاری دووەم چووینەوە خزمەتی نەوشیروان مستەفا، پێی ڕاگەیاندین گەر پێشمەرگایەتیتان پێ ناکرێت بۆ ئابڕووی حیزبەکەتان دەبەن، ئەوە چالاکی بوو ئێوە کردتان و سەرتان لە تەواوی خەڵکی شاری سلێمانی شێواند؟ دەزانن چەندان کەس لەسەر ئێوە لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە دەستگیر کراون؟

ئەوسا ئێمە بەو جۆرە هەوڵمان دەدا و ئاوها ئەمڕۆمان بنیاد دەنا، ئەوسا بە گیانێکی خۆنەویست و بە دڵێکی پاک و بێگەرد و بە بیرکردنەوەیەکی بێ ڕەتووش و بە هەستێکی جوان و بە ویژدانێکی بەرز و خۆنەویست، جگە لەوەش بە دەست و داوێن پاکی خەباتمان بۆ داهاتوویەکی گەش، دوور لە بەزاندنی یاسا و سەروەریی نیشتمان و وڵاتێکی ئازاد و دیموکرات، کە دینگەکانی ئەستوور بە پاراستنی کەرامەتی تاکی کورد و ئازادی تاک هەڵبچنین، دوور لە هەر هەنگاوێک بۆ ناشرینکردنی ئەو ئیدارەیەی بەدەستی دێنین، خەونمان بەوە دەبینی و دەشمانوت: ئێمە بۆ داهاتوو دەژین نەک بۆ خۆمان، کەچی دەبینین ئەو هەموو سوێند و بەڵێنانەی کە دامان، هەندێک سەرانی کورد خستیانە زبڵدانی سەردەمەوە و خەوەنەکانیان لەگۆڕ نایێن.

ئێستا ئەوەی هەیە، زۆر بەئاسانی کەرامەتی تاکی کورد دەشێلرێت و

ئەوەی نییە؛ داوێنپاکی و دەستپاکی و وەفایە بۆ شەهیدەکانمان و ئەوەی کە هەیە تەنها پێچەوانەی ئەو ڕستە و قسانەی دوێنێ بوو؛ دەمانکرد و دەمانوت. ئافەرینیش بۆ بەرپرسان و ئەمەش نیشانەی پەلەکردن و بێ بیرکردنەوەیەی ئێمەی پێشمەرگەیە کە دەرەنجامی لەو جۆرە ڕوو دەدات. ئەم ڕووداوە واقعییەی من گێڕامەوە، چی عومەر عەرەب و چی سەلاح چاوزەقیش لەلای زۆربەی پێشمەرگەی کەرت و تیپەکان کە ئێستەش زۆریان لە ژیاندا ماون، وتبوویان ئێمە بۆ یەکەم جارە پێشمەرگەی قارەمانی وەک شەهاب کەریم ببینین، زۆر جار بریندار داوا دەکات ڕزگاری بکەن، بەڵام شەهاب کەریم هاواری دەکرد «بمکوژن و بەجێم مەهێڵن».

## کامەران ئیسماعیل عارف،
## بە جەستە و ڕۆح لەنێو حسکدا گوللەباران کرا

بینینێکی سەخت بوو هاوڕێ، نەمدەزانی بەو شێوەیە سەرنجەکانت دەمکوژێت، وێنەکانت فرمێسک بارانم دەکات و خەندەی لێوەکانم لێ دەتورێت، گریانێکی پڕ ئازارە و جەستەم بەر نادات هاوڕێ گیان، مەرگی خۆمە و لەگەڵی دەدوێم، جەستەی خۆمە و نزای بۆ دەکەم، ئەوە توێت لە خوێنمدا ڕوو لە قیبلەی ئاڵاکەتم و لە ژووورە خنجیلانەکەتدا کڵپە دەمگرێت، ئەوە چاوەکانی منە بوونەتە چاویلکەکانت و تۆش بێئاگای لە من هاوڕێ گیان. من دەزانم کە ناتوانیت بە زمانە پاراوەکەی شاخ و بە بوێرییەکەی جاران بدوێیت، من تێدەگەم کە چی زوڵمێک ڕۆحتی گرتۆتە ئامێز و چی قوربانییەکی زوڵم گەورەی شاخی، ئەو خەندە کەمانەت دەناسمەوە کە چەند قووڵن بە مێژوویەک کە لێت تۆراوە و ناتناسنەوە.

ئەو سیما دەروێشییە بێنازەی هەمیشە دەتکاتە جێ سەرنج و نیگای تۆبەکارانی زەمەن و زیکری فەنابوونێکی تر دەبەخشیتەوە بە جودایی ڕۆح و دابڕانی گەل و نیشتمان. بیرت نەچێ هاوڕێ گیان، بە دڵ گوێ

ڕادێرە، دەنگی پڕ گرییەی قوربانیان و حەسرەتی دایکی شەهیدان و ڕۆحی زیندووت ئاوێزانی ژینەژانی ئەم گەلە بووە و لە گەردنی جەللادەکانی بوونە سەرکردە و سەرۆک نابنەوە. ئاسوودە بە هاوڕێ گیان، تۆ پەڵەیەکی ڕەشی بە تەوێڵی مێژوویەکەوە کە هەموان قێزی لێ دەکەنەوە. ئاسوودە بە، هەر تۆ سەربەرزتری، دڵنیا بە لەوێش مامۆستا سەردار چاوەڕێتە، چۆن ئەو لەگەڵ تۆدا گوللەباران کران، ئەو بە جەستە و تۆش بە ڕۆحت کاکە کامەرانی ئیسماعیل عارف، دڵنیاشین کە ڕۆحت لەگەڵ ئەودا خستە ژێر خاک، ئەوەش بووەتە هۆکاری ئەوەی جەستەت لێرەدا هیچمان پێ ناڵێت و بزە و خۆشی و ڕۆح و بەرامەی ئاسوودەییتە لێرەدا ئەی شەهیدی هەمیشە زیندووی گۆڕەپانی زوڵم و ستەم، ئەی شەهیدی ڕێی خەبات و خەڵک و شاخ و دەغڵێکی وا بێبەرهەم!

هاوڕێ گیان، پێش چەندین ساڵ لە دووت دەگەڕام، هەر وێنەیەکی تۆم هەبوو... ئای چەند ئازارم دەچەشت دوای ئەو هەموو ساڵە لێکدابڕانە! کە بیستمەوە چۆن لە نەخۆشخانەیەکدا تەنها کەوتوویت، ژیان و باری گوزەران و شوێن و جێگەت نەزانرابوو، بە هۆی نووسینەکانم و بەسەرکردنەوەی هاوسەنگەرانم، توانیم لە ژوورێکی تەنهای نەخۆشخانەیەکدا لە وڵاتی سویدی دنیای غوربەتدا بتدۆزمەوە، ئەی هاوڕێ و هاوسەنگەری ڕۆژگاری سەختی خەباتم...

کامەران ئیسماعیل عارف ناسراو بە «وشیارە سوور»، لە سەرەتای ساڵی هەشتاکاندا دەبێتە پێشمەرگە و لە شەڕی ناچارکراوی براکوژیی یەکێتیی نیشتمانی و بەرەی جوددا، لەگەڵ کادر و پێشمەرگەی دێرین «مامۆستا سەردار» و نەوزاد ناسراو بە «نەوەی سەموون» دەکەوێتە بۆسەیەکی حیزبی سۆسیالیستی کوردستان (حسک) و پاش لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوە، لە هەمان کاتیشدا چەند پێشمەرگەیەکی حیزبی سۆسیالیست بە ناوی: شێخ عیسا، کەمالی حاجی ئیبراهیم، حەسەنی حەمە نوقڵە، عومەری حەلاو، ئاراس قادر منەوەر (ئاراسی قالە منەوەر) و فەرەیدوون، لەلای یەکێتیی نیشتمانیی

کوردستان «دیل» و دەستبەسەر دەبن و هەریەک لە حیزبەکان نەخشە و پلانی خۆیان دادەڕێژن بۆ بەدیهێنانی سەرکەوتن بەسەر حیزبەکانی تردا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ گوناح و تاوانێکی پێشمەرگە لەنێو ئەو شەڕ و خوێنڕشتن و بەربەرەکانێدا نەبووە، بەڵکوو پێشمەرگەی هەموو حیزبەکان لە دڵسۆزی و هاوخەمییان بۆ گەلەکەیان، سنگی خۆیان دەنا بە گوللەی دوژمنەوە و چاوەڕوانی هیچ پاداشتێکی تر نەدەبوون.

سەرەتا دەمەوێت بۆ مێژوو پێناسەی خەباتی هاوڕێی دێرین و هاوسەنگەرم کامەرانی ئیسماعیل عارف (وشیارە سوور) بکەم. لە بنەماڵەیەکی شۆڕشگێڕ و دڵسۆز بوو. «ئیسماعیل عارف»، نووسەر و شاعیر و ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو. ئەردەڵانی ئیسماعیل عارف پێشمەرگەیەکی قارەمانی شار و شاخ بوو، پاشان هاوڕێی و هاوسەنگەری باوەڕپێکراوم بوو. کوردستان ئیسماعیل عارف کە خوشکی کامەران بوو، لە ناخۆشترین و ترسناکترین ڕۆژگاری سەختی خەباتدا کاتێک کە بریندار بووم لەنێو شاردا، وەک ئەندامێکی ڕێکخستنی دێرینی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لەگەڵ ئاریی وەستا ئەحمەدی دارتاش هاوکارییان کردووم بۆ سەر سنووری ئازادکراوی نێو هێزی پێشمەرگە. کامەرانی ئیسماعیل عارف لەو کاتەی بەدیل دەگیرێت لە ئەنجامی شەڕی بەرەی جوددا و لەلایەن حیزبی سۆسیالیست (حسک)، تەمەنی تەنها حەڤدە ساڵان دەبێت.

بەپێی مێژووی تاوانکاری و دەستوەشاندن بەنیازی کوشتن و تیرۆرکردن، هیچ حیزبێک بەدەر نییە لەو گرفت و تاوانکاری و تەنانەت بە کۆمەڵ کوشتنی پێشمەرگە. ئەوەی کە دەبووە سووتەمەنی، کەمترینیان بەرپرسان و زۆرترینیان پێشمەرگەی کوڕی بنەماڵە هەژارەکان بوون، وەک چۆن بارودۆخی سیاسیی ئێستای کوردستان کە زۆرترین دەوڵەمەند و خاوەن پاسەوان و سەروەت و سامان و هێز و عەشرەت تەنها هەندێک لە بەرپرسەکانی نێو حیزبەکانن، بەڵام سەدان نووسەر و ماڵپەڕ و نۆکەریان هەیە، کە بە دڵسۆزترین کەس پێناسەیان دەکەن، بەڵکوو وەک کرێکارێک و

ڕەنجدەر و جووتیارێکی بێ خاوەن زەوی، نۆکەرێک دێت و بێشەرمانە لە کەناڵەکانەوە بەبەر چاو هاوڵاتییانەوە سوێند دەخوات و دەڵێت من چوومەتە ماڵی سەرۆک، بەزەییم پێدا هاتووەتەوە و ماڵەکەی تەنها سێ ژوور بووە و لە ماڵەکەی من بچووکتر بووە... گەر زۆریش لەسەر ئەو ماستاوکردن و ترش و خوێ پێوەکردنەدا بڕۆشتایە، لە هەمان تیڤییەوە و لە هەمان کۆبوونەوەی گشتیی حیزبیدا، دوور نەبوو پێی بوتینایە سەرۆک نانیش نییە بیخوات. هەتا ئێمە خاوەنی لەم سیاسەتمەدار و کەڵەنووسەر و ناڕاستگۆیانە بین، ژمارەی دیکتاتۆرەکان هەمیشە لە پەرەسەندندا دەبن. ئەوەی دەبێتە جێی سەرنج و تێبینیی زیاتریش، دەروێشان زکر لەسەر هەندێک گۆڕی بەرپرسی تاوانباری بکوژی نێو مێژووی خەباتی بزووتنەوەکانی کوردستان دەکەن، چۆن دەبێت و دەکرێت بکوژێک ببێتە گەورەی ئاخوندە و عەمامەبەسەرەکان! ئەوانەی لە ڕۆژگارێکدا بوو باوەڕیان بە دیموکراسی هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەباتگێڕانیان لە پێناو شاردنەوەی تاوانەکانیان دەکوشت و پەکتاویان دەکرد، دەبێت ئەمەش مەتەڵ نەبێت دەروێشان زکر لەسەر بکوژانی هاوسەنگەراندا بکەن؟ ساڵانێک بوو حیزبی ئیسلامی بە پاڵپشتیی عەمامەبەسەرەکانی جمهوری ئیسلامیی کۆنەپەرستی ئێران، فەتوای کوشتنی پێشمەرگەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانیان دەدا و لەنێو بازنەی هێزی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیدا تێکۆشەری دێرینی فەرماندە «سەلاحی موهەندیس»یان شەهید دەکرد و بۆ کوشتنی ئەندامانی سەرکردایەتیی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بێمنەت بوون لەو پێناوەدا بکوژرێن، بەڵام بارودۆخی بەرژەوەندییەکان لەدوای ڕاپەڕینی سەرتاسەریی کوردستان، بە ئاقارێکی تری کەسایەتییەکاندا شکایەوە.

کاتێک هەواڵی بەدیلگرتنی کادری بەتوانا و دڵسۆز و هەردوو تێکۆشەری دێرین؛ مامۆستا سەردار و نەوەی سەموونمان پێ گەیشت، گوایە ئازار و ئەشکەنجەیەکی ئێجگار زۆریان دەدەن و دواتر بۆ تۆقاندن و چۆکدادانیان گۆڕی خۆیانیان پێ هەڵدەکەنن، دواتر مامۆستا سەردار لەبەردەم گۆڕەکەی

خۆیدا شەهید دەکەن و هەردوو دیلەکەی تر؛ نەوەی سەموون و کامەرانی ئیسماعیل عارف لەگەڵ دیلەکانی تری حیزبی سۆسیالیستدا کە لەلای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەبن، هەریەکەیان ئازاد دەکرێن. دوابەدوای ئەوە کامەرانی ئیسماعیل عارف بە نامەیەکی فەرمیی تیپ ڕەوانەی کەرتی ئێمە کرا، کەرتی پێنجی شەهید هاوڕێ جەبار، تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون، کە فەرماندەی کەرتەکەی عومەر عەرەب و جێگرەکەی سەلاح چاوزەق و خۆشم فەرماندەی مەفرەزەی کەرتەکە بووم. بەڵام بەپێچەوانەوە، لە ڕێکەوتی ٢٠١٩/٢/٢٨دا، لە سەردانێکی تایبەت لە شوێنی حەوانەوەی خۆیدا لە «گوڵەخانە» چاوم بە سکرتێری گشتیی حیزبی سۆسیالیست (حسک)؛ محەمەدی حاجی مەحموود کەوت و هەمان مێژووم لێ دووبارە کردەوە سەبارەت بە شەهیدکردنی مامۆستا سەردار و شێوازی گۆڕینەوەی دیلەکان.

محەمەدی حاجی مەحمود پێی ڕاگەیاندم و وتی: بەڵێ ڕاستە، ئەو پێشمەرگانە لەلای ئێمە دیل بوون و پێشمەرگەی ئێمەش لەلای یەکێتی دیل بوون، مامۆستا سەردار لە کاتێکدا وەک دەستبەسەرێک نەوەک دیلێک پێشمەرگەکانی حسک مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە و ڕێزیشیان لێ گرتووە، بەڵام مامۆستا سەردار پەلاماری چەکی شانی پێشمەرگەیەکی داوە بۆ ئەوەی خۆی دەرباز بکات و بگەڕێتەوە ناو یەکێتی، لەو کاتەدا پێشمەرگەیەک بۆ نیازی کوشتنی تەقەی نەکردووە، بەڵکوو کێشەکە وای لێ هات مامۆستا سەردار شەهید بێت. لەو ڕووداوەدا چەندین کەس شایەتحاڵن و هێشتا لە ژیانیشدا ماون، من ئێستەش ویژدانم ئازارم دەدات کە پێشمەرگەی هەموو حیزبەکان بە سەرکردەکانیشەوە لەنێو شەڕی براکوژیدا شەهید بوون.

تێکۆشەری دێرین کامەرانی ئیسماعیل عارف (وشیارە سوور) لە کەرتەکەماندا باری دەروونی و تەندروستیی بەرەو خراپتر دەچوو، تەنانەت شەوێکیان دوو کاتژمێر ئێشکگر (حەرەس) بوو بەسەرمانەوە. هەموومان خەوتبووین، لە نیوەشەودا میلی تفەنگی لە هەموومان هێنایەوە و تەقەی دەکرد بە ئاسماندا و وەخت بوو زۆرمان بکوژێت، بەدەم هاوارکردنەوە

ناوی شەهید مامۆستا سەرداری دەبرد، ناچار بۆ ئەوەی تووشی کارەسات و کێشەی گەورە نەبین، چەکەکەمان لێ وەرگرت و تا دەهات باری تەندروستیی خراپتر دەبوو، بەڵام دواتر لەگەڵ خوشک و براکانیدا لە کۆچڕەویی دوای تێکچوونی دانوستانی یەکێتی و ڕژێمی بەعس بەرەو هەندەران بەڕێ کەوتن و ئێستەش پتر لە سی ساڵ دەبێت لە نەخۆشخانەیەکی دەروونیی وڵاتی سویددا دەژی و ناوی خۆی و خانەوادە و هاوڕێکانی لەبیر چووەتەوە و تەنها ناوی شەهید مامۆستا سەردار و ناوی کوردستانی لەسەر زارە. کارەسات و چیرۆکی پڕ تراژیدیای نێو شەڕی کوردکوشتن و خۆبردنەوە پێشەوەی حیزب و بەرژەوەندییەکانی تاکەکەسی زۆرن و ئاستەمە لەیاد بکرێن، بەڵام مێژوو حەقیقەتی سووتەمەنییەکان و ستەم هیچ کات ون ناکات.

## کوشتنی وریا و پاکتاوکردنی ئەندامانی ئیختیالات، کۆمەڵەی کرد بە دوو بەشەوە

قسەکردن لەسەر ڕابردووی گەلێکی وەک کورد لە ئێستەدا کارێکی قورس و گران و ترسناکە، هەڵدانەوەی مێژووەکەی پرووکێنەر و هەندێک جاریش تۆقێنەر و قێزەوەنە بۆ سەر پەرتووکێک و خستنە بەر دیدی گەنجانی کوردستان و نەوەی داهاتوو. لێرە و لەوێ باس لە بوونی شەرعیەتی شۆڕشگێڕی دەکرێت لە هەموو کایەکاندا و دەیخەنەوە بەرچاو و گوتەی هەمەچەشنە لەو بارەوە دەوترێت کە لە لاپەڕەکانی پێشوودا ئەو جۆرە ڕەفتار و کردارانەم بە لاوازی هەڵسەنگاندووە و تانەوتەشەری نۆکەرانی حیزبی و بەرژەوەندیخواز هەمیشە حەقیقەتی مێژوویان پێ نادروست و ناڕەوایە و ئەوەشی کە بەلایانەوە ڕاست و دروستە، بە ڕاز و نیازی ئەوان چەواشەکاری لە مێژوودا بکرێت. بەڵام ئەوەی بەلای منەوە گرنگە، ئەم دوو چەمکە پێکەوەلکاوەی ئەمڕۆ وەک کەرەستەی چاوبەستکردن و خەڵەفاندن و فرۆشتنەوەی جوامێری بە هاوڵاتییان، بۆیە دەڵێم ئیتر با کۆتایی بێت، سەرانی

سەرکردایەتی و بەرپرسانی هەندێک لەنێو حیزبەکان یادەوەرییەکانیان بە هەڵە و زۆرترین بەرژەوەندیی خۆیان نەنووسنەوە. یادەوەریی من وەک شەهاب کەریم، یادەوەرییەکە لە ناخی هەڵقوڵای پێشمەرگەیەک کە بە هەژاری و نەداری و تەمەنێکی زۆر کەم چەکی کردووەتە شان و چۆتە ناو ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە چیا بەرز و سەختەکانی کوردستاندا. ئەوەشی کە دەینووسم و دەیگێڕمەوە، بەشدارم لە هەموو هەڵە و کوموکوڕییەکانی ڕۆژگاری سەختی خەباتم. بەڵام هەندێک لە بەرپرسان و سەرکردایەتیی نێو حیزبەکان پێیان شەرمە لە یادەوەرییەکانیاندا باس لە هەڵەکانیان بکەن، لەوەتەی بە خوێنی هاوڵاتییان و نان و پێخەفی تاک بە تاکی هاوڵاتییانی گوندنشینەکان و باج و سەرانەی سەر مەرز و ڕێگرتن لە ئازادییەکانی تاکی نێو کۆمەڵگە و بە کۆمەڵ کۆچکردن، لە چارەنووسێکی نادیارەوە بۆ چارەنووسێکی تر و گەیشتن بە هیوا و ئامانجەکانی پاشەڕۆژی ژیانیان.

بۆ مێژووش دەڵێم: ئایا کێ بەرپرسیارە لە ئاست ئەنفال و شەهیدبوونی پێشمەرگە و جینۆسایدکردنی هەزاران هاوڵاتیی سڤیل و کاولکردن و خاپوورکردنی پتر لە پێنج هەزار گوندی کوردستان؟ ئەوە من نەبووم کە تەمەنم لەو کاتەدا مێردمناڵ بووم، ئەوە پێشمەرگە نەبوو بێئاگا بوو لە سیاسیەتی ناڕەوای نێو حیزبەکان، ئەوە هەندێک لە سەرکردەکانی حیزب بوون ئێمەیان دەناردەوە بۆ شار و نارنجۆکیان پێ دەتەقاندینەوە و ئافرەتیان پێ بە کوشت دەداین، گوایە لەشفرۆشن و ڕێکخستنەکانی شار بەگرت دەدەن. گەر بڕوانینە ڕابردووی ئەو مێژووە هەلپەرستەی بەگوێی ئێمەی تازەپێگەیشتوو و مێردمنداڵدا دەچرپێنرا، فڵانە ئافرەت لەشفرۆشە و لەشفرۆشی بە پیاوانی ڕژێم دەکات. لەگەڵ ڕێزم بۆ مافی تاکی نێو کۆمەڵگە، هێندەی ئێستە لە پرۆسەی ئازادی و حوکمەتی پەرلەماندا بێڕێزی بە مافی ئافرەتانەوە دەکرێت و ئافرەتانی وڵاتانی عەرەبی و تورک و فارس و پاکستان و هیندستان بە ناوی کارکردن و بەرژەوەندیی باری کۆمەڵایەتیی

گشتییەوە دەکرێت، کاری لەشفرۆشییان بۆ خزمەتی کۆمپانیاکانیان پێ دەکرێت. بەداخەوە لە نێوەندی سالّی حەفتادا، شاری سلێمانی ئافرەتێکی هەژاری بەسالاچووی خاوەن چەند منداڵێک بە ناوی «فاتە تەماتە» چووە نێو مێژووی لەشفرۆشان، بەلام لەگەڵ ڕێزمدا گەر بڕوانینە بارودۆخی ئێستای بێڕەوشتیی هەندێک پیاوان و ئافرەتان و هەندێک بەرپرسی ئێستە و بەرپرسی ڕژێمی بەعس، دەبینین سەدان فاتە تەماتە دروست بوون و سەدان قومارخانە و باڕ و دیسکۆ و باخ و تەنانەت زۆرترین کووچە و کۆلانەکانیش بە شار و شارۆچکەکانی کوردستانەوە پڕ بوون لە فاتە تەماتەکەی سالانی ڕابردووی سەرهەڵدانی شۆڕش و بزووتنەوەکانی کوردستان. هەندێک جاریش ئەو جۆرە ئافرەتانەی لە ڕابردوودا بە ئێمەیان بەکوشت دەدان، لە ئێمەی پێشمەرگە و خانەوادەی شەهیدان و کەسانی ئەکادیمی زیاتر قسەیان دەڕۆشت و بالادەستتر بوون. هەر چەندە لای ئێمە هێندە پێوانە دانراوە بۆ ئەوەی سنوورەکانی ئازادیی ژنان تەسک بکرێتەوە، ترادسوێنی کوردەواری و جەنجالّیی بیری دواکەوتووی ناوچەی ناوەڕاستی ڕۆژهەلات و تێکەڵەی تێگەیشتن و تەسکردنەوەی ئایدۆلۆژیای ئایینی بوونەتە دینگەکانی ڕاوەستانی بیری تەسکی کۆمەلایەتی بۆ کۆیلەکردنی مێینە، بەلام لەگەڵ ئەم هەموو بەربەستانەشدا جارجارە لە کۆمەڵگای کوردیدا شاژنانی کوردایەتی هاتوونەتە مەیدان و بێ گوێدانە هەر ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ترسناک؛ قۆڵیان لێ هەڵمالّیوە و بەشێک بوون لە هەنگاوە دیار و گەشەکانی کۆمەڵگای کوردەواری و شۆڕەسواری مەیدانێک بوون کە هەندێک پیاوانی کورد لە ئاستیاندا چۆکدادەر بوون. لە ڕۆژهەلات، هەر لە مەستوورە خانمەوە تا قەرە فاتم و تا عادیلە خانم و حەپسە خانی لەمەڕ ئێمە، ئەمانە کۆڵەکەی دەرکەوتەکانی جیهانی ژنی کوردەواری بوون، هەر ڕەگوڕیشەی ئەمانە بوون بۆ شۆڕشی ئەیلوول دەیان گوڵی نێرگزی باخچەی کوردایەتیی پەروەردە کرد و لە سەنگەری کوردایەتیدا هاوشانی کوڕانی پێشمەرگە دەجەنگان. لە شۆڕشی نوێدا ژمارەی ژنان و ڕۆڵی

ژنان هیچ بۆشاییەکی لە ڕووی پێشکەوتنی کورددا نەهێشتەوە، زیندان و سەنگەر و ڕێکخستنەکان ژن تیایدا کۆڵەکەیەکی خەبات و ماندووبوون بوو. ئەگەرچی دەوری ژنان و بەربەستەکانی بەردەم ژنانی کورد لە ئەرک و پێگە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بوونی هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵگای کوردەواری وەک ئەوەی ژن دەخوازێت؛ ڕێگر بووە و ئەوەی ژنان خۆیان بوون لەگەڵ کۆمەڵێک پیاوی تێگەیشتوو توانیویانە لانی کەم ژن لە کۆمەڵگای کوردیدا دەروازەی ئازادیی لێ بکرێتەوە. جێگای داخە نەریتە کۆنەکان و... هتد، هۆکارن ژنانی لەمەڕ ئێمەن هاوشانی ژنانی جیهان بێنە مەیدان. گەر بەراوردێک بکرێت لەنێوان سیستمی کارکردن و دیاردەی نەریتی کۆنەپەرستی و ڕەگەزپەرستیی وڵاتانی خۆرهەڵات و سیستمی کارکردنی وڵاتانی ڕۆژئاوا، دەبینین جیاوازیی نێوانیان بە سەدان ساڵ دەخەمڵێنرێت.

ژن کوشتن لە سەرەتای دروستبوون و سەرهەڵدانی شۆڕشدا، ترسێکی گەورەی خستە نێو دەروونی تاک بە تاکی گشتیی نێو کۆمەڵگە، هێندە ئێمەی شۆڕشگێڕ بڕوامان بە کوشتن هەبووە، بڕوامان بە چاکسازی نەبووە. هەموو تێکڕای حیزبەکان بۆ مێژوو دەڵێم تەنها دوو ئافرەتیان لەگەڵدا نەبووە لە سنووری هێزی سەربازیی پێشمەرگەدا، ئەو ژنانەی کە لەناو شۆڕشیشدا هەبوون، زۆر کەم بوون و بە پەنجەکانی دەست دەژمێردران، پاشان زۆرینەیان هاوسەری بەرپرسەکان بوون. کاتێک نەوشیروان مستەفا لە کۆبوونەوەیەکدا دەڵێت: ژن نابێت لە کەرت و تیپە سەربازییەکاندا بێت، دەبێت لە سەرکردایەتی و ڕاگەیاندنەکاندا پێشمەرگە بن، یەکێک لە ژنە بەرپرسەکان کە پێشمەرگە دەبێت و دەڵێت: نەخێر وا نییە کاک نەوشیروان، ئێمەش مافی خۆمانە لەگەڵ برا پێشمەرگەکانماندا دژ بە دوژمن بجەنگین. نەوشیروان مستەفا دەڵێت: تۆ چیت وا ئەم قسەیە دەکەیت! ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: یەکەم من ژنم و دووەمیش وەک تۆ پێشمەرگەم. ئێستە ئەو کەسە لە ژیاندا ماوە و بۆ مێژووش گەر پێویستی بە سەلماندن کرد، وەک بەڵگە دەتوانم بیخەمە ڕوو.

زۆر جار خۆم بەدوور دەگرم لە باسکردنی ڕابردووی خۆم لە سیاسەتدا، کە ئەمەش بۆ چەند هۆکارێک دەگەڕێتەوە: ئەوەیە هەریەکە و دێت و دەبێت بە پاڵەوانێک، بەتایبەت ئەوانەی بە سوتفەی زەمانە بوون بە سەرکردە و تا ئەمڕۆش وەک گوێزی ساغن، ئەوانەشی کە لە خەستەخانەکانی ئەورووپا مردن، عەیبیان نەبووە لە باری مالییەوە. کۆی ئەمانە بیرەوەریی خۆیان نوسیووەتەوە، خۆیان بە شۆڕشگێڕی نمرە یەک و حەکیم و پاڵەوانی شۆڕش دەزانن، چونکە بەو پارە بێشومارەی کە لە بەرهەمی شۆڕشەوە چینویانە، دەتوانن بیسەلمێنن کە ئەوان یەکەم شۆڕشگێر، ئەوان یەکەم پاڵەوان و ئەوان داهێنەر بوون، ئەوانەی وەک من و زۆرینەی هاوسەنگەرانم لاتوپاتەکانی زەمانەن...، ئیتر لە بیرەوەرییەکانیاندا کە لەپشت مێزە دەیان هەزار دۆلارەکانیانەوە دەینووسن و لەگەڵیشیدا گرانترین جۆری ویسکیی دونیا دەخۆنەوە، دەتوانن بیسەلمێنن کە ئەوان خاوەن شۆڕشن.

بوون بە ئەندامێتیی کۆمەڵە؛ ئەوسا نەریت بوو، ئەندامبوون لە پارتێکی مارکسی-لینینی؛ مانای ئەندامبوونت بوو لە هەموو حزب و پارتێکی دیکەی جیهاندا کە هەڵگری ڕێبازی مارکسیزم-لینینزم بێت لە خەباتی نهێنیدا.

بەهەرحاڵ، ئەو زەمەنە وەک هەموو گەنجێک وامان دەزانی دەتوانین لە شەو و ڕۆژێکدا جیهان بگۆڕین، ئاوا بە خۆپەروەردەکردن بەم تیۆرەی مارکسیزم-لینینیزم، پاشان قووڵبوونەوە لە مێژووی سیاسیی کوردستان و دابەشبوونی کوردستان، کە ئەم بابەتە دواتر جیاوازییە خوێناوییەکەی نێوان «عێراقچێتی» و «کوردستانی»ی لێ کەوتەوە. پاشان ئەرکی دیکە هەبوو، ئەوی تر کارە مەترسیدارەکان؛ کۆکردنەوەی پارە و سەرانەسەندن لە خەڵکی دەوڵەمەند بۆ شۆڕش و سەرپەرشتیی بڵاوکردنەوەی بەیانات، دیوار نووسین، زانیاری کۆکردنەوە لەمەڕ پیاوانی بەعس و سیخوڕ و ئەمنەکان و زانینی هاتوچۆ و شوێنی کەمین و ژمارە و زۆری تر...، ئەمە جگە لە پەیوەندی بە خەتی «ئیختیالات» کە لێرەوە لێپرسراوی لیژنەکان و ئەندامۆڵەکان ڕا و سەرنجیان دەناردە ناوەندی کۆمەڵە، بەڵام لە دواییدا،

دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک، بۆمان دەرکەت کە سکرتێری گشتیی کۆمەڵە (نەوشیروان مستەفا) ئەم خەتە ئیغتیالاتە بۆ خۆی و بەرژەوەندی و میزاجی خۆی بەکار هێناوە، بەتایبەت لەدوای ڕووداوی کوشتنی وریای وەستا وەهاب ناسراو بە «وریا ڕەش». لێرەوە و لەم قەیرانەدا من دەتوانم باسی ئەو کاریگەرییانە بکەم کە لە «وریا»وە دەست پێ دەکات، تاوەکوو بڕیارە هەڵە و کوشندەکانی شۆڕش و کەرتبوونی کۆمەڵە و پلانی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە. ئێستا کە بیر لەو ڕۆژانە دەکەمەوە و بۆ یەکەم جار دەربارەی کوژرانی «وریای وەستا وەهاب» و جۆری کوشتنەکەی بەو شێوە ناشرینەی کە بە لەتوپەتیان کردبوو، دەزانم کە شۆکێکی گەورەی لەناو کۆی ڕێکخراوەکە و ئەندامانی کۆمەڵە دروست کردبوو کە یەکسەر نا، بەڵکوو لەسەرخۆ کاریگەریی خۆی دادەنا. چۆن؟ هەندێک شۆک هەن یەکسەر ڕێکخراوێک، جڤاتێک، خێزانێک، کەسێک، پەیوەندییەک لەتوپەت دەکەن، بەڵام هەندێک شۆکیش هەیە ماوەیەکی دەوێت ڕیالیزەی بکەیت، ئەوسا کاریگەریی قووڵی دەبێت، پاشان وەک دەزووولە ئاوێک وەهایە وردە وردە جۆگەلەیەکی باریک لەناو زەوییەکی قڵیشبردوودا دروست دەکات و دەچێتە ناو کەلێنەکانەوە و هەمووی دەکات بە قوڕ و لیتە. لە شۆکی ڕاستەوخۆدا مرۆڤ هەڵدەستێتەوە و ئەگەری هەستانەوەی هەیە، لە دووهەمدا وردە وردە دەچێتە هەموو خانەیەکەوە و هەڵتدەوەشێنێتەوە. دیارە زەویی سیاسیی کۆمەڵەی ڕەنجدەران، نەک ئایدۆلۆژی، خۆی لە خۆیدا لەدوای شەهیدبوونی ئارام (شاسوار جەلال) وشک بووبوو، بەڵام دەستبەسەراگرتنی نەوشیروان موستەفا و تاقمەکە و قورسایی ئەو پیاوە لە ڕووی فیکرییەوە، بەو سیفەتەی خوێندکاری دکتۆرا بووە لە ڤییەنا و چەند ساڵ لە ئەورووپا بووە، کارێکی وەهای کرد کە کەلێنی شەهید ئارام زۆر نێگەتیڤانە پڕ بێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا نەوشیروان مستەفا تەنێکی نامۆ بوو لە جەستەی کۆمەڵەدا، خۆی ئەوەی دەزانی، هەر بۆیە زەویی کۆمەڵە وردە وردە وشک بووبوو، ئەوەندەی مابوو جۆگە باریکەکەی بۆ بەر بدەیتەوە

تاوەکوو هەموو قڵیشەکان دەبنە قوڕ و لیتە، لێرەوە نەوشیروان مستەفا قۆناغ لەدوای قۆناغ سەکۆی دروست کرد لەناو هەناوی ڕێکخراوەکەدا. هۆکاری سەرەکی ئەوە بوو کەناڵی زانیاری و زانینی ڕاستییەکان لەو زەمەنەدا لاواز بوو، مرۆڤ نەیدەزانی دوو کۆڵان لەولای خۆیەوە چی ڕووی داوە، سەرەڕای وردەکاریی زۆرانبازییەکانی ناو کۆمەڵە و کادرەکانی شاخ لەناو یەکتردا. کەمتەمەنی و حەماسم ڕێگەی نەدەدام بە هیچ کلۆجێک بیر لەوە بکەمەوە کە شۆڕش بە هەڵەدا دەڕوات و لەسەر لێواری هەڵدێرە. حەماسی شۆڕشگێڕانەی گەنجانە، من و هاوڕێکانمی خستبووە ناو بلقێکەوە کە گوێمان لە دەنگی دەرەوە نەبێت، هەوڵیش نەدەین پرسیار بکەین، هەستمان دەکرد گەر هەر گومانێک بکەین، ئەوا مانای ترسنۆکی و چۆکدادانە لەبەرامبەر بەعسی فاشی، کە ڕۆژانە خەڵکی دەکوشت و ئەشکەنجەی دەدان و سیاسەتی تەهجیر و تەعریب و تەبعیسی پیادە دەکرد، هەر بۆیە ڕێکخراوی ناوشار تاوەکوو دوای مفاوەزاتی ١٩٨٥ توند و تۆڵیی بەخۆیەوە بینی. بەڵام بەگشتی هاوڕێیانم، ئەوانەی ماون لە ژیاندا و ئەوانەشی لە بارودۆخی تەمومژاویدا شەهید بوون، گەنجانێک بووین پڕ حەماس و جووڵە، لە پێناو ئازادیی کوردستان و کۆتاییهێنان بە داگیرکاریی بەعس. یەکێک لە کادرە دڵسۆزەکانی ناو ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشار بە ناوی «هاوڕێ عاشوور»، پێی ڕاگەیاندم و وتی: «لەگەڵ مفاوەزاتدا لیژنەکانی ئێمە، لیژنەی شانەی سەرەکی کە هەریەکە و لێپرسراوی سێ شانە تا پێنج شانەی سەرەکی دەبوو و ئەوانیش شانەیەک یان سیان و هەر شانەیەی لە سێ تا پێنج کەس پێک هاتبوو، خۆڕسکانە لەگەڵ پۆل و کەرتدا ئەو بڕیارەمان تەعمیم دەکرد کە حەماسی دانوستان وەهامان لێ نەکات ڕەوتی نهێنیی خۆمان لەدەست بدەین. بەشداریی هیچ ئاهەنگ و بۆنەی پێشمەرگەمان نەدەکرد کە ڕژابوونە شارەکان، خۆمان دوور دەگرت لەوەی هیچ ئەندامێکمان فۆتۆی پێشمەرگە شەهیدەکان و شەهید ئارامی پێ بێت، وەک چۆن گەنجانی تر ئەوەیان دەکرد، کۆی ڕێکخراو دیسپلینی هەبوو و دەمانزانی ئەمن و

ئیستخبارات و مەنزوومەی شیمالی؛ دانوستان بە فرسەتێکی باش دادەنێت بۆ ئاشکراکردنی کادرەکانی ناوشارمان، لێرەوە هەمووان بەو بڕیارانەوە پابەند بووین. بەداخەوە دوای تێکچوونی دانوستان، ژمارەیەکی بێشومار لە گەنجان دەستگیر کران، بەتایبەت ئەوانەی تەنها هاوسۆز بوون لەگەڵ کۆمەڵە و پێشمەرگەی یەکێتی و زۆریشیان لەژێر ئەشکەنجەی سەختدا گیانیان لەدەست دا، هەندێکیان ڕایانکردە شاخ و بوون بە پێشمەرگە. دەبێت بیری شۆڕشگێڕانە زاڵ بێت بەسەر حەماسی شۆڕشگێڕانەدا. دیارە بە هۆی حەزی خۆم لە خوێندنەوە و مێژووی سیاسیی عێراق و کوردستان، تێمگەیاندن کە مفاوەزات مانای بوون بە حکومەت ناگەیەنێت، هەر شتێکیش لەتەنیشت بەعسەوە دروست بێت، گەر حکومەتێکی بچووکیش بێت، بەعس ئێستا دڵداریی لەگەڵدا دەکات و دەیخاتە لیستەوە و لە داهاتووشدا لەناوی دەبات. ئەزموونی حوکمی زاتیی ۱۹۷۰ و پاشان هەڵگیرسانەوەی شۆڕش و نشوستی ۱۹۷٥ لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی، نموونەیەک بوو بەردەوام دووبارەم دەکردەوە.

## خێوی شەهید «وریا ڕەش»، وەك ئەو خێوەی مارکس و ئەنگلس

لە خاڵی دووهەمی دانوستاندا، ئەوە بوو کە ئەمە لای من پۆزەتیڤە، لە خەو ڕاچەنین و خێوی شەهید «وریا ڕەش» وەک ئەو خێوەی مارکس و ئەنگلس لە «مانیفێستی حزبی کۆمۆنیست»دا باسیان لێوە دەکرد، کە بەسەر ئەورووپای سەرمایەداریدا دەخولێتەوە و دەیترسێنێت، بەو شێوەیە خێوی وریا ڕەش هاتە ناو ڕێکخراوەوە و هەمووان باسیان دەکرد. هەمووان تا ئەو کاتە سەرقاڵی کاری ڕێکخراوەیی بوون کە چەندە مەترسیدار بوو لەناو جەرگەی بەعسدا کار بکەیت، هەر بۆیە زیاتر فۆکس خرابووە سەر نهێنیی ڕاگری کارەکان و جۆری بەرگری و ڕێکخستن و خۆپەروەردەکردنی

ئایدۆلۆژی و پەرەپێدانی ڕێکخستن، هەناسە نەبوو بۆ ئەندامانی کۆمەڵە لە ڕێکخستنەکانی شاردا سەرقاڵی دنیایەکی تر بن کە دنیای شاخ و زۆرانبازییەکانیەتی. لە ڕاستیدا شاخ بۆ ئێمە تەنها ئەڵقەی دووهەمی درێژەپێدانی خەباتی سیاسی بوو، چونکە هەمووان دەمانزانی بە چەند سەد پێشمەرگەیەک و چەکی کەم؛ حکومەتێکی وەک سەددام ناڕووخێت، بەتایبەت سەددام هەموو دنیای ڕۆژئاوای لەپشت بوو، سەددام شەڕی ئێران و خومەینیی دەکرد و پارێزەری بەرژەوەندیی ئەمەریکا و ڕۆژئاوا بوو لە ناوچەکە و لە هەمان کاتیشدا دەوڵەتانی عەرەب وەک سەرکردەی پێویست بۆ دەوڵەتانی عەرەب سەیریان دەکرد. لێرەوە لە ڕووی سیاسییەوە دەمانزانی خەباتی چەکداری ئامانج نییە، بەڵکوو میتۆدێکە و ڕێکخستنەکان؛ داینەمۆی شۆڕش و تۆڕە گەورەکەیەتی، هەر لەبەر ئەمەش بوو لە دواییدا هەندێک لە سەرکردەکانی شاخ هەوڵی گەورەیان دا ڕێکخستنەکان لە ناوەوە هەڵبوەشێننەوە و ڕۆڵیان کاڵ بکەنەوە و تا ئەمڕۆشی پێوە بێت خۆیان لە باسکردنی ڕۆڵی گرنگی ڕێکخستنەکان دەپارێزن، کە باسیشیان دەکەن، باس لەوە ناکەن کە کەرت و پۆل و شانە سەرەکییەکانی ناوشار وەک سەکردایەتیی خۆجێیی کاریان دەکرد لەژێر چەتری ئایدۆلۆژیی مارکسیزم-لینینزمدا، بەڵکوو وەک ئەوەی کۆی ڕێکخستنەکان هەمووی بووکەشووشە بن و بە پەتی دەستی ئەوان هەڵسووڕابن، کە ئەمە دوورە لە ڕاستییەوە، تێیدایە لە حەفتاکاندا ئابوونەی ڕێکخراوی خواردووە، کەچی ئێستا خۆی بە شۆڕشگێڕ و خەباتگێڕی پلە یەکی ئەو سەردەمە تێدەگات، لەو وەهمەدا دەژی کە شتەکان لەبیر کراون. با لێرەدا بوەستم، چونکە نامەوێت بچمە بازنەیەکی ترەوە، بەڵام ئەوەندە دەڵێم پاڵەوانەکانی سەر شاشەکان کە باسی مێژووی کۆمەڵە و ئارام دەکەن، با ئەوەندە خۆیان نەکەنە سێنترال، چونکە هێشتا ئێمە زیندووین.

## فەرمانی نەوشیروان مستەفا و
## شەهیدکردنی وریا بە دەستی جەبار فەرمان

بەهەرحاڵ، لە دانوستاندا وردە وردە پێشمەرگەی کەرتە سەربازییەکان نەک کادرەکانی شاخ؛ قسەیان دەکرد، بەتایبەت ئەوانەی هۆشیار بوون و ئاگاداری زۆرانبازییەکان بوون باسی شەهید «وریای وەستا وەهاب»یان دەکرد، باسی فەرمانی نەوشیروان مستەفا بە کوشتنی و تەورەکەی «جەبار فەرمان» و چەند کەسێکیان دەکرد کە یەکێکیان دوای ڕاپەڕین لە شەڕدا کوژرا، باسی ڕۆڵی خراپی «فەرەیدوون عەبدولقادر»یان دەکرد لە هەڵگیرسان و تیژکردنەوەی زۆرانبازییەکان کە سەر بە کوتلەی نەوشیروان بوو، جگە لەوە لەتوپەتکردنی جەستەی شەهید «وریا» و هێشتنەوەی لە کایانی ئالیکخواردنی ئاژەڵدا بەلەتوپەتکراوی و تەسلیمکردنەوەی بەو جۆرە خانەوادەکەی، باسێکە تاوەکوو ئێستا ڕۆحی هەمووان بریندار دەکات. باسی تۆخبوونەوەی تەوژمی «ئاڵای شۆڕش»یان دەکرد و چۆن شۆڕش ئەو کادر و پێشمەرگانەی سەر بە ئاڵای شۆڕشن، زیندانی دەکرێن و ئازار دەدرێن و زۆریشیان بێگومان دوای مفاوەزات کوژران، بە جۆرێک گۆڕی خۆیان پێ هەڵکەندوون و دوایی لەلایەن هاوڕێکانی خۆیانەوە گوللەباران کران...

## بیروراکانی ئاڵای شۆڕش و واژۆکردن
## لەسەر گوللەبارانکردنی سەرکردەکانیان

بەو شێوەیە هەواڵەکان و بیروڕاکانی ئاڵای شۆڕش وردە وردە کاریگەریی خۆی لەسەر ڕێکخراوی سلێمانی دادەنا. من بیرم دێت لە کۆبوونەوەیەکدا ڕەخنەیەکم گرت، هاوڕێیەکم بەتەوسەوە گوتی: «چییە کوڕی باش، نەبوو بیت بە ئاش!» دیارە مەبەستی ئەو هاوڕێ توندڕەوە، کورتکراوەی «ئاڵای شۆڕش» بوو کە نەوشیروان مستەفا یەکێک لە نەریتەکانی ئەوە بوو ناو و ناتۆرەی لەو کەس و بیروڕایانە دەنا کە خۆی بەدڵی نییە و «ئاش»ی لی داهێنابوون... ئاوەها

من وەک خۆم لەدوای ١٩٨٥ هەستم دەکرد چیتر کۆمەڵە ئەو کۆمەڵەیەی جاران نەماوە، هەمووومان چیتر ئەو بنەمایەی کە لەنێو ڕێکخراوێکی مارکسی-لینینستی دا پێمان دەگوت «ڕەخنە و ڕەخنەلەخۆگرتن»؛ پەیڕەو نەدەکرا و خۆمان لێ لا دەدا و گومان لە یەکتری هەبوو، بێ ئەوەی کەس بەڕاستگۆیی باسی ئەم گومانە بکات. بەردەوام بووین لە کۆبوونەوە و کاری ڕێکخراوەیی، بەڵام دواتر درووشمی چەکوش و داس وەک ڕەمز لا برا و سەرەتای نامەکان کە کاتی خۆی بە پەرەگرافێک دەستی پێ دەکرد: «بەرەو پارتی پێشڕەوی چینی کرێکار لە کوردستاندا» و «کرێکارانی جیهان یەک بگرن» و زۆری تر نەما. نامەی ڕێکخراو لە نامەی کەسی دەچوو، کۆبوونەوەکان دوور خرابوونەوە لە ماوەی زەمەنیدا، گوایە لەبەر ئەمنیەت چالاکیی ئێمە تەنها لە زانیاری کۆکردنەوە لەمەڕ پیاوانی ڕژێم کۆ کرابووەوە و دیارە دواییش بۆمان دەرکەوت کە زۆریان پیاوی ڕژێم نەبوون! لەدوای مفاوەزات، گرتن و هەڵمەتی ناوەندی کۆمەڵە بۆ سەر ئاڵای شۆڕش شتێک نەبوو بشاردرێتەوە و چووە قۆناغێکی ترسناکەوە کە جەستەی ڕێکخراوەکانی شار و شارۆچکە و گوندەکانی کوردستانی بەرەو شلبوون و هەڵوەشاندنەوە برد. لە هەموو بۆنەیەکیشدا، باسی کوشتنە ترسناکەکەی کوڕێکی ئازا و چاونەترس و شۆشگێڕی وەک «وریا ڕەش» دەکرا، لەو ڕۆژەوە تا ئێستاش وریا بۆتە گرێی دەروونیی کۆی ئەوانەی لەو زمەنەدا ژیاون. ئەوانەی جەللادی بوون، بەو داخ و ڕیسواییەوە سەریان نایەوە و ئەوانەشی لەناو ڕێکخراودا بوون، تا ئەمڕۆ وریا وەک برینێکی گەورە دەبینین لە ڕۆحیاندا. من پێم وایە لەگەڵ یەکەمین تەور لە وریا، تەور لە کۆی ڕێکخراوێکی گرنگ و دژەفاشیزم و چەپی وەک کۆمەڵەی ڕەنجدران درا، هەر تەورێک بەر «وریا ڕەش» کەوت، جەستەی ڕێکخراوەکەی لە دواییدا لەتوپەت کرد، بەم شێوەیە شۆکی شەهیدکردنی «وریا ڕەش» وردە وردە لە ڕێکخستنەکاندا دەردەکەوت و لەتی دەکردین.

دوای ئەو کارەساتانەی بارودۆخی سیاسیی شار و شاخ، گۆڕانێکی بەرەو هەڵدێری بەسەردا هات و چەندین پرسیار ئاراستەی ناوەندی کۆمەڵە و سکرتێری گشتیی کۆمەڵە کرا و دەنگی ناڕەزایی لە ناوەوەی کوردستان و دەرەوەی

کوردستان بە ئاڕاستەیەکی خراپدا لێ کەوتەوە و پرسیاری کوردستانیبوونی کۆمەڵە بەرەو کوێ و بیرۆکەی پارتی پێشڕەوی چینی کرێکاران لە کوردستاندا لەکوێی کاری سیاسیی ئێمەدایە؟ بەتایبەت ئێمە تەواو وەک حزبێکی «داش عێراق» هەڵسوکەت دەکەین و لە مفاوەزاتیشدا هەر وا بووین.

کوژران و زیندانیکردنی هاوڕێکانمان و هەندێک لە سەرکردە دیارەکان لە شاخ، بە جۆرێکە کە ڕۆژانە دەیبستین و مومارەسە دەکرێت، بۆچی چارەسەری سیاسی و دیالۆگ و ڕەخنە و ڕەخنەلەخۆگرتن نەبۆتە زمانی زاڵ؟ بۆچی کوشتن و زیندانیکردن و سووکایەتی بۆتە میتۆد؟ ناوەندی کۆمەڵە هیچ ڕوونکردنەوەیەکی ئاڕاستەی ڕێکخستنەکان و خەڵکی بەگشتی نەدەکرد و هیچ وەڵامێکی جگە لە نێگەتیڤ پێ نەبوو بۆ وەڵامدانەوەی ئەندامان و هێزی پێشمەرگە و خەڵکی، بەڵام لەو کاتەدا بۆم دەرکەوت کە هێشتا مارکسیزم-لینینزم لە فۆرمی خێڵدایە و ئەوەی خێڵێک پاڵپشتی نەبێت؛ فەوتاوە، ئەمەش لە گاڵتەجاڕییەکانی قەدەرە، چونکە مارکسیزم دەیەوێت جیاوازیی چینایەتی بسڕێتەوە، کەچی ئێمە شوناسە خێڵەکییەکان تۆختر دەکەینەوە! بەداخەوە ئەمە ئەزموونی هەمووان بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کە کادرە مارکسییەکان دەهاتن خێڵەکانی خۆیان دەکردە هێزی مارکسی و لێرەوە خێڵ پتەوتر دەبوو و لە دواییشدا هێزە کۆنەخوازەکان لە ڕێگەی جووڵاندنی عەسەبیەتی خێڵێکییەوە کادر و ئەندامە مارکسیستە-لینینستەکانی حزب ئۆتۆماتیکی دەچوونە قاوغی خێڵەوە. لە لوبنان و فەڵەستینش شوناسی چەپبوونیان پابەند بوو بە شوناسی خێڵەوە، هەر بۆیە چەپ و بزاوتە مارکسیزمە-لینیزمەکان لەسەرخۆ و وردە وردە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لەلایەن خێڵەوە دەخورا و قووت دەچوو. لەو ڕۆژەوە هەستم کرد هێزی مارکسیسی-لینیستی ئێمە، هێزی پابەندبوون بوو بە هێزی خێڵ و بنەماڵەکانمان و باشترین نموونەش؛ هەڵوەشاندنەوەی یەمەنی باشووری سۆسیالستی بوو لە کانوونی دووهەم ١٩٨٦ کە جەنگە ناوخۆکەی بە جەنگی ناوخۆی «خێڵە مارکسییەکان» لەقەڵەم درا و دەوڵەتە سۆسیالستییەکەی یەمەن، خێڵ لەتوپەتی کرد.

## کوشتن و ڕەدوونانی ئەوانەی ڕەخنەیان لە کۆمەڵەی «نەوشیروان مستەفا» دەگرت

من نەوشیروان مستەفا بە سەرکردەیەکی لێهاتوو و بەتوانا و نووسەرێکی باش دەزانم و نووسین و لێدوانەکانی کاریگەریی خۆیان هەیە و لە نزیکەوە چەندین جار بینومە و گوێبستی وتار و دەربڕینی بیروبۆچوونەکانی بووم. نەوشیروان مستەفا مرۆڤێکی کەمدوو و زۆر بەکەمی دەردەکەوت و بیروڕای جیاوازی قبووڵ نەبوو، وەک پێشتر ئاماژەم پێ دا لە چاکسازیدا بڕوای بە نەمانی بەرامبەرەکەی بوو، ئیتر بە کوشتن بێت یاخود دەربەدەرکردن. لێرەدا دەمەوێت چەند بەڵگە و ڕاستی بخەمە ڕوو، نەک بۆ ناشرینکردن و تۆمەتبارکردنی نەوشیروان مستەفا، بەڵکوو لەسەر ڕەفتار و جۆری توندوتیژیی مامەڵەکردنی بۆ بەرامبەر.

## فەرمانی کوشتنی فوئادی مەجید میسری

«هەڤاڵ کوێستانی»؛ کادر و نووسەر و تێکۆشەری دێرین و لە ناوەندی کۆمەڵەدا لە بەشی ڕاگەیاندن ئەرکی شۆڕشگێڕانەی خۆی بەجێ هێناوە و لە ئێستاشدا یەکێک بووە لە باوەڕپێکراوەکانی نەوشیروان مستەفا لەنێو بزووتنەوەی گۆڕاندا و لەسەر توندڕەویی نەوشیروان مستەفا دەڵێت[1]:

فوئادی مەجید میسری لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەدا ئەندامی کۆمەڵە دەبێ، لەدوای دامەزراندنی یەکێتییشەوە لەسەر جیاوازیی بیروڕا و بیرکردنەوە لە کۆمەڵە دوور دەکەوێتەوە، هەر ئەو جیاوازیی بیرکردنەوەیەش بوو لای هەندێک لە بەرپرسانی کۆمەڵە؛ فوئادی دەخستە ناو سەنگەری دوژمنەوە، ئەوەش وای کرد لە پاییزی ١٩٨٢دا فەرمانی کوشتنی بۆ دەربکەن.

---

[1]. ئەو ڕۆژانەی نیشتمان هی هەمووان بوو، هەڤاڵ کوێستانی، چاپی یەکەم، سلێمانی چاپخانەی کارۆ، ٢٠١٧، ل٢٠٢.

فوئاد وەختێک بە بەرنامەی هەوڵی کوشتنەکەی خۆی دەزانێت، نامەیەک بۆ نەوشیروان مستەفا دەنێرێ، لە نامەکەیدا دەنووسێ کە ئەو شتانەی لەسەری دەوترێن، لە دژایەتیکردنی کۆمەڵە و یەکێتی، گوایە لەسەر داوای حکومەت (واتە بەعس) دەیەوێت ڕێکخراوێکی مارکسی-لینینیی هاوشێوەی کۆمەڵە دروست بکات، هەر هەموویان شتی هەڵبەستراون و هیچ بنەمایەکی ڕاستیان تێدا نییە. بۆ وەڵامدانەوەی ئەو تۆمەتە و بۆ نیشاندانی ئەستۆپاکیی خۆشی، ئامادەیی خۆی دەردەبڕێ  و دەڵێت: شۆڕش هەر جێگەیەک بۆ دادگاییکردنی دەستنیشان بکات، ئامادەیە بێت و لەبەردەمی ئەو دادگایەدا بەرگری لە خۆی بکات، دواتر دادگاش هەر بڕیارێکی دا بە کوشتنیشەوە، پێی ڕازی دەبێ. پاشان هەڤاڵ کوێستانی ئاماژەی پێ دەدا و نەوشیروان مستەفا؛ سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەران دەخاتە ژێر پرسیارەوە، بۆ هەڵسەنگاندنی بیروبۆچوونی و جۆری مامەڵەکردن لەگەڵ فوئادی مەجید میسری، هەڤاڵ کوێستانی وەڵامی نەوشیروان مستەفا دەداتەوە و دەڵێت: من پێم وایە ئەوانەی لەسەری دەوترێن، هەر تۆمەتن و گومانی بێبەڵگەن. پێشم وایە ئەگەر لەو تۆمەتانە لەسەری هەن؛ ڕاست بان، فوئادی مەجید میسری ئامادەیی خۆی دەرنەدەبڕی لە هەر جێیەک ئێوە بتانەوێت، ئەو بۆ دادگاییکردنی بێتە ئەوێ. نەوشیروان مستەفا دەڵێت: تۆ پێت وایە ئەوەی لەسەری دەوترێت، هەر گومانە؟ بەڵێ، پێم وایە. خۆ ئەگەر بیروباوەڕی جیاوازیشی لە کۆمەڵە هەبێ، تەنانەت ناڕەزایی و ڕەخنەش، هەر نابێ بگاتە ئەوەی بیر لە کوشتن و تەنانەت ئەزیەتدانیشی بکرێتەوە. من پێم باشە نامەیەکی بۆ بنووسیت و دڵنیای بکەنەوە لەوەی بیر لە کوشتنی ناکەنەوە و ڕێز لە توانای فیکری و نووسینی ئەو دەگرن. من لە قسەکانی خۆم دەبمەوە، ئەو چەند چرکەیەک هیچ ناڵێ، نامەکە دەخاتەوە جێگەکەی خۆی و پێی دەڵێ: سپاس بۆ پێشنیارەکەت، خۆشم هەر شتێکی وا لە مێشکمدا بوو. هەڤاڵ کوێستانی دەڵێت دواتر زانیم کە بۆ گەڵاڵەکردنی ڕایەکی دروست، نامەکەی پیشانی خەڵکی دیکەش داوە.

## فوئادی مەجید میسری لەبریی کوشتن، جامێک تێزابی بە دەموچاودا بکرێ

ئەوەی لەناو ئەو ڕایە دەربڕاوانەدا لە هەمووان زیاتر تووشی نیگەرانی و حەپەسانی کردم، ڕای یەک لە هاوڕێ نووسەرەکانمان بوو: «با نەکوژرێ. من پێشنیار دەکەم لەبریی کوشتن، جامێک تێزابی بە دەموچاودا بکرێ، بۆ ئەوەی تا دەمرێ، نەتوانێ لە ئاوێنەشدا تەماشای خۆی بکا!» لە بەشی کۆتایی ئەم بابەتەدا، جارێکی تر بەکورتی باس لە بیروڕای جیاواز و چیرۆکی کوشتنی فوئادی مەجید میسری دەکەم بە بەڵگەی سەلمێنەر کە خۆم بۆ چەند ڕۆژێک پێکەوە بووین و بەشداری ئەو مێژووە بووین و نەوشیروانیش خەریکی ڕەدوونان و کوشتن و زیندانکردنی کادرانی ناو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و کادرانی شاخ بوو. چیرۆکی گرتن و کوشتنیان، مێژوویەکی درێژ و خوێناوییە.

دوای ڕاپەڕین کۆی دیمەنەکەم لەلا ڕوون بۆوە، نامەوێت نە خۆم بکەم بە پاڵەوان و نە ناوی کەس بڵێم و باسی ڕووداوی دیکە بکەم کە خوێناوین و بێمانا ڕوویان دا. من خۆم لێرەدا ناکەم بە حاکم بەسەر مێژوودا، بەڵام دەزانم شۆڕش بەگشتی لە دنیادا هەر وا بووە، چەندە فاشیزم دەڕووخێنێت، دە ئەوەندە فاشیزمۆچکەی بچووک لە هەناوی خۆیدا دروست دەکاتەوە.

هەندێک لەوانە وەک ئەو بەعسی و جاشانە وەها بوون سەرەتای ڕاپەڕین خۆیان دەشاردەوە، کەچی دوای چەند ساڵێک لە حزبەکاندا و لە دەزگاکاندا لە فۆرمی جۆراوجۆردا دەردەکەوتنەوە. ئێستاش دەبینین هێزێک هەیە کە دەیەوێت ناوی پێشمەرگە ناشرین بکات، ناوی ڕێکخستنەکان و جەنگاوەرە دێرینەکان، ئەو هێزە لەناو حزبەکاندا دووبارە جێگەی خۆیان کردەوە و گەندەڵییش زیاتر ژینگەیەکی بۆ تروکاندنی ئەم فاشیزمە دروست کرد. ئەم فاشیزمە نوێیە بەردەوامە لە فۆرمی گەندەڵیدا، لە فۆرمی چەواشەی مێژووی شۆڕشدا و لە فۆرمی بەبنەماڵەکردنی شۆڕشدا و کردنی بە کۆمپانیا بۆ

منداڵی هەندێک لێپرسراوان بەردەوامیی هەیە. بەهەرحاڵ، دەمەوێت بڵێم کە ڕێکخستنەکان تاوەکوو کارەساتی هەڵەبجە و کۆتایی ساڵی ١٩٨٩؛ لاواز و پەرت بوو و شێوازی شانەیی لە هەندێکدا مابوو و لە هەندێکدا کرابوو بە خەتی دەزوولەیی تەنها پەیوەندی و ئاگالێبوون، چونکە ئیتر بنەما چەپەکانی بەسەختی لێ درابوو، دەتوانم بڵێم لە هەموو بنەما و خەتە ئارامییەکەی «شەهید ئارام» درابوو، مابۆوە تەنها قاوغێکی بەتاڵی تەتەری لەنێوان یەکتر و شاخدا. چیتر کۆبوونەوە نەمابوو، تەنها ڕاگرتنی ئەوانە بوون کە هێشتا دەیانویست ڕێکخراوەکە هەڵنەوەشێت، بەلام لە ڕاستیدا ڕێکخراوەکە هەڵوەشابوو. ڕاستە چەند ئیختیالاتێک کرا، بەلام ئەمە بۆ ورەی خەڵک بوو و لە توندوتۆڵیی ڕێکخراوەکەوە نەبوو.

## گرتن و کوشتنی کادرانی کۆمەڵە بە تۆمەتی ئاڵای شۆڕش

گرتن و کوشتنی کادرانی کۆمەڵە بە تۆمەتی ئاڵای شۆڕش و بە پیلانی نەوشیروان مستەفا ئەمین، کە لە سەرەتادا پەنای بردە بەر «فەریدوون عەبدولقادر» کە نامیلکەیەکی نووسی و باسی «پارتی پێشڕەوی چینی کرێکار لە کوردستاندا» دەکرد و بۆ لێدانی نامیلکەیەکی «سالار عەزیز» بوو کە بە عەرەبی نووسیبووی. سالار عەزیز بە خۆی و چەند پێشمەرگەیەکەوە لە «پارەزان» دانیشتبوون و ناوێکی خراپی هەبوو لەناو هێزی پێشمەرگەدا، وەک هەڵسوکەت و مامەڵە خۆشەویست نەبوو. بەو شێوەیە سالار عەزیز و فەریدوون عەبدولقادر سەدەها کەس ماڵوێران دەکەن بە ناوی ئاڵای شۆڕش و کوردستانی، سەدەها گەنج دەخەنە گێژاوی بە ناو «زۆرانبازیی فیکری مارکسیزم-لینینزم» و دووبەرەکی دەخەنە ناو کۆمەڵەوە، ناو ئەو گەنجە خەونبینەرانەی هاتبوونە شاخ و ماڵ و خوێندن و ژیانی شاریان بەجێ هێشتبوو، یان ئەو ڕێکخستنانەی گەر بەردەست بکەوتنایە، لە ژووری ئەشکەنجەی ڕژێمی بەعسدا لە قیمەیان دەدان و لەتوپەتیان دەکردن و

دەیاندان  لە کارەبا و ئوتوویان لێ دەدان و  بوتڵیان تێ دەبڕین و... هتد. هەندێک «بە ناو ئەو سەرکردانە« هەموو ئەم کوشتارە ناوخۆییەیان هەڵگیرساند لەناو خودی کۆمەڵە، بۆ لێدانی ئەو ڕەوتە چەپە هێمنە موفەکیرە بوو کە «شەهید ئارام» بڕوای پێی بوو. ئارام و قارەمانەکانی تر شەهید بوون و ماڵئاوایی هەتاهەتاییان لێ کردین، کەچی کەسانێک بە مردنێکی ئاسایی لەسەر پێخەفی خەستەخانەی وڵاتانی هەندەراندا کۆچی دواییان کرد و دوای خۆیان ملیۆنەها دۆلاریان بۆ کچ و کوڕەکانیان جێ هێشت. هەردوو شۆڕشگێڕە مارکسییە-لینینییە دژبەیەکەکەش (سالار عەزیز و فەریدوون عەبدولقادر) و سەرکردەکانی دیکەی هەردوو بەرە دژبەیەکەکە دەرکەوتن، کە هیچی تر نین جگە لە کۆمەڵێک ملیۆنەر و گیرفانپڕ نەبێت، کە سوودمەندی ئەم زۆرانبازییانە بوون وەک ئەوەی ئەم زۆرانبازییە سەرمایەیەکی باش بووبێت و هەریەکە و بە جۆرێک پێی بووبێت بە ملیۆنەر و کە دەشمرن؛ ملیۆنان دۆلار بەجێ دێڵن بۆ منداڵە چڵێسەکانیان و منی کادر و پێشمەرگەی فەرماندەی کۆمەڵەی ڕەنجدەران و هاوسەنگەرانی تری ڕۆژگاری سەختی پێشمەرگایەتی، دەبێت خەون بەوەوە ببینین شارەوانی بمانناێژێت و تێچووی گۆڕەکانمان شانی منداڵەکانمان لەوە قورستر نەکات کە نەمانتوانی هیچیان بۆ بەجێ بهێڵین، جگە لە چیرۆکی خەباتی خۆمان نەبێت کە کۆمەڵێک بازرگانی جەنگ و شۆڕش بەرەکەیان چنیوەتەوە. ئێستا ئاوڕ لەو زەمەنە دەدەمەوە، چەند ڕاستییەکم بۆ دەردەکەوێت کە دەمەوێت بێ پەردە باسی بکەم. دیارە ئەمە شرۆڤەی خۆمە و ئەزموونی خوێندنەوە و ژیان و کامڵیی تەمەنمە، ئێستا  دەتوانم تەواوی دیمەنەکەی ئەوسا شی بکەمەوە، من لێرەدا تەنها باسی کۆمەڵە دەکەم، لە ڕاستیدا لەدوای شەهیدکردنی «وریا ڕەش» بەو شێوە قێزەوەنە، زنجیرەیەک گرتن و کوشتن  لەناو شۆڕشدا دەستی پێ کرد و درێژبوونەوەی هەبوو تاوەکوو ساڵی ١٩٨٩  کە وەک حەملەی تەسفیە وەها بوو، بەتایبەت هەندێک کادری ئاڵای شۆڕش وازیان هێنابوو و چووبوونەوە شار و شۆڕشیش هەمووی لە ئێران بوو، کەچی لێرە و لەوێ

دەیانکوشتن و بەدویانەوە بوون! لەو زەمەنەدا حکومەتی بەعس زۆر بەهێز بوو، وەک ئەوەی بەبەر چاوی ئیستخباراتی عێراقییەوە ئەم تیرۆرانەی ناوشار ڕوو بدات یان ئەوان بۆیان بکەن، بەو شێوەیە دەهاتە بەر چاو. ئەو جوولەیەی لەپێش ساڵی (١٩٨٦)ەوە گەر ئاسان بووبێت، ئەوا دوای ئەو مێژووە و بەتایبەت لە ساڵی ١٩٨٨ بەدواوە ئاسان نەبوو. من لێرەدا خۆم دەپارێزم لە ناوهێنان و برینی کۆن هەڵنادەمەوە، بەڵام بۆ تێگەیشتن لەم قۆناغە و بەرچاوڕوونیی هەموو لایەک وەک چۆن عەرەب دەڵێت «شاهد علی العصر»، سەرنجەکانی خۆم لێرەدا ڕوون دەکەمەوە. ئێستا کە بیر دەکەمەوە، ئەو پرسیارە دەکەم: ئایا نەوشیروان مستەفا نەیدەزانی گەر بەم جۆرە توندوتیژییە؛ جیاوازییە فیکرییەکان لەناو کۆمەڵەدا یەکلا بکاتەوە، کاریگەریی دەبێت لەسەر کۆی ڕێکخراوەکە وەک ڕێکخراوێکی چەپ کە جگە لە ئەرکی سیاسی، خەباتی چەکداری لە دژی شۆڤێنزمی بەعسی لە ئەستۆدایە؟ بەتایبەت هەمووان باش دەزانین یەکێتی خۆی هیچ نەبوو بەبێ کۆمەڵە، جگە لە قاوغێکی بەتاڵ، چونکە سەرتیپەکان، کادێرەکانی، ڕێکخراوی شاری و کۆی یەکێتی لە سەددا نەوەد؛ کۆمەڵە بوو. کۆمەڵە بۆ یەکەم جار خەباتی پارتیزانیی گواستەوە دەشتی تەخت، کە ئەمە لە مێژووی پارتیزانیدا دەگمەنە، چونکە پارتیزانی یان لەناو دارستاندا دەکرێت کە چڕە و دنیایەک شوێنی جووڵە و خۆحەشاردانی تێدایە یان لە شاخ، بەڵام تیپی بیست و یەکی کەرکووک و پێشمەرگەی دەشتی هەولێر لە ئەزموونێکی بێوێنەدا بوون، شەڕی «حەمەک» لە ڕووی سەربازییەوە یەکێکە لە شەڕە نابەرامبەرەکان کە شەهید «مامەڕیشە» و هاوڕێکانی بە چەند پێشمەرگەیەکەوە تەوقێک دەشکێنن، لە حساباتی عەسکەریی هەموو دنیادا کارێکی ئەستەمە. بەگشتی وەک نەوشیروان مستەفا خۆی گوتی: ئێمە بەهێزترین ڕێکخراوی مارکسی-لینینین لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کە خاوەنی ئەو ژمارە و چالاکییە بێوێنانە بین لە هەموو ڕوویەکەوە. نابێت ئەوە لەبیر بکەین کە «جەبهەی شەعبی فەڵەستینیی نایف حەواتمە« (نایف

حەواتمە سکرتێری گشتیی بەرەی دیموکراتی ڕزگاریخوازی فەڵەستینە) و باڵی چەپی مونەزەمەی تەحریری فەڵەستینی ئەزموونی خۆیان هەبوو، بەڵام ئەمانە میلشیاتی ناو لوبنان و شارەکان بوون، ئەزموونێک نەبوون لە خەباتی پارتیزانی. لێرەوە لەو بڕوایەدا نیم نەوشیروان مستەفا ئەمین کە سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو، کاریگەریی نێگەتیڤی ئەو کوشتنانەی نەزانیبێت کە دەیکردن لە دژی کادر و پێشمەرگەکان لە شاخ و خەتی شەهید ئارام لە کۆمەڵەدا، لەو بڕوایەدا نیم نەیزانیبێت کە ئەم کارانە ڕێکخراوەکە دادەڕزێنێت و هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵەش لاواز دەکات. نەوشیروان مەستەفا مرۆڤێک نییە دووریی شتەکان هەڵبسەنگێنێت و چارەسەری گشتییان بۆ نەدۆزێتەوە.

## تاوانەکانی نێو کۆمەڵە لە ژیانی خەباتی سیاسیی نەوشیروان مستەفادا

ساڵی ١٩٧٠ تەمەنی من تەنها نۆ ساڵان بوو، ژمارەی گەڕەکانی سلێمانی کەمتر بوون لە ئێستە و بەر دەرکی سەرا سەنتەری نێو شار بوو، لەبەر دەرکی سەرادا بنکەیەکی سەرەکیی گشتیی پۆلیسی شاری سلێمانی هەبوو، فلکەیەک نەخشەیەکی بە دابەشبوونی چوار شەقامدا، وەک تابلۆیەکی جوان شەقامی کاوە و شەقامی مەولەوی و سینەما سیروان و سابوونکەرانی لێک جوودا دەکردەوە، دەنگۆی لەسێدارەدانی کەسێک بە تۆمەتی تەقاندنەوەی نارنجۆکێک لەنێو قوتابخانەی کچاندا دەدرێت، تەواوی گەڕەکەکانی شار یەکتریان لەو هەواڵە ئاگادار دەکردەوە، ماڵی ئێمە ئەودەم لە گەڕەکی چوارباخ و دواتر لە جوولەکان بووین.

تا درەنگانێک زۆربەی زۆری هاوڵاتییان شەویان لێ ڕۆژ نەدەبووەوە و یەکتریان ئاگادار دەکردەوە بەوەی ڕژێم هەواڵی لەسێدارەدانی تێکدەرێک و تاوانبارێکی کورد لەبەر دەرکی سەرادا دەدات. لەگەڵ لەعلیی پوورم بڕیارمان دا ئەو ئێوارەیە بۆ چاوپێکەوتنی ئەو لەسێدارەدانە بڕۆین لەگەڵ دایکم و

خوشکەکانمدا کە فرمێسک سەر گۆنایانی تەڕ دەکرد. ڕژێمی بەعس تەواوی کۆڵانەکانی بە هێزەکانی خۆی تەنیبوو، هەمووان لەگەڵ هاوڵاتییانێکی زۆردا بەرەو بەر دەرکی سەرا بەڕێ کەوتین. کاتێک لەگەڵ ئەو حەشامەتەدا کەسێک بە خامێکی سپیی ڕووخسار داپۆشراو و لەسێدارەدراوم بینی و ئێستەش لەیادمە کاتژمێری سێی سەرلەبەیانی بوو، بۆ ترساندنی زیاتری هاوڵاتییان خامە سپییەکەیان لە سەری کردەوە و زمانی درێژ دەرپەڕیبوو، منیش تەمەن نۆ ساڵان دەبووم، ئەو دیمەنەم زۆر بۆ هەستیار و تۆقێنەر بوو.

## لەسێدارەدراوەکە کێ بوو؟

لە کتێبی ژیان و نهێنییەکانی نەوشیروان مستەفا[1]دا هاتووە: جەمالی ئەحەی خورشە، برای هونەرمەند جەلال کۆچەر، بە فەرمانی نەوشیروان مستەفا لە ئاداری ساڵی ١٩٧٠دا نارنجۆکێک فڕێ دەداتە ناو ئاهەنگی کچانی دواناوەندیی سلێمانییەوە و پێنجیان لێ بریندار دەکات. ناوبراو لە سەنتەری سلێمانیدا لەسێدارە درا و نەوشیروانیش لە بەغداد وەک بەرزەکی بانان لە سەردەمی نازم گەزازی بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتییەوە بەرەو «قاهیرە» و دواتر «نەمسا» بۆی دەرچوو.

ئەم ڕووداوە دەبێتە سەرەتای تەمەنی پڕ لە توندوتیژیی کوشتن و بڕینی ژەنەراڵێکی زاڵم، کە پتر حەز دەکات «اهل السیف» بێت، لەوەی پێی بڵێن «اهل القلم». هەروەها پشکۆ نەجمەدین لە بەشێکی دیکەی وەڵامدانەوەی نەوشیروان مستەفا[2]دا دەڵێت:

---

[1]. ژیان و نهێنییەکانی نەوشیروان مستەفا، ئامادەکردنی: لیژنەیەک لە ڕۆژنامەنووسان، چاپی یەکەم، چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبخانەی جەمالی عەلی باپیر، سلێمانی، ساڵ (...)، ل١٧.

٢. ژیان و نهێنییەکانی نەوشیروان مستەفا، ئامادەکردنی: لیژنەیەک لە ڕۆژنامەنووسان، چاپی یەکەم، چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبخانەی جەمالی عەلی باپیر، سلێمانی، ساڵ (...)، ل١٧.

لە ئەنجامی وەڵامدانەوەی نەوشیروان مستەفادا دەڵێت: یەکەم کەسێک لەسەر نەکوشتنی دیلێکی ق. م (قیادە موەقەتە) لێپرسینەوەی لەگەڵ کردم، خودی نەوشیروان مستەفا بوو. من کە ئەو کارەم نەکردبوو، ئەو پێی وا بوو ترسنۆکم! یەکەم جار کە دیل کوشتنم لە نزیکەوە لەناو ڕیزەکانی یەکێتیدا بینی، پاییزی ساڵی ١٩٨١ بوو. لە ماوەی کەمتر لە دوو ڕۆژاندا، ٤٥ چەکداری «جود» کوژران و ژمارەیەکیان لێ بەدیل گیرا. چەکدارێکی هێزی گەرمیانی یەکێتی کە برایەکی لەو شەڕەدا کوژرابوو، بەبەر چاوی هەموو لایەکەوە گوێچکەی دوو دیلی گرت و لەپەنا دیوارێکدا گوللەبارانی کردن.

تاوانەکان هێندە زۆرن، بەبیرهێنانەوەیان زۆر جار ڕەشبینم دەکات. ئێمە هەموو کات پارتی بە عەشیرەتگەری و حیزبێکی بنەماڵەیی پێناسە دەکەین، خودی عەشرەتەکانیشیان دەڵێن: هەر عەشرەتێک و هەزار پیاومان هەیە، بە هەندێک لە حیزبەکانی تریشەوە، بەڵام جێی داخ و غەمێکی زۆرە ڕێکخراوێکی مارکسی-لینینستی و حیزبێکی مۆدرێن بۆ ئەو سەردەمە، ئەو هەموو شەڕ و کوشتار و تیرۆرکردنەی تیا ئەنجام درابێت.

زۆر جاریش لە هەناوی کۆمەڵەدا، تۆڵە لەبریی کەسێک، کەسێکی تری بەبێ دادگاییکردن و بێ بەڵگە لەسەر دەکوژرایەوە. نەوشیروان مستەفا لەم پرۆسە خوێناوییەدا تەنها دیلەکان ناکوژێت، دیلەکان گیراون، بەڵام ئەو دەستی دەچێتە خوێنی خەڵکانێکیشەوە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان هانای بۆ بردوون یان تەنانەت ژیانی نەوشیروانیشیان ڕزگار کردووە لە چنگیان. خەلیفە کە فەرماندەی دەستەیەکی حسک بوو ئەو (واتە نەوشیروان مستەفا) ی لە مردن ڕزگار کرد، کەچی کە کەریمی برای خەلیفە، عومەری ڕەشە جووتەی کوشت و بۆ لای ڕژێم هەڵات، بە فەرمانی نەوشیروان مستەفا، خەلیفەیان لە بری کەریم کوشت.

لە ناوچەی قەرەداغ پێشمەرگەیەک بە ناوی ڕێبوار لەنێو دەڤەری کەرتەکانی گەرمیان، دەکەوێتە داوی خۆشەویستیی ئافرەتێکەوە و لە ترسی خێڵ و عەشیرەتگەری، هەردووکیان ڕوو لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەکەن

و بەنیازی هاوسەرگیری پێکەوە بڕیار دەدەن نەگەڕێنەوە. پاشان بنەماڵەی هەردووکیان بۆ ئەوەی وەک شەڕ و پێکدانی هەندێک لە عەشیرەتەکانی تر دووچاری یەکتر کوشتن نەبن، چونکە لەنێو کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتدا بۆ ئەو مەبەستە کولتوورێکی جیاواز و دابونەریتێکی قورس و گران هەیە، حیزبەکانی کوردستانیش بە ئێستەشیانەوە، هەمیشە چاوپۆشی لە زۆر تاوان دەکەن لەژێر ڕکێفی خێڵ و عەشیرەتدا. بە نامەی فەرمی لەلایەن هەندێک بەرپرسانەوە، بە مەبەستی پێکهێنانی هاوسەرگیریی ڕێبوار و دڵخوازەکەی، بەڵێن و متمانەیان پێ دەدەن هاوکارییان بکەن و ژیانیان بپارێزن، زۆر بەداخەوە کاتێک ڕێبواری پێشمەرگە و دڵخوازەکەی لەسەر بەڵێنپێدانیان دەگەڕێنەوە نێو سنووری هێزی پێشمەرگە، هەردووکیان گوللەباران دەکرێن، بەلام هەڤاڵ کوێستانی ڕاستیی تاوانەکە لە کتێبی «ئەو ڕۆژانەی نیشتمان هی هەمووان بوو» وەک خۆی باس ناکات و بە شێوەی ڕۆمانێک یادەوەرییەکانی بۆ نەوەی دوارۆژ نووسیوەتەوە. گێڕانەوەی مێژوو پێوستی بە وشەی ڕەنگاوڕەنگ و بریقەدار نییە، دەتوانرێت زۆریش بەسادەیی بنووسرێتەوە، بەلام بە مەرجێک ڕاستگۆیانە باس لە مێژووەکە بکرێت، چونکە خودی هەڤاڵ کوێستانی تەنانەت ئەو مێژووە گرنگ و پڕ تاوانەی شەهید «وریا» تەنها بە دوو دێڕ کۆتایی پێ دەهێنێت[1].

---

١. ئەو ڕۆژانەی نیشتمان هی هەمووان بوو، هەڤاڵ کوێستانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠١٧، ل٢٤٩.

## شەهید وریا کێ بوو؟

کوشتنی «وریا» بە تەور، تاوان و چیرۆکی ڕاستەقینەی سەردەمی ڕۆژانی سەختی پێشمەرگایەتین و کارەساتێکی جەرگبڕ و ناخۆشی نێو شۆڕش و خەباتن، بەداخەوە کەسانێک شەرمنانە یاخود بۆ لەدەستنەدانی بەرژەوەندییەکانیان، ئەنگوست ناخەنە سەر ڕاستییەکان و ئەوەش دەبێت بە جۆرێک لە بازرگانیکردن و بزواندنی هەندێک ئەقڵی بچووک و ئارامگیری بۆیان، بازرگانیی بێ دەستمایەش هەر مایەپووچ دەبێت. ڕەزاقی وەستا وەهاب ناسراو بە «وریا ڕەش»، لە ساڵی ١٩٥٦دا لە شاری سلێمانی لەدایک بووە. لە ساڵی ١٩٧٨دا سەر بە ڕێکخستنە نهێنییەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بووە، تێکۆشەرێکی خۆنەویست و ئێجگار بلیمەت و چاونەترس بووە، نهێنی پاراستن لەلای وریا زۆر گرنگ بووە و ببووە هۆکاری ئەوەی هەمیشە لە کار و چالاکییەکانیدا سەرکەوتوو دەبوو. شەڕی نەگریسی کورد کوشتن و مەرامی گڵاوی هەندێک لە سەرکردە و فەرماندەکانی نێو حیزبەکان و شۆڕش، بووە هۆی ئەوەی دەستیان سوور بێت بە خوێنی یەکتر.

بەڵام هیچ کام و هیچ کاتێکیش هەندێک لەو سەرکردانە بە دەستی خۆیان هیچ چالاکییەکان لە بەرژەوەندیی شۆڕش ئەنجام نەداوە، جگە لە مەلا بەختیار لە تۆڵەی شەهید خالە شەهاب و هاوەڵەکانی کە لەسێدارە دەدرێن، پارێزگاری بەعسی شاری سلێمانی لە شەقامی مەولەوی لە شاری سلێمانیدا، لەگەڵ دوو تێکۆشەری دێرینا بە سزای گەل و شۆڕش دەگەیەنن، دەنا زیاترینیان بە خەڵکی دڵسۆز و هێزی پێشمەرگە کارەکانیان پێ ڕاپەڕاندوون. یەکێک لەو پێشمەرگانەی لە شاری سلێمانیدا کاری «ئیختیالات» و لە نەیارانی یەکتریان پێ بە کوشت دەدان، ئەویش ڕەزاقی وەستا وەهاب ناسراو بە «وریا ڕەش»ە. ئەو کادر و بەرپرسانەی بە دەستی وریا و بە فەرمانی ناوەندی کۆمەڵە کوژران، بریتی بوون لەم ناوانە: (نووری حەمە عەلی -

پارتی، عەبدولی سۆران - پارتی، سدیق ئەفەندی - پارتی، فەتاحە قەڵەو - ئەندازیار، حاکم عومەر - بەعسی بوو، سەلاحی سەموون - فەرمانبەر و «ڕەفیق حیزبی»ی ڕژێمی بەعس و بەڕێوەبەری کارگەی جگەرەی سلێمانی بوو، عەلە خڕە - پارتی، شێخ وەزیر نەکوژرا، بەڵام بریندار بوو، مچەی بابە گەورە و چەندین چالاکیی تری نێو شار) بە دەستی «وریا» ئەنجام درا.

لەگەڵ ئەوەشدا «گۆرانە ڕەش» و «ئازاد چاوشین» بە هەمان شێوە «ئیختیالاتیان» دەکرد، تەنانەت ئازاد چاوشین هێندە کادر و تێکۆشەرێکی بێهاوتای قارەمان بوو، ئەگەرچی خەڵکی سلێمانی بوو و شارەزای بنکە و بارەگا و مۆڵگای بەعس نەبوو لەنێو شاری هەولێردا و شارەزای کووچە و کۆڵانەکانی شاری هەولێر نەبوو، بەڵام ئازایەتی و قارەمانێتیی ئازاد چاوشین دەگەڕێتەوە بۆ دڵسۆزی و لەخۆبردوویی، دەنا تاوانبارێکی بەعس لەنێو شاری هەولێردا بە سزای گەل و شۆڕش بگەیەنێت هەر وا ئاسان نییە، بەتایبەت خەڵکی ئەو شارە و لەدایکبووی ئەو شارە نەبێت. بە هاوکاریی ڕێکخستنە دێرینە نهێنییەکان کارەکەی ئەنجام دابوو، ئەو قارەمانێتییە تەنها لە ئازاد چاوشین دەوەشایەوە، بەتایبەت کاری لەو جۆرە زۆر ترسناکە. پاش دەنگدانەوەیەکی زۆر و ترسی حیزبەکان، بەتایبەت ئەو حیزبانەی ئەندامەکانی دەکوژران، بەیانی فەرمییان بڵاو دەکردەوە و یەکێتییان بەو مەبەستە تاوانبار دەکرد و حیزبی بەعسیش بۆ تێکدانی زیاتری بارودۆخەکە، پاگەندەی خۆی دەکرد و یەکێتییش تاوانی تیرۆرکردنەکانی خستە ئەستۆی حیزبی بەعس و بەم جۆرەش ڕەزاقی وەستا وەهاب ناسراو بە «وریا ڕەش» ناڕازی دەبێت و شەرم لە وەڵامدانەوەی بەرپرسی ناوەندی کۆمەڵە دەکات کە بە نامەی فەرمی داوای کوشتن و لەسێدارەدانی ئەو کەسانەی لێ کردوون، دواتر کاراکتەری چالاکییەکان بە بەعسی ناو ببرێت.

## وریامان کوشت و گەر زیندووش بێتەوە،
## سەد جاری تر دەیکوژینەوە...

پشکۆ نەجمەدین لە وەڵامی کتێبەکەی «نەوشیروان مستەفا ئەمین»دا (پەنجەکان یەکتری دەشکێنن) کتێبێکی بڵاو کردووەتەوە، لەوێ دەقاودەق قسەیەکی مەلا بەختیاری هێناوەتەوە[1]:

باس لە کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە و بینینی شەهید وریا دەکات و دەڵێت: درووژاندنی ئیعدامکردنی وریای وەهاب، بە فەرمانی سکرتێری کۆمەڵە و بەنهێنی جێبەجێکردنی بە دەستی جەبار فەرمان؛ فەزای کۆبوونەوەکان زیاتر لێڵ دەکات و دواتر دەڵێت: من وریام چەند ڕۆژێک پێش بزرکردنەکەی لە گوندی «حاجی مامەندە» دیت و بۆ یەکەم جار ناسیم. وریا باسی ئەوەی بۆ کردم کە لە ناوەندی کۆمەڵەوە داوا کراوە و بەو مەبەستەش لە شارەوە هاتووە. ئەو گوتی: ناوێرم بچم! داوای هەندەک نامەی ناوەندی کۆمەڵەم لێ دەکەن کە پێشتر بۆیان ناردووم. ئەو نامانە بۆ من گرنگن و پەیوەندییان بە چارەنووسمەوە هەیە! ئاخر خۆ من خەڵکم بۆ باوکم نەکوشتووە، من خەڵکم بۆ کۆمەڵە و شۆڕش کوشتووە و تەنها بەڵگەیەکیشم؛ نامەکانن!

وریا لەنێوان دوو بەرداشی ترس و ئازاری ویژداندا لە مەنگەنە درابوو، ترس لەوەی کە سکرتێری کۆمەڵە داوای ئەو نامانەی لێ دەکردەوە کە فەرمانی تیرۆرکردنەکانی تێدا بوو، نەبا دەست لایەنە نەیارەکانی بکەون. ئەو کارانەی کردوونی، دەچنە خانەی تیرۆری شەخسی و تایبەتییەوە و هیچ بەڵگەیەکی سەلمێنەر بۆ داکۆکیکردن لە خۆی؛ بەدەستەوە نامێنێت و لەناوبردنی ئاسانتر دەبێت، ئازارێکی سەختی ویژدان لەهەمبەر تیرۆرکردنی کۆمەڵێک کەسدا کە حیزبەکەی حاشای لە تیرۆرکردنەکەیان دەکرد، ئەو

---

١. ئەزموون و یاد ئاڵای شۆڕش و حیکایەتەکانی زیندان، بەرگی یەکەم ١٩٧٨-١٩٨٣، بەرگی دووەم ١٩٨٣-١٩٨٩، پشکۆ نەجمەدین، چاپخانە (...)، ٢٠٠٧، ل٢٠٠.

دەیویست کەڵلەڕەقی لە ئاست سکرتێری کۆمەڵەدا بکات، بەڵام بە لەدەستدانی گیانی و پارچەپارچەکردنی لاشەی تەواو بوو.

لە لاپەڕەکانی پێشوودا ئاماژەم پێ دا نەوشیروان مستەفا لەسەر بیروڕای جیاواز، هەوڵی تیرۆرکردنی فوئادی مەجید میسریی داوە، کە بە بەڵگەوە باس لە جۆری تیرۆرکردنەکەی بکەم. من وەک ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری ڕێکخراوی منداڵانی ئەڵمانیا و ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری بازنەی ئەڵمانیای پلاتفۆڕمی دابڕان، لە ڕێکەوتی ٢٠١٧/٧/٥دا لە شاری کیولن (stadt köln) لە ئەڵمانیادا سەرقاڵی ئەنجامدانی کۆڕێک بووین بە ناوی جیاوازییە بنەڕەتییەکانی نێوان میتۆدی ئایینی و میتۆدی زانستی، لەگەڵ ئەندامانی بازنەی ئەڵمانیای پلاتفۆڕمی دابڕان و فوئادی مەجید میسری دوو ڕۆژ پێکەوە سەرقاڵی بەڕێوەبردنی کۆڕەکە بووین بۆ فوئادی مەجید میسری، لە ئێوارەخوانێکدا باسمان لە ڕابردووی شۆڕش و بەناهەق شەهیدکردنی وریامان کرد و چۆنیەتیی هەوڵی تیرۆرکردنی فوئادی مەجید میسری بە فەرمانی نەوشیروان مستەفا لەلایەن «وریا ڕەش»، فوئادی مەجید میسری نەهیی لەوە کرد کە «وریا ڕەش» خیانەتی کردبێت و هیچ نهێنییەکی درکاندبێت، تەنانەت باسی مێژووی هاوڕێیەتی و دۆستایەتی و دڵسۆزی و قارەمانێتیی شەهید وریای بە شێوازێک بۆ گێڕاینەوە گەر پرسیاری زیاترم ئاڕاستە بکردایە، پێم وا بوو جگە لە فرمێسک بە چاوەکانیدا؛ هیچ وەڵامێکی تری بۆ نەدەدرایەوە! پاشان بەدووردرێژی باسی خەباتی شاخ و کێشە و ململانێکانی نێو کۆنفڕانس و ڕێگرتن لە ئازادی و بیروڕای جیاوازی دەکرد، یاخود نەوشیروان مستەفا ئەمین لە تەواوی قەناعەتەوە هەوڵی تیرۆرکردنی دابێت، هیچ لەو ڕاستییانە ناگۆڕن کە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە بۆ نەوشیروان مستەفا، ئەندام و کادرانی کۆمەڵە هیچ گرنگییان نەبووە و لای ئەو خەتی ئارام و چەپ، شایەنی ئەوە نین گفتوگۆی سیاسییانە بکەن، بەڵکوو کوشتن و تیرۆر و تۆقاندن و سووککردن؛ تاکە ڕێگەی چارەسەر بووە. بە دیوێکی تردا، سوور دەیزانی بەمە ڕێکخراوەکە کەرت دەبێت،

بەتایبەت ڕێکخراوی شار وردە وردە ئەندامەکانیان وازیان دەهێنا و سەدان پێشمەرگە تەسلیمی ڕژێم دەبوونەوە و وڕەی پێشمەرگە دوای مفاوەزات ڕاستە لە نەبەردییەکانی شەڕی قەیوان ماوەت و دوایی داستانی ڕزگاری و پێشتریش داستانی دابان ڕەنگی دابۆوە، بەڵام وەک مارکس دەڵێت لە شەڕی بەرگریدا کاتێک بەرەی سیاسی فشەڵ دەبێت، بەرە سەربازییەکە وردە وردە کز و لاواز دەبێت. لێرەوە لەو بڕوایەدام نەوشیروان مستەفا بە کوشتنی چەندەها قارەمانی وەک: وریا ڕەش، جوامێر، سالاری حاجی دەرویش و تەنانەت وەک دەڵێن هێمنە ڕەش و تەرەکردن و ئیهانەکردنی چەندەها کەسی وەک عومەر عەرەب و غەریب کونجرینی و ئیهانەکردنی مامە ڕیشە و تۆرانی لە کۆمەڵە و زۆری تر، کەشێکی لە تیرۆرکردنی کەسێتی و جەستەیی پێک هێنا و ئامانجی لاوازبوونی ڕێکخراوێکی چەپی وەک کۆمەڵە بوو.

## گوللەبارانکردنی بێ بەڵگە و شەهیدکردنی سالاری حاجی دەرویش

بۆ من زۆر ئاسان نییە بەسادەیی لە ژیاننامەی تێکۆشەری فەرماندە و کادرێکی دێرینی وەک سالاری حاجی دەرویش بدوێم، ئەوەندە زانیاریم هەیە لەسەر ئەستۆپاکی و پەیوەندیکردنی بە ڕێکخستن و کاری سیاسی و بوونی بە پێشمەرگە لە ساڵی ١٩٧٨دا و خۆی بە بچووکترین پاسەوانی میللەت دەزانێت و بەشانازیکردنەوە وەک هاوڵاتییەکی کوردپەروەری چوارتای سەر بە شارباژێڕ و لە خانەوادە و بنەماڵەیەکی ئەو دەڤەرەدا وەک شۆڕشگێڕێکی سەرەتاکانی خەباتگێرانی شاخ، ڕووبەڕووی نادادپەروەری و ناعەدالەتی لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بەرامبەر بە هاوڵاتییانی کورد دەکرێت، سالاری حاجی دەرویش دەستبەرداری ژیانی خۆی و خانەوادەکەی دەبێت و دەبێت بە پێشمەرگەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان.

سالاری حاجی دەرویش، مرۆڤێک لە جوانی و میهرەبانی و کورتترین مەودای خەباتی پێشمەرگایەتی لە شاخ، لەلایەن شۆڕشەوە پلەی فەرماندەیی وەک کادرێکی زیرەک و بەتوانا پێ دەبەخشرێت. ئەگەرچی لەو زەمەنەدا بنەبڕکردنی بۆچوونە جیاوازەکان سەبارەت بە دامەزرێنەری ئاڵای شۆڕش کران و سالاری حاجی دەرویش وەک فەرماندەیەک جگە لە دڵسۆزی بۆ هاوسەنگەرانی، هیچ بەڵگەیەکی تر نەبوو بۆ گوللەبارانکردنی[1]. سالاری حاجی دەرویش یەکێک بووە لە فەرماندە سەربازییەکان و لە هەمان کاتدا کادرێکی هۆشیاری سیاسییش بووە، لە دوور و نزیکەوە لایەنگری ئاڵای شۆڕش و مەلا بەختیار نەبووە، تەنها هەڵەیەک کە کردبووی و غەزەبی نەوشیروانی بە سەردا باریبوو ئەوە بوو کە کتێبێکی بۆ مەلا بەختیار بە دەستی دوو پێشمەرگەدا کە ناویان ئەنوەر و بەهادین بوو، بۆ مەلا بەختیار ناردبوو تاکوو لە زینداندا کاتی پێ بباتە سەر. وەستا لەتیف لە لایەنگرانی نەوشیروان بوو، سەرپەرشتیی ئەو زیندانەی دەکرد کە مەلا بەختیاری تیادا بوو، هەواڵەکە بە نەوشیروان دەگەیەنێتەوە و دەستبەجێ سالاری حاجی دەرویش دەستبەسەر دەکرێت و دوو پێشمەرگەکەش دەخرێنە زیندانەوە. کاتێک ئەنوەر و بەهادین بەرەڵا کران، چەکیان نەدانەوە و بەڕسواکراوی دەسووڕانەوە، بۆیە ناچار بوون بگەڕێنەوە و خۆیان تەسلیم بکەنەوە و خۆیان بدەنە بەر چارەنووسی نادیار. کادر و تێکۆشەری دێرینی فەرماندە بەبێ هیچ دادگاییەک و هیچ بەڵگەیەک و شایەتی زیندوو و هیچ نووسراوێک، مخابن سالاری حاجی دەرویش گوللەباران دەکرێت و شەهید دەکرێت.

---

١. ژیان و نهێنییەکانی نەوشیروان مستەفا، ئامادەکردنی: لیژنەیەک لە ڕۆژنامەنووسان، چاپی یەکەم، چاپ و بلاوکردنەوەی کتێبخانەی جەمالی عەلی باپیر، سلێمانی، ساڵ (...)، ل٢٩١.

# فیشەکی گڕدار ئاڕاستەی سەر دڵی جوامێری سەرتیپ دەکرێت

شەهید جوامێر، سەرتیپی ۲۳ی سوورداش بوو. بە قارەمانێتی و دڵسۆزیی خۆی لە سەرەتای پێشمەرگەبوونیەوە فەرمانداندەی مەفرەزە و جێگری فەرماندەی کەرت و دواترین پلەی شەرەفی ئەندامێتی کە پێی سپێردرا، سەرتیپی ۲۳ی سورداش بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆی پێشمەرگە بوو، خاوەنی دوو برای شەهید بوو. مرۆڤێک بوو لە ئاستی هەموو کەسێکدا بچووکیی خۆی دەنواند و بەرامبەرەکەی لە خۆی بە گەورەتر دەزانی.

بەڵام لەو جۆرە سەرکردە و فەرماندانە هەمیشە نەیارانیان لەنێو شۆڕشدا بۆ دروست دەبوو، چونکە کەسانی وەک جوامێری سەرتیپی خاوەن خەباتی بێوچانی پاک و بێگەرد، شەرمیان لە خۆجوداکردنەوە دەکرد لەگەڵ پێشمەرگەدا. جوامێری سەرتیپ لەسەر دڵسۆزی و بۆچوونی جیاواز، لە فەرماندەیی و کار و چالاکییەکانیدا سرپان کردبوو. ئەگەرچی جوامێر فەرماندەی من نەبوو، بەڵکوو لەو زەمەنەدا سیستمی عورفی لەبریی سیستم و پەیوەندیی ناوخۆی ڕێکخراوی پرۆلیتاریی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانەکەی لەمەڕ ئێمە بوو، دەبوو هەر چی بچووکترین هەڵەی لێ بوەشێتەوە، بە فیشەکی گڕدار سنگی بسووتێنرێت و لەناو ببرێت. بۆ مێژوو دەیگێڕمەوە، لە گوندی کاپیلۆنی بەری دۆڵی کەپرێکی بە نایلۆن دروست کرابوو، پێیان دەوت چایخانەکەی کاپیلۆن، جوامێری سەرتیپ سەری سفر کردبوو، کلێتەیەکی سەوزی لەسەر دەکرد و تەنها دەمانچەیەکی میکارۆفی بە دوو یەدەکەوە لەنێو قەدیدا بەستبوو، بەڕێکەوت شەهید «بەهە کوێر» لە سنووری شارباژێڕەوە هاتبووە بەری سنووری ئێمە و چاوم پێ کەوت، وتی زۆر ماندووم و با بچین بۆ کەبابخانەکەی «پیر ئەلیاس». چەمێک بوو لەنێوان ڕێگای سەرەکیی کارێزەی کۆن و بە ڕۆژهەڵاتدا گوندی باڵخ و خوار گوندی کاپیلۆن بوو، دوای پشوودان و هەندێک گاڵتەوگەپ کە بەهە کوێر دەیکرد، نە من و نە جوامێری سەرتیپ حەزمان پێ نەدەکرد.

دوای پشوودان، بەهە کوێر وتی: بەزەحمەت قاپێ عەرەقی ڕەشیان بۆ هێناوم، بچین بیخۆینەوە. هەر چەندە خواردنەوە (کحول) قەدەغە بوو لەنێو هێزی پێشمەرگەدا، بەڵام هەندێک جار لە کاتی پشوودا و لە شوێنی تایبەتدا ئارامییەک بە جەستەی ماندووبوو دەدرا. لە ڕاستیدا ئەوە کارێکی ناشایستە بوو، بەڵام جوامێری سەرتیپ بۆ دڵنەشکاندنی بەهە کوێر؛ ئامادەیی خۆی دەربڕی و وتی: «بەهادین، لە ئێستەدا هەندێک لەم ماستاوچییانە ڕاپۆرتیان لەسەر نووسیوم و چەک کراوم و سڕ کراوم بۆ داهاتوویەکی نادیار، ئەگەر دەزانیت کێشەی زیاترم بۆ دروست دەکەیت، ئەوا من دەڕۆم و خۆت بۆ خۆت سەرپشک بە چی دەکەیت.» بەهادین سوێندی بە گۆڕی شەهیدان خوارد بەوەی هیچ هەڵەیەک لە کاتی مەستیدا نەکات. بۆ من یەکەم جارم بوو لەو جۆرە دانیشتنانەدا بەشدار بم، بەتایبەت کە پێشمەرگە بووم و ترسی دوژمن و ئەرکی گەلێکی زوڵملێکراومان لە ئەستۆدا بوو. وەک باسم کرد جوامێری سەرتیپ سڕ کرابوو و بەهە کوێریش تفەنگێکی مزەڵی سیخۆی بە حەوت مەخزەنەوە پێ بوو، وەک ئەوە وا بوو کەسێک لە ئێستادا خاوەنی چەند ڤێللا و خانوویەکی لەسەر یەکی چەند نهۆمی بێت، بەلای ئێمەی تاک بە تاکی نێو هێزی پێشمەرگە وا بوو. بەهادین شووشەیەک عەرەقی لە گیرفانی دەرهێنا و پێشمان نەزانیبوو لە چایخانەکەی پیر ئەلیاس سێ پیاڵەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، من زۆر حەپەسام و پرسیارم کرد: ئەوە چۆن بیری ئەوەت هەبوو ئەم پیاڵانە لەگەڵ خۆتدا بهێنی؟ بەهە کوێر وتی: پرسم بە خاوەن چایخانەکە کرد و مۆڵەتی پێ دام بیهێنم. پاش کاتژمێرێک جوامێری سەرتیپ باسی لە جۆری خەباتی هاوڕێکانی بۆ دەکردین و باسی لە شۆڕش و جوامێریی خاڵە شەهابی دامەزرێنەری کۆمەڵە و هاوڕێکانی بۆ کردین و دواتر هەندێک گلەیی و ناڕەزایی سەبارەت بە خەڵکی خۆبەرەپێشەوە و ماستاوچی و خەڵکی دووڕووی بۆ کردین کە بوونەتە هۆی ئەوەی کێشەیان بۆ دروست کردووە، زۆریش خەمبار بوو بەوەی هەندێک لە هاوڕێکانی مامەڵەی خراپ و ڕەفتاری ناشرینیان نواندووە. ئەو دانیشتنەی من لەگەڵ

جوامێری سەرتیپ و بەهە کوێردا، ئارەزوو و ئومێدەکانیان کوشتم و بێزم لە پێشمەرگایەتی و بوونی هەندێک کەس دەکردەوە. جوامێری سەرتیپ فەرماندەیەکی سەربازیی قسەخۆش و بەئارام بوو، لە شەڕی قەیوان ماوەت کە شەڕێکی درێژخایەنی پتر لە سێ مانگ بوو، هەر لە ماوەتەوە دەستی پێ کرد تاکوو گوندی قەیوان، بەو جۆرە ناوی شەڕەکان بە شەڕی قەیوان ماوت باس دەکرێت و شەڕی برزو و قووتەی حەسەن بەگ وەک فەرماندەیەکی سەربازیی سەرکەوتوو ڕۆڵی کاریگەری هەبوو.

## گوللەبارانکردنی حەمەی شێخ حەسەن (حەمە بچکۆڵ)

حەمەی شێخ حەسەن کوڕێکی بزێوی شۆڕشگێڕ بوو، لە سەرەتای لاوێتییەوە ببووە پێشمەرگە و لەنێو کەرتەکەماندا بە «حەمە بچکۆل» ناومان دەبرد و دڵسۆز و لاوێکی قارەمان بوو. لە ساڵی ١٩٨٢ ببووە پێشمەرگە و بەشداریی زۆرترین چالاکییەکانی ناوشار و دەستوەشاندن لە بنکە و مۆڵگە و سەربازگەکانی ڕژێمی بەعسی لەگەڵدا کردبووین. بەتایبەت نەوشیروان مستەفای زۆر خۆش دەویست و چەندین جار پێی دەوتم: «زۆر حەز دەکەم لە نزیکی نەوشیروان مستەفاوە پێشمەرگە بم، بۆ ئەوەی هەر ڕۆژێک شەهید بم، ناوم بچێتە مێژووەوە و هیچ کات لەیاد نەکرێت.»

## زاهیر کونجرینی، قوربانیی بێئاگای زوڵملێکراو

زاهیر کونجرینی، تێکۆشەری دێرینی فەرماندەی مەفرەزەی کەرتی یەکی شەهید سەلاحی مهەندیس، لە تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون بوو، جگە لەوەی لەگەڵ سەلاح چاوزەقدا خەڵکی گوندی کونجرین بوو، هیچ شتێکی ئەوتۆی بە ئێمەوە نەدەبەستەوە، جگە لە پێشمەرگایەتیبوون.

# تێوەگلان و گوللەبارانکردنی سەلاحی حاجی عەلی

سەلاحی حاجی عەلی ناسراو بە «سەلاح چاوزەق»، خەڵکی گوندی کونجرینی سەر بە شارباژێری سلێمانی بوو، زۆر جاریش بە سەلاح کونجرینی ناو دەبرا، بەلام لەنێو هێزی پێشمەرگەدا زیاتر بە سەلاح چاوزق ناو دەبرا. کورتەمێژووی ژیانی سەلاح بۆ نێو ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگە، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٠. وەک هەمووان دەزانین لەو سەردەمانەدا ڕژێمی بەعس ساڵانە بە سەدان هەزار سەربازی دروست دەکرد و هەر کەسێکیش تەمەنی ببووایە بە ١٨ ساڵ، دەبوو ببێت بە سەرباز، بەلام لەبریی سەربازی، خەڵکێکی زۆر دەبوون بە «پۆلیس»، سەلاح چاوزەقیش ببوو بە پۆلیس و دواتر لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی خۆی کە پۆلیس بوون، بە خۆیان و تفەنگەکانیانەوە هاتبوونە نێو ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان. ئاشنابوونی من لەگەڵ سەلاح چاوزەقدا، زیاتر بە هۆکاری دڵپاکی و قسەخۆشی و مرۆڤێکی سادە بوو. لە خێزانێکی مامناوەندی بوو. برایەکی ناوی «محەمەد» بوو، سەرقاڵی هێنان و بردنی کەلوپەل و خواردەمەنی لەنێوان مەرزەکانی عێراق و ئێران بوو و باری گوزەرانی زۆر باش بوو، هەندێک جاریش هاوکاریی ماددیی ئێمەی دەکرد. ڕۆژێک سەلاح بانگی کردم و وتی: «وەرە بڕوانە ئەم برایەی من چیی بۆ هێناوم؟» کە پیشانی دام، دەستێ جلی شاڵی خورمایی بەدیاری بۆ هێنابوو، دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: «براکەم وا دەزانێت من لە شەقامی تووی مەلیک پیاسەی ئێواران دەکەم.» سەلاح چاوزەق جێی بڕوا و متمانەی نەوشیروان مستەفا و سکرتێری کۆمەڵە بوو، ئەو کاتەی لیژنەی بۆ دەستوەشاندن لە دوژمن لە شار داوا کرا و پێک هێنرا، سەرەتا بەم شێوەیە بوو:

عومەر حەسەن (عومەر عەرەب): فەرماندەی لیژنە

سەلاح حاجی عەلی (سەلاح چاوزەق)

شەهاب کەریم (کەریم)

به نامەی فەرمیی نەوشیروان مستەفا و ئامادەکاری بەرپرسی ڕێکخستنی کەرت؛ تۆفیق ناسراو بە «شەهید هونەر»، لیژنەکە پێک هێنرا و دواتر دێمەوە سەر کار و چالاکیی ئەم لیژنەیە. پێشوەخت نەوزاد عەبدوڵلا (نەوزادی عەبەی تەقێ) بە هۆی کار و چالاکییە سەرسوڕهێنەرەکانی و قارمانێتییەوە، بەفەرمی کرا بە فەرماندەی کەرت. ئەردەڵانی ئیسماعیل عارف، حەمەی شێخ حەسەن (حەمە بچکۆل)، عوسمان حەسەن (نەبەز)، کامەران مەحموود (کامەرانی خولە سمێڵ)؛ چەندین چالاکیی ناوشاریان لە دژی ڕژێمی بەعس ئەنجام دەدا.

یەکێک لە هەرە جوامێرییەکانی عومەر عەرەب، سەلاح چاوزەق، نەوزادی عەبەی تەقێ؛ لە شەقامی مامۆستایان، نزیک یانەی مامۆستایان (نادی معلمین) بوو، کە بەردەوام ڕژێمی بەعس بۆ دەستگیرکردن و بەرژەوەندییەکانی خۆیان، لە کونجی کۆڵانەکان و شەقامە سەرەکییەکانی سلێمانی بۆسەیان دادەنا و پێیان دەوتن «قوەی تەواری». عومەر عەرەب بڕیارێکی بەپێی ڕەزامەندیی ئەندامەکان وەک فەرماندە دەرکرد، ئۆتۆمبێلێکی جۆری شۆفێرلێت، ژمارەی پاسەوانەکان (قوەی تەواری) دوانزە کەس دەبوون، پاش ئەوەی تەقە دەستی پێ کرد و هەندێکیان لێ کوژرابوو، عومەر عەرەب پەنجەیەکی بریندار دەبێت و سەلاح چاوزەق لەپی گوێی بریندار دەبێت و خوێنێکی زۆری لێ دەڕوات، ڕەنگە ئەم چیرۆکە ببێتە جێی پرسیارگەلێکی زۆر، ئاخۆ چۆن لەو ئیختیالاتە خوێناوی و ترسناکەدا تەنها لەپی گوێی سەلاح و پەنجەی عومەر عەرەب بریندار بێت، ئەوەی کە زۆریش ترسناک بوو خوێنی گوێی سەلاح نەدەگیرسایەوە، چونکە شوێنێکی هەستیار بوو. پاش ئەوەی بەوپەڕی دڵەڕاوکێ و ماندووبوونەوە،ماڵی خەزووری عومەر عەرەب لە شوێنی چالاکییەکەوە نزیک دەبێت و بۆ خۆحەشاردانیان دەچنە ئەوێ، سەلاح لەوێدا هەر چۆنێک بووە ئارامییەکی بە دەرووندا دێت و شەو بۆ دەربازبوون لە شار و بۆ سنووری ئازادکراو، سەلاح چاوزەق بە ئازارێکی زۆرەوە ئارام دەگرێت. تاکوو ئەو ڕۆژەی بە فەرمانی سکرتێری

کۆمەڵەی ڕەنجدەران نەوشیروان مستەفا کە گوللەباران کرا، سەلاح چاوزەق جێی لەپی گوێی کورتییەکی پێوە دیار بوو، زۆر جاریش لەنێوان خۆماندا گاڵتەوگەپمان دەکرد و دەمانوت: سەلاح، باش بوو ئەو گوللەیە بەر گوێت کەوت، دەنا بەر لووتت بکەوتایە، ئێستە لووتت کورت دەبوو.

ئێوارەیەکیان نامیلکەیەکی شەهید ئارامم دەخوێندە، سەلاح هاتە لام و نامیلکەکەی لە دەست وەرگرتم و وتی: «هەتیو، تۆ خەریکی خوێندنەوەی چیت! تۆ خۆت بینیوە دەڵێی قامیشیت!» ڕاستیشی دەکرد، من هێندە لاواز بووم بەرگەی مستەکۆڵەیەکیشم نەدەگرت، چاوم چووبوو بەقووڵدا و ناوقەدم هێندە باریک بوو، پشتێنێکی پەڕۆی زۆرم دەبەست و کاتێکیش تاقم و تفەنگ و مەخزەنەکانم لەخۆم دەبەست، هێندە توند دەمبەست بۆ ئەوەی سکم دەرپەڕێ و خەڵکی وا تێبگەن قەڵەوم. جاری وا هەبوو بەنێو گوندەکانیشدا دەرۆشتم، فووم دەکردە سکمەوە و هەناسەم لە خۆم دەبڕی بۆ ئەوەی قەڵەو دیار بم، هەندێک جار خەریک دەبوو سییەکانم بوەستێت و هەناسەم لێ ببڕێت و بەزۆریش ورگم دەئاوساند، کەچی هەروەک بزنە لاتە وا بووم و ئێسقانی کەلەکەم دەرپەڕیبوون. منیش وەڵامم دایەوە و وتم: «چیت دەوێت؟» وتی: «قسەم لەگەڵ عومەر عەرەبدا کردووە و پێم وتووە بیری منداڵەکانم دەکەم، دەمەوێت بڕۆمەوە شەوێک بەشاراوەیی لە ناویاندا بم. دەمەوێت کەریم لەگەڵ خۆمدا بەرمەوە!»

دوای ئەوە ڕێک کەوتین بە ئاگاداریی فەرماندەی کەرتەکەمان عومەر عەرەب، جگە لە مەخزەنەکانی خۆمان، یەکی مەخزەنێکی حەفتا و پێنجیمان پێ بوو کە حەفتا و پێنج فیشەکی تیا بوو. شەو من و سەلاح بەڕێ کەوتین و لە گوندی کانی سپیکەوە، نزیک شەقامی شەستییەکەی سلێمانی بوو، هەمیشە دوژمن لەو سنوورەدا بۆسەی دادەنا و زۆریش مەترسیدار بوو، دەبوو پێشمەرگەیەک بپەڕیایەتەوە ئەوبەر شەقامەکە بۆ ئاشکراکردنی بۆسەکان، زۆر جاریش هەبوو هەر لەوێدا پێشمەرگەکە دەکەوتە نێو بۆسەکەوە و شەهید دەبوو، منیش وەک پێشتر باسم کرد لە چالاکیی بەر حەوزە

وشکەکەدا قاچم بریندار بوو و کورتی هێنابوو و دەشەلیم، سەلاح وتی: «کەریم، تۆ برۆ ئەوبەرەوە و ڕێگا تاقی بکەرەوە، گەر شتێکیش ڕووی دا با تۆ بکوژرێیت، چونکە تۆ شەلیت!» منیش زۆر پێکەنیم و وتم: «بۆ وام پێ دەڵێیت؟» وتی: «بیرتان دێت من لە شەقامی مامۆستایان گوێم بریندار بوو، ئازار دەچووە ناخی دەروونم و خوێنم تیا نەما، کەچی دواتر گاڵتەتان پێ دەکردم و دەتانوت باش بوو لەبریی لەپی گوێت؛ لووتت بریندار نەبوو، دەنا کورتی دەهێنا؟» سەلاح وتی: «بە گۆڕی شەهیدان گەر نەچیتە ئەوبەرەوە و ڕێگە تاقی نەکەیتەوە، دەڵێم کەریم ترساوە!» منیش ناچار شەقامی شەستییەکەم تاقی کردەوە و سەلاحیش دڵی نەهات من بەتەنیا بچمە ئەوبەرەوە، شانبەشانی من هاتە ئەوبەرەوە و وتی: «گەر بکوژرێین، با پێکەوە بکوژرێین.» منیش بەپێکەنینەوە وتم: «سەلاح گیان، گرنگ ئەوە نییە کوژراین، بەلام دواتر فەرهادی ئیزاعە لە دەنگی گەلی کوردستاندا دەڵێت: دوو پێشمەرگەی قارەمان بۆ چالاکییەک چوونە شار و شەهید کران...» خۆ لە ڕاستیدا دەبووایە هەواڵەکە وا بخوێنرایەتەوە، چونکە کەسیان بەو هاتنەوەی ئێمەیان نەدەزانی. ئەویش وتی: «ئەوەی کە بۆشی دەچین هەر چالاکییە، بەلام دەترسم حاجی عەلی باوکم نەیەڵێت چالاکییەکە بەئەنجام بگەیەنم!» حاجی عەلی پیاوێکی بالابەرز و بەتەمەن بوو، لەبەر ئەوەی سەلاحی کوڕی پێشمەرگە بوو، زۆر دەترسا لەوەی کە بە بۆنەی هاتنەوەی سەلاح تووشی کێشە و گرفت بێت، بەتایبەت لەو سەردەمەدا کۆمەڵێک چەکداری زۆری ڕژێم لەو دەڤەرەدا نیشتەجێ بوون کە «عومەرە بچکۆل» سەرپەرشتی و وەک مستەشار و فەرماندەی مەفرەزەی خاسە (ئامر مەفرەزەی خاسە) ڕۆڵی خراپیان هەبوو و غەدریان لە خەڵکی و دانیشتووانی ئەو گەڕەکە دەکرد. بەلام سەلاح لە خۆشەویستیی بۆ خێزان و خانەوادەکەی، بڕیاری دا بەوەی تاکوو سەر لەسەر سنگی خێزانە خۆشەویستەکەی نەنێت و بۆن و هەناسەی خێزانە خۆشەویستەکەی نەکات، بێباک بێت لە تووڕەبوونی حاجی عەلیی باوکی و شەهیدکردنی لەلایەن عومەرە بچکۆلی «ئامر مەفرەزەی خاسە»ی

ڕژێمی بەعسەوە. پرسیاری لێ کردم و وتی: «تۆ دەڵێی چی، دوو شەو لێرە بمێنینەوە؟» لە ڕاستیدا خۆشەویستیی من بۆ سەلاح، ئاسۆیەکی بڵندی بۆ من دەنرخاند و بەتایبەت سەلاح چەندە حەزی دەکرد لەلای بمێنێتەوە، خێزانەکەی دوو هێندەی سەلاح حەزی دەکرد گەر بۆ چەند کاتژمێرێکیش بێت پێکەوە شاد بن. یەکەم شەوی مانەوەمان، ناخواردنێکی باشیان بۆ ئامادە کردین و دواتر حاجی عەلی وتی: «تەواو نانخواردن؟ دەی هەستن و بڕۆنماڵم کاول مەکەن!» سەلاحیش وتی: «باشە بابە گیان، هەر ئێستە دەڕۆین.» ماڵەکەمان بە پلانی نێوان خۆمان بەجێ هێشت و دوای کاتژمێرێک من و سەلاح بە بەرنامە گەڕاینەوە ماڵەوە، کە خێزانەکەی هاوکارمان بوو لە دەرگاکردنەوە و هاتنەژوورەوەماندا و وتی: «پرخەی حاجی عەلیی باوکت ماندووبوونێکی زۆری پێوە دیارە و خەبەریشی نابێتەوە!» من لێرەدا باسی جوامێری و قارەمانێتی و دڵسۆزیی سەلاحی تێکۆشەری دێرینی فەرماندە دەکەم، چەندە مرۆڤێکی بەهەڵوێست بوو و ڕێزی لە خانەوادەکەی گرتووە و لەگەڵ ئەوەشدا تامەزرۆی بۆنی هەناسە و سەر خستنە سەر سنگی هاوژینەکەی بووە.

## عومەر عەرەب کێ بوو؟

دەمەوێت لێرەدا ژیان و کاری سیاسی و ناوی ڕاستەقینەی «عومەر عەرەب» بۆ خوێنەر بخەمە ڕوو. عومەر حەسەن بە بنەماڵە خەڵکی گوندی «ولاخلوو»ی سەر بە بەری دۆڵێ و سنووری دۆڵی جافایەتین، وەک هەر هاولاتییەکی شۆڕشگێڕی ئەیلوول و کوردێکی ڕەسەنی ڕاستەقینەی دڵسۆز، لە سەردەمی بەعسدا لەگەڵ چەندین خێزانی کوردپەروەری دوای نسکۆی شۆڕش ڕەوانەی شارەکانی باشووری عێراق دەکرێن و لە گەڕەکی «سوق الشیوخ» لە شاری ناسریە لەژێر چاودێریی بەعسدا نیشتەجێ دەکرێن. دواتر بە بڕیاری بەعس، زۆربەی زۆری ئەو هاولاتییانەی بە هۆی شۆڕشی ئەیلوولەوە ڕاگوێزرابوون بۆ شارەکانی باشووری عێراق، هیوای

گەڕانەوەیانیان پێ بەخشین و دواتر گەڕانەوە زێدی باوباپیرانیان. کاتێک خانەوادەی «عومەر حەسەن» لە گەڕەکی کاریزەوشکی سلێمانی نیشتەجێ دەبن، عومەر لەنێو هاوڕێ و گەڕەک و قوتابخانەدا و دراوسێکانیدا نازناوی «عومەر عەرەب»ی بەسەردا سەپێنرا. عومەر لە خێزانێکی مامناوەندی و ناسراو بوون، پاش هەرەتی لاوێتی، بۆ خۆپێگەیاندن و بەدیهێنانی ئامانجەکانی؛ لە کرێکارییەوە بەربەرەکانێی گیروگرفتەکانی ژیانی دەکرد و لە کۆتاییدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا و دواتر بوو بە وەستای بیناسازی و دروستکردنی خانوو و... هتد. ناسینی من لەگەڵ عومەر عەرەبدا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٣، کاتێک لە زیندانی ئەبو غرێبدا ئازاد بووم کە بۆ ماوەی بیست ساڵ حوکم درابووم و لە کەرتی ٣ی ئەزمەڕ، تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون، عەبدولڕەحمان سیتەکی فەرماندەی کەرتەکەمان بوو، عومەر عەرەب فەرماندەی مەفرەزەی کەرتەکەمان بوو. بەڵام عومەر بەپێی ژیانی سیاسیی، لە تەمەنێکی کەمدا لە ساڵی ١٩٧٨دا پەیوەندیی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە کردبوو.

لە ساڵی ١٩٨٠دا، پاش ئەوەی زۆرترین چالاکیی سەربازیی لەنێو شاردا دەکات و لە تاقم و گرووپ و ئەندامانی دامودەزگاکانی ڕژێم دەکوژێت، عومەر عەرەب ئاشکرا دەبێت و لە شاخ دەبێتە پێشمەرگە و سەنگەر لە دوژمن دەگرێت. عومەر عەرەب هێشتا فەرماندەی مەفرەزە بوو لە کەرتی ٣ی ئەزمەڕ، بەڵام هەفتەیەک لە شاخ و دوو هەفتە لە شار بەردەوام دەستی لە دوژمن دەوەشاند. وەک پێشتر باسم کرد، عومەر عەرەب بە هۆی چاونەترسی و قارەمانێتی و دڵسۆزی و وەفادارییەوە، بە فەرمانی سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەران (نەوشیروان مستەفا) بوو بە فەرماندەی کەرتی پێنجی شەهید هاوڕێ جەبار، تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون. کاتێک پێشمەرگەی کەرتەکەمان لە دانوستانی یەکێتی و ڕژێمی بەعسدا بە ناوی «بەکری حاجی فارس» شەهید کرا و عومەر عەرەب و سەلاح چاوزەق

و بەندە لە تۆڵەی شەهیدکردنی کاکە بەکر چووینە سەر بارەگای شەهید عوسمان کە لەنێو هاولاتییاندا بە «تۆپیو عوسمان» ناو دەبرا، هێشتا عومەر عەرەب بەوەش دانەدەمرکایەوە و تۆڵەی زیاتری شەهیدکردنی بەکری حاجی فارسی دەکردەوە. بۆ مێژوو دەڵێم: ئەو هاورێیانەی لەلایەن عومەرە عەرەب کە فەرماندەی کەرتەکەمان بوو، لە هەفتەیەکدا سێ چالاکیمان لەناو شاردا ئەنجام دا، بریتی بوون لەم تێکۆشەرە قارەمانانە:

سەلاح عەلی (سەلاح چاوزەق)، نەوزادی عەبەی تەقێ، ئەردەلانی ئیسماعیل عارف، کامەران مەحموود (کامەرانی خولە سمێڵ)، محەمەد شێخ حەسەن ناسراو بە «حەمە بچکۆل»، بەندە شەهاب کەریم (کەریمەشەل). کاتێک دوای ئازادبوونم لە زیندان، پەیوەندیم کرد بە هێزی پێشمەرگەوە، لە کەرتی ۳؛ عەبدولڕەحمان سیتەکی نازناوی «کەریم»ی پێ بەخشیم، ئەودەم وا بوو بۆ ئەوەی ناوی پێشمەرگە ئاشکرا نەبێت، ناوی ڕاستەقینەیان دەگۆڕین. دوای ئەنجامدانی چالاکیی بەر حەوزە وشکەکە و قاچم بریندار بوو، ئەو نازناوەم لێ نرا. لەنێو شاردا دەماینەوە و سەرلەبەیانیان یان زۆر جار ئێواران دەچووینە سەر بارەگاکانی ڕژێم، بۆ دووەم جار چووینەوە سەر بارەگای شەهید عوسمان (تۆپیو عوسمان). عومەر عەرەب هێندە بەداخ بوو لە شەهیکردنی بەکری حاجی فارس، ئارپیجیی بەنێو بارەگاکەدا تەقاند. نەوشیروان مستەفا لەبریی ئەوەی ئەم دەستوەشاندنە وەکوو وەرەقەیەک بەکار بهێنێت بۆ سنووردارکردنی تەجاوزەکانی ڕژێم بۆ سەر ڕێککەوتنی شەڕاگرتن و شەهیدکردنی نامەردانەی پێشمەرگە، عومەر عەرەب بانگ دەکات و لەبریی ئەوەی بە شێوەی ئوسوڵی و لە چوارچێوەیەکی یاسایی و ڕێزدا لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکات و لایەنە باشەکان و خراپەکانی ئەو کارە و چالاکی و هۆکاری ئەو کارە سەربەخۆیەی بخاتە دوو تای تەرازووەوە و حساب بۆ دافعی عاتیفیی مەسەلەکە بکات، وەکوو فرسەتێکی باش دەیقۆزێتەوە بۆ پیادەکردنی ڕەفتارە فەردی و ئاغا و کوێخا ئاسایەکانی

و سووکایەتییەکی زۆری پێ دەکات و چەندین جار خوێڕی و سەرسەریی دەکات و چەکی دەکات و لە فەرماندەیی کەرت لای دەبات. بەکورتی: خۆی وتەنی، ترۆ[1]ی دەکات[2].

## دووبارە «عومەر عەرەب» نەجمەکانی بە شاندا کرایەوە

کاتێ عومەر عەرەب کارێکی سەربەخۆی کردبوو، باشتر نەبوو باشەیەک لەو «خراپەیە« هەڵبهێنجێ و بە دوژمنی بفرۆشیتەوە، تاکوو بزانن کە «السن و بالسن، والعين بالعين، و البادیء و اظلم» مانای چییە لە بەکارهێنانی بنەمای «السن و بالسن...»دا بەرامبەر دوژمنانی وەهمیی هاوزوبانتان! ئەگینا بەپێی شەریعەتی ئیسلام (السن و بالسن، والعين بالعين، و البادیء اظلم) ئێمەش ڕەفتار دەکەین. ئەی ئەو کاتە بۆ ئاوا بەرامبەر ڕژێم ڕەفتارتان نەکرد؟ ڕەنگە وەڵامەکەتان ئەوە بێت کە هێشتا لە «علم الحديث»دا نەگەیشتبوونە ئەو حەدیثە! نەخێر، وەڵامەکە ئەوەیە کە تەنها بەرامبەر بە هاوزبانەکانت سوود لەو بنەمایانە وەردەگریت کە بنەمای دوژمنان و زمانی ئەوانە و ئەوان باشتر تێیدەگەن. پاش ئەوەی یەکێتی لە ڕێککەوتنی ساڵی ١٩٨٤دا مایەپووچ مایەوە و جگە لە لاوازی نیشاندان بەرامبەر ڕژێم و دۆڕانی سیاسی و جەماوەری و لەدەستدانی چەندین دڵسۆزی گەلەکەمان بە دەستی نامەردانەی پیاوەکانی ڕژێم بێ تۆڵەسەندنەوەیان، هیچی لەو گفتوگۆیانە بەدەست نەهێنا. دووبارە

---

[1]. ترۆ: وشە موفەزەلەکەی نەوشیروان مستەفا کە بەشانازییەوە خۆی لە «پەنجەکان یەکتری دەشکێنن» لە لاپەڕەی ١٩٧دا باسی دەکات و دەڵێت: ئەوانەی موخالەفەیان دەکرد، هەتا پلەیان بەرز بووایە، سزاکەیان قورستر دەبوو. ئەو کاتە وشەی «ترۆ» بڵاو بووەوە، ئەم وشەیەمان لە شیعرەکەی مەحوی وەرگرتبوو کە دەڵێ: دنیا ترۆیە مەوەستە تیا بڕۆ! دۆزینەوە و وەرگرتنی ئەم وشەیە، خۆ گرتنی کێوی بێستوون نییە کە بەهەرەوەزی کردبێتتان.

٢. نهێنییەکانی نەوشیروان مستەفا، ئامادەکردنی: لیژنەیەک لە ڕۆژنامەنووسان، چاپی یەکەم، چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبخانەی جەمالی عەلی باپیر، سلێمانی، ساڵ (...)، ل٣١٧.

عومەر عەرەب نەجمەکانی بە شاندا کرایەوە و شەرەفی پێشمەرگایەتیی پێ بەخشرایەوە، ئەویش دووبارە وەک ئەوەی نە بای دیبێ و نە بۆران، دڵسۆزانە کەوتەوە پەلاماردانی ڕژێم و دەیان نەبەردیی تری تۆمار کردەوە. هێزی پێشمەرگەی کەرتەکەمان، کەرتی پێنجی شەهید هاوڕێ جەبار، دوای تێکچوونی دانوستان کە عومەر عەرەب فەرماندەی کەرتەکەمان بوو، لەنێو شاردا زۆرترین چالاکیی لە دژی ڕژێم ئەنجام دا و هەر لە دەستبەسەرگرتنی دوانزە ئۆتۆمبێلی فەرمانگەی ئاو (دائیرە میاە جوفی)، دیلکردنی ١٤ چەکداری ڕژێم و ئۆتۆمبێلی تایبەتی (قائید فرقە)ی ٢٤ و... هتد. عومەر عەرەب ناوبانگی لەنێو تەواوی ئەندامانی حیزبی بەعس پەیدا کرد و هەندێک لە پێشمەرگە و بەرپرس و کادرانی ئەوسای کۆمەڵەی ڕەنجدەران کەوتنە بەربەرەکانێ و هەوڵدان بۆ تێکشکاندنی باری کەسایەتیی عومەر عەرەب، تاکوو وای لێ هات کێشەکان بۆ عومەر عەرەب و هێزی کەرتەکەشمان قووڵتر دەبوونەوە و عومەر عەرەب تا دەهات شێوازی خەباتکردنی ساردییەکی پێوە دیار بوو. ڕاپۆرت نووسین و هەست بریندارکردنی عومەر عەرەب کاریگەریی گەورەی کردبووە سەر و پاش بێڕێزیکردنێکی زۆر لەلایەن نەوشیروان مستەفا و فەرەیدوون عەبدولقادر، ژیانی سیاسی و خەباتی عومەر عەرەبی بەرەو هەڵدێر دەبرد و کێشەی زیاتر دروست دەبوون، تاکوو کار گەیشتە سەر ئەوەی عومەر عەرەب لەگەڵ غەریب کونجرینیدا کە ئەویش جێگری فەرماندەی تیپ بوو، ڕووەو شار هەڵدێن و بەداخەوە ئەوانەی ڕۆژانێک لە تەمەنی مێردمنداڵیدا خەباتیان دەکرد و بەرپرسەکانیش لە تەمەندا کامڵ بوون، نەیانتوانی وەک پێویست ڕۆڵەی ئەو گەلە بکەنە نموونەی خەباتگێڕ و دروستیان بکەن و دواتر هەریەک لە جوامێری سەرتیپ و سەلاح چاوزەق و حەمەی شێخ حەسەن و زاهیر کونجرینی بە تاوانی ئەوەی ئاربیجی بنێن بەو خێمەکەی نەوشیروان مستەفا، بەبێ هیچ بەڵگەیەکی حاشاهەڵگر و هیچ نووسراوێک؛ گوللەباران کران. زۆر جار باس لەم مێژووە کراوە، نەتوانراوە بەڵگەیەکی سەلمێنەر لەسەر تاوان و خیانەتکاریی ئەم تێکۆشەرانە ئاشکرا بکرێت.

نەوشیروان مستەفا دوای چەندین ساڵ، لە بیرەوەرییەکانیدا دان بە ـوو شتدا دەنێت، یەکەم: کە هەرگیز بڕوای بە مارکسیزم-لینینزم نەبووە. ـەوشیروان مستەفا لە لاپەڕە (١٨)ی یاداشتەکانی «لە کەناری دانووبەوە بۆ خڕەی ناوزەنگ»دا تەواو دان بەوەدا دەنێت کە ئەو پێش ئەوەی بێتەوە بۆ کوردستان، بڕوای بە سۆسیالزم و مۆدێلەکەی نەبووە، کەچی لە دواییدا خۆی دەبێتە سکرتێری گشتیی کۆمەڵەی مارکسیزم-لینینزمی کوردستان!

سەیر بکە چ سایکۆپاتێک سەرکردایەتیی کۆمەڵەی کردووە! لێرەدا قەناعەتی تەواوم هەیە کە نەوشیروان مستەفا سوستماتیک کاری بۆ هەڵوەشاندنەوەی پێگە سیاسی و ئایدۆلۆژییە چەپەکەی کۆمەڵە کرد و کۆمەڵەی کردە ڕێکخراوێکی لاواز، ڕێکخراوێک وەک جاران توانای بەرهەمهێنانی پێشمەرگە و کادری بەتوانای نەبێت. هەڵەکانی دیکەی نەوشیروان مستەفا لە قیادەی کۆمەڵەدا لە دوو کارەساتی گەورەدا بەرجەستەن: هەڵەبجە و ئەنفال. با لێرەدا بزانین بە چ پێوەرێک سکرتێری کۆمەڵە ڕێگە دەدات پێشمەرگە پێشڕەوی بکات بۆ هەڵەبجە لەگەڵ پاسداردا! ئەوە باسی بڕینی بانکی هەڵەبجە و تالان و بڕۆ ناکەم کە بەبێ سزا تێپەڕ بوون. سەیرم لێ هات نەوشیروان مستەفا لەسەر بیروباوەڕی ناو حزب، کە لە چوارچێوەی حزبەکەی خۆیدا بوو، کادرەکانی دەکوشت و زیندانی دەکردن و سووکایەتیی پێ دەکردن، کەچی بێدەنگ بوو بەرامبەر سزادانی ئەوانەی تالانی گەورەیان دەکرد لە هەڵەبجەدا! ئەوانە بەشێکی زۆریان سەرکردەی سەربازی و سیاسیی کۆمەڵە بوون. جگە لەوە، هەموومان دەمانزانی سەددام خەریکی دروستکردنی چەکی کیمایی بوو، پێشتر بەهەڵەدا نەچووبم لە ناوچەیەکی کوردستاندا بەکاری هێنابوو، هەواڵی چەکی کیمایی شتێک نەبوو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە نەیزانن، بەو سیفەتەی بەشێک لە هاوڕێیانمان خوێندکاری زانکۆ بوون لە موسڵ و بەغداد و لە ڕێگەی تێکەڵاوییەوە؛ ئەو هەواڵ و ڕاپۆرتانە بەرز کرابۆوە. سەرکردایەتیی یەکێتی و کۆمەڵە بەتایبەت، هەم سروشتی وەحشیگەریی بێوێنەی سەددامیان دەزانی و هەم توانای بەکارهێنانی ئەم چەکەیان دەزانی. بەڵام ئەو حونجەتەی دەگوترێت

لەو بڕوایەدا نەبووین سەددام چەکی کۆمەڵکوژ بەکار بهێنێت، حونجەتێکی لاوازە، بەو سیفەتەی خەڵکی هەڵەبجە سەرەتای دابەزینی پێشمەرگە و پاسدار، دەیانزانی کارەساتی کۆمەڵکوژی ڕوو دەدات، بەڵام فەرمان کرابوو بە پێشمەرگە کە نەهێڵن خەڵک بچنە دەرەوەی شار و ئەم فەرمانە لە کاتی ئەنفالیشدا دەرکرابوو و ناشزانرا حیکمەتەکەی لەکوێدا بوو! من بۆیە ئەوەتان بۆ ڕوون دەکەمەوە کە ئێمە هەمووان وەک کادرانی کۆمەڵە و پێشمەرگەی کۆمەڵە، دەمانزانی کۆی ئەم کارانە هەڵەن، بەڵام بۆچی سەرکردایەتی ئەوەی کرد و نەوشیروان مستەفا (وەک دەڵێن) فەرمانی بە فەریدوون عەبدولقادر کرد سەرپەرشتیی ئەم پرۆسەیە بکات؟ ئەمە پرسیارێکە بەکراوەیی ماوەتەوە و دادگای مێژوویی دەوێت. بەڵام من لێرەدا وەک ویژدانی خۆم دەیڵێم کە لێرەوە پێشمەرگەیان فێری تالانی کرد و ئەوەی دوو ڕۆژ سیاسەت بکات، باش دەزانێت ڕێگەدان بە هەڵسوکەتی نەشیاو وەک تالانی و کوشتنی دیل و ئەشکەنجەدان، هێزی سەربازیی خاوەن بیروباوەڕ دەگۆڕێت بۆ جەردە و پیاوکوژ و میلیشیا... بەڵام بۆچی ئەم کارە تێپەڕ بوو؟ کێ گڵۆپی سەوزی بۆ هەڵکردبوون؟ بۆ ترسیان لە لێپێچینەوە نەبوو؟ سەیرە! دەبێت ئاماژە بەوە بکەم کە پێش تالان و بڕۆی هەڵەبجە، نەوشیروان مستەفا ڕێخۆشکەرییەکی دیکەی کردبوو بەوەی فەرمانی دابووە پێشمەرگە کە دیلەکانی حزبی شیوعی لە قرناقە و پشت ئاشان بکوژن، بە مەرجێک ئەفسەر و سەربازی قوات خاسەی ڕژێم کە بەدیل دەگیران، بە مریشکی گوندییەکان قەڵەویان دەکردن! بە ڕای من ئەم پلانە زیرەکانە نەخشەی بۆ کێشرابوو و مەبەستی لێدانی هێزی پێشمەرگە بوو، لێدانی ورە و فیگۆری پێشمەرگە بوو و سەرەتای کردنی پێشمەرگە بوو بە میلیشیا و کاریگەرییەکانی؛ لەدوای ڕاپەڕین تا ئەمڕۆ درێژبوونەوەی هەیە.

خاڵێکی تر کە ئەنفالی دروست کرد، دەستلێدان بوو لە ستراتیژێک لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە سەددام و ئەمەریکا لەسەری ڕێک کەوتبوون، ئەویش بیرە نەوتەکانی کەرکووک بوو کە نەکەوێتە ژێر هەڕەشەی خومەینی و سەرچاوەی وزە نەکەوێتە هەڕەشەوە، بەو سیفەتەی سەددام بە مانگ نەوتی

بەخۆڕایی لە ڕێگەی بەندەری جیهانەوە بۆ ئەمەریکا پەمپ دەکرد لە کاتی قەیرانی ئۆپێکدا، کەچی نەوشیروان مستەفا لە ساڵی ١٩٨٧ بە خۆی و هێزێکەوە پێش پاسداری ئێرانی دەکەوێت لە بانی مەقان و چیمەنەوە نزیک کەرکووک دەبێتەوە و بیرە نەوتەکانی کەرکووک بە ڕاجیمە و هاوەنی پاسداری ئێرانی و نەگەڵ پاسداردا بۆمبباران دەکات. لێرەوە کورد لە شۆڕشێکەوە کە داواکارییە نەتەوەییەکانی هەبوو، چووە ناو زۆنگاوی پێش پاسدار کەوتن. ئەمەریکا و ڕۆژئاوا گڵۆپی سەوزیان بۆ سەددام هەڵکرد کە دەستی کراوە بێت بەرامبەر بە کورد. سەددام سیاسەتی سووتماککردن و ژەهراویکردن و ئەنفالکردنی پەیڕەو کرد. لێرەوە نەوشیروان مستەفا لێپرسراوی سەرەکییە، ئەو بوو پاسداری هێنا و ئەمیش بوو پەلاماری کەرکووکی دا، باجەکەی هەشت قۆناغی ئەنفال و کیمیاباران بوو، کە سروشت و خەڵکی کوردستان دایان. لە ئەنفالیشدا هەمان هەڵەی هەڵەبجە دووبارە کرایەوە و پێشمەرگە بەپێی فەرمانی سەرەوە ڕێگەیان نەدا خەڵکی؛ گوندەکان چۆڵ بکەن و لەپڕێکیشدا پێشمەرگە بە بەرگرییەکی کەمەوە کشانەوە و خەڵک کەوتنە بەر دەست جاشەکانی خۆمان و ئەنفال کران. نەوشیروان پیاوێکی گێل نەبوو کە سروشتی سەددام و پرۆتۆکۆلاتی تەسنیع عەسکەری (تصنيع العسكري) و چەکی سەددام و گرنگیی نەوت بۆ ئەمەریکا و ڕۆڵی کورد نەخوێنێتەوە! بەڵام پێدەچوو ئەم هەموو خوێنە بۆ ئەوە بێت کە شۆڕش نەک تەنها لەژێر فشاری سەربازیدا کۆتایی پێ بێت، بەڵکوو ڕیسوا بێت لەناو دڵی خەڵکدا و بەرە مەعنەوییەکەی تێکوپێک بشکێت. هەمووشمان شەپۆلی تەسلیمبوونەوە و وازهێنانی پێشمەرگە و ئەندامانی ڕێکخستنی کۆمەڵەمان لەناو شاردا بینی، چەندە قسەمان دەکرد؛ بێسوود بوو. دواجار کۆمەڵێک پەیوەندیی پچڕاو بووین، تاوەکوو ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ و چیرۆکی دزی و فزیی دوای ڕاپەڕینیش ئاشکرایە، ئەوانەشی دەڵێن ڕێکخستنەکان ڕاپەڕینیان بەرپا کرد، جگە لە درۆی شاخدار نەبێت هیچی تر نەبوو، هەموو یەکێک لە کوردستان دەستی دایە چەک و بارودۆخەکە خۆرسکی تەقییەوە. وەک گوتم نەوشیروان مستەفا سوستماتیک کۆمەڵەی هەڵوەشاندەوە و پێشمەرگەی قارەمانی شاخی ڕیسوا کرد و کارەساتی بەسەر میللەتەکەماندا هێنا و هەمیشەش وەک خۆی دەیگوت

مام جەلال برا گەورەمە. بەڵام هەر چی تاوانێکی کردبێت، لە غیابی مام جەلالدا بوو، چونکە کاتێک ئەم تاوانانەش کە دەیکردن، خودی مام لە دەرەوەی وڵات بوو، هەر لە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە بەڕەسمی لە یەکەمین کۆنفرانسی یەکێتیدا، یان ئەوەیە وەک مام دەڵێت من ئاگام لێی نەبووە و لە دەرەوەی وڵات بووم و کاتی خۆی لە دژی ئەو هەموو توندوتیژییە وەستاوم کە ڕوویان داوە. هەر یەکێک لەم گریمانانە وەربگرین، ئەوا نەوشیروان خۆی لێپرسراوە لەم هەموو کارەساتە و دوا کارەساتیشی؛ هەڵخەڵەتاندنی گەنجانی خوێنگەرم و ڕۆشنبیرانی ناو بزووتنەوەی گۆڕان بوو، لە سەرێکەوە ئیسلامییەکانی زیندوو کردەوە و دەستی خستە دەستیانەوە و لە سەرێکی ترەوە گۆڕانی تەسلیمی یەکێتی کردەوە لە ڕێککەوتنی دەباشان. خۆ ئەوە باسی ئەو کولتووری شەڕەجنێوە ناکەم کە بەبن لووتی ئەودا دەکرا و کەیفی پێ دەهات. شەڕەجنێو تا ئەمڕۆ بۆتە جێگرەوەی ڕەخنەی سیاسیی ڕاستەقینە، چونکە نەوشیروان مستەفا هەمیشە ڕقی لە دیالۆگی فیکری بووە و سروشتی خۆی وا بووە شتێکی بەدڵ نەبووبێت، جنێوێکی پێ داوە و ناو ناتۆرەیەکی لێ ناوە. کەسانێکیش بەو کاریگەرن، فێری ئەو جنێوفرۆشی و لاقرتێ ناشرینە بوون و بۆتە بەشێک لە کاراکتەریان. لە ڕوویەکی ترەوە کە سەیری هاتنەوەی هەندێک لەم سەرکردانە دەکەم لە هەندەرانەوە بۆ کوردستان و دوای شەش ساڵ کە کۆمەڵە پتەو بووە لە ناوەوە و کاتێک هەست دەکەن ئارام ڕێکخراوێکی پتەوی دروست کردووە، وەک ئەوەی پیاوی موخابەراتی بەریتانی یان ئەمەریکی بن کە ئەم پیشەیە مێژووی هەیە لە وڵاتانی سێهەمدا، بەوەی پیاوانی موخابەرات دەچنە ناو بزاوتە شۆڕشگێڕەکان و دوایی دەچنە ناو سەرکردایەتی و شۆڕشەکان بەپێی خواستی نەخشەیەکی موخابەراتی هەڵیدەسووڕێنن و ئاراستەیان دەکەن. سەیرە لەگەڵ هاتنەوەی نەشیروان مستەفا، ئارام (شاسوار جەلال) زیز دەکرێت، هەمووان دەزانین ئارام هەرگیز قەناعەتی نە بە نەوشیروان و نە بە عەلی عەسکەری نەبوو کە بەعس دوای شۆڕشی بارزانی ساڵی ١٩٧٥ نەفیی دەکات بۆ باشوور، پلەیەکی ئیداریی باشی دەداتێ. هاتنەوەی نەوشیروان مستەفا جێی سەرنجە و سەیرە مورتاح لە نەمسا و لە لەندەن دەژی، چۆن و بە پارەی کێ دەژی و کورەکانی لە ئەمەریکا

به پارەی کێ دەخوێنن و بە پارەی کێ خانوویان بۆ دەکرێت و بڕوانامەی خوێندن وەردەگرن؟

نەوشیروان مستەفا کە دێتەوە، ئارام وەها لێ دەکەن بەزیزی بڕوات بۆ تەنگیسەر و لەوێ چیرۆکی ئاشکراکردنی شوێنەکەی تا ئەمڕۆ جێگەی پرسیارە و زانیاری هەیە گوایە شوێنی ئارام بە ڕێکخراوێکی فەڵەستینی گوتراوە و ئەوانیش بە بەعسیان گوتووە. ئاوا نەوشیروانێک کە نە بڕوای بە کۆمەڵە هەبوو، نە بە مارکسیزم-لینینزم و بە قسەی خۆی بە تەکلیف بۆتە سکرتێری پارتێکی مارکسی لینینی! ئەمە قسەیەکە مرۆڤ لە کاتی دۆمینەشدا بیکات؛ دەبێتە مەخسەرە، یاخود وەک سەرکردەیەک بەئاشکرا ئەو قسەیە بکەیت! پرسیارەکە ئەوەیە چۆن نەوشیروان مستەفا هات و چۆن تا مردن پارچەیەکی بچووکی لە ڕژێمی بەعسی بەر نەکەوت، یاخود ئەو هەموو خزم و دۆستەی کە هەیبوون لە شار لە سەردەمی ئەو ڕژێمە دڕندەیەدا، کەسیان تەنها بۆ کاتژمێرێکیش زیندان و دەستبەسەر نەبوون؟ ڕاستە نەوشیروان مستەفا نە خێڵەکی بووە و نە بڕوای بە عەشیرتگەری هەبووە و عەشرەتدار نەبووە وەک باسی لێوە دەکرێت، خۆ ناشبێت لە کاتی سەرکردەبوونیدا و وەک سکرتێریکی کۆمەڵە لەلایەن بەعسەوە نەناسرابێت و بێکەس بووبێت، بەڵام هیچ کەسێکیشی لەلایەن بەعسەوە دەستگیر نەکرابێت و ئەوانەشی کە ماون؛ لافی شۆڕش لێدەدەن بە خۆیان و کۆمپانیاکانیانەوە و وەک گوێزی ساغ وان؟ جێی سەرنج و تێبینییە ژیانی هەزارەها گەنجیان فەوتاند بە ناوی مارکسیزم-لینیزم و خۆشیان بڕوایان پێی نەبووە! لێرەوە من لە ئاست هەموو پێشمەرگە قارەمانەکانی کۆمەڵەدا کەسێکم داوای لێبوردن دەکەم. داوای لێبوردن دەکەم کە وەک کادرێک و پێشمەرگەیەکی فەرماندەی سەربازی شار و شاخ، نەمانتوانی ڕێگە بەو هەموو ناشرینییە بگرین کە بەرۆکی میللەتەکەمانی گرتووە و نیوسەدەی دیکەی دەوێت بۆ پاکبوونەوەی. داوای لێبوردن دەکەم کە توانای خۆمان وەک پێویست نەخستە گەڕ بۆ دووبارە دروستکردنەوەی کۆمەڵە و پاراستنی قەوارەکەی وەک ڕێکخراوێکی چەپی جیهانی.

## بەسەرهاتی گوولەبارانکردنی
## لێپرسراوی کەرت؛ خەلیفە عەبدوڵڵا مارف

**«خەلیفەی عەبدوڵڵا مارف مەکوژن، بە زووترین کات**
**بڕیاری گوولەبارانکردنەکەی بوەستێنن.»**
**«جفرەکەی سەرکردایەتیی ی. ن. ک»**

«مامۆستا ئارام باساکی»؛ پێشمەرگە و کادری دێرینی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان، بەم شێوەیە ڕووداوی گوللەبارانکردنەکەی «خەلیفە عەبدوڵڵای مارف»ی بۆ گێڕامەوە، کە چەند کارەساتێکی ناخۆش و هەندێک لە بەرپرسان بێبەزەییانە و چۆن بە ئەقڵیەتی شاخ، بەبێ هیچ هۆکارێک ئەو تێکۆشەرە دڵسۆز و قارەمانانەیان لەناو بردووە و گوللەبارانیان کردوون، منیش لێرەدا بەبێ هیچ دەستکاریکردنێک دەقی گێڕانەوەکەی «مامۆستا ئارام» لەسەر ڕەزامەندیی خۆی، وەک سەرچاوەیەک لەسەر ئەو ڕووداوەی ناو شۆڕش دەنووسمەوە.

لە پێشمەرگایەتیدا زستانی ساڵی ١٩٨٠؛ زستانێکی زۆر سەخت و بەفرانبار بوو، بەفرێکی زۆر باریبوو، ڕێگەی هاتوچۆی خەڵکانی گوندەکانی ئەو ناوچەیەی گران کردبوو، ئێمەی پێشمەرگەش هەمووومان وەک کوڕی خێزانێک لە مزگەوتەکەدا کۆ بووبووینەوە و خۆمان گەرم دەکردەوە، کاتێکمان زانی کەرتەکەی «خەلیفەی عەبدوڵڵا مارف» هاتنە ناو مزگەوتەکەوە، بریتی بوون لە ١٠ تا ١٢ پێشمەرگەیەک، هەموو سەر و شان و جامانەکانیان بە بەفر داپۆشرابوو، بەرگ و چەکەکانیان تەڕ بووبوون.

لە پێشمەرگەیەکم پرسی: «ئێوە چ کەرتێکن؟»

پێشمەرگەکە وتی: «کەرتەکەی خەلیفەین.»

«کاک خەلیفەتان لەگەڵە؟»

لە تەنیشتمدا پێشمەرگەیەک کە خەریکی تەکاندنی سەر و جامانە و

قەمسەڵە خاکییەکەی بوو لە بەفر، هەڵیدایە و وتی: «فەرموو، منم خەلیفە.»
پاش دەست گوشین، ئەوە یەکەم ناسینی «خەلیفە» بوو لەگەڵ من. پاش دانیشتن لە مزگەوتەکە لەبەر نێڵەی زۆپاکە، هاورێیەتیمان زۆر قووڵتر ڕۆچوو. بۆ دابەشبوونی ئێوارە لە ماڵەکانی گوندی پارەزان، ئەو ئێوارەیە پێکەوە دووبەدوو لە دابەشکردندا بەر ماڵێک کەوتین. پاشان پێشمەرگەکانی دیکە و «کەریم»ی برای خەلیفەم ناسی.
ئەوەی لە یادم بێت ماڵەکە ساوەریان لێنابوو، لەگەڵ ماشی ڕەش کردبوویان بە شلە. کاتێ کابانوونی ماڵ خواردنەکەی لەسەر سینییەک هێنا، لەگەڵ کابرای خاوەن ماڵدا دەستمان کرد بە نانخواردن. خەلیفە وتی: «خۆزگە ماشەکە کەمێکی تر بکوڵایە، هێشتا ڕەقە!» کابرا خێرا هەڵیدایە و وتی: «کورە ئەوەی ڕاستی بێت ئەوە ماشی کەوەکانە، لەم چەند ڕۆژەدا کورەکەمان لە سلێمانییەوە هاتبۆوە بۆ کەوەکانی کڕیبوو. کە ئێوە تەشریفتان هێنا، هیچمان نەبوو بۆ شلە، ئەوە لەبەر خاتری ئێوە بۆی لێناون بۆ ئەوەی ساوەرەکەتان بۆ قووت بچێت.»
خێرا خەلیفە هەڵیدایە: «کورە مامە گیان بۆ ئەو زەحمەتەتان کێشا، لێتان بەزیاد بێت. کورە بڕوات هەبێت ئێمەی پێشمەرگە کەپەکی ئەسپیش دەخۆین.»
هەرسێکمان دامانە قاقای پێکەنین و گوێمان لێ بوو ژنی خاوەن ماڵەکەش لەودیو گوێی لە گفتوگۆکەمان بوو، دایە قاقای پێکەنین.
منیش خێرا هەڵمدایە: «دەی باشە، ئێمە ماشی کەوەکانمان خوارد! ئەم بەهارە بمانبە بۆ ڕاو، لەجیاتیی کەوەکان ڕاوێکی باشت بۆ دەکەین!»
دیسان پێکەنینەکە تازە بوویەوە.
ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام پێڵاوەکانی خەلیفە بوو، کە لەپێیدا بوون. وەک هەموو پێشمەرگەکانی دیکە، جووتێ پاتەی لاستیکی ڕەشی ئێرانی بوون، نەرم بوون بۆ ڕۆیشتن و داکەندن و لەپێکردن زۆر خۆش و سووک و ئاسان بوون، کە خۆشم هەر ئەو جۆرە پاتانەم لەپێ دابوو. پاتەکەی

پێی ڕاستی خەلیفە دڕابوو، قڵیشێکی درێژی دادڕاوی تێدا بوو، هەموو گۆرەوییەکانی تەڕ بووبوون و پەنجەکانی تەزیبوون.

«کاک خەلیفە، پێڵاوەکانت کونی تێدایە، بۆیە هەموو پەنجەکانت تەزیوە و گۆرەوییەکانت تەڕ بوون!»

«مامۆستا ئارام، دوو مانگە یارمەتیی پێشمەرگایەتیمان وەرنەگرتووە، پارەم پێ نییە پێڵاو بکڕم.»

«کاک خەلیفە، ژمارە چەند لەپێ دەکەیت؟»

«بڕوا دەکەیت مامۆستا گیان نازانم بەتەواوی، هەر چی بە پێم باش بێت؛ لەپێی دەکەم، وا بزانم ٤٢ یان ٤٣ لەپێ دەکەم...»

پاش ماڵئاوایی لە خانەخوێکەمان، هەردووکمان بە گاڵتەوگەپەوە هاتینە دەرەوە. بەفر کڕێوەی دەکرد، پرووشەی بەفر برژانگەکانی هەردووکمانی داپۆشیبوو. ئەو گەڕایەوە بۆ مزگەوتەکە و منیش چووم بۆ دووکانە بچکۆلەی گوندەکە.

لە دووکاندارەکەم پرسی: «پاتەی لاستیکت هەیە؟»

«بەڵێ مامۆستا گیان، باشترین پاتەی لاستیکیی ئێرانیمان هەیە و هەموو پێشمەرگەکان لەوە دەکڕن.»

«نرخی چەندە؟»

«دینارێک و پانزە پەنجایی.»

پاش مامەڵە، بە دینار و چارەکێک ڕێک کەوتین. پاتەکانم کڕی، ویستم بڕۆم، بینیم «خەلیفە» هات بۆ دووکانەکە و منیش پاتەکانم پێشکەش کرد، خەلیفە وتی: «سوپاس، زۆر مەمنوونم مامۆستا گیان.» خەلیفە پاتە کۆنەکانی داکەند، کابرای دووکاندار وتی من فڕێی نادەم، بە ئاگر پارچە لاستیکێکی بۆ دەتوێنمەوە، پینەی دەکەمەوە و دەیدەم بە پێشمەرگەیەکی تر کە پێویستی پێ بێت.

خەلیفە وتی: «مامۆستا، دیارە یارمەتییەکەتان وەرگرتووە!»

«کاک خەلیفە، من لەوەتەی پێشمەرگەم، یەک مانگ یارمەتیم وەرنەگرتووە، ئەوە پارەی ماڵەوەیە بۆم دەنێرن، شەونم خانی خوشکم لە سلێمانییەوە

بۆی ناردووم.»

ساڵ بەرەو کۆتایی زستانی ساڵی ١٩٨٠ هەڵدەکشا، لەگەڵ هەرێمی یەک لە شارباژێڕ ئەو کاتە ڕەوانشاد کاک بەکر حاجی سەفەر (یادی بەخێر) لێپرسراوی هەرێمەکەمان بوو، کاک بەکر پیاوێکی لەسەرخۆ و زۆر لە گفتوگۆکردندا بەئەدەب بوو. لە بەسەرکردنەوەی ناوچەکەدا، لە پێشمەرگایەتیدا پێیان دەوت «جەولە»، ڕێمان کەوتە گوندی گوورگەدەر (گورگەیەر)، شەو لەوێ نووستین، بۆ ئێوارەکەی ڕوومان کردە گوندی «عازەبان»، دەمەوبەیانی لە دەوروبەری کاژێر ١٠ی بەیانیدا من لەگەڵ پێشمەرگەیەک لە سەربانێک وەستابووین چاوماڵی (مراقەبە) جادەکەمان دەکرد، لەناکاو لاوێکی بەخۆ بە کراسێکی سپییەوە بەڕاکردن بەبێ چەک، سەر شان و باڵی خوێناوی بوو و خوێنی لێ دەچۆڕا بەرەو ڕووی گوندی «عازەبان» دەهات و هاواری دەکرد: «کاک بەکر! کاک بەکر! کاک بەکر!» پێشمەرگەکەی هاوڕێم کاک بەکری ئاگادار کردەوە و منیش چووم بەدەم بریندارەکەوە. بریندارەکە کوڕێکی لاو بوو ناوی «سالار» بوو، پێشمەرگە بوو لە کەرتی «کاک عومەری ڕەشە جووتەی» قرگەیی. کاک عومەر پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بوو، پیاوێکی بەخۆ و بەڕێز و خۆشەویست بوو، من خۆم لە پێشمەرگایەتیدا دوو جاران پێی گەیشتبووم و زۆر ڕێزی لە بەرامبەرەکەی دەگرت. زۆر بەداخەوە بووم بۆ کاک عومەر، کە بەو شێوەیە ڕۆیشت و شەهید بوو...

کاک بەکر سەرەتا شێوا و پرسیی: «سالار، چی بووە؟ جەیش هاتە سەرتان لە گورگەیەر؟»

«نەخێر کاک بەکر، کەریمی عەبدوڵلا مارف برای خەلیفە تەقەی لە کەرتەکەمان کرد و چەند پێشمەرگەیەکی شەهید کرد!»

(کەریم لێپرسراوی مەفرەزە بوو لە کەرتەکەی خەلیفە و پێشمەرگەیەکی لاو و چالاک بوو، پێشمەرگەکان باسی ئازایەتییان دەگێڕایەوە لە دانیشتنەکانیاندا). بەدەم گێڕانەوەی باسەکەوە، ئەوەمان بۆ ڕوون بووەوە کە پێشمەرگەکان لەنێوان خۆیاندا بووە بە شەڕیان و شەهید و بریندارمان

هەیە. کاک بەکر فەرمانی دا کەرتی هەرێم بەرەو گورگەیەر بەڕێ بکەون. کەرتی هەرێم ١٠ تا ١٥ پێشمەرگە دەبووین، شێخ حسەینە سوور (یادی بەخێر) فەرماندەی کەرتی هەرێم بوو، چووینە ناو گوندی گورگەیەر (شێخ حسەینە سوور هاوڕێیەکی گیانیبەگیانی ژیانی پێشمەرگایەتیم بوو، یەکێک بوو لە پێشمەرگە ئازا و دەستوەشێنەکانی ئەو کاتەی هەرێم، لە شەڕی براکوژیی نێوان پارتی و یەکێتیدا بووە قوربانی و گیانی بەخشی).

### کارەساتەکە چۆن ڕووی دابوو؟

لە گورگەیەر زانیمان کە کاک عومەر شەهید بووە و کاک سالار بریندارە و کاک ڕێبوار؛ لاوێکی دەوروبەری ٢٠ تا ٢٣ ساڵان دەبوو، ئەویش بریندار بوو، گوللەیەک لە قوڕگی دابوو، بارودۆخی ناجێگیر بوو. دکتۆر هەژار؛ دکتۆرە خۆشەویستەکەی پێشمەرگە گەیشتە ئەوێ (دکتۆر هەژار ناوی عەبدولڕەحمان بوو، ئێستە دکتۆری دەروونییە لە سلێمانی، لە پێشمەرگایەتیدا لاوێکی چالاک و خۆشەویست بوو، لەلایەن خەڵک و پێشمەرگەوە زۆر ڕێزی لێ دەگیرا).

من پرسیم: «دکتۆر، من یارمەتیت دەدەم. چی بکەم؟ بەڵکوو ڕێبوار نەمرێت.» هیچ دەرمانێکی چارەسەر نەبوو، بێجگە لە هەندێ بابەتی سەرەتایی و فریاگوزاریی زیاتر، ڕێبواریش بەخەستی بریندار بووبوو. دکتۆر هەژار وتی: «مامۆستا، خوێنی زۆری لێ ڕۆیشتووە!» ئاوی دڵۆپاوی بۆ هەڵواسی، منیش بەپێوە وەستام و بە درێژایی ئەو کاتە ئاوەکەم بە دەستەوە گرتبوو، پاش تەواوبوونی ئاوەکە، کیسەی دووەمی ئاوەکەی بۆ هەڵواسی، بەڵام دکتۆر هەژار هەر خەریکی لەفاف گۆڕین و وەستانی خوێنەکەی بوو، ناوبەناو ڕێبواری بریندار چاوە جوانەکانی بەرز دەکردەوە، نیگایەکی من و دکتۆر هەژاری دەکرد، وەک ئەوەی پێمان بڵێت تکایە مەیەڵن بمرم! ئێستەش نیگای چاوەکانی ڕێبوارم لەبەر چاوە، لەگەڵ هەموو چاوهەڵبڕینێکدا نیگاکانی کزتر دەبوون. بەداخەوە، کاژێر پێنجی بەیانی، دەمەدەمی گزنگ، نیگای

چاوەکانی ئەو لاوە کوژانەوە، ئیدی جارێکی دیکە هەڵنەکرانەوە، گیانی سپارد و ماڵئاوایی کرد لە هاوڕێکانی. ئێستەش شێوەی دەموچاوە خەماوییەکەی دکتۆر هەژارم لەبەر چاوە دوای کۆچی شەهید ڕێبوار. لەپاش ڕۆیشتنی ئێمە (کەرتی هەرێم) بۆ عازەبان، کەرتەکەی خەلیفە و کەرتەکەی کاک عومەر هاتبوونە گورگەیەر، کەرتەکەی خەلیفە خەریک بوو دەڕۆیشتن، لە دەرەوەی مزگەوتەکە چاوەڕوانی خەلیفەیان دەکرد بێت و بڕۆن، خەلیفەش لەگەڵ پێشمەرگەیەک لە ماڵێک بوون، کەریمی برای خەلیفە لە ئەنجامی گفتوگۆوە لەگەڵ پێشمەرگەیەکی کەرتەکەی کاک عومەر دەبێتە دەمەگازێیان، کەریم هەندێک جنێو دەدات، پێشمەرگەکەش کاک عومەر ئاگادار دەکاتەوە، کاک عومەر دێت و لەبەر مزگەوتەکەدا دەبینێ کەریم وەستاوە و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات و دەیەوێت چەکی بکات، وەک پێشمەرگەکان گێڕایانەوە و لە کارەساتەکەدا شاهید بوون، کاک عومەر بە کەریم دەڵێت: «چەکەکەت دابنێ، من چەکت دەکەم!» کەریم کە کاتێ گوێی لە وشەی چەککردن دەبێت، دەروونی هەڵدەچێت و سوور دەبێتەوە و دەڵێت: «تۆ بۆت نییە من چەک بکەیت! کەس ناتوانێت من چەک بکات! تۆ دەبێت لێپرسینەوە لە پێشمەرگەکانی لای خۆت بکەیت نەک من، چونکە تۆ ئامرکەرتی من نیت! پاشان هیچ پیاوێک ناتوانێ من چەک بکات، من پێشمەرگەم. من چەک نادەم بە تۆ!» هەندێ جنێویش کەوتبووە نێوانیانەوە، بەڵام کاک عومەر هەر دێتە پێشەوە و دەیەوێت چەکی بکات، کەریم میلی کلاشینکۆفەکەی ڕادەکێشێت و دەڵێت: «دەستم بۆ نەهێنی، تەقەت لێ دەکەم! من چەک نادەم!» بەڵام کاک عومەر هەر سوور دەبێت چەکی بکات، تاوەکوو هێندە لە کەریم نزیک بووبووەوە خەریک بووە دەستی بگاتە کلاشینکۆفەکەی کەریم. کەریمیش چەند هەنگاوێک دەچێتە دواوە و دەسترێژێکی پێوە دەنێت. کاک عومەر دەکەوێت، پێشمەرگەی مزگەوتەکە دێنە دەرەوە، کەریم دەسترێژێک دەکات لێیان، بۆ ئەوەی دەست نەکەنەوە تاکوو دەردەچێت، هەر لەو دوو سێ دەسترێژەدا دوو شەهید و برینداریکی لێ کەوتەوە. ئێمە چووین بەسەر شەهید و بریندارەکاندا. کەرتەکەی خەلیفە

گورگەدەریان بەجێ هێشتبوو، نەمانزانی ڕوویان لە کوێ کردووە، ترسی ئەوەمان هەبوو کە خۆیان ڕادەستی حکومەتی بەعس بکەنەوە و جەیش بێتە سەر ناوچەکە. پاشان کەرتەکەی کاک وەهاب (کاک وەهاب لێپرسراوی کەرت بوو، کەرتەکەی یەکێک بوون لە کەرتە زۆر چالاکەکانی ناوچەی مەڵبەندی یەک، سەرپەرشتیی دەیان چالاکیی دەستوەشێنی لە دوژمن کردبوو، خۆیشی پێشمەرگەیەکی بەدیسپلین و کادرێکی سەربازیی زۆر سەرکەوتوو بوو) کەوتنە گەڕان بەدوایاندا. ڕۆژێک دوای ئەوە من لە ماڵی شێخ مستەفا و دادە ڕەعنا خان بووم کە ماڵەکەیان هەمیشە وەک میوانخانەیەکی پێشمەرگە وا بوو، بەردەوام وەک ماڵەکانی دیکەی گوندی گورگەیەر لە خزمەتی پێشمەرگەدا بوون، دەمەوئێوارە پیاوێک هات نامەیەکی بۆ هێنام و وتی: «تۆ مامۆستا ئارامی باساکیت؟»

«بەڵێ برام، فەرموو!»

«ئەو نامەیە بۆ تۆیە.»

من لەگەڵ سوپاسێکدا نامەکەم وەرگرت و کابرا سواری هێسترەکەی بوو و ڕۆیشت. نامەکەم کردەوە و بە دەستوخەتێکی پچڕ پچڕ نووسرابوو:

**بەڕێز مامۆستا ئارامی باساک**

**سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە**

تکایە ئاگاداری کاک بەکرم بۆ بکە، من زۆر دڵگرانم بەو کارەساتە و هیچ خەتایەکی منی تێدا نەبووە، تاوەکوو کارەساتەکە ڕووی نەداوە، من ئاگادار نەبووم. پێم خۆشە لێپرسینەوە لەسەر ئەو ڕووداوە بکرێت، وەک کەریمی برام باسەکەی بۆ گێڕامەوە، خەتای ئەوی تێدا نەبووە. من ئامادەم بە هۆی تۆوە بێم بۆ لای کاک بەکر، بەڵام تۆ وەرە بۆ لامان و لەگەڵ تۆدا دێین. ئەگەر زوو جوابم لێ بگێڕیتەوە؛ سوپاست دەکەم، با زیاتر خوێن نەڕێژرێت.

**برات: خەلیفە**

منیش چوومە دەرەوە، هەواڵی هێستر سوارەکەم پرسی و دیار نەبوو، چووم بۆ مزگەوت دیار نەبوو، بە کورتییەکەی لە گورگەیەر نەمابوو.
نامەکەم بەپەلە گەیاندە کاک بەکر.

کاک بەکر ئاوای وت: «مامۆستا ئارام، تۆ بە هیچ جۆرێک ناچیت بەدوایاندا، نەوەک پلان بێت و بیانەوێت بتگرن و لەگەڵ خۆیاندا وەک دیاری تەسلیم بە حکومەتت بکەنەوە!» منیش وتم: «کاک بەکر، بڕوا ناکەم خەلیفە ئەوە لەگەڵ من بکات!» کاک بەکر وتی: «نابێت! نە تۆ دەچیت و نە هیچ پێشمەرگەیەکی تریش ناچێت.» نامەکە شوێن و جێگەی لێ نەنوسرابوو، کابرای هێستر سواریش ڕۆیشتبوو، لەبەر ئەوە نامەکە گومانی لای کاک بەکر دروست کرد و دوودڵ بوو لێی. کاک بەکر دەیوت: «بۆچی هێستر سوارەکە چاوەڕوانی نەکردووە؟ بۆچی نامەکە شوێنی لەسەر نییە؟ ئەی دەبێت تۆ بۆ کوێ بچیت؟» بەڵگەکانی کاک بەکر، منیان بێدەنگ کرد.

کاک بەکر وتی: «من ئەم نامەیە دەنێرم بۆ کاک وەهابی ئامرکەرت، بەڵکوو شوێنەکەیان بدۆزنەوە.» پاش ڕۆژێک دوای ئەوە، کاک وەهاب هەواڵی نارد بۆ کاک بەکر کە خەلیفە و کەرتەکەی لە گوندی «تەگەران» لەوبەر جادەی سیتەک خۆیان شاردۆتەوە و دۆزیومانننەتەوە، پاش گفتوگۆ لەنێوان کاک وەهاب و خەلیفەدا، خەلیفە بە خۆی و کەرتەکەیەوە گەڕانەوە، بەڵام کەریم ڕۆیشتبوو تەسلیم بە دەوڵەت بووبووەوە. ئیدی لە کاک وەهابم نەپرسییەوە ئایا ئەو نامەیەی خەلیفەی پێ گەیشتبوو یان پێی نەگەیشتووە، بەڵام ئەوەم بیست کە خەلیفە خۆی نامەی نووسیوە بۆ کاک وەهاب، دەیەوێت گفتوگۆ بکەن لەسەر ئەو ڕووداوە، وام هەست کرد کە خەلیفە لە وەڵامەکەی من بێهومێد بووە و نامەی بۆ کاک وەهاب نووسیوە. پاشان من بە خەلیفەم وت: «من بۆیە وەڵامی نامەکەم نەداوەتەوە، چونکە ئەو کابرای کە هێنابووی؛ ڕۆیشتبوو، پاشان شوێنی لەسەر نەبوو، نەمدەزانی بۆ کوێ وەڵامت بدەمەوە، ئەوە قسەی کاک بەکریش بوو.» خەلیفە وتی: «مامۆستا ئارام، کاتێ کابرای نامەبەر هاتەوە، وام دەزانی وەڵامی نامەکەمی پێیە، لێم

پرسی: کوا وەڵامی نامەکەی مامۆستا ئارام؟ نامەبەر بەترسێکەوە وەڵامی دایەوە: «ئەوەی ڕاستی بێت چاوەڕوانی وەڵامم نەکرد، زۆر دەترسام بمگرن، بۆیە وەڵامم نەهێنایەوە خێرا خۆم ون کرد، چونکە هەستم کرد گورگەیەر بۆنی خوێنی لێ دەهات و لە هەموو لاوە پێشمەرگە لە پاسەوانی و کەمیندا بوون.»

پاشان هەرێم بڕیاری دا، هەموو پێشمەرگەکانی کەرتەکەی خەلیفەیان بۆ ماوەیەک چەک کرد و هەروەها خەلیفەشیان چەک کرد، بەڵام ڕێگەیان دابوو کە دەمانچەیەکی بە قەدەوە بێت. لەگەڵ ئەوەدا خەلیفە چەک کرابوو، بەڵام لەبەر ڕێزلێنان وەک فەرماندەیەکی کەرت دەمانچەیەکیان دابوویە لەسەر پشتێنەکەی بەستبووی، بەڵام دوایی وەک لە پێشمەرگەکانم بیست کە گوایە دەرزیی دەمانچەکایان دەرهێناوە، فیشەکی شانە (مەخزەن) ی دەمانچەکە خاڵییە و فیشەکی تێدا نییە. خەلیفە لەگەڵ کەرتەکەی کاک وەهابدا دەسووڕایەوە، بەڵام لەژێر چاودێریی پێشمەرگەدا بوو. ڕۆژێک کاک بەکر، مامۆستا شێرکۆ و منی بانگ کرد و وتی: «ئێوە هەردووکتان وەک لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە (تەحقیق) دەچن، لێپرسینەوە لەگەڵ خەلیفە دەکەن و پرسیاری چۆنیەتیی ڕووادانی کارەساتەکەی لێ دەکەن، دەبێت ڕاپۆرتێکی پوخت و ڕاستم بۆ ئامادە بکەن، چونکە سەرکردایەتی داوای کردووە، دەینێرین بۆ سەرەوە. ئەو لێکۆڵینەوەی ئێوە، بڕیار لەسەر ژیانی خەلیفە دەدات.»

خەلیفە لەگەڵ کەرتەکەی کاک وەهاب بوو لە گوندی عازەبان، مامۆستا شێرکۆ و من بەڕێ کەوتین بۆ گوندی عازەبان، پاش ئەوەی کاک وەهابمان ئاگادار کرد لەماڵێک (خەلیفە و مامۆستا شێرکۆ من)، سێ بە سێ دانیشتین، نزیکەی چەند کاژێرێک پرسیارمان لە خەلیفە کرد لە بارەی چۆنیەتیی ڕووداوەکە. من خودی خۆم پرۆتۆکۆڵەکەم دەنووسییەوە.

لە ئەنجامی پرسیارەکانی پرۆتۆکۆڵەکەدا، ئەوەمان بۆ ڕوون بوویەوە کە

خەلیفە هیچ تاوانێکی لە کارەساتەکەدا نەبووە و ئاگای لێ نەبووە. هەروەها کاک بەکریشمان ئاگادار کردەوە کە خەلیفە بێتاوانە لەو کارەساتەدا، تەنها کەس کە بە کارەکە هەڵساوە، کەریمی برای بووە و غیرەتی ڕێگەی نەداوە کە کاک عومەر چەکی بکات، چونکە چەککردن شکانی ویژدانی پێشمەرگە بوو، هەروەها بۆ پێشمەرگە شتێکی زۆر قورس بوو کە چەک بکرێت، هەندێ جار ڕەخنەگرتنیش بووبووە شتێکی قورس بۆ پێشمەرگە.

### دوو نموونەی یادگاری لەسەر ڕەخنەلەخۆگرتن

لەگەڵ شەهیدان مەحموود گەرمیانی و ئەحمەد شاتوانی (یادیان بەخێر)، هاوڕێیەتیم زۆر خۆش بوو. شەهید مەحموود گەرمیانی لەگەڵ دادە گەردەی هاوسەری و چیای کوڕی، ئەو کاتە چیا سێ ساڵان دەبوو، بەماڵەوە هاتبوونە گوندی باساک. ئەو ساڵە زستانێکی سارد بوو، من لە ژوورەکەم مشارێکی دار بڕینەوەم هەبوو. شەهید مەحموود هات، وتی: «مامۆسا (مامۆستا)! مامۆسا!»

«بەڵێ، برا مەحموود! هۆ بەڵێ!»

«مامۆسا گیان ئا ئەو مشارەم پێ بە، با ئەو دارانەی بۆ زۆپاکەمان پێ کورت کەمۆ، ناچن وە زۆپاکەدا، تاقەت تەور وەشاندنم نییەس.»

مشارەکەی برد، ڕۆژی دوایی هێنایەوە: «مامۆستا گیان، ها ئەوە مشارەکەت!» منیش پێم خۆش بوو کەمێک مەحموود گەرمیانی بدوێنم، دەمزانی وەڵامەکەی جنێوە. سەیرێکی دەمی مشارەکەم کرد و کەمێک ئەمدیو و ئەودیوم کرد، پاشان وتم: «برا مەحموود، ڕەخنە لە خۆت بگرە، دەمی مشارەکەت کول کردووە، نەتزانیوە باش وەکاری بهێنیت!»

سەیرێکی کردم و سەرێکی با دا و هەڵیدایە: «ئاخ لەدەست ئەم کادرانە! سەرتان لە خواش شێواندووە و داک عالەمتان گاوە. وە تەلاقی گەردە یەک سەلیەم پێوە بنێ نامرم، بەس مەیەژە ڕەخنە لە خۆت وگرە، چونکە کە ڕەخنەم لێ دەگرن، وا دەزانم چەکم دەکەن!»

چەککردن بۆ پێشمەرگە هێندە کارێکی ناخۆش بووە! پاش پێکەنینێکی خۆش: «برا مەحموود، گاڵتەت لەگەڵ دەکەم، ماڵی من هیی تۆیە.»

«دەزانم مامۆستا گیان، وەسیاقەو ووم. ئاخ مامۆستا، پێم نایەژیت تۆ چت داوە لەم شاخە و شاخ و ڕاکەڕاکە! بۆ ناچیتەوە سلێمانی، چڵم عەلیشیشێ (مەبەستی بۆینباخ بوو)، لەگەڵ قات فاسۆنێک لەبەر کەیت و لەبەر دەرک سەرای سلێمانی چای شیرین بخۆیتۆ!»

«مەحموود گیان، کوردەواری دەبێژێت کنگر و ماست بە وەعدەی خۆی. ئەگەر نەمرین، ئەوەش کات و وەعدەی خۆی دێتەوە.»

## یادەوەرییەکی دیکە

پێشمەرگەکانی شارەزوور سەر کەوتبوون بۆ شارباژێڕ، هاتبوونە دەوروبەری گوندی مامەخەلان و موبرە و بەوزان و گۆڕەدێم. لە گوندی بەوزان کاتی نیوەڕۆ بوو، لەبەردەم قوتابخانە داخراوەکەی بەوزاندا لەگەڵ دوو پێشمەرگە وەستابووین قسەمان دەکرد، لەپڕ پێشمەرگەیەکی شارەزوور نەمدەناسی، هات و وتی: «مامۆستا ئارام، کارم پێت هەس!»

«فەرموو، برام!»

«ئەوەی ڕاسی بێت تێرم نەخواردییە لەو ماڵە، بەڵکوو بە چاودێرەکە (چاودێر کەسێ بوو لە خەڵکی گوندەکان کە پێشمەرگەی بۆ نانخواردن بەسەر ماڵەکاندا دابەش دەکرد) بێژیت بمبات بۆ ماڵێکی تر، هیچ نەبێت نان و ماستێکم پێ بەن.»

«کوڕە وەی بەسەر چاوان، بە چاودێر ناڵێم، خۆم دەتبەم بۆ ماڵێک زۆر بەخزمەتن!»

کاتێ بەرەو ماڵەکە دەڕۆشتین، ژنی ئەو ماڵەی پێشووتر لێی بوو؛ لەسەر بانیجەکە وەستابوو مەنجەڵێکی ڕەشی دەشت، بەبەردەمی ماڵەکەدا تێپەڕیین، کوڕە پێشمەرگەکە دیار بوو زۆر گاڵتەچی و خۆشمەشرەف بوو، ڕووی کردە ژنی سەر بانیجەکە و پێی وت: «ها میمکە گیان، ڕەخنە لە خۆت

بگرە، یەک جار بوومە میوانت تێرت نەکردم، زگم یەژی مانگایە دەقوڕێنێ.»

هەستم کرد ژنەکە گلەییەکەی لا ناخۆش بوو، وەڵامی دایەوە: «جا بەقوربانت بم، ڕیقنەی چی لە خۆم بگرم، تۆ سکت دەڵێی مەشکەی دۆژەنە، هەتا تێی کەی شڵقەی دێت. تەشتێک کەرە و ماست و دۆشاوم بۆ داناویت، لەوە زیاتر چیت لێ بکەم؟»

پێکەنین لە ناخی من و پێشمەرگەکەوە بەرز بووەوە. پێشمەرگەکە هاتەوە وەڵام: «میمکە گیان، قەستم گلەیی نەوو، قەستم ئەوە بوو بێژم دیسانەوە ڕەخنە لە خۆت بگرە کە میوان تێر ناکەیت.»

ژنەکە ئەم جارە لە مەبەستی گاڵتەی پێشمەرگە تێگەیشت و بە زەردەپێکەنینێکی ناسکەوە، بەڵام لە دڵەوە هەڵیدایە: «کوڕە ڕیقنە لە سەری دایکی خۆت بگرە، تۆ بە دوو ژەمی تریش تێر ناخۆیت! لا لەبەر چاوما، ئەگینا ئەم ڕەشاوی مەنجەڵە دەکەم بە سەرتا.»

پێکەنینی هەرسێکمان وەک هەورەگرمە تێکەڵ بوون.

لە پێشمەرگەکەم پرسیی: «ئەرێ بەڕاستتە کە تێرت نەخواردووە؟»

«کورە مامۆستا گیان، ڕۆژ وا هەس لە شارەزوور ژەمی نیوەڕۆ لە چوار ماڵ دەخۆم، هەر بە پێکەنین و گاڵتەکردن و قسەی خۆش لەگەڵ کەیبانووی ماڵەکە زگم تێر دەکەم. وا نەبێت، دەمرم لە برسا و ئەم ڕاکەڕاکە خواردنی گەرەکە خواردن. ئەی وەکوو جەلال کولکنی خاسە کە دادەمەزرێت، هێلکەوڕۆنێکی بۆ دەکەن، نیوەی دەخوات و نیوەکەی تری دەگێڕێتۆ بۆ خاوەن ماڵەکە و یەژێت ها دادە گیان ئەو نیوەی بۆ مناڵەکان!»

(جەلال کولکنی؛ لێپرسراوی کەرتێک پێشمەرگە بوو لە شارەزوور، لاوێکی زۆر چالاک و بەدیسپلین و کەمدوو و ئازا بوو، هەموو نموونەیەکی پێشمەرگایەتیی تێدا بوو، هاوڕێیەکی خۆشەویستم بوو.)

سەیر ئەوە بوو ژنەکە نەیدەزانی ڕەخنە چییە، دەیوت ڕیقنە!

کەرتی هەرێم چووینەوە گوندی چگنیان لەپشتی گوندی نۆدێ، وە زستانەکەی هێندە سارد بوو هەموو پێشمەرگەکانی لە باوەش زۆپاکان

خزاندبوو. کاکە ڕەش کەرکووکی کادری کۆمەڵە بوو، لەگەڵ کەرتی هەرێمدا جەولەی دەکرد، پێشمەرگەیەکی زۆر خۆشەویست و لەسەرخۆ و بەئارام بوو، پێشمەرگەیەکی بەئەمەک بوو (لەناو پێشمەرگەدا پێیان دەوت مامۆستا کاکە ڕەش)، هاوڕێیەتیمان زۆر خۆش بوو، زۆربەی کاتەکان پێکەوە دەڕۆیشتین و بەدەم ڕێگاوە باسی زۆر کارمان دەکرد، ئەو ڕۆژە لە چنگیان پێکەوە لە ماڵی مام ڕەشید؛ قسەخۆشی گوندەکە لەگەڵ سەرجەمی خێزانەکەیان دانیشتبووین، لەپڕ گوێمان لە دەنگە لەسەرخۆکەی کاک بەکری حاجی سەفەر بوو، لەبەردەم ماڵەکەدا هاواری دەکرد: «مامۆستاکان! مامۆستاکان!»، ئێمەش چووینە سەر بانیجەکە.

«فەرموو، کاک بەکر!»

«مامۆستاکان، لە ئێستەگەکەوە جفرەیەک دێت بۆمان، جفرەکە بە ژمارەیە، زەحمەت نەبێت ڕادیۆکەی مامۆستا ئارام بکەنەوە، جفرەکە بنووسنەوە بەبێ غەڵەت، یەک ژمارەی غەڵەت بێت، جفرەکەمان لێ تێک دەچێت.»

«بەسەر چاو کاک بەکر، دڵنیا بە بەڕێکی جفرەکە وەردەگرین و دەینووسینەوە.»

کاک بەکر ڕۆیشت و ئێمەش هاتینەوە ژوورەوە و بەدیار ڕادیۆکەوە دانیشتین (من لە پێشمەرگایەتیدا ڕادیۆیەکم پێ بوو، مارکەی ناشناڵ بوو، تەنها لە ئێران دەست دەکەوت، شەهید شێخ فارووقی بەرزنجە (یادی بەخێر) لە ئێران گەڕابوویەوە بەدیاری لەگەڵ خۆی بۆی هێنابووم. ڕادیۆکە سیستمی ئێف ئێمی تێدا بوو، کاتێ هەلیکۆبتەر دەهاتە سەرمان، ڕادیۆکەم دەکردەوە، دەنگی هەموو سایەقی کۆبتەرەکانی وەردەگرت کە قسە لەگەڵ یەکدی دەکەن و دەمانزانی لە چ شوێنێک دەدەن. ئێستە ڕادیۆکە لە مۆزەخانەی نیشتمانیی ئەمنە سوورەکە، لە بەشی یادگارەکانی شەهید فاروقدا پارێزراوە).

لە کاژێر ١١ی بەیانیدا لە ڕادیۆکەوە قیڕە بەرز بوویەوە: «بۆ ئاگاداری... بۆ ئاگاداری! جفرەیەک بۆ هەرێمی یەک! جفرەیەک بۆ هەرێمی یەک!» چەند جارێک ئاگادارییەکە و جفرەکە دووبارە کرایەوە، ئێمەش جفرەکەمان

نووسییەوە، پێک هاتبوو لە چەند ژمارەیەک. لە مزگەوتەکەی چگنیان بردمان بۆ کاک بەکر.

«کاک بەکر فەرموو، ئەوە جفرەکەیە!»

«سوپاستان دەکەم، مامۆستاکان.»

من لە ژوورەکەی مزگەوت هاتمە دەرەوە و لەپاش نیوکاژێر، ١١ی بەیانی، کاک بەکرم بینی بەتەنها و بەپەستی لە سەربانی تەنیشت مزگەوتەکە پیاسەی دەکرد، هەستم کرد پەستی و نائارامییەکی زۆر لە جەستەیدا بەدی دەکرێت. چووم بۆ لای: «کاک بەکر، ببوورە ئیزعاجت دەکەم...» بەدەم هەناسەیەکی قووڵەوە سەیرێکی کردم، وەڵامی نەدایەوە، یەک دوو خولی تر پیاسەی کرد و هاتەوە تەنیشتم.

«کاک بەکر، هەست دەکەم زۆر نائارام و بێتاقەتیت! قەت وام نەدیویت! خێرە، هیچ ڕووی داوە؟»

«مامۆستا ئارام، جفرەکە؛ ئەمری ڕەمیکردنی خەلیفە بوو! تکایە نابێت کەس بزانێت لە خۆت زیاتر!» من سەرسام بووم، وەڵامم نەدایەوە، بەکورتی تووشی پەشۆکان بووم. کاک بەکر خولێکی تر سووڕایەوە بەتەنها و هاتەوە تەنیشتم: «کاک بەکر، بۆچی ئەمری ڕەمیکردنی خەلیفە؟ من و مامۆستا شێرکۆ لیژنەی لێکۆڵینەوە بووین، تاوانی خەلیفەی تێدا نییە، هەروەها شاهیدی پێشمەرگە و شاهیدی گوندەکەش دەڵێن خەلیفە خەتای نەبووە. باشە، ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەی ئێمە گەیشتووە بە سەرکردایەتی کە خۆیان داوایان کردبوو، سەیرە بەلامەوە کە هێندە خێرا ئەو بڕیارەیان دەرکردووە. چۆن لەجیاتیی تاوانبارێک، بێتاوانێک دەکوژنەوە؟ ئەمە چۆن تێڕوانینێکە سەرکردایەتی هەیەتی؟»

«مامۆستا ئارام، منیش نازانم بۆچی هێندە خێرا ئەو بڕیارەیان دەرکردووە!»

«باشە کاک بەکر، بڕیاری هەرێم چییە؟»

«مامۆستا، نازانم هەرێم. چی بکەین، بڕیاری سەرکردایەتییە و دەبێت

جێبەجێ بکرێت، ئێمە وابەستەین بە بڕیاری سەرکردایەتییەوە.»

«کاک بەکر، ئەگەر هەوڵ بدەیت دوای بخەن، بەڵکوو خۆت لەگەڵ سەرکردایەتی بە جیهازەکە قسە بکەیت و ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی مامۆستا شێرکۆ و منیان بۆ ڕوون بکەیتەوە.»

«با بزانم مامۆستا، قسە لەگەڵ برادەران دەمەکەوە.»

پاش ئەو کورتە گفتوگۆیە، من گەڕامەوە بۆ لای «مامۆستا کاکە ڕەش» لە مزگەوتەکە. کاکە ڕەش کە منی بینی، وتی: «کاک بەکر هیچی پێ وتیت؟»

«بەڵێ، باسی گوللەبارانکردنی خەلیفەی کرد. تۆ دەڵێیت چی؟»

«مامۆستا ئارام، ئەوە بڕیاری سەرکردایەتییە.» کەمێک بەماتی سەیری یەکمان کرد و قسەکردنەکەمان کۆتایی هات.

پاش مانەوەم لە ژوورەکەی مزگەوت، پاش ماوەیەک هاتمە دەرەوە، ڕۆشتم بۆ ئەو سەربانەی بەردەم ماڵی مام حاجی ڕەشید کە کاک بەکر و پێشمەرگەکانی لێ بوون، هەندێک پێشمەرگە هەڵچۆکابوون و هەندێکیش پیاسەیان دەکرد و بەدەم پیاسەکردنەوە گفتوگۆیان دەکرد. کە نواڕیم خەلیفە لەگەڵ کاک بەکر وەستاوە قسە دەکات لە سەربانەکە، منیش بەرەو سەربانەکە دەکەوتمە ڕێ، بەڵام پێش ئەوەی من بگەم، خەلیفە تەوقەیەکی لەگەڵ کاک بەکر کرد و بەرەو مزگەوتەکە هات، لەبەردەم مزگەوتەکەدا بەیەک گەیشتین و دەستی یەکمان گوشی و چاک و چۆنیمان کرد، ئەملاو لای یەکمان ماچ کرد. جا سەیر ئەوە بوو کاتێ خەلیفە دەستی هێنا پێکەوە تەوقە بکەین، ڕێگاکە بەستبووی، هەمووی سەهۆڵ بوو، قاچی خلیسکا، خەریک بوو بکەوێت، بە قۆڵی منەوە خۆی گرتەوە.

بەپێکەنیەوە خەلیفە وتی: «مامۆستا، پاتەکانی کە لە پارەزان بۆت کڕیم، بنەکەکەیان سواوە.»

«بەڵێن بێت کاک خەلیفە، ئێستە دەچم بۆ دووکانەکەی گوند، جووتێ ترت بۆ دەکڕم.» پاش نانخواردنی نیوەڕۆ چووم بۆ دووکانەکە، بەڵام پاتەیان نەبوو بۆ فرۆشتن.

نەمتوانی زیاتری لەگەڵدا باس بکەم، چونکە پێشمەرگەیەکی لەگەڵدا بوو بۆ پاسەوانی. پاشان پێشمەرگەکان بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ دابەش بوون بەسەر ماڵی گوندەکەدا، خەلیفە و پێشمەرگەکە بەر ماڵێکی سەرپەڕی گوندی چگنیان کەوتبوون. پاش گوللەبارانکردنی خەلیفە، پێشمەرگەکە لای پێشمەرگەکانی تر ئەمەی گێڕابوویەوە:

«کاتێک لە ماڵەکە بووین، خەلیفە چەند جارێک چووە دەرەوە بە بۆنەی میزکردنەوە، هەموو جارێک لەگەڵی دەچوومە دەرەوە، سەیرم دەکرد خەلیفە زۆر بەوردی سەیری دەوروبەری ماڵەکە دەکات، گومانم لەلا دروست بوو، بۆچی ئەم هەموو میزە دەکات کە تا لەوێ بووین قومێک ئاوی نەخواردەوە! پاشان لە ژوورەوە پێی وتم: بەڕاستی کلاشینکۆفەکەت جوانە، دەتوانم سەیرێکی بکەم! منیش نەمدایە دەستی، چونکە گومانم کردبوو کە ڕابکات و ئەوسا من تووشی لێپرسینەوە ببم.»

پاش نانخواردنی نیوەڕۆ، «مستەفا چاوڕەش» لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا هاتنە چگنیان، پاشان ئاگاداری پێشمەرگە کرا خۆتان کۆ بکەنەوە دەردەچین بەرەو گوندی «دۆڵەتوو» بەرانبەر شاخی کەتوو کە «خولە پیزەی» تێدا شەهید کرا. پێشمەرگە کەوتنە ڕێ، دوو دوو بەدوای یەکدا و خەلیفەش لەگەڵ کەرتەکەدا بوو. لەنێوان گوندەکانی چگنیان و دۆڵەتوودا، لەپشتی جادەکەوە فەرمان درا و پێشمەرگە وەستان.

کاک بەکر بە ڕەنگێکی شێواو و زۆر بەخەمبارییەوە، ڕەنگی تێک چووبوو، خێرا خێرا تفی قووت دەدا و دەمی وشک بووبوو، دیار بوو لە دڵەوە گوللەبارانکردنەکەی پێ ناخۆش بوو، وتی: «برادەرینە، ئەمڕۆ جفرەیەکی سەرکردایەتیمان پێ گەیشتووە، بڕیاری گوولەبارانکردنی خەلیفەیان دەرکردووە، بەڕاستی جێگەی داخە بۆ ئێمە و زۆر بەداخەوەین کە پێشمەرگە و برادەرێکی هاوسەنگەری خۆمان گوللەباران دەکەین، بەڵام ئەو کارەساتە کاک عومەر و کاک ڕێبواری تێدا بوون بە قوربانی، ئەمەش بڕیاری سەرکردایەتییە، دەبێت جێبەجێی بکەین.» کۆتایی بە قسەکانی هێنا.

پاشان خەلیفە ڕەنگی زەرد بوو، دەستی کرد بە قسەکردن: «برادەران، دەمەوێت ئەوە بڵێم کە من هیچ تاوانم نییە و ئاگاداری ئەو کوشتارە نیم، من بەشداریم تێدا نەکردووە! تکاتان لێ دەکەم گوللەبارانم مەکەن، با کەریمی برام نەبێت بە دڕک و لەگەڵ حکومەتدا دەست تێکەڵ بکات! خۆ لیژنەی لێکۆڵینەوە بێتاوانیی منیان سەلماند. مەمکوژن! بە ناحەق دەمکوژن...» کاتێ وشەکانی تەواو کرد، مستەفا چاوڕەش پێی وت: «کاک خەلیفە، ئەوە فەرمانی ئێمە نییە، هیی سەرکردایەتییە، دەبێت جێبەجێی بکەن.»

خەلیفە دڵنیا بوو لەوەی گوللەبارانی دەکەن، بە مستەفای چاوڕەشی وت: «دە باشە ڕێگەم بدەن خۆم بشۆم!» ئەو داوایەی نەدەتوانرا جێبەجێ بکرێت، چونکە لەو کێوەدا ئاو نەبوو. پاشان بە کاک بەکری وت ڕێگەم بدەن نامەیەک بۆ دایکم بنووسم. نامەیەکی بۆ دایکی نووسی و دایە دەست کاک بەکر. پاشان چاویان بەستەوە و لەبن درەختێکی گەورەدا وەستاندیان. خەلیفە داوای کرد چاوی بکەنەوە با چاوی لە پێشمەرگەکانەوە بێت. پاشی چەند خولەکێک، دەنگی ڕیزی کلاشینکۆف لەنێو دڵی شاخی کەتوودا دەنگی دایەوە. ئەو دارەی خەلیفەیان لە ژێردا گوللەباران کرد، لەلایەن خەڵکی ناوچە و پێشمەرگەوە ناو نرا «دارەکەی خەلیفە».

کاک بەکر؛ شەهید شێخ حسەینە سوور و چەند پێشمەرگەیەکی نارد لە چنگیان تەراکتۆرێکیان هێنا و لاشەکەیان برد بۆ گوندی گورگەدەر (گورگەیەر) بۆ ناشتن. پاش ماوەیەک خەڵکی گوندەکە بۆیان گێڕامەوە کاتێ لاشەکەی خەلیفەیان هێناوە، خەڵکەکە ناڕەزاییەکی زۆریان دەربڕیوە و بە پێشمەرگەکانیان وتووە ئێوەتان کرد بە گۆمی خوێن، ئیتر بەسە ئێم یەکتر کوشتنە. دایکان ڕۆڵەکانیان دەنێرن بۆ کوردایەتی و ئێوە لێرە لە یەکیان بەر دەدەن. ئیتر بەسە، نە نانمان ماوە، نە ئاو، هەموویمان دا بە ئێوە، ئێوەش ئەم هەموو کوڕە جوانانە دەدەن بەکوشت. هەروەها ئەوەشیان وت: کاتێک کە خەلیفەیان دەشت، هێشتا گیانی تێدا مابوو، کەمێک لرخەلرخ لە قوڕگیەوە دەهات... پاش ئەوەی لە گوندی «دۆڵەتوو» نانی نیوەڕۆمان

خوارد، هەمووی چەند کاژێرێکی خایاند، دیسانەوە لە ڕادیۆکەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە جفرەیەکی نوێ هاتە خوارەوە. لە جفرەکەدا ئەمە نووسرابوو: «خەلیفەی عەبدوڵڵا مارف مەکوژن، بە زووترین کات بڕیاری گوللەبارانکردنەکەی ڕابگرن!»

منیش کاتێک هەواڵی پەشیمانبوونەی سەرکردایەتیم گوێ لێ بوو، وەک شریتی فلیمێک کوشتنەکەی ئەو سێ پێشمەرگەم وەیاد هاتەوە و ناتەبایی سەرکردایەتی لەنێوان خۆیاندا بردمیە نێو بیرکردنەوەیەکی تری ژیانەوە، وردە وردە چووم بۆ لای مام مەتڵەب لە ژوورە بە تەنەکە دروستکراوەکەیدا و پشیلەکانی دەوریان دابوو. لای دانیشتم، وتم: «مام مەتڵەب چۆنی!» سەیرێکی تفەنگ و تاقمەکەی کردم و وەڵامی نەدامەوە، پاشان هەر سەیری یەکمان دەکرد بەبێدەنگی. من هەڵمدایە: «مام مەتڵەب، خۆزگەم بە خۆت کە نە ئاگات لە دونیا و نە ئاگات لە هیچ شتێک هەیە!»

مام مەتڵەب وتی: «من ئاگام لە هەموو شتێکە.»

«ئەی بۆ قسە ناکەیت! مام مەتڵەب، هەر سەیرم دەکەیت و باسێکم بۆ ناگێڕیتەوە!»

«ئاخر ئەگەر قسە بکەم، دەمکوژن!»

«مام مەتڵەب» کابرایەکی لانەواز بوو، لە دەرەوەی گوندی «دۆڵەتوو» بە تەنەکە و بەرد خەڵکی گوندەکە ژوورێکیان بۆ دروست کردبوو، ڕۆژانە خەڵکی گوندەکە خواردنیان بۆ دەبرد، خزمەتی پشیلەکانی گوندەکەی دەکرد، هەر چی پشیلەی گوندەکە و پشیلەی کێوییە دەهاتنە لای بۆ خواردن، نانی هەموویانی دەدا، بەڵام زۆر کەمدوو بوو، هەمیشە بەسەرنجەوە سەیری پێشمەرگەی دەکرد و لە چەک دەسڵەمییەوە...

## سەرنج لەسەر ڕووداوەکە

لەو سالانەدا سەرکرایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کەوتبووە نێو داوێکی ململانێی توندوتیژی باڵباڵێنەی سیاسی و چەکداریی لایەنە جیاوازەکانی ناوخۆی. شەڕکردن لەگەڵ پارتی و حسک و پاسۆکدا گەیشتبووە لوتکە و بووبووە ئامانجی سەرەکیی جووڵانەوەکە. هێندەی سەرکردایەتی پلانی بۆ شەڕی براکوژی دادەڕشت، هێندە لەگەڵ دوژمندا لە توندوتیژیدا نەبوو. پێشمەرگەش سەرەڕمی هەموو تیرەکانی؛ سەرکردایەتی بوو، چۆنیان بویستایە؛ دەیانهاویشت و کوێیان بویستایە؛ پێیان دەپێکا. فەرمانی گوللەبارانکردنی خەلیفەش، لەنێو ئەو تۆڕە ئاڵۆزەی یەکەمدا بڕیاری لەسەر درا و پەشیمانبوونەش لە گوللەبارانکردنەکەش تۆڕی دووەم بڕیاری لەسەر دا، ئەوە نیشانەی نەبوونی هاوتەبایی و نەبوونی لێپرسینەوەیەکی دادگایی جووڵانەوەکە بوو، بەتایبەتی دوولایەنیی بڕیاردان لە یەک سەرکردایەتیدا بەڕوونی دەبینرا و لە خڕەی نێو زەنگدا دوو سەرکردایەتی فەرمانڕەواییان دەکرد لەناو یەک جووڵانەوەدا.

## قرگەییەکان

پێم باشە لەگەڵ ئەم بابەتەدا هەندێ ڕوونکردنەوە لەسەر قرگەییەکان بنووسم، چونکە باسەکان وابەستەن پێکەوە.

پاش ئەوەی ماوەیەک بەسەر ئەو ڕووداوەی گوندی گورگەیەردا تێپەڕی، من ڕووم کردە سەرکردایەتی و لە ناوەندی کۆمەڵە لە خڕەی نێو زەنگ گیرسامەوە. ڕۆژێک دوای نیوەڕۆ بۆ کارێک دەچووم بۆ مەکتەبی عەسکەری لە گوندی تووژەڵە، لەوێ شێخ دارای شێخ جەلالی حەفید و کاک محەمەدی عەتیەم (یادیان بەخێر) بینی، پاشان پێکەوە هەڵساین. شێخ دارا پێشنیاری کرد کە سەرێک بدەین لە ماڵە قرگەییەکان. ماڵی کاکەبرای قرگەیی لەگەڵ ڕووناک خانی هاوسەریدا لەوێ بوون لەژێر خێمەیەکدا لەلای چەپی مەکتەبی عەسکەرییەوە. کاتێ گەیشتین، ڕووناک خان بەردەم خێمەکەی گسک دەدا

و لەگەڵ کاکەبرادا زۆر بەڕووخۆشی هاتن بەپیرمانەوە، خێرا ڕووناک خان وەک شێوەی خانەدانی خۆیان چایی بۆ دەمکردین. پاش وتوویژ، باس هاتە سەر ڕووداوەکەی قرگە. من نەمدەزانی کە ڕووناک خان خوشکی شەهید عومەرە، هەروەها کاک محەمەدی عەتیەش ئەوەی نەدەزانی، بەڵام شێخ دارا باسەکەی کردەوە وەک دڵنەواییەک بۆ ئەو خێزانە و ویستی دڵنەواییان بداتەوە. من بێدەنگ مامەوە، چونکە کاک عومەر قرگەیی و خەلیفەش هەردووکیان هاوڕێم بوون، بەڕاستی کە شێخ دارا باسەکەی کردەوە، زۆر دڵگران بووم بۆ هەردووکیان. لە کاتی قسەکردنەکاندا کاک محەمەدی عەتیە هەڵیدایە و وتی: «بەڕاستی سەرکردایەتی غەدرێکی گەورەیان لە خەلیفە کرد و بێتاوان گوللەبارانیان کرد، چونکە ئەو کاک عومەری نەکوشتبوو، بەڵکوو کەریمی برای دەستی وەشاندبوو، دەبووایە خەلیفەیان بەو ناحەقییە گوللەباران نەکردایە.»

هێندەمان زانی دەنگی گریان تەقییەوە، بەڵام گریانێکی بەکوڵ و لە دڵەوە. ڕووناک خان هاواری گریانی بەرز کردەوە کە باسی کاک عومەری برای کرا، پاشان کاک محەمەدی عەتیە داوای لێبوردنی لە ڕووناک خان کرد، بەڵام ڕووناک خان قوڵپی گریانی نەدەوەستا، ناچار خێمەکەمان چۆڵ کرد و بەدڵگرانییەوە هاتینە دەرەوە، پاشان کاک محەمەدی عەتیە گلەیی لە کاک دارا کرد بۆچی پێی نەوتووە کە ڕووناک خان خوشکی کاک عومەرە.

پاش ڕووداوەکەی گوندی گورگەیەر، ماڵ و خزمەکانی کاک عومەر هاتبوونە گوندی کانی درکە. هەرێم بڕیاری دابوو کەرتەکەی کاک عومەر دابەش بکەن بەسەر کەرتەکانی دیکەدا. ڕۆژێک کاک عەلی ڕەشە جووتە برای شەهید عومەر لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی خزمیدا هاتە لام بانگهێشتی ماڵی خۆیانی کردم. پاش گفتوگۆیەکی درێژ، قرگەییەکان دەیانویست کەرتەکەیان بمێنێت و خۆیان کەرتەکە ببەن بەڕێوە. کاک عەلی داوای دەکرد کە خۆی کەرتەکە ببات بەڕێوە، من لەو بارەیەوە قسە لەگەڵ کاک بەکر بکەم. منیش کارەکەم پێ چاک بوو، لەگەڵ کاک بەکر قسەم کرد و پێم وت: «کاک بەکر،

قرگەییەکان پیاوێکی جوامێری وەک کاک عومەریان لەکیس چووە، جێی داخی هەموومانە. با هەرێم هەوڵ بدات ئەو کەرتە دابەش نەکات، هەر لەبەر دڵنەوایی قرگەییەکان، بۆ ئەوەی دڵیان لە خەبات سارد نەبێتەوە.» کاک بەکر سەرەتا بێدەنگیی هەڵبژارد، وتی پەلە مەکە مامۆستا، با منیش پەیوەندی به سەرکردایەتییەوە بکەم. بەڵام من لەگەڵ کاک عەلی و قرگەییەکان دانیشتم و دەستمان کرد بە نامە نووسین بۆ مام جەلال و مەکتەبی عەسکەری. من نامەکانم دەنووسی و کاک عەلی وەک نوێنەری قرگەییەکان واژووی دەکرد. کاک بەکرم لە ناوەرۆکی نامەکان ئاگادار دەکردەوە لەسەر ڕەزامەندیی کاک عەلی. پاش چەند نامەیەک و دووبارە قسەکردنەوە لەگەڵ کاک بەکر، سەرکردایەتی بڕیاری دا کە کاک عەلی بکەنە لێپرسراوی کەرتەکەیان، کارەکانیان وەک هەمان کاری کەرتی پێشوو لەئەستۆ بگرنەوە، بەڵام کەرتەکە لەناو پێشمەرگەدا هەر بە کەرتی شەهید عومەرەوە ناوی دەبرا. ڕۆژێک مام جەلال خودی خۆی بە جیهازەکە قسەی لەگەڵ کاک بەکر کرد و بڕیارەکەی پێ دا. من زۆر دڵخۆش بووم کە ئەو ماندوونەبوونەم بەخۆڕایی نەچوو، هەروەها توانیم خزمەتێک بە قرگەییەکان و بە گۆڕی کاک عومەری جوامێر بکەم. کاک عومەر و ڕێبوار و خەلیفە بوونە سێ قوربانیی بێتاوان لە کارەساتێکی کوتوپڕ و چاوەڕواننەکراودا، یادی هەرسێکتان بە خێر وماڵیان ئاوا (ئای لەو ڕۆژگارە خوێناوییەی کە لەو ماوەیەدا لەگەڵ پێشمەرگەکان بەسەرمان برد!).

**نووسینەوەی ئەم باسە:**
**ئارام محەمەد غەریب (لە سەردەمی پێشمەرگایەتیدا ناسراو بە: مامۆستا ئارامی باساک).**

## فەرەیدوون عەبدولقادر، سیاسەتمەدارێکی جنێوفرۆش

پێناسەی ئەو شۆڕش و پێشمەرگایەتییەی کە کردوومانە، هەر کەسەمان بەپێی ئەزموونی خۆی دەتوانێت دیدێکی جیاوازی لەسەر هەبێت. ناشکرێت هەموو شۆڕش و قوربانیدانەکان بخەینە بەر ڕەخنە و کارە باشەکانیان وەلا بنێین و تەنها خراپەکانیان بخەینە ڕوو، من وەک پێشمەرگەیەکی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، بە هەموو کەموکوڕی و سەرکەوتن و شکستیەکانەوە شانازی بە یەکێتیبوونی خۆم دەکەم و هەمیشە خەڵکی گوندنشینەکان بە پێشەوای شۆڕشەکان دەزانم، هەر لە بنەماڵەی شەهیدان و سکرتێری یەکێتی و کۆمەڵەی ڕەنجدەران و زیندانیانی سیاسی و ئەندامانی ڕێکخستنە نهێنییەکان و بەرپرس و فەرماندەکان و تەواوی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیم خۆش دەوێت و ڕقوکینەم بەرامبەر بە هیچ کەسێکیش نییە و گەر ڕۆژێکیش لە ڕۆژان ئازار و غەدریشم لێ کرابێت، کە غەدرکردن لەنێو شۆڕش و حیزبەکاندا جێی قسەوباس نییە و نەهیی لێ ناکرێت چەندە بێوەفایی و پشتکردنە هاوڕێ و هاوسەنگەران هەیە کە بەبەر چاوی خەڵکییەوە دەکرێت و بێوەفایی ئەو سەرکردانەی کە ڕۆژانێک هاوڕێمان بوون لە شاخ؛ لە ژماردن نایەن و دڵنیاشم تەنها بۆ خولەکێکیش ئاسوودە نین کە بەرامبەر بە تێکۆشەران و هاوڵاتییان ئەنجامی دەدەن. لەنێو شۆڕشەکاندا تەنها هەندێک لە بەرپرسەکان تاوانی غەدر و کوشتن و ئیهانەکردن و شپرزەکردنی تێکۆشەران و خەڵکیان لە ئەستۆدا نییە، بەڵکوو بە خۆشمەوە و هەندێک لە تێکۆشەرانیش بەشداریی هەڵە و کەموکوڕییەکانی ژیانی خەباتی سیاسیی ئەو ڕۆژگارە سەختەین، بەڵام بۆ ئێمە زۆرترین بەرپرسیارێتیی تاوان ناخرێتە ئەستۆمان، گەر هەڵەشمان کردبێت هێشتا بە هەڵەش قبووڵ ناکرێت، چونکە لەو سەردەمەدا هەریەکەمان تەمەنمان شانزە بۆ حەڤدە ساڵان دەبوو. لە سیستمی بەڕێوەبردنی ژیان و گوزەرانی باری ئاسایی هاوڵاتییان، لە هەندێک لە وڵاتانی جیهاندا تەمەنی هەر تاکێکی نێو کۆمەڵگە لە هەژدە

سالان کەمتر بێت، هێشتا لێی قبوول ناکرێت بەئاسانی بتوانێت بڕیار لەسەر داهاتووی ژیانی خۆی بدات. کە ئەو پێناسەیەم بۆ کەسانی خوار هەژدە سالان کردووە و کوردوتەنی دەڵێین مێردمندال، کە ئەم وشەیە لە زۆرترین نووسین و یادەوەرییەکاندا ناو دەبرێت، دووبارەکردنەوەی ئەو وشەیەش لە ئەستۆی هیچ نووسەر و بەرپرس و تێکۆشەرێکدا نییە، بەڵکوو هەندێک لە بەرپرسان لە پێناسەی وشەی مێردمندال زیاتر گەیشتوون کە چۆن ئەو مندالانە بەکار هێنراون بۆ مەبەستی تایبەتی و بەرژەوەندیی هەندێک دەمانچە بە نێوقەد و پاڵەوانی نێو شۆڕش و بە ناو خەباتی کوردایەتییان کە نموونەی فەرەیدوون عەبدولقادری ئەندامی مەکتەبی سیاسی، جنێوفرۆشییان ڕەنگە زۆرتر هەبێت. کەواتە ئێمەی مێردمنداڵی نێو ئەو شۆڕشە، هێشتا لە زۆری ماناکانی ژیان نەگەیشتبووین، بەپێچەوانەوە هەندێک لە سیاسەتمەدارانی نێو شۆڕش زۆری تەمەنیان تێپەڕاندبوو، بڕیاری کوشتن و دیلکردن و دادگاییکردنیان بەسەر تێکۆشەراندا دەدا و سەرزەنشتیان دەکردن و منداڵی بێکەسی ئەو نیشتمانەیان تووشی شەرمەزاری و شکست و پشتکردنە شۆڕش دەکردن، کە یەکێک لە قوربانی و بەرەو هەڵدێر بردنی «عومەر عەرەب» و دەیان فەرماندە و تێکۆشەری دڵسۆز بوو، کە بە هۆی خراپیی ڕەفتارکردن و مڕومۆچی و تووڕەبوون و غەزەبی دەسەڵاتی بەرپرسی حیزبی بوو، ئەوەش وەک دیاردەیەکی زەق ڕەچاو دەکرا و کاتێکیش بەرپرسێکی دەسەڵاتدار هەڵەیەکی بکردایە، بێگومان بەخێرایی بەردێکی قورس دەخرایە سەر هەڵەکانی و تاوانەکەی دادەپۆشرا. لە ڕاستیدا گەر لە شۆڕشەکاندا تووشی هەر تاوان و شکستییەک بووبن، ئەوە هۆکاری ڕەفتاری پێشمەرگە نەبووە، بەڵکوو پێشمەرگە جگە لە برسێتی و ترس و دڵەڕاوکێ و خۆبەکوشتدان، هیچی تری لە دەسەڵاتدا نەبوو، ئەوە هەندێک لەو بەرپرسانە بوون کە ئاستی بەرپرسیارێتیی مێژووی گەلێکیان لە ئەستۆدا بووە، وەک ئەوانەی دوای پرۆسەی ئازادیی کوردستان؛ خاوەنی دەیان کۆمپانیا و زۆرترین سەروەت و سامانن، لە ڕابردووشدا تەنها خاوەنی تفەنگێک و

جووتێ پێڵاوی لاستیک بوون. بۆ ئەوەی بتوانم هەندێک سەرنج و ڕاستیی هەندێک بەرپرسی قسەخۆشی دووڕووی پارەپەست و هەندێکی تریش جگە لە غەزەب لە ڕووخسارياندا بەدی نەدەکرا، بۆ ئێوەی خوێنەر بخەمە ڕوو، لێرەدا لە چالاکییەکەوە دەست پێ دەکەم کە لەبریی ئەوەی دەستخۆشیمان لێ بکرێت، وەڵامێکی ناشرینمان دەست کەوت، ئەویش ئیهانەکردن و جنێو و وشەی ناشرین بوو کە لە زاری فەرەیدوون عەبدولقادری ئەندامی مەکتەبی سیاسییەوە ئاراستەی ئێمەی پێشمەرگە دەکرا.

لە ساڵی ١٩٨٥دا تێکچوونی دانوستانی یەکێتی هێشتا بە بڕیاری فەرمیی سەرکردایەتیی یەکێتی ئاراستەی جەماوەر نەکرابوو، بەڵام لەپێش شەهیدکردنی «مامە ڕیشە» تەواو بارودۆخی سیاسی و گفتوگۆی نێوان حوکمەت و یەکێتی بەرەو لێکتێنەگەیشتن دەچوو، لەلایەن هێزی پێشمەرگە و جەماوەرەوە شیرازە پچڕابوو، شەڕ لە هەموو تیپەکانەوە دەستی پێ کردبوو، هێزی پێشمەرگە تەواوی ئامادەکاریی خۆی بۆ شەڕکردن کردبوو و ناوشارەکان بە لیژنەی تەنسیقەوە کە ئاوات عەبدولغەفوور سەرپەرشتیی دەکرد، کشابوونەوە بۆ سنوری ئازادکراوی نێو هێزی پێشمەرگە. ڕژێمی بەعس تەواوی بازگەکانی بە سەرباز و هێزی تایبەت (قوات خاسە) پڕ کردبوو، ناو کووچە و کۆڵانەکان و شارەکانی بە چەکدارەکانی خۆی کۆنترۆڵ کردبوو، مەترسییەکی گەورە لەسەر ڕێکخستنە نهێنییەکانی شار و دۆست و لایەنگرانی یەکێتی هەبوو، خەڵکی بەگشتی ترسیان لێ نیشتبوو، بەردەوام هاوڵاتی دەستگیر دەکرا و پێشمەرگە شەهید دەکرا. ئەم کار و کردەوانە تەنها من باسم لێوە نەکردوون، بەڵکوو هەر لە سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەران؛ نەوشیروان مستەفا و ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی؛ فەرەیدوون عەبدولقادر و مەلا بەختیار و یادەوەرییەکانی تری تێکۆشەران[1]

---

[1]. قەندیل بەغدادی هەژاند، یاداشتەکانی پێشمەرگایەتی ١٩٧٦-١٩٨٠، شەهید ڕێباز، چاپی دووەم، چاپخانەی پەیوەند، ساڵی ٢٠٠٨، ل٢٩٣.

هەمان بۆچوون و بیرکردنەوە و لێکدانەوە بۆ ئەو مەبەستەش هەیە، هەر کەسێکیش بیەوێت بە ئاڕاستەیەکی جیاواز باس لە گێڕانەوەی مێژووی بزووتنەوەی نیشتمانی و سەرکەوتن و شکست و هەڵە و کەموکوڕییەکان بکات، ئەوا تاکوو تێکۆشەران و خاوەنی قوربانیدانەکان لە ژیاندا مابن، هیچ کەسێک ناتوانێت پەردەپۆشی بۆ ڕاستییەکان بکات، بۆ نموونە ئەو بەسەرهات و چیرۆکی تراژیدیا و تیرۆرکردنی هەندێک لە تێکۆشەران بە ناوی دیل و شەڕی براکوژی و درکاندنی نهێنییەکان و سەرپێچیی پێشمەرگە و فەرماندەکانی نێو شۆڕش بکات، دەرخستنی ڕاستییەکانیش هێز و توانای خۆی لە پشتە، ئەویش تەنها پێنووسی خەباتگێڕان و ماندوونەناسەکانی ڕۆژگاری ستەمی حوکمی دیکتاتۆرەکانی هاوشێوەی ڕژێمی بەعسن کە سەدان نووسەری دڵسۆزی بوێر و نیشتمانپەروەری کردۆتە بەڵگە بۆ ئەو مێژووە و ئاشکراکردنی حەقیقەتی نهێنیی پشتی پەردەی ژوورە تاریکەکان کە لە چەند لاپەرەی پێشوودا ئاماژەم پێ داوە و دەکرێت لە کێشە و ململانێی سیاسیدا ئاماژەکردنیان دووبارە بێتەوە.

مەبەستی من لە تێکشاندنی باری کەسایەتیی ڕابردووی خەباتی فەرەیدوون عەبدولقادر نییە، چونکە وەک خۆی باسی دەکات لە بنەماڵەیەکی بۆرژوای مامناوەند بووە، لێ بە بەڵگە و وتەی خۆشی باسی ئەوە دەکات لە کاتی دەستگیرکردنی هەندێک لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی ڕەنجدەران، خاڵە شەهاب و هاوەڵەکانی و بەتایبەت حوکمی لەسێدارەدانیان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بەسەردا سەپێنرابوو، فەرەیدوون عەبدولقادریش حوکمی زیندانی بیست ساڵی بەسەردا سەپێنرابوو، خودی خۆی باس لەوە دەکات بە هۆی دروستکردنی  پێڵاو چنین و جزدانی دەستی ئافرەتانەوە، حەوت هەزار دیناری لەنێو زیندانی ئەبو غرێب لە ساڵی حەفتاکاندا پەیدا کردووە. چەندە شەرمە بۆ کەسێکی بە ناو سەرکردە و سیاسەتمەدار گەر هاوڵاتییەکی ئاسایی نەبێت و شانازی بە پارە پەیداکردن بکات، لە کاتێکدا هاوەڵەکانی لە ژووری سێدارەدا بن! فەرەیدوون عەبدولقادر چۆن توانیویەتی

له کاتی هەڵواسینی خاڵە شەهاب و دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران، بیر لە کۆکردنەوەی «پارە» بکاتەوە؟ لە کۆتایی ئەم بابەتەمدا باس لە ئیرەیی ئەم بە ناو شۆڕشگێڕ و ڕۆشنبیر و ئەندامی دانوستانی نێوان ڕژێمی بەعس و یەکێتی دەکەم، ئەگەر فەرەیدوون عەبدولقادر ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری ڕێکخراوێکی مارکسی-لینینستی بووایە، نەدەبوو هێندە عەودالی حەز و ئارەزووەکانی و پارەکۆکردنەوەی بۆ دواڕۆژ هەبووایە. لەدوای سەرکەوتن و ڕاپەڕینی ئازادیی کوردستاندا، دوای ئەوەی میقداری «دوو ملیۆن» دیناری بۆ چاککردنەوەی بینای چەند نهۆمیی حەسیب ساڵح و کردنی بە «هۆتێل پالاس»، پارەی لە «مام جەلال» وەرگرت و فەرەیدوون لە کاسبکارێکی نێو زیندانی ئەبو غرێب کە سەرمایەکەی بە هۆی جزدان چنین و پێلاو چنین بە دەستە ڕەنگینەکانی؛ خاوەنی حەوت هەزار دیناری ئەو کاتە بووە و دوای لەسێدارەدانی هاوەڵەکانی لە زیندان؛ بە لێبوردنی گشتی ئازاد کراوە و چووەتەوە نێو ڕیزی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و خەڵات و شەرەفی ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانیی پێ سپێردراوە. نووسینی ئەم یادەوەرییەم پەیوەستە بە ڕابردووی شۆڕشێکەوە کە نەوشیروان مستەفا و فەرەیدوون عەبدولقادر و چەندین سەرکردەی تر بڕوایان بە ڕێبازی مارکسی و لینینزم و دروشمی داس و چەکوش و مافی کرێکاران (پرۆلیتاریا) و جووتیاران و زەحمەتکێشان هەبووە، بە نووسینی چەندین نامیلکە بە ناوی خوازراو ئاراستەی جەماوەر و سەدان کادری نێو ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشار دەکرا و لەسەر ئەو دروشمە و وێنەی داس و چەکوش کە بە واتای کرێکار و جووتیار دێت و دروشمی کۆمەنیستییە، دەستگیر دەکران و لەسێدارە دەدران. دواتر سەد مخابن نەوشیروان مستەفا پێش ماڵئاواییکردنی لە ژیان، لەپێش بەرەوچوون و پێشوازیکردنی لە کرێکاران و جووتیاران، پێشوازیی لە مەلایانی ئیسلام و چەند مەلایەکی نەخوێندەوار و... هتد کرد و قورئانی بەرز کردەوە و ماچی کرد و هاوپەیمانیی لەگەڵ حیزبی ئیسلامیدا کرد، ئەو حیزبە ئیسلامییەی زیندوو کردەوە کە دەستیان سوور بوو بە شەهیدکردنی سەلاحی موهەندیس

و سەربڕین و شەهیدکردنی چەندین پێشمەرگەی ئاوایی خێڵی حەمە.

من لەگەڵ ڕێزمدا بۆ هەموو پیرۆزییەکانی مرۆڤ و ڕێزیشم بۆ نەوشیروان مستەفا کە سکرتێری کۆمەڵەی ڕێکخراوێکی مارکسی و لیلینزم و لە سەردەمی سکرتێریی ئەم زاتەدا، تێکۆشەری دێرین «مام ئاراسی حسک» لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قورباندا پێش ئەوەی گوللەباران بکرێت، لەلایەن خەڵکی ئاوایی و چەند کەسایەتییەکی ناودارەوە قورئانیان ڕووبەڕووی ئەو فەرماندانە کردەوە کە مام ئاراسی حسک شەهید نەکرێت. ئەمە جێی پرسیار نییە نەوشیروان مستەفا پێش ماڵئاواییکردنی لە ژیان، قورئانی بەرز کردەوە و ماچی کرد و چوار ڕکات نوێژی هەینییشی لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی کرد؟ ئەمە گەمەیەکی سیاسییە بەدەم شۆڕشێکەوە کە بڕوات پێی نەبووبێت و لەبەر خاتری مام جەلال، سکرتێریی ڕێکخراوێکی مارکسی و لینینزمت قبووڵ کردبێت. دەبوو پێش ئەوەی بە بنەماڵەی ئەو کوڕە تازەپێگەیشتووانەت بوتایە من بڕوام بە قورئان و خودا و پێغەمبەر و ئیسلام هەیە، تکایە ئێوەش بڕواتان بە نامیلکە و کۆڕ و سمینار و وشەی من نەبێت و لەسەر درووشمی داس و چەکوشێک کە من بڕوام پێی نەبووە، ئێوە ژیانی خۆتان مەخەنە مەترسییەوە و با لەسەر بڕیار و یەکەم ئاستی بەرپرسیارێتیم وەک سکرتێرتان، لەسێدارە نەدرێن...

لێرەدا پرسیارێکی نەوشیروان مستەفا لە سەرەتای دروستکردنی بزووتنەوەی گۆڕان سەبارەت بە گەندەڵی و بازرگانیکردنی فەرەیدوون عەبدولقادر دەخەمە ڕوو، کاتێک فەرەیدوون عەبدولقادر بە نەوشیروان مستەفا دەڵێت: «کاک نەوشیروان، دەڵێن بزووتنەوەی گۆڕانت دروست کردووە؟» نەوشیروان مستەفاش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: «فەرەیدوون گەر لەگەڵمانیت؛ باشە، گەر لەگەڵیشمان نیت؛ دژایەتیمان مەکە. فەرەیدوون، بیستوومە و دەڵێن دیسکۆ و قومارخانەت هەیە!» ئەو باسە لە زۆربەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بڵاو کرایەوە و بوو بە قسەی سەر زاری ڕۆژانەی خەڵکی. ئەمە ڕاستییەکی نەوشیروان مستەفایە، کە فەرەیدوون عەبدولقادر

نهێنییەکانی نەوشیروان مستەفای وەک ئەرشیف لەبەر دەستایە، ئەوەشیان گەڕانەوەیە بۆ ڕابردوو و مێژووی خۆیان لە شاخ، کە فەرەیدوون عەبدولقادر ڕاستە ئەندامی مەکتەبی سیاسی بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هاوڕێی دێرینی خاڵە شەهابی ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بووە و لە دوور و نزیکەوە ئاگاداری گەڕانەوەی نەوشیروان مستەفا بووە لە ڤییەنا و هۆکاری گەڕانەوەی لە وڵاتێکی بەسیستم و دادپەروەری بۆ نێو ژیانی جەنجاڵی و ململانێی حیزبی و ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا. دیارە فەرەیدوون کە دژایەتیی نەوشیروان مستەفای دەکرد و نەوشیروان مستەفاش فەرەیدوون عەبدولقادری بە بازرگان و خاوەن قومارخانە و باڵەخانەکانی لوبنان و... هتد پێناسە دەکرد، ئەم بەربەرەکانییە هۆکارێکی نهێنیی پشت ژوورە تاریکەکان و سلکردنەوە و درکاندنی نهێنییەکانی یەکتر بووە!

ئەنجامی پاشگەزبوونەوەی فەرەیدوون عەبدولقادر وەک هێزێکی پاڵپشت و خاوەنی سەرمایەکانی، داوای لێبوردنی لە ئازاردانی مەلا بەختیاری سەرکردەی ئاڵای شۆڕش و هاوەڵەکانی کردووە لە کاتێکدا مەلا بەختیار لە شاخ لەسەر بیروڕای جیاواز دووچاری کێشە و گرفتی سیاسی بووبوو و فەرەیدوون عەبدولقادریش کە لە سەردەمی شاخدا وەک ئەندامی مەکتەبی سیاسی دەستڕۆشتوو بوو، دژایەتیی پارتیی دەکرد و بە بنەماڵە و خێڵ و عەشیرەتی تاوانکاری ناو دەبردن و دژایەتیی دەکردن، کەچی ئێستە بەپێچەوانەوە، لەم بارودۆخە هەستیارەدا فەرەیدوون عەبدولقادر دەڵێت: هیچ کەسێک سەرۆکایەتیی کورد و کوردستانی پێ ناکرێت و ناتوانێت دەوڵەتی کوردی دروست بکات، جگە لە مەسعوود بارزانی. فەرەیدوون عەبدولقادر دوو ڕووخساری هەیە، یەکەمیان لەنێو کۆمەڵە و یەکێتیدا ئاستی بەرپرسیارێتیی ئەندام مەکتەبی سیاسی بوو، کەچی بەبێ ئاگاداری نەوشیروان مستەفا هیچ کارێکی سیاسیی ئەنجام نەدەدا. دوای ئەوەی سیستمی حوکمڕانیی نەوشیروان مستەفا بەرەو کۆتایی دەچوو، دژایەتیی دەکرد دواتریش دەیگوت: بەداخەوە ڕۆژانێک بوو لە شاخ غەدرمان لە مەلا بەختیار دەکرد،

لەسەرووی هەموانەوە من ئازارم دەدا. دواتریش مێژوویەکی جوان و ڕاست و دروستی بۆ سەرۆکی پارتی؛ مەسعوود بارزانی لە تەواوی میدیا و ڕاگەیاندنەکان بە شێوەیەکی گشتی لە چاوپێکەوتنەکانیدا باس دەکرد. ئەم کار و کردەوانەی فەرەیدوون تەنها لە بەرژەوەندیی موڵک و سامانەکانی بووە و لە ژیانی تایبەتیی خۆیدا هەمیشە کەسێکی هەستناسک بووە بەرامبەر بە ڕووخساری ئافرەتان، من هەمیشە لە چاوپێکەوتن و چەند جارێکیش ئەم زاتەم لە تەمەنی پێشمەرگایەتی و دوای پێشمەرگایەتییشدا بینیوە، هیچ کاتێک خاوەنی بڕیاری ڕاستەقینەی خۆی نەبووە، بەتایبەت دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس و پرۆسەی ئازادیی کوردستان کە ڕەفتاری جیاوازی لە خەباتی شاخدا هەبووە. زیاتر دوورتان ناخەمەوە لە باسەکەم، هاوسەنگەرێکی دێرینی شاخ و شۆڕش ئاگاداری کردم و پێی ڕاگەیاندم لە کاتی نووسین و گێڕانەوەی یادەوەرییەکانی مێژوی سەردەمی پێشمەرگایەتی و ڕۆژگارە سەختەکانی شاخدا: «ئاگات لە خۆت بێت، ئێمە هەمووان ئاگاداری چاکە و خراپی و هەڵەکانین، بەڵام بەداخەوە کە ناتوانین هەڵوێستی تایبەتیمان هەبێت و بۆ خەڵکی ڕوون بکەینەوە، لە ڕابردوودا حیزبەکان بە ئەقڵیەتی شاخ؛ بە زۆر یاسایان سەروەر کردووە و ئێستەش ئەقڵیەتی بنەماڵەیی و عەشیرەتگەری؛ هەموو سەروەرییەکانی شۆڕشی وەلا خستووە!» گفتوگۆی نێوان من و هاوسەنگەرەکەم و گێڕانەوە بۆ زەمەنی دوای کیمیاباران و بارەگای حەوانەوەی پێشمەرگە لە گوندی «قاسمەڕەش»، کاتێک دەنگۆی ئەوە بڵاو بووەوە گوایە فەرەیدوون عەبدولقادر لەناو ئۆتۆمبێلێکی «ئیتلاعات»ی ئێراندا پەرتووکێکی «مارکس»ی فڕێ داوە و وتوویەتی: «ئیتر تەواو، لێرەوە بە دوا هیچ کەسێک بڕوای بەم پەرتووکانە نەبێت و شۆڕش کۆتایی هات.» بەڵام بۆ وەڵامدانەوەی ئەو ڕەفتارەی فەرەیدوون عەبدولقادر، وێنەی کاریکاتێرێکی زەکەر (کێر) بڵاو کرایەوە و وێنەی ڕووخساری فەرەیدوون عەبدولقادر لەسەر «کێر»ەکە دروست کرابوو، هێشتا وێنەی ڕووخساری فەرەیدوون لە شێوەی کێردا نەبووە وەڵامێکی ڕاستەقینە لەناو هێزی پێشمەرگەدا، بەڵکوو هێزی پێشمەرگە هەمیشە ڕەفتاری لەو جۆرەیان بە ناشایستەترین و ناجوامێریی تێکۆشەرێک دەزانی،

که لەناو ئۆتۆمبێلێکی ئیتلاعاتی عەمامەبەسەرەکانی بەناو جمهوریی ئیسلامیدا که هاولاتییانی بە شۆڤل و عامودی شەقامەکاندا هەڵدەواسی و فەرەیدوونیش پەرتووکێکی ڕێکخراوە پیرۆزەکەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی بەبەر چاویانەوە توورِ دا و هاوخەمی و هاوسۆزیی خۆی بۆ خومەینی سەلماند و پێی ڕاگەیاندن: «ئەوەی ئێوە دەتانەوێت، بۆتان جێبەجێی دەکەم».

ئەگەرچی فەرەیدوون نابێت دڵگران بێت لە وێناکردنی ڕووخساری بە کاریکاتێرێکی زەکەر (کێر)، چونکە ئەو جۆرە دەربڕینە مانایاک بە ئازادیی ڕادەربڕین دەبەخشێ و مافی هەموو تاکێکە بتوانێت مانای مرۆڤایەتیبوون و ئازادبوون و هەڵوێستی خۆی دەربڕێت، هیچ یاسایەکیش نییە بتوانێت مافەکانی تاک زەوت بکات جگە لە یاسای بیابان و شاخ.

تێگەیشتن و بڕوابوون بە فەرەیدوون زەحمەت بوو، بەئاسانی لە ناخی ئەم زاتە تێناگەیت، تەنانەت خودی سکرتێری گشتیی یەکێتی لە کار و کردەوەکانی ڕازی نەبووە و بڕواشی پێی نەبووە. تازە کۆمەڵەی مارکسی- لینینی ئەندێشەی ماوتسی تونگ دروست دەبێ، بۆ ئەو مەبەستەش پەیوەندی لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی چینیدا دروست دەکەن، مام جەلال و شەهابی شێخ نووری پەیوەندی بە سەفارەتی چینی میللییەوە لە عێراق دەکەن و باسی بیرۆکەی دروستبوونی کۆمەڵەیان بۆ دەکەن، ئەوانیش بیرۆکەی دروستبوونی ڕێکخراوێکی ماوییان لە عێراقدا زۆر پێخۆشە، بەلام ئەو ترسەیان دەبێت گەر پەیوەندی لەگەڵ ئەو ڕێکخراوەدا ببەستن و حکومەتی عێراقی پێی بزانێ، زیان بە پەیوەندییە دیپلۆماسی و سیاسی و ئابوورییەکان بگەیەنێت، بۆیە مەرجی دروستبوونی ئەو پەیوەندییە دەبەستنەوە بەوەی جگە لەو دوو کەسە، واتە مام جەلال و شەهید خالە شەهاب، هیچ کەسێکی تر لەناو سەرکردایەتیی کۆمەڵەدا نەزانێت[1].

---

[1]. ئەو ڕۆژانەی نیشتمان هی هەمووان بوو، هەڤاڵ کوێستانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠١٧، ل٩٤.

پاشان مام جەلال و شەهابی شێخ نووری داوا دەکەن بۆ بینینی سەرۆک ماو، سەفەرێکی چین بکەن. دوای ئەوەی لایەنی چینی دڵنیا دەکەنەوە لەوەی ئەمان ڕێکخراوێکی تازەدروستبووی نهێنین و نهێنی پاراستن و دیسپلین لە ناویاندا لە باڵاترین ئاستدایە، یەک دوو هەفتە دواتر سەفارەتی چین داوا لە مام جەلال و شەهابی شێخ نووری دەکات سەردانیان بکەن و جگە لەو دوو کەسە هیچ کەسێک لەنێو سەرکردایەتیی کۆمەڵەدا نەزانێت، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەمانیش بڕوایان بە ڕابەرایەتیی کۆمەڵە هەیە و ناتوانن هیچ شتێک لە سەرکردایەتییەکەی خۆیان بشارنەوە، لە سەرەتاوە هەر هەنگاوێکیان ناوە، ئەندامەکانی تری سەرکردایەتییەکەی خۆیان ئاگادار کردۆتەوە. مام جەلال و شەهید خاڵە شەهاب چاوەڕێی ڤیزە و سەفەری چین دەکەن، بەڵام بەرپرسی سەفارەت داواکارییەکانیان ڕەت دەکاتەوە بەوەی کەسێکی نێو سەرکردایەتیی ئێوە بە ناوی فەرەیدوون هاتووە و خۆی بە ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە ناساندووە و داوای ڤیزەی کردووە بۆی بخرێتە سەر پاسپۆرتەکەی. بەم شێوەیە بە هۆی فەرەیدوون عەبدولقادرەوە، پەیوەندییەکەی مام جەلال و شەهابی شێخ نووری هەڵدەوەشێتەوە. مام جەلال ڕووداوێکی تری هاوشێوەی لەسەر هەوڵی دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ میسردا گێڕاوەتەوە، کە هەمان کاراکتەر فەرەیدون عەبدولقادر ئەویشی بە هەڵوەشاندنەوە داوە. دەمەوێت جارێکی تر بگەڕێمەوە سەر ئەو هۆکارانەی کە تێکۆشەرانیان بەرەو هەڵدێر و لەخشتەبردن دەبرد و کەسایەتی و دووڕووخسارییی فەرەیدوون و دەمپیس و جنێوفرۆشانیش کاتێک هێزی پێشمەرگە لە قوڕ و لیتەی نێو وەردەکان و بەر لێزمەی باران و خەباتی سەخت لە چیا بەرزەکان ژیانی خۆیان بەخت دەکرد، ئەویش بەبێ پشتێن و هەندێک جاریش شەوان سەری گەرم دەکرد و هەندێک پێشمەرگەش پاسەوانییان دەکرد، ڕۆژگارێکی قێزەونە و نەتوانیت ڕای خۆت دەربڕیت کە هەموو تەمەنی خۆت کردۆتە قوربانیی ئەو ڕێگایە و کەسانی وەک فەرەیدوونیش بوون بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی، بۆیە لێرەوە دەست پێ دەکەم...

## «قسەی زل نەکەن، ئەو پێڵاوانە دەخەمە دەمتانەوە!»

ئێمەش وەک کەرتی پێنجی شەهید هاوڕێ جەبار، تیپی چل و حەوتی پیرەمەگروون، بەرپرسەکەمان «عومەر عەرەب» کە فەرماندەی کەرت بوو، چەند پێشمەرگەیەکی لێ هەڵبژاردین، لەوانە: فازیلی باجە لە کەرتێکی ترەوە گوازرابۆوە کەرتی ئێمە و دواتر بوو بە فەرماندەی مەفرەزە، لە چالاکییەکدا لە ناوتاقانی پشتی گوندی کانی سپیکەی سلێمانی لەگەڵ تۆفیق (هونەر) (ئەویش دواتر بوو بە جێگری فەرماندەی کەرت) شەهید کرا. سەلاحی حاجی عەلی (سەلاح چاوزەق)، دواتر بوو بە فەرماندەی کەرت و گوللەباران کرا. ئەردەلانی ئیسماعیل عارف، دواتر بوو بە جێگری فەرماندەی کەرت لە تیپی پارێزگاری عەبدولڕەحمان سیتەکی سەرتیپ بوو، شەهید سالاری حاجی دەروێش کە گوللەباران کرا فەرماندەی کەرت بوو، ئەردەلانی ئیسماعیل عارف جێگری فەرماندەی کەرت بوو، ئەم تیپە پارێزگاریی لە سەرکردایەتی و بارەگای مام جەلال دەکرد، حەمەی شێخ حەسەن (حەمە بچکۆل) وەک پێشووتر باسم کرد، گوللەباران کرا، ئازاد کەرکووکی ئێستە لە ژیاندا ماوە، کامەران مەحموود (کامەرانی خولە سمێڵ) لە ڕووداوێکی زەماوەندێدا کوژرا، نوورەدینی برام (سەربەست) ئێستە لە ژیاندا ماوە، بەندە (شەهاب کەریم) و ڕزگار قلیاسانی لە ناوتاقان شەهید کرا؛ چەند جارێک لە هەوڵی چالاکییەکی مەزندا بووین کە دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبێت و ترسی زیاتر بخەینە نێو دەروونی چەکدارەکانی سەر بە ڕژێم. لە شاری سلێمانی، لە ڕاستەڕێی شەقامی مامۆستایان، بە دووریی پێنج سەد مەتر لە نزیکی بارەگای ئیستخبارات، کە لەو سەردەمەدا بارەگای ئیستخباراتی لێ بوو، لەنزیک یانەی مامۆستایان (نادی معلمین) ئۆتۆمبێلێکی پۆلیس (شرطة النجدة)ی بە چوار چەکدارەوە لێ بوو کە ڕژێمی بەعس بۆ ئەوەی زیاتر بتوانێت چاودێری بکات، لەبریی پۆلیس، هەندێک لە چەکدارە تایبەتییەکانی خۆیان شەوانە ئێشکیان دەگرت و پەلاماری هاولاتییانیان دەدا. پێشتر

ئێمەش دوو ئۆتۆمبێلی جۆری بەرازیلیمان بۆ ئەنجامدانی چالاکییەکەمان بۆ ئامادە کرابوو، پاش ئەوەی نەخشە و پلانی خۆمان دارشت و چووینە سەریان و بە سزای گەل و شۆڕشمان گەیاندن و ئۆتۆمبێلەکە و هەر چوار چەکی جۆری کلاشینکۆف و دەمانچەیەک و جیهازێکی پەیوەندیکردنمان لەگەڵ خۆماندا هێنا. کاتێک گەیشتینە سنووری ئازادکراو و ڕۆژمان لێ بووەوە، لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە پەیوەندیمان بە جیهازەوە پێ کرا، ئەو جیهازانەی کە پۆلیسەکان بەکاریان دەهێنا لەنێو ئۆتۆمبیلەکەدا بوو و سەلاح چاوزەقیش بەدەم پێکەنین و گاڵتەجاڕییەوە وەلامی دەدانەوە. کاتژمێری حەوتی سەرلەبەیانی گەیشتینە گوندی گاپیلۆن، بارەگای شۆڕش ئیسماعیل، سەرتیپی ٤٧ی پیرەمەگروون کە ئێستا ئەندامی مەکتەبی سیاسی و وەزیری پێشمەرگەیە لە کابینەی نوێیەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان. لەسەر ڕێگای گوندەکە ڕامانگرت و ڕۆژانە خەڵکی بەسەرسامییەوە دەهاتن سەیریان دەکرد کە بە چی شێوازێک توانراوە ئەم ئۆتۆمبێلە بهێنرێت! لە ڕاستیدا چالاکییەکی زۆر مەترسیدار و زەحمەت بوو، پاشان لە مێژووی ئەو شۆڕشەدا هیچ تیپ و کەرتێکی هێزی پێشمەرگە چالاکیی لەو جۆرەیان ئەنجام نەدابوو. خەڵکی گوندەکان و خەڵکی شاریش کە دەهاتن بۆ ئەوێ، بەتایبەتی بۆ چەند خولەکێک سەیریان دەکرد و پرسیاری ئازایەتی و قارەمانێتیی ئەو پێشمەرگانەیان دەکرد کە ئەو چالاکییەیان ئەنجام داوە. ئێمەش زۆر خۆشحاڵ بووین بەوەی کە سەرکەوتنمان بەدەست هێناوە. پاش هەفتەیەک هەواڵمان پێ گەیشت بەوەی بچین سەردانی فەرەیدوون عەبدولقادر بکەین، عومەر عەرەب وەک فەرماندەی کەرت و من و سەلاح چاوزەق. بۆ ڕۆژی دواتر گەیشتینە لای فەرەیدوون عەبدولقادر، هەر چەندە زۆر ماندوو بووین، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر خۆشحاڵ بووین کە نێردراوە بەدواماندا و چاومان بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی دەکەوێت و خەلات دەکرێین. بەلام کاتێک فەرەیدوون عەبدولقادر هاتە دەرەوە بە ڕووخسارێکی پاک و پوختە و جلێکی جوان، یەکەم پرسیار وتی: «عومەر

عەرەب، تۆ خۆت بە چی دەزانیت کێشەی گەورەمان بۆ دروست دەکەیت؟»
عومەریش وەڵامی دایەوە وتی: «کاک فەرەیدوون، نازانم باسی چی دەکەیت! من هیچ کێشەیەکم بۆ شۆڕش دروست نەکردووە.» وتی: «با، تۆ کاری سەربەخۆ دەکەیت و پێشمەرگە دەبەیتە شار و تەقە دەکەیت!» عومەر وەڵامی دایەوە و وتی: «کاک فەرەیدوون، من فەرماندەی کەرتم و دەست لە ڕژێم ناپارێزم و جگە لە ئەنجامدانی چالاکی و خۆبەختکردن، هیچی ترم نەکردووە.» لە وەڵامدا فەرەیدوون عەبدولقادر وتی: «عومەر، قسەی زل نەکەیت، ئەو پێڵاوانە دەخەمە دەمتانەوە!» لە ڕاستیدا من وام دەزانی هەر هیچ نەبێت یەکی دەمانچەیەکمان خەڵات دەکات و ئێوارەخوانێکمان بۆ ساز دەکات، ئەو جنێوە و ئەو وشە ناشرین و نەشیاوە، هەرسێکمانی داڕووخاند و تینوویتی و برسێتیی ڕێگای لەبیر بردینەوە. تازە پێشمەرگەیەک کە لەو سەردەمەدا پێیان دەوترا پێشمەرگەی مفاوەزات، هاتە تەنیشتمانەوە و وتی: «کاک فەرەیدوون گیان چەکیان بکەم؟» عومەر ئاوڕی دایەوە و وتی: «کێ چەک دەکەیت، با مێشکت نەتەقێنم!» دوای پرسیار و هەندێک گفتوگۆ، ئێمەش بەنائومێدی گەڕاینەوە بۆ بارەگای کەرتەکەمان کە لە گوندی باڵخێ بوو. ئەو جنێوەی فەرەیدوون بە ئێمەی دا، کاریگەریی دەروونیی کردە سەرمان. بە چەند مانگێک دوای شەهیدبوونی مامە ڕیشە، لە وەڵامی جنێوەکەی فەرەیدوون، گەورەترین چالاکیمان لە سلێمانی ئەنجام دا. کوشتنی شەش چەکداری ڕژێم و بردنی چەند ئۆتۆمبێلێک کە یەکێکیان درا بە شۆڕش ئیسماعیل و دووانیان ڕەوانەی سەرکردایەتی کرا، عومەر وتی: «با ئۆتۆمبێلێکیان بۆ فەرەیدوون بێت، گوناحە، ئەو ئیشی پێی دەبێت، چونکە زۆر سەرقاڵی سەفەرکردنە بۆ ئێران!»

فەرەیدوون عەبدولقادر هەر ئەو کاتە سیاسەتمەدارێکی جنێوفرۆش نەبوو، بەڵکوو لە ئەمساڵیشدا هەڕەشەی کوشتن لە منداڵێکی سێ ساڵان دەکات و تەنانەت وشەی نەشیاوی بازاڕییش وەک: حیز، قوزی خوشکت و دایکت دەگێم بەکار دەهێنێت و لەسەر قەرز و پارە و مامەڵەکردنی

کالاوه، هەڕەشەی کوشتن لە هاولاتییەک دەکات و دەڵێت: «سەگی سەگباب، ئەوا دێم و دەتکوژم و سەرت دەخەمە قوزی ساحێبتەوە!» تەواوی تۆڕە کۆمەلایەتییەکان بە جنێو و هەڕەشەکانی فەرەیدوونەوە سەرقاڵ بوون و بڵاویان کردەوە. ئای لەو سیاستمەدار و قوتابیی قوتابخانەی مارکس و لینین و ماوتسی تونگ! ئای لە فەرەیدوونی ئەندامی مەکتەبی سیاسی، کە ناخی ڕاستەقینەی دەردەکەوێت. ئەو فەرەیدوونەی لە شاخ لەسەر ئەنجامدانی چالاکییەکی گەورەی مەترسیدار، پێلاوی دەخستە دەمی پێشمەرگەوە. ئەو فەرەیدوونەی وتاری دژ بە ڕژێمی بەعس دەنووسی، ڕێکخستنە نهێنییەکانی شار بڵاویان دەکردەوە و داوای مافی گەلی کوردی دەکرد، ئێستە گەورەترین بازرگان و سەرمایەدار و خاوەن هۆتێلی چەند نهۆمیی بەرزی پێنج ئەستێرە و قومارخانە و دیسکۆ و ڕێستۆرانتە. بەداخەوە، ڕۆژانێک بوو ئێمە سنگمان بە گوللەوە دەنا و ئەویش خۆی لە گوللەی چەکی ڕژێم دەپاراست، ئێمە گیانفیدا و ئەویش بازرگان و سەرمایەدار! مارکس کاتێک تێکەڵ بە بزووتنەوەی جەماوەری دەبێت و لە ڕێپێوانێکدا خێزانەکەی وەلامی بۆ دەنێرێت و دەڵێت: منالەکەمان زۆر نەخۆشە و ئەگەری مردنی هەیە، مارکس وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: منالەکەمان گەر بشمرێت، منالێکی تر لەدایک دەبێتەوە، بەلام ڕەنگە ڕێپێوانێکی تری پرۆلیتاریی لەم جۆرە نەکرێت و لەدایک نەبێتەوە. مارکس هەتا مردیش، خاوەنی هیچ سەرمایەیەک و تەنانەت بەقەرزارییش مرد و دوای خۆی نووسینەکانی؛ جیهانی سەرمایەداریی گۆڕی بۆ جیهانی پرۆلیتاری، بەلام هەندێک لە سیاسەتمەدارانی نێو شۆڕشەکانی ئێمە، خەباتی پرۆلیتاریایان گۆڕی بۆ خۆشگوزەرانیی خۆیان و دروستکردنی کۆمپانیا و حیزبی عەشیرەتگەری و خێڵەکی و سەرمایەداری.

## گوللەبارانکردنی نەرمین و ئیشق بەسەر لوتکەکانی شۆڕشەوە

جەباری عەلی عەوێز بەشێک بوو لە نەسرەوتن و قوربانییەکانی بێئاگای نێو شۆڕش، ئەو بە سواری داشقە دووئەسپییەکەی باوکیەوە باڵی دەگرت و دەفڕی، هەندێک جار بەرەو دوندی شۆڕش، سەرکەشانە بازی بەسەر لوتکەکانی چیادا دەدا و هەندێک جار لە پشتی فەرشە لۆکەییەکانی هەورەوە، پڕ بە ئاسمان دڵداریی لەگەڵ خۆرێکدا دەکرد، نەیدەزانی لە کوێدا لوتکە کۆتایی دێت و کەییش خۆر ئاوا دەبێت! قارەمانێتی لای ئەو ئەوە نەبوو لە جەنگێکدا بیباتەوە، سەنگەرێک لە دڵە قاییمەکەی قاییمتر داکوتێ، ئەو لە فیشەک خێراتر بوو، لە شمشێر تیژتر بوو، گوڕی با بوو، پاڵەوانی هەزاری بوو، لە مەدرەسەی برسێتیدا مەشقی ژیانی دەکرد و لە چاوانی نەرمینێکدا عیشقبازیی لەگەڵ ژیاندا دەکرد. هەرکە زرینگەی زەنگۆڵە دەهات، منداڵانی گەڕەک چاوەڕوان دەبووین ئێستا جەبار بەسەر باڵی ڕەشەباوە دێت، لە ژووانی یار گەڕاوەتەوە و حکایەتەکانی «گورنەتەڵە» و «شێتە و ژیرە» و «کوڕە کەچەڵە»مان بۆ دەگێڕێتەوە.

ئەو منداڵێکی گورج، گورجتر لەو ڕووناکیيانەی لە چاوی نەرمینەوە دەیماشییەوە. ئەو کە دەهاتە گەڕەک، هەردوو گیرفانی شەرواڵە دڕاوەکەی کە لەوەی دەکرد لە گوێنییەک دورابێت نەک لە پارچە قوماش، لە درزەکانی گیرفانیەوە درەوشانەوەی ئەو تیشکانەمان دەدی کە لە ژووانی ئەشقەوە چنیبوونیەوە. ئەسپەکانی باوکی زۆر لەو سەفەرانە دەترسان لەگەڵ جەباردا، کۆڵانەکانی خەیاڵ و ئەفسانەکانی ڕۆستەم و زۆرابیان لە گەڕەکەوە تا ئەوپەڕی دنیا، تا ئەو شوێنانە تەی کردبوو کە ئێمە بە چیرۆک نەبێ؛ پێی نەگەیشتبووین. بۆ سبەی کە دەهات بۆ قوتابخانە، پڕ بە داشقەکەی باوکی ژاوەژاوی لەگەڵ خۆی دەهێنا، بەقەد پۆلێک منداڵ؛ عەجولی و هاریی دەهێنا. ئەو بەشێک بوو لە نەسرەوتن، گڤەیەک بوو تا مردن دانەمرکایەوە، مەخلوقێک بوو نەمدەزانی کەی دەخەوێت، کەی دەسرەوێت، لە چ کاتێکدا پشوویەک

دەدات، یان تەنیا ساتێکیش لەگەڵ ئارامیدا ئاشنا بێت. ئەو پارچەیەک بوو لە جمان، خێراتر لە تەمەنی خۆی ساڵەکانی منداڵیی جێ دەهێشت. هاوتەمەن و هاوپۆلی یەک بووین، کەچی ئەو زۆر خێراتر لە ئێمە وازی لە منداڵی و قوتابخانە و یارییەکانی منداڵی هێنا و کەوتە یاریکردن لەگەڵ گەورەکان. نەرمینیش کیژۆڵەیەک بوو جوانتر لە پێناسەکردن، مەگەر چاوە گەشەکانی ئەو جەباری بەند کردبا، دەنا جەبار لە یەک کاتدا لە هەموو شوێنێک بوو و لە هیچ شوێنێکیش نەبوو. نەمدەزانی چۆن خۆشەویستی دەکات، بەڵام مەفتوونی نەرمینیش بوو! نەمدەزانی چۆن دڵداری دەکات، بەڵام کوشتەی داوی عیشقی ئەو خانمە دەمبەخەندە و پڕ لە عیشوەی ژنبوونە بوو! ئاخر جێی سەرنجە جەبارێک جگە لە حیکایەتی فڕین و سەرچڵی، هیچ پاشەڕۆژێکی تری نەبوو، دەبێت چۆن نەرمینی بدەنێ! نەرمینێک نەرمتر لە ئاوریشم و نەمتر لە لۆکەی سپیی ژێر سەرین و نەمتر لە ژیان، چۆن دەبێت لەگەڵ جەباری عەلی عەوێزدا یاریی مەرگ بکات؟ لەگەڵ نەرمیندا دایە شاخ و لوتکەی بەرز، مەگەر تەنها «حسک» بەرگەی لاسارییەکانی جەباری عەلی عەوێزی گرتبا. ماڵی هاوەڵە ڕاوچییەکانی تری با بوو، لەگەڵ مەحموودی محەمەد ناسراو بە خولەی حەمە تاتە و یاسینە هەتیو ناسراو بە مام ئاراس. هاوڕێیانی شیرین و خۆشەویستی لە حسکەوە یەکیان گرتەوە و بەشێکی گرنگ بوون لەو شۆڕشەی تازەی دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول دەستی پێ کردەوە. کۆڵانەکانی چوارباخ و سەرکارێز و سەرشەقام؛ نەوەیەک لە پاڵەوانی شار و شۆڕشی بەرهەم دەهێنا، بەڵام هەر ئەو شار و شۆڕشە دابەشی دەکردنەوە بەسەر حیزب و تاقمی جیاوازی دژبەیەکدا. ئەوانەی لە شۆڕشدا بوون، شاخ دەیکردنە جەنگاوەری شەڕی براکوژی و هەندێکی شاریش دەوڵەت دەیکردنەوە بە ڕاوچیی ئەوانەی شاخ و کەسوکاریان لەناو شاردا بوو. جەباری عەلی عەوێز لەپاش حسک ناوی بە پاڵەوانە لاسارەکە دەرکردبوو، لەناو حسکەوە پەڕییەوە بۆ ناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و شەرەفی ئەندامێتیی فەرماندەی کەرتی پێ سپێردرا و کەم تا زۆر لەسەر بیروڕای

جیاوازی کوردایەتی و چوونە ناو یەکێتیی نیشتمانییەوە، ناکۆکی کەوتە نێوان جەباری عەلی عەوێز و مەحموود محەمەد (خولەی حەمە تاتە)، کە لە هەمان کاتیشدا دوو هاوڕێی دڵسۆز و منداڵیی یەکتر بوون. جوولەکان و چوارباخ دوو گەڕەکی دێرینی شاری سلێمانی بوون و دەیان تێکۆشەری فەرماندەی دڵسۆزی تیا هەڵکەوت و سەدان دڵسۆزی نیشتمانپەروەر هاوکاریی شۆڕش و ڕێکخستنەکانی ناوشاریان دەکرد، لەو ساڵانەشدا خیانەتکردن زۆر قورس و گران بووە و کەم کەس دەیتوانی ڕوو لەو کارە بکات و دەستی تێکەڵ بە دوژمن و نەیارەکانی گەلەکەی بکات. لە سەرەتای دەستپێکردن و سەرهەڵدانی شۆڕش لە ساڵانی حەفتاکاندا، خێزانێک بە ناوی بنەماڵەی «ئامە قەرەج[١]» لە گەڕەکی جوولەکان دەژیان، لە ڕووی ئابوورییەوە کەمدەرامەت و باری گوزەرانیان خراپ بوو، ژیانێکی سادە و ساکار دەژیان. ئامین واتە ئامە قەرەج، هەژاری هێندە نارەحەتی کردبوو، زۆر جار بە هۆی گیروگرفتی منداڵەکانییەوە تووشی دەنگەدەنگ دەهات و وەک ئافرەتێکی زۆربڵێ و دەمبەهاوار لەنێو گەڕەکدا دەردەکەوت، ئەوەش بووە هۆکاری ئەوەی ناوی قەرەجی بەسەردا بسەپێنرێت. لەنێو ئەندامانی ئەم خێزانە هەژارەدا دوو کەسایەتیی جیاواز هەڵکەوتن و هەریەکەیان سەرقاڵی ژیانی تایبەتیی خۆی بوو، یەکێکیان بە ناوی ئاواتی ئامە قەرەج، وەک مرۆڤێکی هونەردۆست و هونەرمەندێکی میللیی دەنگخۆش و خۆشەویست لەنێو خەڵکی ناسرابوو، گۆرانییەکانی ئاواتی ئامە قەرەج لەلایەن زۆربەی خەڵکی بەتایبەتی نەوەی ئاڵتوونییەوە دەبیسترێت. کەسایەتییەکی تری نێو ئەو خێزانە بە ناوی ئازادی ئامە قەرەج، ژیانێکی مەترسیدار و ڕەفتاری خراپ و ترس و تۆقاندنی لەنێو خەڵکی و دەروونی دەوروپشتیدا چاندبوو. چاونەترسانە خۆی وەک پاڵەوانێکی مەزنی فیلمێکی پڕ تراژیدیا دەهاتە بەر چاو، پێچەوانەکەشی ڕۆڵی سیخوڕێکی ڕژێمی دەبینی.

---

[١]. لە ڕاستیدا ئەم خێزانە بە بنەماڵە قەرەج نەبوون، بەڵکوو بارودۆخی گوزەرانی ئەو کاتە و جیاواز لە ئێستە، بەتایبەت ناو و ناتۆرەی زۆر لە خەڵکی دەنرا، وەک: کوێر، شەل، هەتیو، بێوەژن و... هتد.

بە سواری ماتۆڕ و بە جووتێک کلاشی سەرپێنراو و شەرواڵ و کراسێکەوە، بێباک لە هیچ ناو و ناوزڕاندن و تیروتوانجێک، بۆ دەوڵەت ڕاوی ئەندامانی نهێنیی ڕێکخستنەکان و کەسوکاری ئەوانەی لە شاخ پێشمەرگە بوون، دەکرد. ئەو ڕەفتار و تاوانانەی ئازاد دەیکردن بە دەمانچەکەی لاقەدیەوە کە لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بۆ ڕاوە پێشمەرگە پێی خەڵات کرابوو، زۆرترین تاوانی پێ ئەنجام دابوو، چەندین هاولاتیی بەدبەختی بێچارەی ڕادەستی داموودەزگاکانی ڕژێمی بەعس کردبوو. ئەو دەمە لە کۆتایی حەفتاکاندا بوو، لەیادمە لە کارخانەی سەرداری بلۆکی چوارباخ کارم دەکرد و بلۆکمان دروست دەکرد. چێشتخانەی عەلی سوور لەبەر دەرکی سەرادا بەرامبەر بە سینەما سیروان بوو، بۆ پشووی نیوەڕۆ دەچووین بۆ چێشتخانەی عەلی سوور، لە کاتی گەڕانەوەماندا بۆ کارخانەکە لەسەر ڕێگەکەماندا چایخانەیەکی لێ بوو بە حەسیر دروست کرابوو بۆ چاخواردنەوە ڕوومان لەوێ دەکرد، پاشان گەراجی هاتوچۆی عەربەت و قەراخ و شارەزووری لێ بوو، ئازادی ئامە قەرەج هەمیشە دەمانچەکەی دەکرد بە لاقەدیدا و لەوێ کاتی بەسەر دەبرد. ئازاد باسی لە قارەمانێتیی خۆی دەکرد، گوایە قوتابییەکی ناوەندیی سیروانی بە دەمانچەکەی کوشتووە کە سەر بە ڕێکخستنەکانی ناوشار بووە و ڕادەستی ئەمنی سلێمانیی کردووە. بەڵام وەک خەڵکی لە چایخانەکە دانیشتبوون، بە شێوەیەکی تر دەیانگێڕایەوە، گوایە ئازادی ئامە قەرەج حەزی لە خوشکی کەسێکی دانیشتووی گەڕەکی چوارباخ کردووە و بووە بە دەمەقاڵێیان و دواتر کوشتوویەتی، بوختانی بۆ هەڵبەستووە بەوەی کاری حیزبیی لەگەڵ یەکێتیدا کردووە. هێزی پێشمەرگە بۆ تەمبێکردنی ئازادی ئامە قەرەج مەفرەزەیەکیان ناردەوە بۆ شار تا بیگرن و بە سزای گەل و شۆڕشی بگەیەنن، چونکە تەواوی خەڵکی گەڕەکی جوولەکان و چوارباخ و سەرشەقام تووشی دڵەڕاوکێ ببوون، هەموو سات و کاتێک چاوەڕوانی ئەوە بوون لەلایەن ئازادی ئامە قەرەجەوە ڕادەستی ڕژێمی بەعس بکرێن، بەڵام ئازاد بەڕێکەوت لە ماڵەوە نەبوو و دەستگیر نەکرا. ئامینە خانی دایکی و ئاواتی

برایان بەر دەستی هێزی پێشمەرگە کەوتن، کاتێک پێشمەرگەکان ئاواتی بێتاوانی دەنگخۆش و خۆشەویستی نێو جەماوەر دەکوژن و ئامینە خانیش لە هەستوسۆزی بۆ کورە کوژراوە بێتاوانەکەی؛ سکاڵا و هاوار و دەنگەدەنگی بەرز دەبێتەوە و تەواوی خەڵکی گەڕەکی جوولەکانی لە نیوەشەوێکی ترسناکی لەو جۆرەدا بەخەبەر هانی و پێشمەرگەش وەک پارتیزانی ئەو ڕۆژگارە سەختە، نەیانتوانی هیچ شتێک بکەن جگە لەوەی بە چەند گوللەیەکی گڕدار کۆتایی بە ژیانی ئامە قەرەج بهێنن و دوو جەستەی دایک و کوڕی بێتاوان لەنێو کۆڵانە باریکەکانی جوولەکاندا بەتەنیشت یەکەوە ڕیز کران. ئەم چیرۆک و بەسەرهاتە ڕاستەقینە پڕ تراژیدیایانە، مێژوویەکە و بەشێکە لە قەدەری شۆڕشی ئێمە. لەو ڕووداوانانەی لەبریی کەسی تاوانبار، کەسێکی بێتاوانی وەک ئاواتی برای ئازادیان سزا دا و کۆتاییان بە ژیانی ئەو مرۆڤە هێنا، جگە لە خۆشەویستی و خزمەتی هونەری میللی، هیچی تری نەکردبوو.

دوای ئەو کارەساتەی بەسەر خێزانی ئازادی ئامە قەرەجدا هات، بووە هۆی ئازاری ویژدان و هێندەی نەبرد پشتی لە دەوڵەت کرد و پەیوەندیی کرد بە ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگە و شەڕی هەڵۆکانەوە لە شاخ و داوای کرد ببێتە پێشمەرگە لەناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. لە هەمان کاتیشدا ئازاد، جەباری عەلی عەوێزی بە کاراکتەری سەرەکیی کوشتنی دایک و براکەی دەزانی. دەمەوێت لە ڕێگەی نووسینەوەی ئەم سەرگوزەشتە و یادەوەرییانەوە ئاماژە بە شتێک بدەم، ئەویش کاتێک بۆ سزادانی تاوانبارێک، مەفرەزەیەکی هێزی پێشمەرگە هەر کەسێک بە سزای گەل و شۆڕش بگەیەنن، هیچ پێشمەرگەیەک تاوانبار نییە و مافی تۆڵەسەندنەوەی بۆ پەسەند نییە، چونکە ئەوە بڕیاری حیزب و هێزی پێشمەرگەیە، نەک تاکەکەسی تیا تاوانبار بکرێت. گەر جەباری عەلی عەوێزیش کاراکتەری بەسزادانی هەر تاوانبارێکیش بووبێت لەنێو ئەو مەفرەزانەی کە بڕیاری لەسەر سزادانی تاوانبارێک دەدا، ئەوە حیزب و هێزی پێشمەرگەی لێ بەرپرسیارە، بۆیە لێرەدا ئازادی ئامە قەرەج و جەباری عەلی عەوێز وەک دوو دوژمنی سەرەکی دەیانڕوانییە

یەکتر، جێی نیگەرانیی یەکێتییش بوون. ئەگەرچی بۆ سەرەتای سەرهەڵدانی شۆڕش و خەباتی چەکداریی شاخ، بوون بە پێشمەرگە زۆر پێویست بوو، بەڵام کەسێکی وەک ئازادی ئامە قەرەج و جەباری عەلی عەوێز لە یەک شوێندا جێگەیان نەدەبوویەوە کە زیاتر لەوەی دەکرد ئازادی ئامە قەرەج هاتبێت بۆ ئەوەی تۆڵەی ئاواتی برای و ئامینە خانی دایکی بکاتەوە. شۆڕش بۆ ئەوەی نیازپاکیی ئازادی ئامە قەرەج تاقی بکاتەوە، ناردیانەوە بۆ ناوشار بۆ ئەوەی «ملازم موحسین» و چەند تاوانبارێکی تر بکوژێت و لەکۆڵ شاری سلێمانیی بکاتەوە. دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول و سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، دەوڵەت ملازم موحسینی هێنایە شاری سلێمانی و دەسەڵاتی تەواوی لەژێر دەستدا بوو، هەر لە تالانی و دەستدرێژیکردنە سەر هاوڵاتییان و باج و سەرانە وەرگرتن و شەهیدکردنی هاوڵاتییانی سڤیل و ڕیش سووتاندنی لاوان و زیندانیکردنیان، کە بەڕاستی ئەو کاتە ملازم موحسین ئیزرائیلی شار بوو. ئازادی ئامە قەرەج نە توانیی ملازم موحسین بە سزا بگەیەنێت و سەرکەوتوو نەبوو لە کارەکەیدا، نە نهێنیی یەکێتیبوونەکەی ئاشکرا بێت، ئەوە سەفەری مەرگی بوو و بۆ هەتاهەتایە ئازادی ئامە قەرەج ناوی سڕایەوە. ئەستێرەی جەبار ڕۆژبەڕۆژ دەگەشایەوە و دەنگدانەوەی ئازایەتیی؛ شار و شاخی پڕ کردبوو، ئەویش وەک هەمیشە نەیدەتوانی بە قسەی حیزبێک یان سەرکردەیەک و لێپرسراوێک بجووڵێتەوە، هێندە بە ئازایەتی و چاونەترسی خۆی دەنازی. ئەو هەر جووڵەیەک بوو بۆ خۆی، لەناو شۆڕشدا بوو، بەڵام نەیدەتوانی بەشێک بێت لە شۆڕش، چونکە وای هەست دەکرد وەک هەڵۆیەک نابێت پەڕوباڵی بکرێت. لە دانوستانی نێوان میری و یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستاندا لە ساڵی ١٩٨٤دا، هێزی پێشمەرگە دەمێک بوو ئارەزووی بینینی خێزان و خانەوادەکانیان دەکرد، ئارەزووی بینینی کووچە و کۆڵان و شەقامی شاریان دەکرد، میری سوودی تەواوی بۆ دەستوەشاندن و ئاشکراکردنی شوێن و ماڵە پێشمەرگە و ڕێکخستنەکانی نێوشار وەرگرت، پاشان بۆ ناشرینکردنی

هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، خەڵکانی سەر بە خۆیانی دەناردە ناو هێزی پێشمەرگەوە، پاش ئەوەی چەکی پێشمەرگایەتییان لە شان دەکرد و یەکێتییش لە هەمان کاتدا لە دانوستاندا بوو لەگەڵ میری، ئەو هەلەیان دەقۆستەوە و بە ناوی پێشمەرگەوە ڕاوورووت و دەستدرێژیکردنە سەر ئافرەتان و بەسەرخۆشی چوونە سەر ماڵان و تەقەکردن لە هاوڵاتییان دەستی پێ کرد. ئەمەش دەنگی زۆری دایەوە و ڕێکخستنەکانی ناوشار سکاڵایان دەردەبڕی و ڕۆژانە دەیان ڕاپۆرت ڕووبەڕوی حیزب دەبووەوە، ئەوەش بووە هۆکاری ئەوەی چوونەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ ناوشار قەدەغە بکرێت و لیژنەیەک دروست کرا بە سەرپەرشتیی ئاوات عەبدولغەفوور وەک بەرپرسی لیژنەی تەنسیق لە سلێمانی ئەو ئەرکەی پێ سپێردرا.

زۆرێک لەو پێشمەرگانەی بەبێ بڕیاری شۆڕش دەچوونەوە ناو شار، دەستگیر دەکران و بێسەروشوێن دەکران. ئیتر هیچ بەرپرسیارێتییەک لە دەسەڵاتی شۆڕشدا نەما و ڕۆژبەڕۆژ ڕژێمی بەعس ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشاری ئاشکرا دەکرد و ئەندامانی لێ دەستگیر دەکردن، ئەوەش بووە مایەی نیگەرانی بۆ شۆڕش و لە کۆبوونەوەیەکی تیپ و کەرتەکاندا، ئەودەم من لە کەرتی سێی ئەزمەڕی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون بووم، عەبدولڕەحمان سیتەکی کە مرۆڤێکی هێمن و خاوەن چەند منداڵێکی زۆر بوو، بەڵام ویژدان و هەستی کوردایەتیی وای لێ کردبوو کە تەواوی خێزان و منداڵەکانی بەجێ بهێڵێت و ڕوو لە شاخ و پێشمەرگایەتی بکات، فەرماندەی کەرتەکەمان بوو، جێگری کەرتەکەمان عەباس سیتەکی بوو (ئەگەر بڵێم مرۆڤی دڵسۆزی لەو زاتە کەم بوو، ڕەنگە ببێتە هۆی سەرنج و تێبینی بۆ نووسینەوەی یادەوەرییەکانم)، عومەر حەسەن ناسراو بە «عومەر عەرەب» فەرماندەی مەفرەزەی کەرتەکەمان بوو، لە دۆڵێکی نزیک گوندی کانی بەردینەی سەر بە دۆڵەڕووت، زۆربەی زۆری پێشمەرگە و فەرماندەکان کۆ بووینەوە، ئاگاداریان کردین نەوشیروان مستەفا دەیەوێت چاوی پێمان بکەوێت و لەسەر هەندێک هەڵە و کەموکوڕییەکان و چۆنیەتیی

دانوستان بدوێت. کاتژمێر یەکی پاش نیوەڕۆ کۆ بووینەوە و نەوشیروان مستەفا بە جلی سادەوە و کۆن و جووتێ پێڵاوی لاستیک و جامانەیەکی ئاسایی، لەگەڵ مام ڕۆستەم و دوو پێشمەرگەدا بە لاندگرۆزەرێکی پیکاپی سپیی مۆدێل ١٩٧٩دا هاتن. هەمووان لەسەر زەوی دانیشتبووین، ئەویش بەپێوە، مام ڕۆستەمیش بەلای شانی ڕاستیەوە وەستابوو، دەستی کرد بە قسەکردن. سەرەتای دەستپێکردنی قسەکانی، زۆر بەتووڕەییەوە وتی: «ئێمە ئەمڕۆ لە دانوستاندابن لەگەڵ حوکمەتی عێراقدا، بەو دڕندەییەی خۆیەوە گفتوگۆمانە و باس لە چارەنووسی گەلەکەمان دەکەین، بەڵام پێشمەرگە دەچنەوە ناوشار و تووشی سەرئێشەمان دەکەن و گرفتمان بۆ دروست دەکەن. من پێشمەرگەی خوێڕی و دز و چەتەم ناوێت!» زۆربەی پێشمەرگە دێرینەکانی نێو ئەو کۆبوونەوەیە تا ئێستەش لە ژیاندا ماون و زۆر جاریش ئەو سەرگوزەشتەیە بەبیر یەک دەهێنینەوە. من ئەو کاتە تەمەنم بیست و سێ ساڵ بوو و وتم: «کاک نەوشیروان، یەکێتیی نیشتمانی چۆن دەبێت دز و خوێڕیی تیا بێت و ناوی لێ بنرێت پێشمەرگە و شۆڕشگێڕ؟» ئەویش لە وەڵامدا وتی: «بەڵێ تیایەتی و خراپتریشی تیایە.» دوابەدوای من، «شەهید حەمە عەلیی بەر خانەقا[1]» پرسیاری ئاڕاستەی وتەکانی نەوشیروان مستەفا کرد و وتی: «کاک نەوشیروان، پێشمەرگەمان هەیە ماندووە و زۆر دەمێکە کەسوکاری نەبینیوە و هەشمانە بە هۆی ئەم دانوستانە ژیانی هاوسەرگیریی پێک هێناوە و هەشمانە نەخۆشە...» نەوشیروان مستەفا وەڵامی دایەوە و وتی: «ئەوەی کە نەخۆشە، خۆمان نەخۆشخانەی شۆڕشمان لە بەرگەڵوو و سووورداشدا هەیە. گەر هەر زۆر

---

١. حەمەعەلیی بەرخانەقا: فەرماندەی کەرتی دووی ئەوسای تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون بوو، لە ڕاپەڕینی ئازادکردنی کوردستان ساڵی ١٩٩١، لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی بەرگریکردنی شاری کەرکوکی بابەگوڕگوڕ و زۆرترین هێزی سەربازی و کۆپتەری جەنگی ئاسمانیی ڕژێمی بەعسی عێراقی، لەگەڵ پۆلێک تێکۆشەری دێریندا لە چیمەن نزیکی کەرکووک شەهید بوون.

نەخۆشییەکەی سەخت بوو، ئەوا لە ڕێگەی لیژنەی تەنسیقەوە دەینێرینەوە بۆ شار و چارەسەر بکرێت.» مام ڕۆستەمیش بە زەردەخەنە و گاڵتەوە، وەک پیشەی هەمیشەیی کە گاڵتە و قسەی خۆشی دەکرد، وەڵامی دایەوە و وتی: «ئەوەی کە ژنیشی هێناوە، ژنەکەی بێنێت بۆ ناوچەی ئازادکراوی ژێر سنووری هێزی پێشمەرگە، خێمەیەک بۆ خۆی هەڵبدات، تاوەکوو بزانین گفتوگۆی نێوان ئێمە و حکومەت ئامانجی چی دەبێت.» نەوشیروان مستەفاش ئاوڕێکی لەلای شانی ڕاستی دایەوە و وتی: «بەسە ڕۆستەم!» ئەویش پێکەنین گرتی. ئەوەی مەبەستی نەوشیروان بوو، تەواو ڕاست و دروست بوو، چونکە وەک لە سەرەوە ئاماژەم پێ داوە، ڕژێمی بەعس لایەنگرانی خۆی دەناردە نێو هێزی پێشمەرگە و چەکیان لە شان دەکرد و دواتر دەچوونەوە نێو شار خەریکی ئاژاوەگێڕی و ڕاووڕووت و دەستدرێژیکردنە سەر خەڵکی بە ناوی پێشمەرگەوە و شۆڕشەکەیان لەبەر چاوی خەڵکی ناشرین دەکرد. بەڵام یەکێک لەوانە جەباری عەلی عەوێز کە فەرماندەی کەرتیش بوو، گوێی بە بڕیاری شۆڕش نەدەدا و لەگەڵ مەحموودی محەمەد جان ناسراو بە «خولەی حەمە جان»، ئێوارەیەک لە گەڕەکی تووی مەلیک لەگەڵ کۆمەڵێک چەکدارانی دەوڵەتدا ڕووبەڕووی یەک دەبنەوە و ئەمان تەنها دوو پێشمەرگە دەبن و چەکدارانی دەوڵەتیش بە هێزێکی زۆرەوە ئابڵۆقەیان دەدەن، خولەی حەمەجان لەوێدا شەهید دەبێت و جەباری عەلی عەوێزیش دەستگیر دەکرێت. لە ڕاستیدا جەباری عەلی عەوێز دەستگیر نەدەکرا، بەڵام سەرپێچیکردنیان لە بڕیاری شۆڕش و هاتنەوەیان بۆ شار و شەهیدکردنی خولەی حەمە جانی هاوڕێی دێرینی، بووە هۆکاری ئەوەی چیتر جەبار درێژە بە بەرگریکردن و شەڕ نەدات و لەوێدا دەستگیر دەکرێ.

نازانم چۆن بتوانم باسی هەڵوێست و خۆڕاگریی ئەو تێکۆشەرە قارەمانانە بکەم کە لە زینداندا بوون[1]، چۆن لە کاتی ئازار و ئەشکەنجەدانیاندا

١. یادەوەریی عەبدولڕەزاق، لڤین، پاشکۆی ژمارە ١٨٦، کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٢.

لەلایەن داروودەستە و تاقمە داپلۆسێنەرەکەی ڕژێمی لەناوچووی عێراق بە شێوازێکی نامرۆیی ئازار دەدران. ئەوانەی لەنێو زینداندا بوون، هەندێکیان چەند پێشمەرگەیەکی شاخ بوون و لە سەروەختی مفاوەزات و لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٤دا هەریەک بە هۆیەک کەوتبوونە نێو زیندانی دائیرەی ئەمنی سلێمانییەوە، لە ناویاندا: ئازاد چاوشین، شۆڕش جوانڕۆیی، کرێکار؛ لە ناسراوەکان بوون، هەریەکەیان بە ئومێدێک چاوەڕوانی ئازادکردن بوون، سەرکەوتنی گفتوگۆ و لێبووردنی گشتی، یان گۆڕینەوەی دیل بە دیل. زۆرێک ئازاد کران و شەش پێشمەرگەیان گۆڕییەوە، واتە ئەوانەی سەر بە ڕژێمی بەعس بوون و لەلایەن یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە بەدیل گیرا بوون و ڕێککەوتن دەکرا هەریەک لە دیلەکانی پێشمەرگەی زیندانی ئەمن و ئەو دیلانەی سەر بە ڕژێم بوون و لای شۆڕش بوون، ئازادیان بکەن و بیانگۆڕنەوە. شەش پێشمەرگەیان گۆڕییەوە کە حەوتەمیان جەباری عەلی عەوێز بوو، دەبووایە بگۆڕدرایەتەوە لەگەڵ دیلەکانی ڕژێمدا، لەنێو زینداندا مایەوە و ئازاد نەکرا. من ماوەیەکی کەم بوو بەر ئەو ئازادکردنە کەوتبووم، دوای ئەوەش زۆر چیرۆک و بیرەوەریی زیندانەکانم خوێندووەتەوە، تا ئێستەش بڕوام وایە عەبدولڕەحمان مونیف بە شاکاری خۆرهەڵاتی دەریای ناوەڕاستیشەوە (ڕۆمانی خۆرهەڵاتی دەریای ناوەڕاست)، عەبدولڕەحمان مونیف لە ساڵی ١٩٧٥دا نووسیویەتی، کە ڕەجەب ئیسماعیل پاڵەوانی ڕۆمانەکەیەتی، زیندانیکی سیاسییە، بە حەوت زینداندا تێپەڕ دەبێت، لە ڕۆمانەکەدا باس لە ئازار و ئەشکەنجەدانی دەکات کە چۆن قورسایی بە گونییەوە هەڵدەواسن و سەری دەخەنە نێو کیسێکەوە کە پڕیەتی لە پشیلە و بە دار لە پشیلەکان دەدەن و پشیلەکانیش لە ترساندا پەلاماری دەموچاوی دەدەن و ئازاری دەدەن، دوای ساڵانێکی زۆری پڕ ئازار و ئەشکەنجەدان، ڕەجەب ئیسماعیل بەڵێن و بڕیاری ئەوە دەدات بچێتە دەرەوە و هیچ کارێکی سیاسی نەکات و لە زیندان ئازاد دەکرێت، هاوڕێکانی ئەمە بە خیانەت تێدەگەن، بەڵام ئەو دەیەوێت بچێتە دەرەوە و زام و برینەکانی سارێژ بکات

و چارەسەری خۆی بکات، ئەو دەیەوێت چیرۆکی خۆی لەنێو ئەو زیندانەدا بنووسێت کە چۆن ژیانی سەختی تێدا بەسەر بردووە و دواتر دەڕواتە دەرەوە و (لە مارسیلیا) نەیانتوانیوە بەتەواوی گوزارشت لە زیندان و دۆخی زیندانییەکانیان بکات! ڕاستی ئازار و ئەشکەنجە و ئەندێشەی زیندانییەکانی بەعسی عێراقی تا ئێستاش وەک پێویست نەنووسراوەتەوە، جوامێری و ئازایەتیی ئەو کەڵەپیاوانەی شوێن بزر بوون، دەلاقەی دەرگا ئاسنینەکانی ناو ژووورە تاکەکەسییەکانی ئەمنی سلێمانی هەر بە وایەری لەحیم بە شێوەیەک بڕابوویەوە، هێندەی هێلکەی نەعامەیەک بڕابوونەوە، لە ناوەوە بۆ دەرەوە دەردەکەوت، ژوورەکەی ئەو بە لاتەنیشتی چەند ژوورێکی ترەوە بوو، لەو دەلاقەیەوە بەئاستەم ڕووخساریمان دەبینی. من جەباری عەلی عەوێزم وەک فەرماندەی کەرتی ٣٣ی سلێمانی دەناسی، ژوورەکەی جەباری عەلی عەوێز بچووکتر و ناخۆشتر و تەنهاش بوو، ئێمە دووان و سیان پێکەوە بووین. پرسیارم ئاڕاستەی جەبار کرد و وتم: «هۆکاری چییە هەمیشە تۆ بەپێوە لەنێو ئەو ژوورە بچووکەدا وەستاویت؟» لە وەڵامدا وتی: «چی بکەم، دوو بست ئاو لە ژوورەکەمدایە، نایلۆنم لە بەتانییەکانم پێچاوە و هێشتا ناتوانم دانیشم.» هەندێک جار سەتڵمان دەهێنا و لە دەلاقەی بەتاڵکردنەوەی سەتڵی میز و پیسایییەکانەوە، بەدزییەوە بەتانییە شڕ و ئەسپێیاوییەکانی نێو ژوورەکانی خۆمان دەدایە. «ئەبو نەهلە» کە سەردەستەی پاسەوان و سەجانەکانی زیندان بوو، شارەزا و دڵسۆزی بێئەندازەی ڕژێم بوو، بە کردنەوەی دەرگا ئاسنینەکانی ژوورەکانی زیندان، هەموو سات و چرکەیەکی ژیانمان ئازارێکی نوێ بە جەستە و ڕۆحماندا دەهاتەوە، شکاندنی کەسایەتیی ئەم زاڵمە، هێزێکی مەعنەویی زۆر بوو ئاهێکی بەبەردا دەکردینەوە. بۆیە کەم کەس دەیتوانی بەرپەرچی ڕەفتاری ناشرینی ئەم زاڵمە بداتەوە، جەباری عەلی عەوێز بە وتەکانی ڕۆژانەی، هێزی بە ئێمە دەبەخشییەوە. وەک فەرماندەیەکی بوێری نێو شۆڕش و کوردایەتی لەنێو زینداندا ڕەفتاری دەکرد، بە دەنگێکی گڕ و بەرز تکای

له زیندانییانی نێو زیندانەکە دەکرد، بەوەی هیچ کەسێک لەژێر ئازار و ئەشکەنجەی دەستە و تاقمەکەی ئەم ڕژێمە، بەڵگە و هیچ وتەیەکی ڕاست لەسەر خۆی و هاوڕێکانی نەدرکێنێت. لەدوای هەڵوێستی مەزنی خۆی بۆ هاوڕێکانی، جەستەی زامداری پیشانی هاوڕێکانی نێو زیندان دەدا و هانی دەدان و پێی ڕادەگەیاندن ئازار و لێدانی جەستە؛ ڕاهاتنە، دەبێت هەمووان خۆمانی لەسەر ڕابهێنین. زۆر جار جەباری عەلی عەوێزیان دەبرد بۆ لێپرسینەوە و لێکۆڵینەوە لە نهۆمی دووی دائیرەی ئەمنی سلێمانی، هێندە ئەشکەنجەیان دەدا، بەبێهۆشی و بە جەستەی خوێناوی لەنێو پەتوویەکدا دەیانهێنایە خوارەوە و لە ژووری زیندانەکەدا فڕێیان دەدا. دواتر بە پێکەنینە بەرزەکەی جەبار و ئاوازچڕینی جەبار، هەستیان پێ دەکرد کە جەبار بە جەستەی خوێناوی بەهۆش هاتووەتەوە و هەر کاتێک جەللادێک یان پاسەوانێکی زیندانەکە دەرگای ئاسنینی ژوورەکەیان بکردایەتەوە، جەباری عەلی عەوێز بە ڕوویاندا هەڵدەشاخی و پڕجنێوی دەکردن. سەرانسەری قاوشەکە دەنگی دەدایەوە، پێی ڕادەگەیاندن: «ئێوە ئیعترافی چی بە من دەکەن؟ خۆتان کوژراوەکانی خۆتان باش دەناسن کێیە، کێتان لە چالاکییەکانی ناو شاردا لێ کوژراوە، ئەوانە هەمووی من کوشتوومن! ئێوە لە سەروەختی مفاوەزات و گفتوگۆدا منتان دەستگیر کردووە، دەنا ئێوە ئەو پیاوانە نین من لە شەڕدا بگرن!» جەباری عەلی عەوێز ئەمانەی لە کاتێکدا دەوت کە هیچ کام لەو زیندانییانە لە ترسی لێدان و ئیهانەکردن، نەماندەتوانی بچووکترین بەگژداچوونەوە بنوێنین. جەبار قەڵایەک لە وردەی بە هەمووان بەخشیبوو، دواتریش لە قاوشەکان یەکمان دەگرتەوە، زیاتر لە سەد کەس لەو زیندانەدا بووین قسەی بۆ دەکردین، کۆڕی دانیشتنی گەرم دەکرد. جەبار دەیوت: «ڕازی نیم کەس ئیعتراف بکات، من ئەوە شەش مانگە لێرەم، هەر کەس یەکێکی تر بەدوای خۆیدا بهێنێت، سووک و ڕسوای دەکەم. ئێمە تازە گیراوین، با کەسی تر تووش نەکەین، دڵنیا بن ئەوەی کە ئیعتراف نەکات؛ بەر دەبێت، ئەوەی ئیعترافیشی کرد؛ ئیمزا لەسێدارەدانی خۆی کردووە.»

جەباری عەلی عەوێز وەک ڕابەری زیندان خۆی دەنواند و ئێمەش هەموو وەک سەرکردەی زیندان لێمان دەڕوانی، ئاسۆی ئومێد و هیوایەکی نیشان دەداین کە لە ڕاستیدا نووزەی ژیان لەوێدا هەست پێ نەدەکرا.

جەبار و ئازاد چاوشین؛ دوو پیاوی ئازا و دوو سەرکردەی زیندان بوون، بەش بە حاڵی خۆم زۆر دڵم پێیان دەکرایەوە و شانازیم دەکرد کە هاوڕێی ئەوانم و کۆمەڵە پێشمەرگەی وەک ئەوانی پەروەردە کردووە، هەردووکیان گرفتاری گەورەیان؛ ژن و منداڵەکانیان بوو. لە کاتی چوونەدەرەوە و «تەحقیق»دا ژنەکانیان بۆ دەهێنان و لەبەر چاوی خۆیاندا هەڕەشە و سووکایەتی و ئیهانە و داوای پاکانە و تەسلیمبوونیان لێ دەکردن، لە گەڕانەوەیاندا ئەوان ناخی خۆیان هەڵدەڕشت، هەر چییەک ڕووی دەدا بۆ منیان دەگێڕایەوە. هێشتا دانوستان هەر لەئارادا بوو، چەندین پێشمەرگەی زیندانی لەگەڵ ئەفسەر و سەربازی ڕژێم کە لە سنووری ئازادکراوی هێزی پێشمەرگەدا دەستبەسەر بوون، ئاڵوگۆڕیان پێ کرا و ئازاد کران. لەبەر ئەوەی جەباری عەلی عەوێز، ئەو پیاوە شاخنشینە هێشتا هەر لە زینداندا بوو، نە ئەوە بوو ئازاد بکرێت و لە شاردا لەژێر دەسەڵاتی بەعسدا چاودێری بکرێت نەبا جارێکی تر بگەڕێتەوە ناو هێزی پێشمەرگە، نە ئەوە بوو لەگەڵ ئەفسەرە عێراقییە دیلەکانی ژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگە بگۆڕدرێنەوە و ئازاد بکرێت. ڕۆژبەڕۆژ خەڵکی کوردستان لە چاوەڕوانیی ئەنجامی گفتوگۆی نێوان یەکێتیی نیشتمانی و میریدا بوون، خەڵکی زۆر نائومێد و ڕەشبین بوون بەرامبەر بە دەوڵەت کە دان بە مافەکانی گەلی کورددا بنێت. ڕژێمی بەعس تاوانی بەرامبەر بەو پێشمەرگانە دەکرد کە بە ڕێگەی فەرمیی لیژنەی تەنسیقەوە لەلایەن شۆڕشەوە دەنێردرانە نەخۆشخانەکانی شار بۆ چارەسەرکردن، لەلایەن هێزە سەرکوتکەرەکانیانەوە پێشمەرگەی نێو نەخۆشخانەکانیان دەستبەسەر دەکرد و ڕەوانەی زیندانە نهێنییەکانی خۆیان دەکرد. بە هۆی دانوستانەوە هەندێک لە ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناو شاریان ئاشکرا کردبوو، هەڵیاندەکوتایە سەر ماڵەکانیان و دەستگیریان دەکردن،

ڕۆژانە هەواڵی شەهیدبوونی پێشمەرگە دەبیسترا و هەر لە سەروبەندی دانوستاندا بوو سەرکردە و فەرماندەی یەکێتییان شەهید دەکرد. کاتێکیش گفتوگۆی نێوان میری و یەکێتی تێک چوو کە مامە ڕیشەی فەرماندەی کەرتی چواری جەباری شەهید بوو، ئیتر یەکێتی نەیتوانی زیاتر ئارامی و بێدەنگی هەڵبژێرێت و بڕیاری ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ تەواوی هێزی سەربازیی عێراقی دا. جەباری عەلی عەوێز، ئەو پیاوە شاخنیشینە هێشتا هەر لە شاردا بوو، بۆ چەند ڕۆژێک ئازادیان کرد کە لەژێر چاودێریی خۆیاندا بوو، دواتر گەڕاندیانەوە زیندان و ئازاری دەروونییان دەدا، بۆ ئەوەی سوودی لێ ببینن و بەڵێنی هاوکاریکردنیان لە دژی هێزی پێشمەرگە بدات.

ڕژێمی بەعس بۆ بێڕێزیکردن بە جەباری عەلی عەوێز، ئەو جەبارەی لەنێو زینداندا منەتی نەبوو بە ئازار و ئەشکەنجەی پتر لە ساڵێک و تینوویێتی و برسێتی و دوور لە خێزان و منداڵەکانی، بە ئۆتۆمبیلی تایبەتیی سەربازیی خۆیان دەیانگێڕا بە شەقامەکانی شاری سلێمانیدا و لە تەنیشتیەوە چەند چەکدارێک لەنێو ئۆتۆمبێلەکەدا لوولەی تفەنگەکانیان بە ڕووی خەڵکیدا دەردەهێنا، بۆ ئەوەی لە متمانەی جەباری عەلی عەوێز کەم بکرێتەوە و وایان پیشانی جەماوەر دەدا گوایە لەگەڵ خۆیاندایە، لە لایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشار ڕاپۆرتی دەستتێکەڵکردنی جەباری عەلی عەوێز لەگەڵ بەعسدا ڕووبەڕووی سەرکردایەتیی یەکێتی بکەنەوە. دەمەوێت لە نووسینەوەی ئەم یادەوەرییەدا کە بەرپرسیارم لە تەواوی وشەکانی، ئەنگوست بخەمە سەر گێڕانەوەی سەرگوزەشتە و ئەو چیرۆکە پڕ تراژیدیا و کارەساتە جەرگبڕە، کە بەسەر مرۆڤێکی پاکی بەئەمەک و دڵسۆزی وەک جەباردا هاتووە. شایەتحاڵێک کە لە سەردەمی خەبات و شۆڕشدا هاوڕێ و هاوسەنگەری جەباری عەلی عەوێز بوو کاتێک لەنێو حسکدا بوون (حیزبی سۆسیالیستی کوردستان) بە ناوی «شامیل»، کە دواتر پشتی کردە شۆڕش و گەڕایەوە شار، دەڵێت:

من بە هۆی ناسینی کەسێک کە ئەفسەری هەواڵگریی سەر بە ڕژێم بوو،

داوایان لێ کردم بە جەباری عەلی عەوێز ڕابگەیەنم کە هاوکارمان بێت و لەگەڵماندا بێت، ئەوەی کە دەیەوێت لە سامان و خۆشگوزەرانی؛ بۆی جێبەجێ دەکەین و پارێزگارییشی لێ دەکەین. داواکاریی ئەو کەسەی سەر بە ڕژێمم بە جەباری عەلی عەوێز ڕاگەیاند، بەڵام جەبار لە وەڵامدا وتی: «من گەر ئەوەم بکردایە، نەمدەهێشت ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجەیەم لە زیندانەکەیاندا بدرایە، ئەمە جگە لەوەی زۆرترین ئازاری دەروونییان دام، بێڕێزییان بە خۆم و خێزان و هاوڕێیان و هاوسەنگەرانم کرد. ئەوانە خەون بەوە دەبینن من لەگەڵیاندا بم و هاوڕێ و هاوسەنگەرانم بۆ ئەوان دەستنیشان بکەم؟» جەباری عەلی عەوێز زیاتر پێی لە مەرگی خۆی دەنا و هەموو بنەماڵەکەی دایە دەست قەدەر و جارێکی تر وەک هەڵۆیەک بەرەو بەرزایی چیاکان هەڵفڕی و بەتیژی لەسەر بەرزاییەوە خۆی کردەوە نێو هێزی پێشمەرگە و هاوشانی براکانی بۆ تۆمارکردنی مێژوویەکی لەوە گرنگتر، ئەویش چارەنووسی گەلەکەی بوو، مەرگی پێش خۆی خست و چەکی شەرەفی پێشمەرگایەتیی کردەوە شان، لە زۆرترین داستانی قارەمانانەی ڕووبەڕووبوونەوەکانی دوژمنی گەلەکەیدا وەک فەرماندەیەکی دلێر و لێهاتوو، نەبەردانە و سەرکەوتووانە دەجەنگی. دەمەوێت لێرەدا نامەی یەکێک لە تێکۆشەرانی ڕۆژگارە سەختەکان بخەمە ڕوو کە چۆن جەباری عەلی عەوێز پاڵەوانی ئەو ڕۆژگارە سەختە بوو، تێکۆشەری دێرین دیاری چالاک دەڵێت کاتێک جەباری عەلی عەوێز لە زیندان ئازاد دەکرێت و دەچێتەوە شاخ، من لە تیپی ٤٣ی ئاسۆس بووم لای کاک نەبەز، واتە «خولەی جگەر» کە هاوڕێی جەباری عەلی عەوێز بووە، هاتە لای نەبەز، واتە دوای ئازادبوونی لە زیندان و لەژێر چاودێریکردنی ڕژێم و جارێکی تر هەڵهاتنی بۆ شاخ، لە گوندی مەرگە لە خانوویەکی بچووکی نزیک بارەگای تیپ لەگەڵ خێزانەکەی و دایکی نیشتەجێ بوو. بۆ هەر چالاکییەک بیاننارديناية، شەهید جەبار ڕەوانی شاد بێت لەگەڵماندا دەهات، لەوانە: شەڕەکانی داستانی ڕزگاری و شەڕی بەردەسپیان لە سنووری سەفرە و

زەروون. جەباری عەلی عەویز هاورێیەتیی لەگەڵ مام هێرشدا زۆر بەتین بوو، مام هێرش فەرماندەی کەرت بوو، پاش ئەوەی لەلایەن مەڵبەندی دوو نەخشەی گرتنی چەرمەگای داڕشتبوو، جەباری عەلی عەویزیش لەگەڵ مام هێرشدا بۆ گرتنی چەرمەگا لەگەڵ هێزەکەدا بەڕێ کەوتن، بەڵام لە ڕێگادا کەوتبوونە بۆسەیەکەوە و دووچاری شەڕێکی سەختی دەستەویەخە بووبوون و لەوێدا هاوڕێی خۆشەویستی جەباری عەلی عەویز؛ فەرماندەی قارەمان و دڵسۆز غەریبە ڕەش شەهید دەبێت. گێڕانەوەی ئەم یادەوەرییە و بەشداریکردنی جەباری عەلی عەویز لەگەڵ هاوڕێی و هاوسەنگەرانی ئەو ڕۆژگارە دژوارەی شاخ و بەجێهێشتنی خێزان و منداڵەکەی لە گوندی مەرگە، دەلالەت لە دڵسۆزی و نیشتمانپەروەری و خۆشەویستیی بۆ هاوڕێکانی دەکات. پاش شەهیدبوونی غەریبە ڕەش و درێژەپێدانی خەباتی بێوچانی، جەبار دەگەڕێتەوە گوندی دۆڵان لە بەری قەرەداغ بۆ بەڕێوەبردنی پرسەی شەهید غەریبەڕەش. دوابەدوای ڕوودانی ژەهراویکردنی کۆمەڵێک پێشمەرگە و سەرکردە لە گوندی سێروانە، جەبار لە گەڕانەوەیدا بۆ مەرگە لە ڕێگادا دەستگیر دەکرێت و لەو ڕووداو و کارەساتە جەرگبڕەدا تێوە دەگلێت. پێش ئەوەی ئاماژەی تەواو بە جۆری دەستگیرکردنی جەبار بدەم و لەو کارەساتە بدوێم، دەمەوێت هەندێک زانیاری لەسەر ژەهراویکردنی پێشمەرگە بدەم. ژەهری «سالیۆم[1]»، بە واتای «مەرگەموش» کە بۆ کوشتنی جرجی گەورە بەکار دێت، بەڵام ڕژێمی عێراقی بە هاوکاریی زۆر کارشناسی بێگانە وایان لێ کردبوو کە وەکوو ئاو یان پاودەرێکی زۆر سادەی لێ بکەن و بەئاسانی بەکار بێت لەناو خواردن یان خواردنەوەدا، بۆ لەناوبردنی ئەو نیشتمانپەروەرانەی کە دژی ڕژێمی بەغداد خەبات دەکەن و دەجەنگێن. لەبەر ئەوەی هەندێک کەس لە دەرەوە چارەسەر کران لە

---

١. کوشتن لە عێراق بە گازی سالیۆم و تراژیدیاکەی سێروانی ناوچەی مەرگە لە کوردستان، دکتۆر سالار باسیرە، پەرتووکخانەی دڵزار، ٢٠٠٠، ل١٩.

«ژەهراویکردن بە سالیۆم» و هەندێکیش لە دەرەوە وەفاتیان کردبوو، تا ڕادەیەک ئەم ژەهرە ناسرا بە ناوی «ژەهری عێراقی»، بەڵام لە ڕاستیدا زانیارییەکی وایان نەبوو لە دەرەوەی نەخۆشخانەکان لەسەر چۆنیەتیی کاریگەریی ئەم ژەهرە لەسەر مرۆڤ و ڕادەی کوشتنی، چونکە زیاتر زانیارییەکە لە کارکردنی لەسەر جرج و گیانلەبەری تر هەبوو، کەم کەس بڕوای دەکرد کە دەوڵەتێک هەبێت ئەم ژەهرە لە دژی هاوڵاتیی خۆی بەکار بهێنێت. کاریگەریی ئەم ژەهرە لە مرۆڤدا لە هەڵوەرینی مووی جەستە و دابەزینی کێشی بەبێ ئەندازە و هەڵئاوسانی پێستی سەر و ڕووخسار و چاو کزبوون و پەیدابوونی نەخۆشیی «پارکنسۆن»، کە بریتییە لە جۆرێک تێکەی عەسەبی کە لە ئەنجامی لەدەستدانی کۆنترۆڵی مێشکەوە بەسەر ئەندامەکانی جەستەدا یاخود بەشێک لە بەشەکانی جەستەوە دێت، بۆیە جووڵەی ئەو بەشەی جەستە نائیرادی نائاسایی دەبێت. دەوڵەت بۆ دەستوەشاندن لە هێزی پێشمەرگە و شەهیدکردنیان، جۆرەها پلانی دادەڕشت. یەکێک لەو کارەساتە جەرگبڕانەی کە لە ڕێگەی ژەهراویکردنەوە ڕووی دا، هێزی پێشمەرگە و خەڵکی کوردستان ناڕەحەت بوون و دەوڵەت سوودێکی بێئەندازەی لەو کارەساتە بینی کە بەسەر کۆمەڵێک سەرکردە و خەڵکی سڤیلدا هات و قوربانیی گەورەی لێ کەوتەوە کە ژەهرخواردکردنی سەرکردەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان؛ مستەفا چاوڕەش و چەند سەرکردە و پێشمەرگەیەک بوو.

هەر بۆیە مستەفا چاوڕەش بەدووروودرێژی ئاماژەی بە چۆنیەتیی ژەهرخواردکردن و شەهیدبوونی ئەو کەسانە دەکات کە لەگەڵیاندا بوون، لە نێوانیاندا دایکی مستەفا چاوڕەش کە لە تەمەنی ٦٤ ساڵیدا شەهید

دەبێت. ئەو دەڵێت[1]: چیرۆکی ژەهرخواردکردنمان لە گوندی سێروانە، سێ مانگ دوای گرتنی خێزانم. لە ساڵی ١٩٨٧ لە مانگی نۆدا کامەرانی برای و حەسەنی ئامۆزای لە شاخی قوڵەپوشێنە لای شەدەڵە شەهید بوون. لەو کاتەشدا بارەگای تیپی ٤٣ی ئاسۆس لە مەرگە بوو. جەباری عەلی عەوێز لە کاتی دانوستانی یەکێتی و حکومەتدا گیرابوو، لەو ماوەیەدا بە لێبوردن بەر بوو، پێش ئەوەی خۆی بێت، ژن و منداڵەکەی هاتبوون و لە مەرگە بوون، ڕەفیقەکانی جەباریش هەر لە مەرگە بوون، بارەگای منیش لە سێروان بوو، بە سەیارە نیوسەعات لە مەرگە دوور بوو. جەباریش کە لە زیندان بەر بوو، هات و ماڵی دانا لای تیپی ٤٣ی ئاسۆس، ئەو کاتە هەڤاڵ نەبەز (خولەی جگەر) سەرتیپی ٤٣ی ئاسۆس بوو. پاش ماوەیەک لە دێیەکە گلەیی و گازندەیان کرد و قسەی لەسەر دروست بوو کە شەوانە مەشرووبات دەخواتەوە، من و کاک ملازم عومەر بانگمان کرد و وتمان تۆ دوای ئەم هەموو ماندووبوونە؛ بۆچی خۆت ناشرین دەکەیت؟ ئەگەر وا بکەیت، خەڵکەکە داوای دەرکردنت دەکەن. خوا هەڵناگرێ وتی: هەڵە بووم، ئیتر شتی وا ناکەم و ڕوو ناداتەوە. کاتێک جەبار گیراوە، نەرمینی خێزانی هاتوچۆی بەغدا و دائیرەی ئەمنی کردووە و پەیوەندیی دروست کردووە، قسەشیان لەسەر جەبار دەکرد کە بە هۆی ژنەکەیەوە بەر بووبێ. بۆ مێژوو دەڵێم: جەبار لەگەڵ حکومەت هیچی نەبوو، ژنی خراپ نەبێ. ئێمە ئاگاداری ئەم وردەکارییە نین، ئەو کاتە ژن و منداڵی منیش لە زینداندا بوون، بەڵام دایکم و تریفەی خوشکەزام لام بوون لە ماڵەکەی خۆم. من گومانم دەکرد ڕێژەیەکی کەم ژەهریان پێ دابم، چونکە زۆر هیلاک بووم، سنگم دەیەشا، وەک ئەوە بوو تێزابی پێدا بکەیت، بە شەرتێ من جگەرەشم نەکێشاوە.

---

١. یادەوەرییەکان، مستەفا چاوڕەش، چاپی یەکەم، سلێمانی چاپخانەی سەردەم، ٢٠١٤، ل٢٦٤.

له ڕۆیشتنندا له پێشمەرگایەتیدا کەس لەگەڵ من دەرنەچووە، هەمیشەش له خەیاڵی منداڵەکانمم که زیندانین، شەوێکیان هەر خەوم لێنەدەکەوت، سەعات ١٢ بوو، هەستام و وەسیەتم نووسی بۆ ملازم عومەر، کامێرایەکی ڕەسمگرتن و کامێرایەکی ڤیدیۆم هەبوو، لەگەڵ دوو هەزار دینار، هەموویم بەیەکەوە گرێ دا و بە تیپ بەستم، لێم نووسی کاک عومەر ئەگەر شتێکم لێ هات، ئەمەی هەمە لە ژیانمدا! بیدە بە منداڵەکانم. سەعات ١٢ بیرم کردەوە ئەو ژنە (نەرمین) جارێکیان هات و وتی: دەتوانم ژنەکەت ببینم، بەڵام بۆ بەربوون ناتوانم. کە بیرم دەکردەوە، ئەم قسەیە سەرنجی ڕاکێشام، خەیاڵم بۆ ئەوە چوو هەر ئەو ژنە ژەهری کردبێتە خواردنەوە! هەر چی خواردبووی، وای لێ هاتبوو، بۆ نموونە: عومەر بۆتانی، جەلال مینەبەگ، عومەر جەیران عوسمان، قادر منەوەر. من خۆم جارێک بە سەیارە هاتبوومە خوارەوە، لە مقەڕ کاک نەبەز واتە خولەی جگەر کفتەیان هەبوو، منیش مامەوە، دیار بوو ئەوەشی کردبوو، ڕێژەکەی کەم بووە، لە کولاندا کاریگەرییەکەی کەم دەبێتەوە. وتم: عەیبە بەم شەوە هەڵیبستێنم لە خەو. بەیانی سەعات هەشت چووم بۆ لای کاک عومەر، هێشتا لە خەو هەڵنەستابوو، تۆزێک هاتوچۆم کرد، دوایی هەڵمساند، وتم: کاک عومەر، ئەم سنگئێشەیە و هیلاکییەی من نەخۆشی نییە، وتی: چییە؟ وتم: شکم لەو ئافرەتەیە، چونکێ قسەیەکی وای کردووە کە دەتوانێ سەردانی منداڵەکانم بکات. ئیتر لەگەڵ کاک عومەر ڕێک کەوتین ئەگەر ئەم جارە بێتەوە، جانتاکەی بپشکنین.

## چوونی ملازم عومەر بۆ یاخسەمەر

نێوان مەرگە و یاخسەمەر لای مام جەلال، بەپیادە پێنج بۆ شەش سەعات دەبێت. ئەو کاتە من سەیارەیەکی تویۆتام هەبوو، بۆ ڕێزگرتن لە کاک عومەر کە هەموو تەمەنمان پێکەوەین و وەک برا بووین، وام بەلاوە جوانتر بوو بە سەیارەکە بڕۆین، وتم خۆ سەیارەکەم هەر خەڵکی سوودیان لێ دەبینن... من لێرەدا لە مەبەستی ئەم نووسینە نەگەیشتووم کە مستەفا چاوڕەش لە یادەوەرییەکەیدا لە لاپەڕەی ٢٦٦دا دەڵێت: وتم خۆ سەیارەکەم هەر خەڵکی سوودیان لێ دەبینن! بەهەرحاڵ، دەمەوێت شێوازی نووسین و دەربڕینی وشەکان، سەرنجی تەواوی خۆمیان لەسەر بدەم، چونکە یادەوەرییەکانی خەباتی پێشمەرگایەتی، مێژوویەکی گرنگن و بەتایبەت کەسانی بەرپرس و سەرکردەکان، نەوەی نوێ کتێب و نووسینەکانیان بە سەرچاوە دەهێننەوە، بەتایبەتی کاتێک نووسینێک دەخرێتە سەر لاپەڕە و دەکرێت بە کتێب، دەبێت خاڵبەندی و هەڵەگریی لەلایەن کەسانێکەوە بۆ بکرێت کە پسپۆڕ و شارەزا بن لە بواری ڕێزمان و زمانەوانیدا. مستەفا چاوڕەش دەڵێت: خۆمان حازر کرد، وا بزانم ڕێکەوتی ١٩٨٧/١١/٢١ بوو. ڕۆشتین، کە گەیشتینە بەرگەڵوو، ملازم عومەر سەر کەوت بۆ بارەگای کاک نەوشیروان، منیش وتم دەچم پشکنینی خوێن دەکەم و ئەشیعەیەک دەگرم، چونکێ تەندروستیم باش نەبوو. ئەو ڕۆشت و من چوومە خەستەخانەکە، دکتۆر بەرزان ئەکرەمی عزەت نەجیب شاهیدە و دکتۆر شوان لەوێ بوو، پشکنینیان بۆ کردم، وتیان سەرمات بووە، شرووبێکیان بۆ نووسیم. لەبەر چاوی ئەوان سەرەکەیم کردەوە، تۆزێکم لێ خواردەوە و هەڵمدایە چەمەکەوە، وتم هەر ژەهریان داومەتێ. پاش ئەوە چوومە بارەگای کاک نەوشیروان، وتی بۆچی هاتوون؟ ئێمە برووسکەمان کردووە بۆ تیپەکانی گەرمیان بێن بۆ لای ئێوە، پەلاماری شاخی ئاسۆس و زینوی سپی دەدەین و دەیگرین. لەبەر گرنگیی بڕیارەکە، بۆ ڕۆژی دوایی یان هەر ئەو ڕۆژە گەڕاینەوە. چۆن چووین، وا هاتینەوە.

هێزەکان دێن بۆ ئەوەی ڕێکیان بخەین بۆ گرتنی شاخی ئاسۆس و زینوی سپی، بڕیارەکەش بە ئێمە وتراوە کە چی بکەین. ڕۆژی ۱۹۸۷/۱۱/۲۲ هێزەکان گەیشتن، خۆمان ئامادە کرد، لەگەڵ کاک عومەر چووینە کانی توو، دوا قۆناغە کە ئۆتۆمبێل بۆی دەچێ، وردە وردە لە کورکورەوە هێزەکانمان بەرەو شوێنی دیاریکراو سەرخست. من لەبنی دارێکدا دانیشتبووم، هیلاکیم پێوە دیار بوو، هێزی جارانم نەمابوو، گومانەکەم هەر بەردەوام بوو، لە دڵی خۆمدا وتم کاک عومەر وا تێنەگات دەترسم یان شتێکی تر. هاتە سەر ئەوەی ئێمەش سەر کەوین بۆ سەر شاخ، خۆم ئامادە بووم، کیسەخەو و پێداویستیی ترم پێ بوو، کاک عومەر هات و وتی کاک مستەفا تۆ نەخۆشیت، مەیە. وتم وەڵڵا کاک عومەر کە بڕیارم دابوو بێم، زیاتر لەبەر خاتری تۆ بوو. چونکێ لە داستانی ڕزگاریی یەکەمدا من لێپرسراوی بووم، جێگەکان شارەزا بووم، مادام وایە، من نایەم و دەڕۆمەوە بۆ بارەگای خۆمان، ئێرانی وتەنی بەرپرسیاری تدارکات دەبم، خواردن و فیشەک و پێویستییان بۆ جێبەجێ بکەم. خوا حافیزیمان کرد و گەڕامەوە بۆ سێروان بۆ بارەگای خۆمان. ڕۆژی پێشتر وەستا مەجید گۆشتی مریشکی بۆ هێنابووین، هەر چوار ڕانە مریشک لە نایلۆندا بوو، دایکم بەتەمەن بوو، ژن لە زینداندا بوو، ئیسماعیلم بانگ کرد کە پێشمەرگە بوو لام، شۆفێریش بوو، وتم بچۆ بۆ ماڵی مامۆستا مەلا موحەڕەم کە ئیمام جومعەی مەرگە بوو، با سەریعەی کچی بنێریت یارمەتیی دایکم بدات، مامۆستا مەلا موحەڕەم خزممان بوو. وتم مادام خۆم نەچووم بۆ شاخ، با ئەو خواردنەی لە ماڵەوە هەیە، ئامادەی بکەم و بۆیان بنێرم. دوای نیوەڕۆ ئیسماعیل هاتەوە، لەباتیی سەریعەی مەلا موحەڕەم بێنێت، نەرمینی ژنی جەباری عەلی عەوێزی لەگەڵ خۆی هێنابوو، هەر ئەو ڕۆژە لە سلێمانی گەڕابووەوە، عەلی لووت ماسی بە سەیارەی مەفرەزە خاسە لەگەڵ خۆی تاکوو بنگرد هێنابووی. ئێمە ئەمە نازانین جەباری مێردی چووبوو بۆ قەرەداغ بۆ لای خێزانی مام هێرش، مام هێرش شەهید بووبوو، پێشمەرگەیەکی ئازا بوو و ڕەفیقی جەبار بوو، دیارە پێش

ئەوەی بێت، دائیرەی ئەمن پێیان وتووە چی بکات و چۆن بەکاری بهێنێ. هاتە ماڵی ئێمە، ئەو کاتەش لەنێوان یەکێتی و هێزە سیاسییەکاندا ئاشتبوونەوەی گشتی هەبوو، بەرەی کوردستانی لە سەرەتای دروستبوونیدا بوو. دکتۆر مەحموود عوسمان، عەدنان موفتی و موحسین بایز هاتبوون کە بارەگای حیزبی سۆسیالیستی کوردستان دابنێن کە ڕەسووڵ مامەند سکرتێری بوو، هاتن و پەیدا بوون، بارەگاکەمان هیچی تێدا نەبوو، سەرم خستن بۆ ماڵی خۆمان، سەعات دەوری یانزە بوو، چووین دانیشتین، برادەران نامەیان بۆ من نووسیبوو شوێنیان بۆ پەیدا بکەم بۆ بارەگا، من بیرم کردبۆوە کانی شینکە چەند خانوویەکی تێدایە و نزیک خۆمانە، بیاندەمێ بۆ بارەگا، پێشتر ماڵی شێخ جەنگیی تێدا بوو، ئەوان چووبوون بۆ ئێران و چۆڵ بوو. کە چووینە ماڵی خۆمان، وتم: نیوەڕۆ ناڕۆن بۆ هیچ جێگەیەک، تەماشای یەکتریان کرد، تێگەیشتم لای من میوان دەبن. دەرگای ژووری میوانەکەمان بەرامبەر چێشتخانە بوو، ڕووم کردە دایکم و وتم: دایە، نان دروست بکەن بۆ نیوەڕۆ. ئەو نەرمینەش لەوێ بوو، نەرمین فرسەت دەهێنێت دەچێت هەر چی ماستمان دەبێ؛ دەیگرێتەوە و ماستاو دروست دەکات، ئەو دەرمانەی پێی دراوە، دەیکاتە ناو ماستاوەکەوە. دوایی ئێمەیان برد بۆ لەندەن بۆ عیلاج، دەرکەوت ئەو ژەهرەی پێمان دراوە، پێی دەڵێن «سالیۆم». دەوری سەعات دوانزە و نیو بوو نان تێ کرا، سفرە ئامادە کرا و پەرداخەکان لەسەر سفرەکە دانران، من خۆم پەرداخە ماستاوەکانم تێ کرد، بەقەدەر ژمارەی میوان. هەر لە کاتی ماستاوتێکردندا لە پێشەوە پەرداخێکم خواردەوە، بە حیساب مەعیدەم ساف بێت بۆ ئەوەی نیوەڕۆ نانی باش بخۆم. کە نان دانرا، ئەوانەی لەسەر سفرەکە بوون، ئەگەر لەبیرم نەچووبێ: ١. دکتۆر مەحموود عوسمان، ٢. عەدنان موفتی، ٣. سامی شۆڕش، ئەوکات لەسەر چاپخانەی یەکێتی بوو لای خۆمان، ٤. بێستوونی مەلا عومەر، ٥. ئاوات مەحموود، دوای ئێمەش دیارە دایکم و سەریعەی مەلا موحەڕەم و تریفەی خوشکەزام نانیان خواردووە، دکتۆر شوان دوای ئێمە هات، نەخۆشی هەبوو، ئەویش

نانی خوارد. وتم: با زوو نان بخۆین، دوو شەهیدمان هەیە کە لە شەڕەکاندا شەهید بوون، هێنابوویاننە خوارەوە، یەکێکیان سەردار بوو، برای هاوڕێ جەبار لای کاک ملازم عومەر شۆفێر بوو، ئەوی تریشیان خەڵکی تووە سووران بوو، چاوەڕوانی هاتنی کەسوکاریان دەکرد. بەپەلە نانمان خوارد و چووین بۆ سەرقەبرانی دێی چنارنە، لەوێ قەبرمان بۆ هەڵکەندبوون. هەر لەو خواردنەی وەستا مەجید هێنابووی، لێمان دروست کردبوو و ناردبوومان بۆ برادەرانی سەر شاخ کە لەگەڵ کاک عومەر بوون و لە شەڕدا بوون. لەسەر قەبران پێش ئەوەی شەهیدەکان بنێژن، کاک بێستوون وتی گێژم، منیش مەتارەیەک ئاوم پێ بوو، دامێ و دەموچاوی پێ شت، وتم بچۆ لای سەیارەکان دانیشە، ئێمەش کە تەواو بووین؛ دێینەوە بۆ لات. پاش بەخاکسپاردنی شەهیدەکان کە هاتینەوە لای سەیارەکان، بێستوون لەسەر جادەکە لەتەنیشت سەیارەکە ڕاکشابوو، بەپەلە خستمانە ناو سەیارەکە و بردمان بۆ خەستەخانەکەی لای خۆمان. ئەو دکتۆرانەی لەوێ بوون، ئەمانە بوون: دکتۆر مەحموود عوسمان، دکتۆر شوان، دکتۆر جەلال. ئەوەی پێویست بوو؛ بۆیان کرد، هیچ هۆشی نەهاتەوە، وتیان دڵیەتی. پاش ڕاوەشان و هەوڵدان، گیانی لەدەست دا. هەر لەو کاتەی دکتۆرەکان لەسەر بێستوون بوون و ئێمەش لەوێ بووین، سەریعەی کچی مەلا موحەڕەم کە هاتبوو یارمەتیی دایکم بدات، هات بۆ خەستەخانەکە و وتی سەرم دێشێت، یەکسەر لەوێ کەوت بە زەویدا، پاش ماوەیەکی کورت ئەویش تەواو بوو. ویستم سەریعە سواری سەیارەکە بکەم و لەگەڵی بچمەوە بۆ مەرگە، وتیان دایکت بانگت دەکات، کە چووم بۆ لای، وتی مستەفا گیان مەعیدەم دێشێ، هەر ئەوەندەم لێ بیست، ئەویش بێهۆش بوو، ئەویشمان نارد بۆ لای دکتۆرەکان. من سەریعەم بردەوە بۆ مەرگە تەسلیم بە کەسوکاریم کرد، خەڵکی مەرگە، کاک چەتۆ و پوورە گەلە کە خەڵکی مەرگە بوو و ئێستاش ماوە، لێم کۆ بوونەوە. دۆستان مەسینەیەک شیریان بۆ هێنام، هەر لەناو سەیارەکەدا دەستم کرد بە خواردنەوەی و هەموویم تەواو کرد، هەستم

دەکرد وردە وردە بێهێز دەبم، ئەمە ڕۆژی یەکەم بوو. دایکیشم گیانی سپارد و تەواو بوو، هێنایانەوە بۆ دێی ئاوەژێ، قەبریان بۆ هەڵکەند، ویستم بچمە ژێر تەرمەکەیەوە، بەڵام نەمتوانی. ئەو ژنەش بەدرۆ خۆی ڕشاندبۆوە، بە مانای ئەوەی ئەویش خواردوویەتی. هەر لە ئاوەژێ نەوزادی نووری بەگ لەگەڵماندا بوو، وتم کاک نەوزاد وریای ئەم نەرمینە بن شتێکتان بەسەر نەهێنێ، شێرکۆی شێخ نووری وتی ڕەمیی بکەم؟ وتم نا، چونکێ ئەگەر شتێکی وا بکەی، ڕەنگە بڵێن شتێک هەیە و بۆ داپۆشینی کووشتویانە، ئەو کاتەش نیوەی دنیا بڕوات پێ ناکات. تریفەی خوشکەزام هیچی لێ دیاری نەدابوو منداڵ بوو، ناردم بۆ سلێمانی خزمان ئاگادار بکات، ماڵی بێستوون چووبوونەوە بۆ سلێمانی، جوابم ناردبوو بۆ گوڵەی خێزانی کە لە ترسی حکومەت بەدزییەوە تەعزیە دابنێن.

ڕۆژی دواتر خزمەکانم لەگەڵ گوڵەی خێزانی بێستوون هاتن، ئەو ڕووداوەی ڕووی دابوو، بە چاوی خۆیان بینییان. بە منیان وت تۆ بڕۆ مشووری خۆت بخۆ، حەقی ئێمەت نەبێ. من هەر شەوەکەی پێش ئەوەی ئەوان بێن، وردە وردە سەری پەنجەکانم سڕ دەبوون و تووکی سەرم دەوەری. شەو دکتۆر شوان هات و لام نووست، وتم دکتۆر گیان وەزعم باش نییە، وتی تۆ وەزعی نەفسیت خراپە. بەهەرحاڵ، ڕۆژمان کردەوە، خزمان هاتن. پێش ئەوەی ئەوان بێن، دوو ئێسترم حازر کردبوو، نەقالەی نەخۆشم حازر کردبوو، من ڕۆیشتم بەرەو کانی توو، لەوێ ئیتر ڕێگەی سەیارە نەما، سواری ئێسترەکان بووم بەرەو ئێران و خزمانم بەجێ هێشت، لەگەڵ دەستەی پێشمەرگەکانی لای خۆم ملی ڕێگامان گرت. ئەوەشم بیر نەچێت هەر دوای ڕووداوەکە برووسکەیەکم کرد بۆ ملازم عومەر، وتم ئەو خواردنەی بۆم ناردوون، مەیخۆن ژەهری تێدایە، بەڵام دوایی دەرکەوت کە ئەوانیش خواردوویانە، بەڵام لە مریشکەکەدا نەبوو، لە ماستاوەکەدا بوو کە ئێمە خواردبوومانەوە، دوایی بۆیان گێڕامەوە کە چەند ترساون، دەیانوت هەموومان لە خۆمان دەترساین شتێکمان لێ بێت لەسەر ئەو شاخە و

دەمانوت هەر ئێستا لێمان دیاری دەدات. هەرکە لە کانی توو دەرچووین، سکم کەوتە ئازار، سواری ولاخیان کردم، داوای ئاوم دەکرد نەیاندەدامێ، چونکێ شارەزاییمان نەبوو، لەو کاتەدا باشترین ئاوە بۆ ئەوەی میزی زۆر بکەیت و ژەهرەکە فڕێ بدەیت. هەر چۆنێک بێت سەر کەوتین و چووینە سەر شاخی ئاسۆس نزیک جێگەی شەڕەکان، ئەوەی لەبیرم بێت: ملازم عومەر، شێخ دارای حەفید، شێخ سەدرەدین، قادری مامەند ئاغا، لێپرسراوانی پێشمەرگەکان و برادەرانی تریش لەوێ بوون. وەزعم زۆر خراپ بوو، کاک عومەرم جیا کردەوە و وتم هەر شکم لەو ئافرەتەیە؛ نەرمین، ئەویش وتی نامەیەک بنووسە بۆ جەباری مێردی، بۆ ئەوەی هەرکە لە قەرەداغ گەڕایەوە خۆی بیکوژێ، منیش دەستم قەڵەمی نەدەگرت، بەو شەوە تاریکە بە خەتێکی ناخۆش ئەم چەند دێڕەم بۆ جەبار نووسی، ئێستاش لەبیرمە چیم نووسیبوو.

**برام کاک جەبار**

سڵاو

کاکە گیان خیانەتی ژنەکەی تۆ بووە هۆی شەهیدبوونی کاک بێستوونی مەلا عومەر کە برادەری چەند ساڵەتە، هەروەها دایکم و کچەکەی مەلا موحەڕەم، ئێمەش چارەنووسمان دیار نییە، هیوادارم خۆت معامەلە لەگەڵ ئەم وەزعە بکەی.

**برات مستەفا چاوڕەش**

مانای ئەوەی بیکوژە. دوای نووسینی نامەکە، هەر بەو شەوە سنووری ئێران و عێراق بۆ دێی هەرزنە ڕۆشتین، شارەزامان لەگەڵ بوو، شەڕیش بەردەوامە لەنێوان عێراق و ئێراندا، نزیکی سنوور بووینەوە لای هەرزنە. دواتر مستەفا چاوڕەش باری تەندروستیی ڕۆژبەڕۆژ بەرەو خراپتر دەبێت، وەک خۆی دەڵێت بۆ پشکنین و چارەسەرکردن دەچێتە نەخۆشخانە لە شاری

سەردەشت و دواتر ڕەوانەی نەخۆشخانەی شاری تەوریزی دەکەن لە ئێران و لەوێشەوە ڕەوانەی هەندەران دەکرێت و دەچێتە وڵاتی هۆڵەندا و بە هۆی سەختی و خراپیی باری تەندروستیی، ڕەوانەی وڵاتی بەریتانیا دەکرێت لە نەخۆشخانەیەک لە شاری لەندەن. زۆرێک لە بەرپرس و سەرکردەکانی حیزبەکان ژەهرخوارد کراون، ئەمەش ژەهرخواردکردنی مستەفا چاوڕەش و دایک و کچی مەلا موحەرەم و ئەو سەرکردانەی لەگەڵی بوون کە گومان لە نەرمینی خێزانی جەباری عەلی عەوێز دەکرێت. نەرمین لە گوندی سێروانەوە خۆی دەگەیەنێتەوە شاری سلێمانی. ڕاستییەک هەیە و دەبێت ئاماژەی پێ بدرێت، جەباری عەلی عەوێز کەسێکی بێتاوان و بێئاگا بووە لەو ڕووداوە، بەڵام بە بڕیاری نەوشیروان مستەفا و بڕیاری شۆڕش، جەباری عەلی عەوێز لە کاتی گەڕانەوەیدا لە گوندی دۆڵان لەلایەن مەفرەزەیەکی هێزی پێشمەرگەوە کە هاوڕێ و هاوسەنگەری خۆشی بوون، بەدیل دەگیرێت و بەرەو سەرکردایەتی ڕەوانە دەکرێت. نێوان قەرەداغ و سەرکردایەتی ڕێگایەکی چەند ڕۆژەی دووردرێژە، بەتایبەت لە سالانی هەشتاکاندا ڕژێمی بەعس تەواو دەستی گرتبوو بەسەر زۆربەی سنووری ژێر دەسەلاتی هێزی پێشمەرگە و ئەرک و ماندووبوونێکی زۆری دەویست بۆ گەیشتن بە سەرکردایەتی. گریمانەیەک بخەینە پێش چاوی خۆمان، گەر جەباری عەلی عەوێز تاوانبار و سەر بە ڕژێم بووایە، ئەوا زۆر بەئاسانی دەیتوانی خۆی لەو ڕووداوە ترسناکە نەجات بدات، چونکە ئەو مەفرەزەیەی لەگەڵی دابوون و هاوسەنگەری خۆی بوون و خۆشیان دەویست، تاکوو گەیشتوونەتە سەرکردایەتی، چەکەکەی شانیان لێ وەرنەگرتبوو، ئەوەش دەبووە هۆکارێکی ئاسان بۆ دەربازبوون و نەجاتبوونی لەو کارەساتە. پاش چەند ڕۆژێک، جەباری عەلی عەوێز دەبەنە سەرکردایەتی و لە بەرگەڵوو زیندان دەکرێت. پشکۆ نەجمەدین[1] بەم شێوەیە باس لە

---

[1]. ئەزموون و یاد ئاڵای شۆڕش و حیکایەتەکانی زیندان، بەرگی یەکەم و دووەم، ١٩٧٨-١٩٨٣، ١٩٨٣-١٩٨٩، پشکۆ نەجمەدین، چاپی یەکەم، چاپخانەی (...)، ل٢١١.

زیندانیکردنی جەبار دەکات: زیندانی بەرگەڵوو، فێبریوەری ١٩٨٨، ئەو ساڵە؛ ساڵی هاتنی ئەنفال و نغرۆبوونی دنیا بوو، جەنگی عێراق و ئێران لە بەرەکانی نێوەڕاست و باشووردا چەقیوە و تەکانێ نادات. هێزەکانی عێراق پێچەوانەی چاوەڕوانی ئێران و هێزە سیاسییەکانی کوردستان، کێڵگەکانی «مەجنوون» و هەندەک ناوچەی دیکەی گرنگ دەگرنەوە. کوردستان دەبێتە شەڕگەی هێزە دژەکان و ئێران، قورسایی خۆی لە بەرەکانی کوردستاندا بە هاوکاریی هێزە کوردییەکان زیاتر دەکات، لە مانگی جەنیوەردا زەنگی مەترسییەکی گەورە دەبیسترا، تاپۆی حەزیایەک دەبینرا کە دەیویست هەموو وڵات لووش بدات، هێزەکانی پاسداران وەک ڕەوەگورگ لە ناوچەکە بەر بووبوون، کۆپتەرەکانی ئێران دۆڵاودۆڵ دەفڕین و لە بەرگەڵوو ڕێک لە تەختاییەکەی تەنیشتی زینداندا دەنیشتنەوە، بارەکانیان جێ دەهێشتن و دەگەڕانەوە، فڕۆکەکانی عێراق لە بەرزاییەوە کۆپتەرەکانی ئێرانیان بنچاو دەکرد و بۆسەیان بۆ دەنانەوە.

مامە شێخ وتی: شوکر یەکێتی فڕۆکەخانەیەکی هەیە، بەڵام بۆ دەبێ ئەم فڕۆکەخانەیە ڕێک بە قنگی ئێمەوە نووسابێت! دەترسێم ڕۆژێک فڕۆکەیەکی ئێراقی بە ڕۆکێتێک، فڕۆکەخانە و زیندانەکەی ئێمەش نغرۆ بکات!

فڕۆکەیەک هات و نیشتەوە، عەلی مامە حەمە گوتی: بەرزم بکەنەوە، دەمەوێت لەو کونەوە ببینم کە داخۆ چیی تێدایە! جەباری عەلی عەوێزیش گوتی: وەرە سەر شانم! عەلی لە قەڵادوشکانی جەباردا دانیشت و جەبار هەستایە سەر پێیان. عەلی گوتی وا نابێت، هیچ نابینم، دەبێت بە پێیان لەسەر شانت بوەستم، دیوارەکە هێند بەرزە دەڵێی شوورەی قەڵایە! هەستە سەر پێ! عەلی هەستا و گوتی: «دەیبینم!»

«چییە؟»

«مەسینە! ئافتاب!»

«چی!»

مەسینەی دەستنوێژهەڵگرتن. پاسدارەکان دەچن بۆ کەربەلا و پێیان وایە ئێراق مەسینەی لێ نییە. جەبار گوتی دابەزە شانم شکا! جەباری

عەلی عەوێز مانگێک دەبوو بۆ دیوەخانەکەی ئێمەیان هێنابوو، من جەبارم پێشتریش دەناسی. دەرگایان کردەوە، مەلا یاسین گوتی جەبار لای ئێوە دەبێت! ژنەکەی جەبار خۆی دەرباز کردبوو و پاداشتی خۆی لە بەعس وەرگرتبوو. جەبار جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ئەو لەو کاتەدا لە قەرەداغ بووە لە مەڵبەندەوە برووسکەیان بۆ کردووە و خۆی بە پێی خۆی هاتووە بۆ سەرکردایەتی.

ئەگەر من ئاگاداری ئەو بێرەوشتییەی ژنم بووایەم، بە پێی خۆم نەدەهاتم، من دەمتوانی لەبریی ئەوەی بۆ ئێرە بێم، بۆ سلێمانی بڕۆم! ژنەکەم پێش ئەوەی تاوان دژی ئەو برادەرانەی من بکات، تۆڵەی لە من کردووەتەوە. جەبار وەهای دەگوت!

مەرگی بێستوون دڵگرانی کردم، بێستوون لە شەوی پەلامارەکەی یەکێتی و زیندانیکردنی ئێمەدا میوانمان بوو. من خۆم بە ئەندامی ئەو ڕەوتەی ئێوە دەزانم، هەر کێشەکە بە ئاشتی و بێ تەقوتۆق چارەسەر بکرێت من لەگەڵ ئێوەم، ئاخر من دەمەوێت نە کورد بکوژم و نە کوردیش بمکوژێت! بێستوون دوا ئێوارە لە گوندی تەکیە وەهای پێ گوتم!

لەگەڵ خەستبوونەوەی هێرشەکانی بەعسدا، زیندان دەهات و چۆڵتر دەبوو. زیندانییەکان پاکوپیس دەکران، هەندێکیان بە چەردەیەک پارە لەنێوان ۲۰ تا ۳۰ هەزار دینار ئازاد دەکران. ئەفسەرێک کە داوای پەنجا هەزار دیناریان لێ کردبوو، بەکوڵ دەگریا و دەیگوت پەنجا هەزار دینار ئەگەر گەلای دارپرتەقاڵیش بێت، بەساڵێک کۆ نابێتەوە. هەندێک لە سەرباز و جاشان بێ بەرانبەر ئازاد کران، ژمارەیەکی زۆریان گواستەوە بۆ ناوچەکانی قەرەداغ و خۆشناوەتی و جارێ سەد کەسێک لە زینداندا مابوون.

بازنەی ئەنفال بە زمانی بڵێسەی خۆیەوە تەنگ دەبوویەوە، بەعس بڕیاری دابوو بە هەر نرخێک بێت و ئەو ناوچەیە کە مەترسیی بۆ دەسەڵاتی ئەو لە کوردستاندا دروست کردبوو، کۆنترۆڵ بکات، درێژایی بەرەکانی شەڕ لە هەر چوار لاوە چەند سەد کیلۆمەتر دەبوو، ژەنەراڵەکانی سوپای بەعس لە

نزیکەوە سەرپەرشتیی شەڕەکەیان دەکرد، هێزەکانی یەکێتی سەرسەختانە بەرگرییان دەکرد، ناپاڵم و کاتیۆشا و تۆپی دوورهاوێژی ژارڕژێن؛ یەک چرکەش وروونیان نەدەدا. لە دۆڵی جافایەتیدا قیامەت هەڵسابوو، دۆزەخ تاو درابوو، مرۆڤەکان چەکدار و بێچەک، ژن و منداڵ پیر و گەنج لەو دۆزەخەدا دەسووتان.

گەوەی زنجیرەکان بە هەڵاوی نزوولە و
سنگکوتانی دایک گەرم دانەهاتن،
بە هەناسەی ژەهراویی بیابان لێک ترازان!
لەژێر بریسکەی ئەو شمشێرانەی بە ئاسماندا هەڵدەسووڕان،
سپێنەی چاوەکانی هەتاو ڕژا،
دەربەندەکان پەرکەمیان گرت،
ئەستێرەی بن ئەشکەوتەکان کووژانەوە،
بنکاچەکان کەفیان چەڕاند،
گابەردەکان، سەری بەناڵەیان بە کۆشی نواڵاندا کرد...

زیندان چۆڵوهۆڵە، قاوشەکان سرتەیان لێوە نایەت. ئێستا مامە شێخ، عەلی مامە حەمە، جەباری عەلی عەوێز و من، میراتگەری ئەم زیندانە گەورەین! شۆڕش ئەگەر شتێکی بە میرات بۆ ئێمە جێ نەهێشتبێ، ئەم زیندانەی وەکوو دیاری پێ بەخشیوین. جەبار دەترسێ و لە ناخەوە هەرەسی هێناوە، شەوانە خەوی نییە و تا سپێدە جگەرە دەکێشێ. گەردوگوڵی بەیانی دەنگی بادانی کلیلی زیندان، جەباری ڕاچڵەکاند. جەبار لە ناخەوە، لە قووڵایی نەستی خۆیدا هەستی بە کۆتایی خۆی کردبوو. «من دەڕۆم! گەردنم ئازاد بکەن! ئێستا دەمبەن و ئیعدامم دەکەن!» دەرگا کرایەوە و جەبار هەستا، ئاوڕێکی لە ئێمە دایەوە، لە چاوانی جەباردا جگە لە ترس، هیچی تری دیکەم نەبینی! جەبار جگەرەیەکی پێکرد، بێ ماڵئاوایی پێشیان کەوت. لەنێو گرمەی تەقینەوەی کاتیۆشادا گوێمان لە ڕێژنە گوللەیەک بوو، من ئەو دەستڕێژەم ناسییەوە، ئێستاش نەمزانی کە داخۆ جەبار هاوتاوانی ژنەکەی بوو، یاخود ئەو دەستڕێژە تاوانێک بوو بۆ

سڕینەوەی مرۆڤێک کە ناوی جەباری عەلی عەوێز بوو... نازانم!

«نەرمین»؛ خێزانی فەرماندەی تێکۆشەری دێرین، دوای کارەساتی ژەهرخواردکردنەکە، بەرەو شاری سلێمانی هەڵدێت. مستەفا چاوڕەش بۆ پشکنین و چارەسەری ژەهرخواردنەکەی، لە ساڵی ١٩٨٧دا بەرەو ئێران و دواتر بۆ هەندەران دەچێت. نەوشیروان مستەفا؛ سکرتێری کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان دەبێت و بارەگای لەنزیک زیندانی بەرگەڵوو دەبێت. جەباری عەلی عەوێز لە بەرگەڵوو گوللەباران دەکرێت. بارودۆخی سیاسیی عێراق گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە و ڕاپەڕینی سەرتاسەری کراوە. لە ڕێکەوتی ١٩٩١/٣/٧دا شاری سلێمانی ئازاد دەکرێت و هێزی پێشمەرگەی هەموو حیزبەکان لە تەواوی شارەکانی کوردستاندا ئازادانە تێکەڵ بە جەماوەر دەبن، تاوانبارانی دژ بە گەل و نیشتمان بە سزای گەل و شۆڕش دەگەیەنرێن، نەرمینی خێزانی جەباری عەلی عەوێز لە شاردایە و هێزی پێشمەرگەش لە لوتکەی بەرزیدایە.

ئایا نەرمینی خێزانی جەباری عەلی عەوێز، وەک هەر تاوانبارێک بە سزای گەل و شۆڕش گەیەنرا؟ یان بەبێ ئاگاداری بڕیاری شۆڕش و گەل، ئەو کارە ئەنجام درا[١]؟

پێش ئەوەی جەبار بکوژن، ژنەکەی وتوویەتی جەبار بێتاوانە و ٢٥ کەس لەو موئامەرەیە بەشدارە. سەبارەت بە ڕووداوی ژەهرخواردکردنی مستەفا چاوڕەش و هەندێک بەرپرسانی تر، دایکی دەڵێت: کوڕەکەی بێتاوان بووە و یەکێتی بە ناهەق و بەبێ دادگاییکردن و بێ لێکۆڵینەوە کوژراوە. لەو ڕووداوەدا ستەمێکی گەورە لە کوڕەکەی و بنەماڵەکەیان کراوە، کە تاوانێکی لەو جۆرە دەخەنە پاڵیان. ڕەعنا حەمە ئەمین کە دایکی جەباری

---

١. بۆ ئەو مەبەستەش بڕوانە: سالار مەحموود، لڤین، ٢٠١٢، ل١٨٧. دایکی جەباری عەلی عەوێز ئاماژە بە هەندێک وردەکاریی مێژووی تاوانی ژەهرخواردکراوانی ئەو بەرپرسانەی یەکێتیی نیشتمانی و کاراکتەری تاوانەکە دەدات.

عەلی عەوێزە، بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە باس لە پاکی و قارەمانێتیی کوڕەکەی دەکات کە چەندە قوربانیی لە پێناو یەکێتی و شۆڕشدا داوە، کە لە ساڵی ١٩٨٤دا لەلایەن حیزبی بەعسەوە دەگیرێت و بۆ ماوەی بیست ساڵ لەژێر دەسەلاتی ئەو ڕژێمەدا حوکم دەدرێت و پاش سێ ساڵ زیندانیکردن، بە لێبوردنی گشتی ئازاد دەکرێت. پاشان حکومەت کۆمەڵێک بەڵێنی گەورەی پێ دابوو، بەڵام جەبار بەو مەرجانە ڕازی نەبوو. پاش ئازادبوونی لە زیندان بە دوو هەفتە، جارێکی تر ڕووی لە شاخ کردووە و گەڕاوەتەوە نێو هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانی و ڕایگەیاندووە بەوەی من بەبێ شاخ ناژیم. هەر لەو ساڵەدا کە چووەتەوە شاخ، ڕووداوی ژەهرخواردنەکە ڕووی داوە. پاش شەش مانگ، خێزانەکەشیان برد بۆ شاخ کە ماڵیان لە مەرگە بوو. دواتر جەباریان ناردبوو بۆ بەری قەرەداغ بۆ پرسەی مام هێرش. کە چووبوو بۆ قەرەداغ، ژنەکەی ناردبوو بۆ ڕانیە بۆ ماڵی براکەی.

دایکی جەبار لە پرسەی بێستوونی مەلا عومەردا دەبێت، ئەو پێشمەرگەیەی ژەهر دەیکوژێت، خەسووی نەبەز واتە «خولەی جگەر» بە دایکی جەبار دەڵێت: بۆ ناچیت سەرێ لە جەباری کوڕت بدەیت؟ دایکی جەباریش دوودڵی و ترس دەچێتە ناخیەوە و بۆ ڕۆژی دواتر بەتەنها بەرەو شاخ بەڕێ دەکەوێت. بە چەند ڕۆژێک و ترس و دڵەڕاوکێ، خۆی دەگەیەنێتە مەرگە و لەوێ خێزانەکەی نەبەز (خولەی جگەر) ڕووداوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە.

دایکی جەبار ئاماژە بەوە دەکات لەو کاتەدا بەرپرسێکی یەکێتی نەرمینی گەیاندووەتەوە شاری سلێمانی، ئەو بەرپرسە زانیاریی داوەتێ. دایکی جەبار دەڵێت: ئەو بەرپرسە بە سایەقەکەی خۆیدا ژنەکەی دێنێتەوە سلێمانی، وتبووی بیبەنەوە تەسلیمی دایکی بکەنەوە، بەڵام دایکی ژنەکەی جەبار ناهێڵێت بمێنێتەوە، دەینێرێت بۆ ماڵی خوشکەکەی جەبار. دواتر عەلە لووت ماسی و ملازم عەلا کە سەر بە ڕژێم دەبن، دەدەن بەسەر ماڵی خوشکەکەی جەباردا و عەلە لووت ماسی داوای نەرمین دەکات، لە ژووری سەرەوە نەرمین دەهێننە خوارەوە، لەگەڵ دوو خوشکەزای جەباردا دەیگرن. ئەوەی

جێی سەرنج و تێبینییە، عەلە لووت ماسی لەدوای ڕاپەڕین دەستگیر کرا و دواتر لە زیندان ئازاد کرا و تا ئەم چاوپێکەوتنە عەلە لووت ماسی لە سووریا دەژی. دایکی جەبار درێژە بە باسەکە دەدا و باس لە چۆنیەتیی ڕووداوەکە دەکات و دەڵێت: من بەو بەرپرسەی یەکێتیم وت بۆ نەرمینتان ناردەوە بۆ سلێمانی؟ لە وەڵامدا وتی: من ئاگام لێ نییە و نازانم پلانی (موئامەرەی) کێ بووە. سەبارەت بەو ڕووداوە دەڵێت: کاتێک گەیشتمە مەرگە، خولەی جگەر (نەبەز) نامەیەکی بۆ نووسیم بیبەم بۆ کاک نەوشیروان مستەفا لە بەرگەڵوو. بە تراکتۆرێک سەعات دووی شەو گەیشتمە بەرگەڵوو، دواتر چوومە بەردەم ئەو زیندانەی کە جەباری تێدا زیندانی کرابوو، داوام لە پاسەوانەکان کرد کە جەبار ببینم، ئەوانیش پێیان وتم: ئەمرمان پێ نییە، سبەی وەرەوە بەڵکوو ببینیت. بەیانی چووم بۆ بارەگاکەی نەوشیروان مستەفا، پاسەوانەکانی نامەکەیان لێ وەرگرتم و بردیان بۆ نەوشیروان مستەفا، دواتر پێیان ڕاگەیاندم نەوشیروان مستەفا کۆبوونەوەی هەیە. پاشان چوومەوە بۆ بەردەمی زیندانەکە، داوام لە بەڕێوەبەری زیندان کرد کە جەبار ببینم. لە دوورەوە یەکێک بانگی کردم و وتم تۆ کێیت؟ ئەویش وتی جەبارم و هاتە بەردەمم. وتم ئەوە چییە گۆبەندیان بۆ ناویتەوە؟ پاشان ئاماژە بەوە دەدات و دەڵێت: جەبار داوای کردووە ئازادی بکەن، گەر خێزانەکەی تاوانبار بێت و بەڵگەی لەسەر بێت ئەوا، دایک و خوشک و برایەکی بە بارمتە لەلای یەکێتی دادەنێت و بچێتەوە سلێمانی لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا نەرمینی خێزانی بکوژێت. پاشان لای هەندێک بەرپرس و هاوڕێیانی وتبووی گەر ئێوە پیاو بوونایە، نەتاندەهێشت نەرمین بڕواتەوە سلێمانی و دەستبەسەرتان دەکرد. کاتێک نەرمینی خێزانی جەباری عەلی عەوێز پاش دەستگیرکردنی لەلایەن عەلە لووت ماسی و ڕادەستکردنی دائیرەی ئەمن؛ ئازاد دەبێت، دایکی جەبار پێی دەڵێت: ئەوە چییە نەرمین، ئەم گۆبەندە چی بوو ناتەوە؟ نەرمینیش لە وەڵامدا دەڵێت من ئاگام لە ڕووداوەکە نەبووە و بیست و پێنج کەس «موئامەرەیان» لە جەبار کردووە. پاشان دایکی جەبار ئاماژەی

بەوەش داوە بەر لەوەی جەبار بکوژن، جەبار وەسیتی کردووە هاوڕێیەکی خۆی ڕاسپاردووە بە ناوی «بێستوونی تەسجیلات» کە نەرمینی خێزانی بکوژێت. هاوڕێکەشی دوای ڕاپەڕینی ئازادکردنی کوردستان، وەسێتەکەی جەبار جێبەجێ دەکات و نەرمین دەکوژێت. دایکی جەبار دەڵێت: لە ڕۆژێکی ڕەمەزاندا دەچنە ماڵی دایکی نەرمین و نەرمین دەبەن، پاش لێکۆڵینەوە نەرمین دەڵێت جەبار بێتاوانە. وەکوو باسی دەکەن و باس دەکرێت، کۆپییەکی دەنگی لای بێستوونی تەسجیلاتە. دایکی جەباری عەلی عەوێز ئاماژەشی بەوە دا کە مام جەلال؛ جەباری زۆر خۆش دەویست، وتوویەتی دەست لە جەبار مەدەن تاکوو خۆم دێمەوە، بەڵام بەر لەوەی مام جەلال بێتەوە، گوللەبارانیان کردووە. گێڕانەوەی مێژوو لەلایەن هەندێک کەسەوە بۆ بەرژەوەندیی خود و تاکەکەسییە و سوودمەند دەبێت، لەلایەن هەندێک کەسانی تریشەوە ڕاستی و دروستیی مێژووەکە وەک خۆی باس دەکرێت و تووشی سەرئێشە و کێشە و ململانێ و گیروگرفت دەبێت، بۆیە منیش لێرەدا مێژووەکەم بە ڕاست و دروست وەک خۆی گێڕاوەتەوە لە بەشێکی یادەوەرییەکانمدا و دەبێت باجەکەشی هەر چییەک بێت؛ بیدەم، تەنانەت ڕۆحکێشانیش بێت. کاتێکیش ڕۆح لەسەر ڕاستی و دروستیی گێڕانەوەی مێژوو بکێشرێت، بێگومان ئەو مێژووە هەمیشە زیندوو دەبێت...

کاتێک جەباری عەلی عەوێز لە زینداندا دەبێت، بارودۆخی سیاسی و تەسکبوونەوەی سنووری ئازادکراوی ژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگە لەلایەن ڕژێمی بەعس و تۆپبارانکردنی تەواوی گوندەکان لە تەنگاوێکی زرووفی ئەنفالی یەکدایە، نەوشیروان مستەفا ئەو دەمە کە سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بووە، زانیویەتی کە جەباری عەلی عەوێز بێئاگا بووە لەو ڕووداوە و بێتاوان بووە، بەڵام شۆڕش بڕیاری گوللەبارانکردنی بۆ دەردەکات بەو تۆمەتەی تازە جەبار کەڵکی نەماوە، گەر دەستی بگاتەوە بە شاری سلێمانی، بەم حاڵەتەوە خراپەی زۆری لێ دەوەشێتەوە، بەو هۆیەوە لە دەرەوەی زیندانەکەدا بە چەند گوللەیەک تەواو

کراوە. لەبەر حاڵەتی ئیحتیاتی شۆڕش و گریمانەی خراپبوونی لە داهاتوودا، دەنا نەوشیروان مستەفا دەیزانی کە جەباری عەلی عەویز بێتاوانە، وەک وریا و جوامێری سەرتیپ و سالاری حاجی دەرویش و زاهیر کونجرینی و مام ئاراسی حسک و... هتد؛ بێتاوان شەهید کران. گێڕانەوەی ئەم یادەوەرییانە بۆ کولاندنەوەی زام و برینی بنەماڵەی قوربانییان و بێڕێزیکردن بە خودی هیچ کەسایەتییەک نییە، بەڵکوو تەنها ڕاستی و دروستیی مێژووییەکە بۆ نەوەی داهاتوو کە چیتر هەڵە و کەموکوڕییەکان دووبارە نەبنەوە و لە چەمکی تەواوی شۆڕش و سەروەرییەکانی و کێشە و ململانێکان بگەن و ببێتە ئەزموونێکی ڕابردوو بۆ داهاتووی پڕ لە ئومێدی سەرکەوتن و پێکەوەژیان.

پێش ئەوە سەرنج و تێبینیی زیاترم بۆ ئەو ڕووداوە دەربڕم و بخەمە ڕوو، واتە کاتێک نەرمینی خێزانی جەباری عەلی عەویز کە بە کاراکتەری سەرەکیی گەورەی ژەهرخواردکردن دەزانن، گوایە لە کاتی گەڕانەوەی بۆ شاری سلێمانی؛ زۆرترین پاداشت کراوە لەلایەن حیزبی بەعسەوە.

من دەمەوێت لێرەدا نەخشەی ئەو ماڵە بکێشم کە نەرمینی خێزانی جەباری عەلی عەویز دوای کارەساتی ژەهرخواردنەکە تا ئەو کاتەی دەکوژرێت لەلایەن «بێستوونی تەسجیلات» کە هاوڕێی سەرەکی و گیانیبەگیانی جەباری عەلی عەویز دەبێت، لەو خانووەدا ژیانی لەگەڵ دایکی جەبار و دوو منداڵەکەیدا بردۆتە سەر. مەبەست لە نەخشەکێشانی ئەو خانووەی نەرمینی خێزانی جەباری عەلی عەویزی تیا ژیاوە، دواتر دێمەوە سەر مەبەستی سەرەکیم لە نووسینەکە. خانووەکە بەرامبەر «مەرکەزی سەیوان بوو»، ڕووی بەردەمی خانووەکە چۆڵ و گۆڕستانی سەیوان بوو، واتە هیچ خانووەیەکی تری لێ نەبووە، پشتی خانووەکە شێوەکەی سەرکارێزە و تەنها سنووری جوگرافیای ئەو خانووەی نەرمینی تێدا دەژیا؛ چوار خانوو بوون لەتەنیشت یەکەوە، پاشان دیواری سەرەکیی خانووەکە؛ نزم و بە هەردوو دیودا چۆڵەوانی بووە. لەو دەمەدا کوڕەکەی کە ناوی جیڤارایە، تەمەنی چوار ساڵ و کچەکەی حەوت ساڵان بووە. لەدوای ڕاپەڕین و

ئازادبوونی کوردستان، جارێکی تر چاوم بە کوڕەکەی جەباری عەلی عەوێز کەوتەوە. دوای پرسیارگەلێکی زۆر و گەڕانەوە بۆ بارودۆخی ئەو کارەساتە کە ڕووی دابوو، چۆنیەتیی گوزەران و ڕووداوی کوشتنی نەرمینی دایکیم لێ پرسی.

جیڤارای کوڕی جەباری عەلی عەوێز پێی ڕاگەیاندم: دوای ئەوەی کە باوکم شەهید کرا و منیش تەمەنم لەدوای ڕاپەڕین بە پەنجەکانی دەست دەژمێردران و لە دە ساڵان تێپەڕی نەدەکرد، باری گوزەرانمان بە ڕادەیەک ناخۆش و دژوار بوو؛ ئاراممان لێ هەڵگیرابوو، ناچار نەمتوانی درێژە بە خوێندن بدەم، کە هیوا و ئامانجی پاشەڕۆژم بوو. هەر لەو دە ساڵییەی تەمەنمەوە کەوتمە بازاڕەوە و ناچار کاری دەستگێڕی و گۆرەوی فرۆشتن و چلوورەم دەکرد، ڕۆژانە سێ بۆ چوار دینارم دەست دەکەوت. دایکم (نەرمین) سێ برای هەبوو، یەکێکیان لە جەنگی عێراق و ئێراندا سەرباز بوو، شەهید بوو، مووچەی شەهیدانەی لەلایەن حوکمەتەوە بۆ بڕابووەوە، برایەکی تری لە ڕانیە دەژیا و برای سێیەمی لە کارەساتێکی ڕووداوی وەرگەڕانی ئۆتۆمبێلدا گیانی لەدەست دا.

ناچار بەو کارە کەمەی کە من دەمکرد و مووچەی شەهیدانییەکەی خاڵم دەژیاین. لە ئەنجامی کارکردنی دەستگێڕی و ماندووبوونمدا، نەمدەتوانی لە قوتابخانە وەک هاوڕێکانم بخوێنم. بۆیە سەختیی ژیانمان لە دووریی نەبوونی باوک و دایکێکی نەخوێندەوار و هەژارم، خۆم و خوشکەکەم وازمان لە قوتابخانە هێنا و درێژەمان بە کاری دەستگێڕی دا. ئەوەی کە ئەندامانی خێزانەکەمانی وەڕز کردبوو، وەرزی زستان بوو. هەموو ساڵێک ئەو وەرزە ببووە نەهامەتی بۆ ئێمە، چونکە تەنها زۆپایەکمان هەبوو، لەبەر بێ نەوتی، شەوانە نەنکم یەک کاتژمێر زۆپاکەی دادەگیرساند و هەموومان لەدەوری کۆ دەبووینەوە، هەر ئەوەندەی تینی گەرمامان بۆ دەهات کە چەند سەنتیمەترێک لێوەی دوور بووین، دەکوژێنرایەوە و هەریەکە و پەتوویەکمان دەدا بەسەر شانماندا و لەبەر ئازاری جەستە و بەدەنم کە

لە کاتی کاری دەستگیرپیدا ماندووی دەکردم، بەر لە خوێندنەوەی کتێبەکە خەوم لێدەکەوت، ئەوەش ببووە هۆکاری ئەوەی چیتر نەتوانم وەک قوتابییەکی ئاسایی لە قوتابخانەدا بخوێنم. سەبارەت بە کوشتنی نەرمین، پێی ڕاگەیاندم کە «بێستوونی تەسجیلات» کە هاوڕێی باوکم بوو، دایکمی کوشت. لەم دوادوایەدا بێستوونم بینی و پرسیارم لێ کرد سەبارەت بە کوشتنی دایکم، ئەویش لە وەڵامدا وتی بەڵێ من کوشتوومە و ئەو ئەرکەم بەجێ هێناوە کە باوکت وەسیەتی بۆ کردووم. کاتێک کەوتمە گفتوگۆ لەگەڵ بێستوون، ڕووخساریم بەبیر هاتەوە، ئەو کاتە من منداڵ بووم وەک هەر منداڵێک کە حەز بە گەمە و یاریکردن دەکات، لە کۆڵانەکەی بەر ماڵەکەماندا بەرامبەرمان گۆڕستان بوو، یاریم دەکرد، لە دوورەوە دوو پێشمەرگەم بینی و بەرەو ماڵی ئێمە هاتن، کە یەکێکیان «بێستوونی تەسجیلات» بوو کە هاوڕێی باوکم بوو، پاشان بە خێزانی تێکەڵ بووین، هاتن و خۆیان کرد بە ماڵی ئێمەدا و داوای دایکمیان کرد بەوەی هەندێک کاریان پێیەتی و دواتر دەیهێننەوە بۆ ماڵەوە. دوای گفتوگۆیەکی زۆری نێوان نەنکم و دایکم و بێستوون لە ژووری ئەودیو، پێی ڕاگەیاندبوون بەوەی ملازم عومەر کاری پێیەتی و هەندێک پرسیاری لێ دەکات و دواتر نەرمین ئەمانەتە لای من بۆتان دەهێنمەوە. پاش درێژەپێدانی گفتوگۆی نێوان من و بێستوونی تەسجیلات، وتی: دایکت عەباکەی دا بە سەریدا و وتی بێستوون با بڕۆین. دایکت بە نەنکتی وت: واتە بە دایکی جەباری عەلی عەوێز، ئەگەر من نەهاتمەوە، ئاگات لەم دوو منداڵەم بێت. دواتر نەنکت زۆر بەتاسەوە وتی: بێستوون، ئەمانەتی تۆ و نەرمین! منیش وتم: خەمت نەبێت چۆن دەیبەم، ئاواش دەیهێنمەوە.

ئێستە تەمەنی من گەیشتۆتە بیست و حەوت ساڵان و جارێکی تر چاوم بە بێستوونی تەسجیلات کەوتەوە، پرسیارم لێ کرد: چۆن و بە چی دایکمت کوشت؟ وەڵامی دایەوە: لەدوای ڕاپەڕین بەرەی کوردستانی لە مزگەوتی عەلی کەمال لێکۆڵینەوەیان لە تاوانباران دەکرد و بڕیار دەدرا ئەو کەسانەی

تاوانیان کردووە، بکوژرێن. ئیتر نازانم ملازم عومەر چۆن لێکۆڵینەوەکەی لەگەڵ نەرمین کردووە، چونکە ملازم عومەر خۆی قسەی لەگەڵ کردووە، بەڵام دڵنیام زۆر زوو بڕیار لەسەر کوشتنی دایکم دراوە. دواتر بێستوونی تەسجیلات پێی ڕاگەیاندم کاتێک بڕیاری کوشتنی نەرمین لەلایەن ملازم عومەرەوە دەرکراوە، بێستوون وتوویەتی من بەو کارە هەڵدەستم و دەیکوژم! بێستوون وتی: کاتێک من و دوو پێشمەرگەی تر نەرمینمان برد بۆ شەقامی شەست مەترییەکە، نەرمین وتی: بێستوون، بوەستە با جارێک خۆم چاک بکەم، کاتێک تەقە دەکەیت و کەوتم، با جەستەم دەرنەکەوێت. پاشان بێستوون وتی: نەرمین خۆی چاک کرد، واتە زیاتر پۆشاکی توندتر و خۆی پێچاوەتر کرد و دواتر وتی: بێستوون، من ئامادەم، تەقە بکە. بێستوون وتی: دەستڕێژیم کرد و نەرمین دەستبەجێ لە شوێنی خۆیدا کەوت و گیانی لەدەست دا.

بێستوون وتی: کاتێک گیانی لەدەست دا و چوومە سەری، بینیم بە شێوازێک خۆی پێچابووەوە کە کەوتیش، هیچ شوێنێکی جەستەی دەرنەکەوت. لە کاتی دەستڕێژیکردندا نەرمین ماکسییەکی ڕەشی لەبەردا بوو، چونکە شەش مانگ بوو برایەکی بە ڕووداوی وەرگەڕاندنی ئۆتۆمبێل گیانی لەدەست دابوو. بۆ بەخاکسپاردنی دایکیشم، دەرامەت و بژێویمان بە جۆرێک خراپ بوو کە لەنێوان خزم و خێزخوازاندا پارەی کفن و گۆڕ هەڵکەندن و بەخاکسپاردنی دایکم، کۆمەکی پارەیان بۆ کردین. پێش ئەوەی کۆتایی بە چیرۆک و ئەم یادەوەرییە تفت و تاڵە و کارەساتە پڕ تراژیدیایە بهێنم، دەمەوێت سەرنجی خوێنەر لەسەر چۆنیەتیی ڕووداوەکە و جۆری بەڵگە و نووسینەوەی یادەوەرییەکە و تاوان و کاراکتەری سەرەکی و پشتی پەردەوە بدرێت. سەرەتایەکی ڕوون و ئاشکرا و شێوازی بیوچانی خەباتی مرۆڤێکی دڵسۆزی وەک فەرماندەی دێرین شەهید جەباری عەلی عەوێز، مێژوو شایەتی حەقیقەتی مەزنیی ئەو مرۆڤەیە کە لە سەرەتای لاوێتییەوە و لە شۆڕشی ئەیلوولەوە چەکی پێشمەرگایەتیی کردووەتە شان و دوای

نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول و لە هەڵگیرساندنەوەی خەباتی ڕێکخستنی نهێنیی شار و شاخ و پێشمەرگە سەرەتاییەکان بووە. جەباری عەلی عەوێز خۆی بێبەش نەکردووە لە خزمەتکردن بە نیشتمانەکەی، مێژووش حەقیقەتی بێتاوانیی ئەم مرۆڤە دڵسۆزەی دەرخستووە بەوەی کە بەدوور بووە لە خیانەت و پلانی ژەهرخواردکردنی ئەو تێکۆشەرانەی دووچاری ئەو کارەساتە جەرگبڕە بوون. ئەوەی دەبێتە جێی پرسیار ئەوەیە چۆن نەرمین دوای ئەنجامدانی ئەو کارە، توانیویەتی خۆی بگەیەنێتەوە ژێر دەسەڵاتی دوژمن و خۆی دەرباز بکات لەو کارەساتە جەرگبڕ و ترسناکە؟ پرسیاری لەوە گەورەتر ئەوەیە لەو ساڵانەدا نەوشیروان مستەفا کە بە یەکێک لەو سەرکردانە بەناوبانگ بووە کە چاوپۆشیی لە هەڵەیەکی بچووکیش نەکردووە نەک هەڵەیەکی  گەورە، بەتایبەت تاوانی لەو جۆرە! پاشان پێش ئەم تاوانی ژەهرخواردکردنە، تاوانی تریش ڕووی داوە و بە کەمترین کات بەسەر تێپەڕبوونی تاوانەکەدا، تاوانبار بە سزای گەل و شۆڕش گەیەنراوە، لە هەمان کاتیشدا بە زووترین کات گوێبیستی ئەو هەواڵە بووە، هۆکاری بێدەنگیی نەوشیروان مستەفا لەو تاوانەدا چی بووە؟ ئایا نەوشیروان مستەفا نەگەیشتۆتە سەر ئەوەی بڕیاری سزادانی نەرمین دەربکات و نەرمین خۆی دەرباز کردووە؟  یان کارەکان لە تاریکیدا و لەپشتی پەردەوە ئەنجام درابن؟ خۆ ئەگەر وا بێت، نەرمین دوای ماوەیەک گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی. پاشان تاوانێکی گەورەی لەو جۆرە، جێی لێخۆشبوون و لێبوردەیی نییە، هۆکاری چییە نەرمینی خێزانی جەباری عەلی عەوێز دوای ساڵانێکی زۆر لە سلێمانیدا ژیاوە و لەو خانووە چۆڵەی دووره شاردا بە سزا نەگەیەنراوە و نەکوژراوە، واتە لەدوای ڕاپەڕینی سەرتاسەری ئازادکردنی کوردستان کوژراوە، کە ماوەیەکی درێژخایەنە دوای ئەنجامدانی ئەو کارەساتە گەورە و ترسناکە؟

ئایا نەرمین هێندە پاسەوانی ڕژێمی لەگەڵدا بووە بۆ پارێزگاریکردنی و ماڵەکەی لەنێو سەنتەری شاردا بووە تاکوو دەستی هێزی پێشمەرگەی

پێ نەگات؟ کە بە پێچەوانەکەیەوە ماڵی نەرمین لە گەڕەکی سەرکارێز و چۆڵەوانیدا بووە و ماڵەکەشی بەتەنها بەتەنیشت چوار ماڵدا بووە. هەر لەو ساڵانەشدا هێزی پێشمەرگە تاوانبارانی زۆری بە سزای گەل و شۆڕش گەیاندووە و نەرمینیش تەنها لەگەڵ ئافرەتێکی بەساڵاچووی (دایکی جەباری هاوسەری) و کوڕ و کچێکیدا ژیاوە، بۆ لەبریی ئەنجامدانی ئەو تاوانە، بە سزای گەل و شۆڕش نەگەیەنراوە؟

یان کاتێک جەباری عەلی عەوێز دەستگیر دەکرێت و زیندان دەبێت، داوا لە شۆڕش دەکات بەوەی گەر بەڵگە لەسەر ژنەکەی هەیە، ئازادی بکەن بەو مەرجەی جەبار منداڵەکانی و دایکی بە بارمتە دابنێت لای شۆڕش و بچێتەوە شار نەرمینی خێزانی بکوژێت، هۆکاری چییە ڕێگر بوون لەبەردەم پێشنیارەکەیدا؟ کاتێکیش بۆیان ڕوون بووەوە جەباری عەلی عەوێز بێتاوانە، بۆچی کوژرا و کەسێکی بێتاوان لەبریی تاوانبارێک باجی کۆتایی ژیانی بدرێت؟ گەر جەباری عەلی عەوێز تاوانبار بوو، بۆچی لە ئێستەدا بە پێشمەرگەی شەهید خانەنشینە؟

کاتێک نەرمین ئەم تاوانەی ئەنجام دابێت، دەبێت لەلایەن دوژمنەوە پاداشتێکی گەورە و بەنرخ کرابێت. وەک دکتۆر سالار باسیرە لە پەرتووکی کوشتن لە عێراق بە ژەهری سالیۆم و تراژیدیاکەی سیروانەی ناوچەی مەرگە لە کوردستاندا دەڵێت: نەرمین دوای ئەنجامدانی تاوانەکە و گەڕانەوەی بۆ شار، لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە پاداشتێکی گەورەی وەرگرت. هەروەها تیکۆشەری دێرینی فەرماندە پشکۆ نەجمەدین لە پەرتووکی ئەزموون و یاد، ئاڵای شۆڕش و حیکایەتەکانی زینداندا بە هەمان شێوە دەڵێت: ژنەکەی جەبار خۆی دەرباز کردبوو، پاداشتی خۆی لە بەعس وەرگرتبوو. گریمان نەرمین ئەو هەموو پاداشتەی لە ڕژێم وەرگرتبێت، بۆچی لە خانوویەکی ڕووخاودا ژیانی بەسەر بردووە و بۆ بژێویی منداڵەکانی لەلایەن خەڵکەوە یارمەتی دراوە؟ ئەمانە هەموو پرسیارگەلێکن بێ وەڵام ماونەتەوە. سەرباری ئەوەی خۆشم لەم چیرۆکە تێنەگەیشتووم، بەڵام

هەندێک یادەوەری هەیە نابنە جێگەی گومان و پرسیارکردنی بێ وەڵام، ئەوەی لێرەدا وەڵامەکەیم وەرگرتووەتەوە، بکوژەکەی نەرمینە. بێستوونی تەسجیلات هاوڕێی گیانیبەگیانی جەباری عەلی عەوێزە و زۆرترین کاتەکانی لەگەڵ جەباردا بەسەر بردووە و زۆرترین یادەوەریی هاوڕێیەتیی لەگەڵ جەباردا هەبووە و تێکەڵی تەواوی خانەوادەکەیەتی و دەکرێت بڵێین لەگەڵ نەرمین و جەباردا وەک خوشک و برا بوون و سۆز و خۆشەویستیی نێوانیان پێناسەی نەبووە، چونکە ئەوەی من بزانم جەباری عەلی عەوێز لەگەڵ هەموو هاوڕێکانیدا تێکەڵیی خێزانیی هەبووە و کەسێک بوو هەمیشە هاوڕێکانی سەردانیان کردووە و لە ماڵەکەیدا نەرمینی خێزانی خزمەتی دەکردن، لەگەڵ ئەوەشدا دوای ڕاپەڕین بە دەستڕێژیی گوللەی کلاشینکۆفی بێسووتنی تەسجیلات، نەرمین دەکوژرێت! کەواتە لێرەدا پاڵەوانی چیرۆکەکە هێندەی نەماوە بێستوون بێت. دەمەوێت چاوێک بە نەخشەی ئەم پاڵەوانەی مەیداندا بخشێنم، ئاخۆ لەنێو ئەم هەموو ڕۆژگارەی نێو ئەم هەموو ساڵەدا کە تێپەڕی بەسەر ئەم تاوان و کارەساتە جەرگبڕەی تاوانی گوندی سێروانە، بۆچی نەرمین نەکوژرا؟ تەنها پاڵەوانی نێو شۆڕش، بێستوون بوو؟ واتە شۆڕش نەیدەتوانی ئەو کارە ئەنجام بدات و بێباکانەش وەک سزادانی تاوانبارەکانی تر، لە ئێزگەی دەنگی کوردستاندا بڵاو بکرێتەوە؟ ئەمە بیروڕای بێستوونی تەسجیلات خۆیەتی، هۆکاری کوشتنی نەرمین بە پاڵەوانێتیی خۆی دەزانێت و دەڵێت: خۆم کوشتوومە! وەک خۆی دەڵێت، داواکاریی جەباری عەلی عەوێز بووە، ئەمە لە کاتێکیشدا هیچ بەڵگەیەکی بۆ دوای خۆی نەخستۆتە ڕوو، تەنها ئەوە نەبێت دەڵێت: کاتێک لە مزگەوتی عەلی کەمال تاوانباران بە سزای گەل و شۆڕش دەگەیەنران، من لەلایەن ملازم عومەرەوە نێردرام و لەگەڵ دوو هاوڕێی تری پێشمەرگایەتیمدا داوام کرد کە بچم نەرمین بێنم و چووین هێنامان بۆ مزگەوتی عەلی کەمال. کاتێک بڕیاری کوشتنی دەرکرا، من داوام کرد خۆم بیکوژم. دواتر بردمە سەر شەقامی شەستییەکەی سلێمانی و کوشتم. پرسیارێک بۆ کاراکتەری

بکوژی نەرمین بکرێت، هۆکاری چییە لە بڵاوکردنەوەی پاڵەوانێتیی خۆی لە کوشتنی نەرمیندا، ئایا بڵاوکردنەوەی ئەم هەواڵە بە قارەمانێتی و مەزنیی خۆی دەزانێت؟ ئەمە لە کاتێکدا هەزاران تاوانبار بە سزای گەل و شۆڕش گەیەنراون و هەموو بە ناوی شۆڕشی حیزبەکانەوە ناو دەبرێت؟ دەبێت مەبەست لێرەدا چی بێت، بێستوون شانازی بەم پاڵەوانێتییەوە دەکات؟ ئایا پێش ئەوەی ئەم ئافرەتە بکوژێت، وەک خۆی دەڵێت: پێش ئەوەی نەرمین بکوژم، داوای لێ کردم بەوەی خۆی پۆشتە بکاتەوە و توند عەباکەی لە خۆی پێچایەوە، کاتێکیش پێش ئەوەی فیشەکی ئاراستە بکەم، نەرمین وتی: بێستوون، سەیرم بکە و بینێ بە نێوچەوانمەوە. لێرەدا بکوژی ئەم ئافرەتە باس لە قارەمانێتیی ئەو دەکات و باس لە پاڵەوانێتیی نێو مەیدانی خۆی دەکات کە لوولەی تفەنگەکەی ئاراستەی نێوچەوانی ئافرەتێکی تەنها کردووە!

ئایا ئەگەر نەرمین لە بواری کۆمەڵایەتیدا خاوەنی خێڵ و عەشرەتێکی گەورە و زۆر بووایە، بێستوون هۆکاری گوللەبارانکردنی نەرمینی دەگرتە ئەستۆی خۆی؟ یان لە نزیکەوە ئاگادار بووە کە نەرمین بێکەس بووە و بێمنەت بووە لە باسکردنی گوللەبارانکردنی؟ ژیان هەموو بوونەوەرێکی جۆراوجۆری تیا دەژی و سروشتی هەموو سیفاتەکان لە مرۆڤدا جیاوازن و چوونیەک نابن، کەواتە دەبێت ڕەچاوی هەر شتێک بکرێت کە چاوەڕواننەکراو بێت، بۆیە پرسیاری زیاتر بەدوای خۆیدا دێنێت، چونکە ئەم کارەساتە و ئەم تاوانە گەورەی ژەهرخواردکردنە و پەیوەندیی ئەم ئافرەتە بە ڕژێمەوە، لەدوای ڕاپەڕین کە هەموو دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێمی بەعس دەستی بەسەردا گیرا، نەرمین هیچ «مەلەف»ێکی بەر دەستی هاوڵاتییان و شۆڕش نەکەوتووە. چۆن دەبێت کەسێک تاوانی گەورەی لەو جۆرەی ئەنجام دابێت و پاداشتی زۆری لەبریی ئەو تاوانەدا لەلایەن ڕژێمەوە وەرگرتبێت و هیچ مەلەفێکی پەیوەندیکردنی بە ڕژێمەوە نەبووبێت و ئاشکرا نەبێت؟ دادگایکردنی تاوانباران لەلایەن بەرپرسێکی خاوەن ئەزموونی سیاسیی خەباتی ژێرزەمینی و خەباتی چەکداریی شاخ کە لە ڕابردووی

ئەو هەموو ئەزموونە دژوارەی ملازم عومەر کە بەرپرسی مەکتەبی عەسکەریی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بووە، چۆن هەر ئاوا ئاسان کەسایەتیی خۆی لەنێو ئاپۆرەی جەماوەردا لەدەست بدات و ئافرەتێکی تاوانبار بەبەر چاوی حەشامەتەوە تەسلیمی کەسێک بە ناوی پێشمەرگەی دێرینەوە بکات و دواتر گوللەبارانی بکات؟ مەبەست لە پێشمەرگەی دێرین، واتە بە ڕاست و دروست ئەو پێشمەرگەیە لە ڕابردوودا و لە سەردەمی خەباتی شاخدا بە کردار پێشمەرگە بووبێت، بەڵام کاتێک یەکێتیی نیشتمانی لە سەرەتای دەستپێکردنی دانوستاندا بوو لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا، بێستوونی تەسجیلات سەرقاڵی دووکانەکەی بوو، سروودی نیشتمانیی بە دەنگی بەرز بۆ خەڵکی بڵاو دەکردەوە و ڕیکلامی مفاوەزاتی دەکرد. ئەوکات کەم تا زۆر ئێمە بۆ کاری شۆڕش دەهاتینەوە بۆ شار، ئاوات عەبدولغەفوور وەک «لیژنەی تەنسیق» لەنێوان یەکێتی و ڕژێمدا بوو، ئایا لێرەدا ملازم عومەر پەلەی بێسنوور و بێ بەڵگەی لە تاوانبارکردن و کوشتنی نەرمیندا کردبێت؟ یان بکوژەکەی نەرمین وەک پاڵەوانێکی خەیاڵیی نێو فلیمەکان و ڕۆڵی پاڵەوانێتیی ڕۆستەمی زاڵی گێڕابێت و ناڕاستگۆیی بە مێژووی ملازم عومەرەوە کردبێت؟ خۆ ئەگەر واش نییە، هیچ بەڵگەیەک لەبەر دەستدا نییە بۆ کۆتاییهێنان بە ژیانی ئافرەتێک کە پێش ئەوەی بکوژرێت، بە هاوڕێی هاوسەرەکەی بڵێت: با خۆم پۆشتە بکەم و عەباکەم بدەم بە سەرمدا، نەبا دوای کوشتنم؛ جەستەم دەربکەوێت!

لێرەدا نامەوێت زیادەڕەوی لە مێژووی ئەم پاڵەوانەدا بکەم، چونکە جگە لە کوشتنی ئافرەتێک، مێژوویەکی دیکەی ئەم جەنگاوەرە و ئەم پاڵەوانەم نەبیستووە کە بۆخۆم هێندە مێژووی سەروەریی تێکۆشەرە دێرینەکانم بینیوە و بیستووە، شەرم لە فیشەک تەقاندنی کەسێکی لەو جۆرە بەرامبەر بە ئافرەتێکی تاق و تەنها و بێکەسی سەر شەقامێکی دوورە شاری سلێمانی دەکەم.

ژیان بەردەوامە و نەوە لەدوای نەوە لەدایک دەبن و ئەوەی کە بینیمان و ئەوەشی کە بیستمان، دەکرێت بڵێین: تەنها بوو بە چیرۆکێک

لە یادەوەرییەکانماندا، بەڵام کام چیرۆک و کامە یادەوەری؟ هەر لە سەرەتای دەستپێکردنیەوە تاکوو کۆتاییەکەی، وشەکانم بەگومانەوە لەنێو نووسینەکانمدا بەرجەستە بوون و وەڵامی ڕاستەقینەم وەرنەگرت، ئاخۆ ئەمە خەون بوو یان حەقیقەتی ڕووداوێکی ڕاستەقینەی نێو ئەزموونی شۆڕشێک کە هەزارەها خەباتگێڕ قوربانیی بۆ داوە؟ گومان لەوە ناکرێت شۆڕش بەبێ هەڵە و کەموکوڕی نابێت، هێندەی شۆڕشی یەکێتی لە خزمەتی گەل و نیشتماندا بووە، مەحاڵە هیچ حیزبێکی تر جێگرەوەی ئەو مێژووە بێت، لێ دەکرێت هەندێک تاوان لەپشتی پەردەوە کرابێت و لە ژووره تاریکەکاندا نەخشە و پلانیان بۆ کێشرابێت و داڕێژرابێت. کۆتایی چیرۆکەکەش، جەباری عەلی عەوێز بە چەند دەستڕێژێک دەکوژرێت و پاش چەند ڕۆژێک جەستەی شێواوی دەخرێتە بیرێکەوە و دۆسیەکەی دادەخرێت و کۆتایی بە چیرۆک و نهێنییەکانی دڵی نەرمینش هێنرا و خرایە بیرێکی قووڵتر لە بیرەکەی جەبارەوە...

## داستانی قەیوان ماوەت

جەنگی عێراق و ئێران کە پتر لە هەشت ساڵی خایاند، هەردوو وڵاتی دژ بە یەکتر لە ڕووی ئابووری و هێزی سەربازییەوە شکستخواردن و ماندووبوونیان بەخۆوە دەبینی و دەسەڵاتی ڕژێمی بەعس ڕۆژبەڕۆژ لاوازتر دەبوو، بەداخەوە سەرکردەکانی لەمەڕ شۆڕشەکانی ئێمە وەک پێویست ئەو هەلەیان نەقۆستبووەوە و دوژمنیش هەر دوژمنە، نابێت بڕوا و متمانەی زیاتری پێ بکرێت. هەموو حیزبەکان پەیوەندیی دۆستانە و پەیوەندیی ستراتیژییان لەگەڵ ئێران و تورکیا و سوریادا هەبوو، بەڵام لە کاتی هاوکاری و پێویستیبوون پێیان، دەستبەرداری حیزبەکان دەبوون و پشتیان تێ دەکردن.

یەکێتی ئەگەرچی لە ڕابردوودا شەڕی ئێرانی کردبوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٦دا پەیمانی ڕێککەوتننامەیان بەست و ئێران بەڵێنی هاوکاری

و ناردنی ئازووقه و تەقەمەنی و چارەسەری بریندار و پێویستییەکانی هێزی پێشمەرگە دابین بکات. دوای ئەوەی کە یەکێتی کەوتە شەڕی سەخت و ڕووبەڕووی هێزێکی زەبەلاحی ڕژێمی بەعس بووەوە، ئێران پشتی لە یەکێتی کرد و خاوەنی پەیمان و ڕێککەوتننامە و بڕیار و بەڵێنەکانی خۆی نەبوو. ئەم ڕێککەوتنەی یەکێتی و ئێران، ڕژێمی بەعسی تووڕە کردبوو و ڕژێمی بەعس بە هۆی جەنگی ئێرانەوە لە زۆر شوێندا شکستی سەربازی هێنابوو، دەیویست لە سنووری ئازادکراوی نێو هێزی پێشمەرگەوە هێرشی سەربازی بکاتە سەر بازگە و بنکەکانی پاسداری ئێران، کە لە دۆڵەڕووتەوە دەستی پێ دەکرد و لە سەفرە و زەروون کۆتایی پێ دەهات. دۆڵەڕووت سەربازگەی گەورەی «سارداو»ی لێ بوو کە نزیک شاری سلێمانی بوو، کانی بەردینە و کانی گۆران و گوندی فەیاڵ، دواتر بە کەڵکی قەیواندا و چیای دوو برا کە بە «قوتەی دوو برا» ناو دەبرا و دواتر دێمەوە سەر چیا و گوندەکانی تر کە هێزی پێشمەرگە پتر لە سێ مانگ دووچاری شەڕێکی قورس و ترسناک و سەختی خوێناوی بوو، کە بە خوێنی پتر لە (١٠٠) شەهید بە شکستەوە شەڕەکان کۆتاییان پێ هات.

لەو کاتەدا بارەگای هێزی پێشمەرگە لە بەری دۆڵێوە، هەر لە یەکەم گوندی «باڵخێ»وە تاکوو سەرگەڵوو و بەرگەڵوو، بارەگای هێزی پێشمەرگە و سەرکردایەتی و مەڵبەندی دوو و نەخۆشخانە و زیندانی بەرگەڵووی لێ بوو، کارێزەی کۆن بە چەند کیلۆمەترێکی کەم لە ناحیەی کارێزەوە دوور بوو، من وەک فەرماندەی مەفرەزەی کەرتی پێنجی شەهید هاوڕێ جەبار، بۆ دڵنیابوون لەو کەسانەی لە شارەوە دەهاتن، پرسگەیەکی بچووکمان دانابوو، «لیوا ڕوکن عەبدولکەریم ئەلخەزرەجی» کە سەرۆکفەیلەقی یەک بوو، لەلایەن ڕژێمەوە پێی ڕاگەیەنرابوو کە وەفدێک بنێرێت بۆ لای «مام جەلال» کە حکومەتی عێراقی دەیەوێت لەو سنوورانەوە هێزی سەربازیی خۆی لە دژی ئێران جووڵە پێ بکات بەرەو سەفرە و زەروون کە ئەو کاتە مەرزی نێوان عێراق و ئێران بوو. یەکێتی سوودمەندی گەورەی ئەو مەرزە

بوو. من لەگەڵ چوار پێشمەرگەدا لە پرسگەکەدا بووم و وەڵاممان بۆ هات دوو ئۆتۆمبێلی خاکیی سەربازیی جۆری لاندگرۆزەر بە چەند ئەفسەرێکەوە دەیانەوێت سەردانی «مام جەلال» بکەن. ئێمەش سەرووی خۆمان ئاگادار کردەوە و بە ئۆتۆمبێلی تایبەتیی سەرکردایەتی هاتن بەدوایاندا و سەردانی «مام جەلال»یان کردبوو. داواکاریی وەفدەکە لە سەرکردایەتیی یەکێتی ئەوە بوو کە ڕژێمی بەعس هیچ پەلامارێکی هێزی پێشمەرگە نادات و ئەو سنوورانەیان بۆ چۆڵ بکەن کە بەدەست هێزی پێشمەرگەوەیە، بەڵام ڕێککەوتنەکە نەکرا و ڕژێمی بەعسیش بڕیاری هێرشکردنە سەر تەواوی سنوورەکانی هێزی پێشمەرگەی دا و لە مانگی سێپتەمبەری ساڵی ١٩٨٦دا شەڕ لە دۆڵەڕووتەوە دەستی پێ کرد. یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەفەرمی بڕیاری شەڕی ڕاگەیاند و هەندێک لە هێزەکانی خۆی کۆ کردەوە کە بریتی بوون لە تیپی ٢١ی کەرکووک و تیپی ٨٥ و ٨٦ و ٨٧ی قەرەچوغ و دەشتی هەولێر و تیپی ١٣ی سۆران و ٢٥ی خاڵخالان و ١٩ی کۆڕەک و ٧٨ی کاروخ، تیپی ٥١ی گەرمیان و ٥٣ی شێروانە و ٥٥ی قەرەداغ و ٩٣ی کۆیە، تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون و ٣٧ی شارباژێڕ و ٣١ی سلێمانی؛ بەشداریی ئەو شەڕەیان کرد، جگە لە زۆربەی فەرماندەی کەرت و جێگری کەرت و فەرماندەی مەفرەزە و زۆرترین پێشمەرگە. لێرەدا ناوی هەندێک لە سەرتیپەکان بەپێی شەڕەکان و ناوی هەندێک لە بەرپرسی سەربازیی مەڵبەندەکان دەهێنم لە یەکەم شەڕی قەیواندا، کە بریتی بوون لەم سەرتیپ و بەرپرسی مەڵبەندانە: شۆڕش ئیسماعیل، مستەفا چاوڕەش، سامان گەرمیانی، سەلاح چاوشین، عەولا بۆر (شێرە بۆر)، سەرهەنگ ئیسماعیل، مام غەفوور (مامە غەفە)، ڕەهبەری سەیید ئیبراهیم، شێخ جەعفەر، عومەر عەرەب، سەلاحی حاجی عەلی (سەلاح چاوزەق)، نەوزادی عەبەی تەقێ، سابیر ڕەسووڵ، ئازادی حەمەی گەمحان، سالارە چاوشین. ئەم هێزانە بە بڕیاری سەرکردایەتی کۆ کرابوونەوە، لە هەر سنوورێکی ئەم تیپانەدا چەند مەفرەزە و کەرتێکیان بەجێ هێشتبوو، کەرتی ئێمە لە گوندی «باڵغ»

بوو، شۆڕش ئیسماعیل سەرتیپی ئێمە بوو، شەڕ لە چیاکانی دەوروبەری دۆڵەڕووت و کەڵکی قەیوان دەستی پێ کرد، خەڵکی گوندی قەیوان هەندێکیان چۆڵیان کردبوو، هەندێکیشیان لەوێ مابوون. لە ڕاستیدا خەڵکی تەواوی هەموو گوندەکان ورەیان زۆر لە هێزی پیشمەرگە زیاتر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ورەی زیاتریان بە هێزی پێشمەرگە دەدا و خواردەمەنییان ئامادە دەکرد و بریندارەکانیان بە وڵاغ و تراکتۆر دەگواستەوە بۆ نەخۆشخانەی شۆڕش کە ئەو دەمە لە بەرگەڵوو بوو، نەخۆشخانەیەکی حیزبی دیموکراتی ئێرانیش لە گوندی گەڕەدێ بوو، هاوکاریی هێزی پێشمەرگەیان دەکرد و هەندێک لە بریندارەکانیان چارەسەر دەکرد. ڕژێمی بەعس لە دۆڵەڕووت و شارباژێڕ، لە گوندی سیتەکەوە، ڕاجیمە و تانک و زرێپۆش و جگە لە زۆرترین چەکداری کورد و تەواوی هێزی سەربازیی خۆی لەو ناوەدا کۆ کردەوە. وا پێویستی دەکرد هەندێک پێشمەرگەی کەرتی ئێمە بۆ پاراستنی گوندەکانی باڵخ و گاپیلۆن و ئەو سنوورە بچن، چونکە ڕێگەی سەرەکیی سەرکردایەتیی یەکێتی بوو، بەتایبەت تەواوی مەکتەبی سیاسی و بنکەی ڕاگەیاندن و نەخۆشخانەی شۆڕش و زیندانی بەرگەڵوو، جگە لەوەی لە شاخی هەلاج و دابانەوە پەی پێ دەبرا، بەڵام ڕێی سەرەکی و هاتوچۆی ئاسایی ئەو ڕێگایە بوو کە لە گوندی کارێزەی کۆنەوە ڕاستەوخۆ تاکوو گوندی یاخسەمەر کە مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی لێ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بارەگای «مام جەلال» لە گوندی یاخسەمەر بوو و نیوەیان لەوێ بمێننەوە. چەند پێشمەرگەیەکیان لەگەڵدا ناردم، بریتی بوون لەم ناوانە: هێرش ناسراو بە «شازین»، غەفووری حاجی ڕەشید، ڕێبواری مام کوێخای کانی سپیکەیی (لەدوای ڕاپەڕین لە شەڕی ناوخۆدا بە دەستی چەکدارانی حیزبە ئیسلامییەکان شەهید کرا)، نوورەدینی برام، ئازاد کەرکووکی، محەمەد قارەمان (چەند مانگێک ببوو بە پێشمەرگە. لەگەڵ گەیشتنمان بۆ شەڕەکە، دوای دوو کاتژمێر تفەنگەکەی فڕێ دابوو و ڕایکردبوو، تاکوو ئێستەش نەمبینیوەتەوە)، کاروانە قەڵەو، شوانەی یوسفی عەبەکە، هێمن؛ چووینە

گوندی قەیوان. تیپی ٢١ی کەرکووک بەسەر چیای دوو برا (قوتەی دوو برا)وە بوون، لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕ، دوو شەهیدیان دابوو. عەبەڕەق کە جێگری کەرتی دووی تیپی ٣١ی سلێمانی بوو، بە خۆی و حەوت پێشمەرگەوە بەسەر کەڵکی قەیوانەوە بوو. چونکە ئامادەکاریی باش نەکرابوو، سەرەتا عەبەڕەق بەو هێزە کەمەوە چووبووە سەر شاخ، نەخشە وا داڕێژرابوو شەو ئێمە بچین بەهانایانەوە، بەڵام لەبەر بوردوومانکردنی سەختی ڕاجیمە و گوللە تۆپ و تانک و تەقەی زرێپۆشەوە، مستەفا چاوڕەش پێی ڕاگەیاندم ئەمشەویش نەچینە لای عەبەڕەق، چونکە سەرکەوتنمان بۆ سەر شاخ هەر وا ئاسان نەبوو، بە درێژایی ڕۆژ فڕۆکەی هەلیکۆپتەر و سیخۆ و تەواوی تۆپ و تانکەکانیان بۆ تەنها کاتژمێرێکیش بواری نەدەدا و ناو گوندەکەشی تۆپباران دەکرد کە ژن و منداڵ و خەڵکی بەساڵاچووی تیا مابوو. لە دیوی ئەودیویش هێزێکی سەربازیی زۆر بەپیادە سەر دەکەوتن و هێرشیان دەکرد، سەر ڕێگای شاخ هەر چی درەخت و دەوەن هەبوو گڕیان گرتبوو، بە چوونی ئێمەش، نەک چەند کەسێک بەڵکوو هەمووومان شەهید دەکراین، چاوەڕێی ئەوە بووین بۆردوومانکردن کەمتر بێت و ئێمەش بچینە لای عەبەڕەق. بۆ سبەی ڕۆژ بووەوە، جارێکی تر بۆردوومان دەستی پێ کرد، بەڵام زۆر خراپتر، لەناکاو هەشت هەلیکۆپتەر هاتنە سەر گوندەکە و بێ دەستپاراستن لە تەواوی خەڵکی ئاوایی، تەنانەت کانیی ژنانیشی بۆردوومان دەکرد. ئێمەش لەگەڵ هێزەکەی مستەفا چاوڕەش کە بەرپرسی سەربازیی مەڵبەندی دوو بوو، ئەو هێزەی تیپی ٢١ی کەرکووک کە لەسەر شاخ بوو، چەند پێشمەرگەیەکی لە خوارەوە لەگەڵ ئێمەدا بوون، بۆ خۆپاراستن لە بۆردوومانی کۆپتەرەکان بڵاوەمان لێ کرد و هەریەک بە لایەکدا چووین. من زۆر خەمی شوانەی یوسفی عەبەکەم بوو (ئێستە لە هۆڵەندا دەژی)، زۆر منداڵ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بوێر و چاونەترس بوو، پێکەوە چووینە قەدپاڵی شاخەکە و کۆپتەرەکان بە شێوازێک نزم ببوونەوە کە بۆردوومانیان دەکرد بەئاسانی دەبینران، منیش زۆر بەتوندی ملی شوانەم گرت، بۆ

ئەوەی نەجووڵێت و لەناو دەوەنەکەدا نەمانبینێت. ئێمە کلاشینکۆفمان پێ بوو، تەقەمان بکردایە، هەروەک ئەوە وا بوو بەردی تێ بگرێت. دوای بۆردوومانێکی زۆر و برینداربوونی دوو منداڵ و ژنێک لە گوندی قەیوان، کۆتایی هات و هەریەکەمان گەڕاینەوە دەوروپشتی گوندەکە و سەرقاڵی ئەوە بووین چۆن شەو بچین بەهانای عەبەڕەقەوە. یەکێک لە نەخشە و پلانە جوانەکانی عەبەرەق ئەوە بوو ئەو هەموو کۆپتەر و زرێپۆش و تانکەی بۆردوومان و تەقەیان لە سەنگەرەکانی ئەو هێزە بچووکەی عەبەڕەق دەکرد، ئەو هەموو هێرشە سەربازییەش دەکرایە سەریان، سەنگەرەکانیان چۆڵ نەدەکرد، پلانەکەشیان ئەوە بوو لە کاتی بۆردوومانکردندا ئەمان لە ئەشکەوتێکی بچووکدا بە ڕۆژ خۆیان حەشار دەدا و بە شەویش دەهاتنە دەرەوە و ڕووبەڕووی ئەو هێزە زەبەلاحەی ڕژێم دەبوونەوە لە خوارەوە. ئێمە دیمەنی سووتاندنی دەوەن و تۆزی ئەو بۆردوومانەیەمان دەبینی کە بە گڕی ئاگرەوە لەنێو ئەو هێزە کەمەی عەبەڕەقدا دەتەقینەوە. مستەفا چاوڕەش وتی: «عەبەڕەق ڕۆحم بەقوربانت بێت، چەندە قارەمانیت!»

ئەو هێزەی لەوێ بووین، هێندە ماندوو ببووین ئارەزووی تەنها خولەکێک خەومان دەکرد. بە پێشمەرگەکانم ڕاگەیاند کەمێک پشوو بدەین و بخەوین، چونکە شەو دەچینە سەر شاخ. هەندێکمان ڕاکشاین و هێشتا چەند خولەکێکی کەم بوو خەومان لێکەوت، گوللەتۆپێک لە نێوانماندا تەقییەوە و لە نێوانیاندا من بریندار بووم. ئازاد کەرکووکی و غەفووری حاجی ڕەشید هەر چۆنێک بێت تاقم و تفەنگەکەیان بۆ هەڵگرتم و بەرەو گوندی باڵخ گەڕاینەوە و ئەو هاوسەنگەرانەی لەگەڵمدا نێردرابوون، بێئاگا بووم لێیان و بەبێ فەرماندە مابوونەوە.

کە گەیشتینە گوندی باڵخ، عومەر عەرەب کە فەرماندەی کەرتەکەمان بوو، شەوانە بە مەفرەزە دەچووە ناو ناحیەی کارێزەوە، دەستی لە سەرباز و چەکدارەکانی ڕژێم دەوەشاند. عومەر عەرەب یەکێک بوو لەو فەرماندانەی شارەزاییەکی تەواوی هەبوو لە جۆری مەفرەزەی تایبەت بۆ سەر نەیاران

و دوژمن، له دووره‌وه كه منی بینی، به‌په‌له به‌ره‌و رووومان هات و باوه‌شی پیدا كردم و وتی: «ئه‌وه برینداری؟ ئه‌ی براده‌ران چۆنن! كه‌س شه‌هید نه‌بووه؟؟»

منیش هینده خوینم لی رۆشتبوو، نه‌مده‌توانی وه‌لامی بده‌مه‌وه، به‌لام غه‌فووری حاجی ره‌شید پیی راگه‌یاند كه بارودۆخه‌كه ئیجگار ئالۆز و خراپ بووه، تیپی ۲۱ی كه‌ركووك دوو شه‌هیدیان داوه و هیزیكی كه‌می عه‌به‌ره‌ق له پیشه‌وه‌ی شه‌ردان و كه‌سیش ناتوانیت بچیت به‌هانایانه‌وه. عومه‌ر عه‌ره‌ب وتی جاریك پشوو بده‌ن. پیشمه‌رگه‌یه‌كمان له‌گه‌لدا بوو ناوی ئاكۆ بوو، باوكی ده‌رزیی له خه‌لك ده‌دا، ئه‌ویش هه‌ندیك شاره‌زایی له ده‌رزیلیداندا هه‌بوو، پییان ده‌وت دكتۆر ئاكۆ. له سه‌رده‌می شاخ و بی دكتۆری و بی مامۆستایی و ته‌نانه‌ت مه‌لای موسلمانیش، به قه‌سابیان ده‌وت دكتۆر و هه‌ر كه‌سیكیش سی ده‌قی قورئانی له‌به‌ر بووایه، پییان ده‌وت مه‌لا، یاسین و ته‌لقینی له كاتی پیویستدا ده‌خویند. ئیتر به‌و هۆیه‌وه ئاكۆ ببووه دكتۆر. مووكیشیكی گه‌وره‌ی پی بوو، پیشمه‌رگه له‌و سه‌رده‌مه‌دا وا بوو، ئاوینه‌یه‌كی بچووك و مووكیشیك بۆ ریش چاككردن، چونكه زۆر دره‌نگ خۆیان ده‌شت و ریشیان ده‌تاشی، ئه‌وه‌ش ببووه هۆكاری ریش هیشتنه‌وه‌ی زۆرینه‌یان و فلچه‌یه‌كی ددان شتن، به كیفی مه‌خزه‌نی كلاشینكۆفی نیو قه‌دیانه‌وه بوو، جاربه‌جار ریشی خۆی پی چاك ده‌كرد، ده‌یكرد به شوینی برینه‌كه‌مدا و هینده خه‌ریكی ده‌بوو، ئازاری جه‌سته‌م وای لی كردبووم په‌ی به مردنی خۆم به‌رم، به‌لام ئه‌و هه‌ر كۆلی نه‌ده‌دا و زیاتر مووكیشه‌كه‌ی ده‌كرد به‌ناو جه‌سته و شوینی برینه‌كه‌مدا، تاكوو ئه‌وه‌ی پارچه ئاسنیكی بچووكی گولله‌تۆپیكی ده‌رهینا و ئیتر رۆح جاریكی تر گه‌رایه‌وه به جه‌سته‌مدا و بی ئه‌وه‌ی شه‌رم له كه‌س بكه‌م، خه‌وم لیكه‌وت. پاش ماوه‌یه‌كی كه‌م كاتیك به‌خه‌به‌ر هاتمه‌وه، وام ده‌زانی خه‌وم لیكه‌وتووه، به‌لام هاوریكانم پییان وتم له كاتی ده‌رهینانی ئه‌و پارچه ئاسنه له‌هۆش خۆم چووم. یه‌كه‌م سه‌ركه‌وتنی رژیمی به‌عس له شه‌ر و نه‌خشه دارێژراوه‌كانیدا، له دۆله‌رووته‌وه ده‌ستی پی كرد و كه‌لكی

قەیوانی کۆنترۆڵ کرد و تیپی ۲۱ی کەرکووک پاشەکشەی بە هێزەکەی کرد و ئەوەندەی من ئاگادار بم پێش برینداربوونم، ئەو هێزانەی کەرت و تیپەکانی یەکێتی خاوەنی هێزێکی لەبننەهاتوو بوون، بەڵام ئاستەمە خۆڕاگرتن بەرامبەر هێزێک سەد جار لە هێزی خۆت مەزنتر. عەبە ڕەق لەو شەڕە جوامێرانەی کە کردبووی، دوو پێشمەرگەی بریندار و تیپی ۲۱ی کەرکوک دوو شەهیدیان دابوو، هێزی پێشمەرگەش لەو سنوورەدا شکستی هێنابوو و ڕژێمی بەعس بەردەوام لە هێرشکردندا بوو بۆ کۆنترۆڵکردنی تەواوی سنووری ئازادکراوی نێو هێزی پێشمەرگە.

## بڕیاری سەرکردایەتی و هێرشکردن بۆ سەر ناحیەی کارێزە

ڕژێمی بەعس دوابەدوای ئەوەی سەرکەوتنی بەدەست هێنا و ناوچەی دۆڵەڕووت و کەڵکی قەیوان و زنجیرە چیای ئەزمەڕ و سیتەک و نیوەی سنووری شارباژێر و پێشتر سوورەقەڵات و قەڵاچوالان و چوارتا و ماوەت و ناحیەی کارێزەی بەدەستەوە بوو، لەو شوێنانەشەوە بۆردوومانی هێزی پێشمەرگەی دەکرد و نەخشە و پلانی کۆنترۆڵکردنی تەواوی سنووری ئازادکراوی هێزی پێشمەرگەی دادەنا کە لە کونەماسی و گوندی باڵخ و گاپیلۆن و ولاخلول و دۆڵبێشک و چیای بایلۆسە تا دەگاتە سەر مەرزی سەفرە و زەروون، بۆ هێرشکردنە سەر سوپای ئێران.

لە ڕێکەوتی ۱۹۸٦/۹/۳، مەکتەبی سیاسیی یەکێتی بڕیاری گرتنی ناحیەی کارێزەی دا و شۆڕش ئیسماعیل وەک سەرتیپی ٤٧ی پیرەمەگروون، بەفەرمی بە هەموو کەرتەکانی ڕاگەیاند هێرش بکرێتە سەر ناحیەی کارێزە. عومەر عەرەب فەرماندەی کەرتی ئێمە بوو، ڕۆژێک پێش هێرشکردنە سەر ناحیەی کارێزە، کاتژمێر حەوتی ئێوارە کۆبوونەوەیەکی بە تەواوی پێشمەرگەی کەرتەکەمان کرد و لە کۆبوونەوەکەدا ڕایگەیاند کەرتی ئێمە کەرتێکی چالاکە و هەمیشە چالاکیی گەورە و زیانی زۆری بە ڕژێمی بەعس

گەیاندووە، پاشان ناحیەی کارێزە سنووری ئێمەیە و بۆ ئێمەش شەرمە کە قورسترین و گەورەترین ڕەبایەی دوژمن لەم شەڕەدا نەگرین، چونکە هێزێکی گەورەی هەموو تیپەکانی یەکێتی لە هەموو سنوورەکانەوە هاتوون و ئەوان نەشارەزان. ئەوەش بڕیاری مەکتەبی سیاسییە کە هێرش بکرێتە سەر ناحیەی کارێزە. ئەو ڕەبیەی کە عومەر عەرەب دەستنیشانی کردبوو، لەناو کارێزەدا بوو، بەرزترین و گەورەترین هێزی چەکداری ڕژێمی تیا بوو، هەر چواردەوری ڕەبییەکە لوغمرێژ کرابوو، تەنها ڕێگەیەکیان بۆ هاتوچۆی خۆیان هێشتبووەوە و ڕێگاکانی تریان تەلبەند کردبوو، لە بەرزاییەوە چوار بلاجکتۆری گەورەی ڕووناککەرەوەیان دانابوو، هەر چی بەوێدا تێپەڕیایە؛ بەئاسانی دەبینرا. ڕەبییەکە دەیڕوانییە سەر گوندی مۆکەبە. مۆکەبە گوندێک بوو لەسەر ڕێگەی ڕاستەوخۆی هەموو گوندەکانەوە بوو، کە لە پشتەوە لە گوندی قەیوانەوە دەستی پێ دەکرد تاوەکوو گوندەکانی باڵخ و کاپیلۆن و مالومە و یاخسەمەر کە مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی لێ بوو. هەر چەندە خۆشم هێشتا برینداریيەکم سارێژ نەبووبوو و هەر ئازاری هەبوو، بڕیاری لەو جۆرەی شۆڕش زۆر گرنگ بوو، لە کاتێکدا ئامادەییت تیا نەبووایە و بەشدار نەبوویتایە، دەبووە عەیبەیەک لەو هێرشە گەورەیە کە مێژوویەکی زۆر گرنگی نێو شۆڕش بوو. عومەر عەرەب لە کۆبوونەوەکەدا ڕای گشتیی پێشمەرگەی کەرتەکەمانی وەرگرت و پرسیاری کرد: کێ ئامادەیی تیایە کە دەستەی هێرشبەر بێت؟ تەنها یەک دوو پێشمەرگە ڕەزامەندیی خۆیان دەربڕی، یەکێک لەوانە ناوی هێرش (شازین) بوو، عومەر عەرەب زۆر زویر بوو کە پێشمەرگەکان بێ هەڵوێست بوون. هۆکاری ئەوەی ئەو ڕەبیە ترسناک بوو، هەندێک چەکداری ناوچەی شارەزوور و زەڕایەنی تیا بوو (لەسەر ڕێی عەرەبەت و ڕاستەڕێی سەرەکیی شارەزوورە)، عەشرەتێکی گەورە و دوژمنایەتییان هەیە، زۆریان بە هۆی دوژمنایەتییەوە پشتیان کردبووە شۆڕش و پاڵپشتی ڕژێمی بەعس بوون، شارەزایی تەواویان لە تفەنگ تەقاندن و جۆری بۆسەنانەوە و توندڕەو بوون، دەستکەرەوە

و شارەزای تەقەکردنیان تیا بوو، لە کاتی کۆبوونەوەکەشماندا بەردەوام دەنگی گوللەتۆپ و ئارپیجی و بێکەیسی و تەقەی تفەنگی پێشمەرگە دەهات. عومەر عەرەب بەناچاری خۆی هەندێک پێشمەرگەی دەستنیشان کرد، بۆ ئەوەی زیاتر ورەی پێشمەرگەکان بەرز بکاتەوە، لەوانە: بەکر کە برای خۆی بوو، پێم وایە تەمەنی حەڤدە ساڵ دەبوو، نوورەدینی برای من و هێرش کە خۆی هەڵوێستی هەبوو، مەریوان و دلاوەرە شەل، ئازاد کەرکووکی، غەفووری حاجی ڕەشید، عەلی قلیاسانی فەرماندەی مەفرەزە بوو، منیش کە فەرماندەی مەفرەزە بووم، وەک لێپرسراوی ئەو چالاکییە و دەستەی هێرشبەر دەستنیشان کرام. هەر چەندە من لەگەڵ ڕای پێشمەرگەکاندا بووم و بە عومەر عەرەبم وت: ناهەقیان مەگرە، گرتنی ئەو ڕەبایە هەر وا ئاسان نییە و دڵنیاشم شەهیدمان دەبێت و بۆمان ناگیرێت. عومەر عەرەبیش پێشنیارەکەی منی پێ پەسەند بوو، بەڵام وتی: چارمان ناچارە و ناشکرێت بڵێین بۆمان ناگیرێت. ئەو سەردەمەش وا بوو، پێشمەرگە بیزانیبایە شەهید دەکرێت، وشەی «نەخێر» بەسەر زاریدا نەدەهات.

بۆ سبەی ئێوارە شۆڕش ئیسماعیل هەر پێنج کەرتەکەی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروونی کۆ کردەوە، جگە لە ئێمەش؛ کەرتی تیپی مەڵبەندی دوو و کەرتێکی تیپی ٢١ی کەرکووک و کەرتی تیپی ٢٥ی خاڵخالان، هەموومان نزیکی دوو سەد پێشمەرگە دەبووین. کەرتی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون، ئازاد وەندەرێنی و خلەبێدین و جەمال چاوشین فەرماندەییان دەکرد، بنکەی سەرەکیی ئیستخباراتی ناحیەی کارێزەیان پێ سپێردرا. ئێمە لە سەرەتادا کەرتی پێنجی شەهید هاوڕێ جەبار بووین، بەڵام لە تەشکیلاتی تیپدا بووین بە کەرتی یەک و کەرتی پێنج، وەستا مەجید بوو بە فەرماندەی کەرت. پاش ئەوەی وەستا مەجید شەهید بوو، مەلا خالید کرا بە فەرماندەی کەرت، بەڵام هێشتا دەستبەکار نەبوو، بۆیە کامیلی مام ڕەسووڵ کە خزمی خۆم بوو، وەک فەرماندەی کەرت گرتنی ڕەبیەی کارێزەی کۆنی پێ سپێردرا. سەلاحی حاجی عەلی و نەوزادی عەبەی تەقێ، وەک فەرماندەی کەرت گرتنی ڕەبیەی

ناو ناحیەی کاریزەیان پێ سپێردرا. لە کۆبوونەوە گشتییەکەدا شۆڕش ئیسماعیل ڕایگەیاند هیچ پێشمەرگەیەک تەقە نەکات، تاکوو عومەر عەرەب ئارپیجی نەتەقێنێت. شەو بەڕێ کەوتین و هەریەک بەپێی بەرنامەی خۆی جیا بووینەوە. دەنگی غەڵبەغەڵبی پێشمەرگە، چەکدارەکانی ڕژێمی بەئاگا هێنابووەوە، بەتایبەتی ئێمەش بە ڕووناکیی بلاجکتۆرەکان دەبینراین و ئەوانیش هەستیان پێ کردبووین و ئامادەباشیی خۆیان وەرگرتبوو. لە ڕاستیدا چەکداری ئەو ڕەبییانە شەوانە پێشمەرگەیان دەبینی و تەقەیان لێ نەدەکردن، چونکە ڕێککەوتنێک هەبوو بەوەی ئەوان جگە لەوەی کە چەکداری ڕژێمن، بەڵام هەقیان بەسەر پێشمەرگەوە نەبوو. کاتژمێر دوانزەی شەو ئێمە چووین لەدەوری ڕەبیەکەی پێمان سپێردرابوو، ئامادە بووین. من دەستەی هێرشبەرم جیا کردەوە و عومەر عەرەب و ئەبو فەلاح کە بە ڕەگەز عەرەبی باشووری عێراق بوو، سەربازی هەڵهاتووی سەربازگەی سارداو بوو، لە سەربازیدا خولی ئارپیجیی تەواو کردبوو، زۆر شارەزا بوو. عومەر عەرەب و ئەبو فەلاح کەوتنە ئارپیجی تەقاندن و لەگەڵ یەکەم ئارپیجی بە ڕووی ڕەبیەکەدا تەقی، ئەوان پێشتر هەستیان پێ کردبووین و خۆیان ئامادە کردبوو، بە چواردەوری خۆیاندا ئاگربارانیان دەست پێ کرد، بۆ چرکەساتێکیش مۆڵەتی ئێمەیان نەدەدا، تەنها ڕێگایەکیش هەبوو بۆ ئەوەی هێرشیان بۆ بەرین، بە گوللەباران و ئارپیجی و دۆشکە و گوللەهاوەن ئەو ڕێگەیان ئاگر تێ بەر دا، چواردەوری ڕەبییەکەش تەلبەند و لوغمرێژ کرابوو. هەر چەندە چەند جارێک هێرشمان بۆ دەکرد، بەڵام لە ترسی شەهیدبوونی پێشمەرگە، نەمدەتوانی ئەو بەرپرسیارێتییە هەڵبگرم. عومەر عەرەبیش بەردەوام ئارپیجیی پێوە دەنان. هێزی پێشمەرگە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا دەستیان گرت بەسەر بنکەی ئیستخباراتی ناحیەی کاریزە کە لەنزیکماڵەکان بوو، سەلاح حاجی عەلی (سەلاح چاوزەق) و

نەوزادی عەبەی تەقێ ڕەبیەی نزیک ماڵەکانیان کۆنترۆڵ کرد. کەرتی دوو کە ڕەبیەی کاریزەی کۆنیان پێ سپێردرابوو، ئەوانیش بە هەمان شێوەی ئێمەیان بەسەردا هاتبوو، نەیانتانیبوو دەست بەسەر ڕەبیەکەدا بگرن، ئەگەرچی کامیلی مام ڕەسووڵ فەرماندەی مەفرەزە و پێشمەرگەیەکی لێهاتوو بوو، ڕۆڵی فەرماندەی کەرتی دەبینی، بەداخەوە بەبریندارییش وەک هاوسەنگەرەکانی باسیان لێوە دەکرد، هێرشی زیاتری دەکرد و تاوەکوو لەنێوان پێشمەرگە و چەکدارەکانی نێو ڕەبییەکەدا ڕۆحی دەرچووبوو. سەد مخابن بۆ شەهید کامیلی مام ڕەسووڵ و گشت شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری. کاتێک دەبرێت بە خاک بسپێردرێت، جزدانەکەی هەندێک پارەی تێدا بوو، لەگەڵ سەعاتەکەی دەستی و مستیلەیەکی ئاڵتوونی لە دەستدا بوو، کەس نەیزانی کام پێشمەرگەی قارەمان لووشی دابوو! جێی سەرنجە ئێستە خەڵکی ڕەخنە لە دەسەڵات دەگرێت و دەڵێن گەندەڵی هاوڵاتییانی نائومێد و زویر کردووە. ئەوەی کە من باسی لێوە دەکەم، گەندەڵی نەبووە، بەڵکوو تاوانێک بووە، هاوسەنگەرەکەت سەرتاپای جەستەی خوێنی لێ بچۆرێت، هاوڕێکەی بتوانێت مستیلەکەی پەنجەی دەربهێنێت و شانازی بە جوانیی پەنجەی دەستی خۆی بکات.

بەردەوام لەلایەن ڕژێمەوە بۆردوومانی تەواوی ئەو ڕێگایانە دەکرا کە جێی هاتوچۆی پێشمەرگە بوون، عومەر عەرەب بە منی ڕاگەیاند نیوەی هێزەکە لەگەڵ خۆم ببەم با هەمووان پێکەوە، نەبین بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبێت شەهیدی زۆر نەدەین.

ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵ مندا بوون، جیا بووینەوە و بەدەم ڕاکردن و هەناسەبڕکێ و ترسی بۆردوومانی ڕژێم، بە شێوازێک کە زۆر بەزەحمەت دەپەڕژاینە سەر یەکتر، لەنێوان تەقەی ڕەبییەکان و بۆردوومانی هاوەن و دۆشکە و ئارپیجیی چەکدارەکانی ڕژێمدا، کونە زێرابێکی چیمەنتۆی وشک کە پێشتر وەک پاشماوەی ئاوەڕۆی کاریزەی پێدا تێدەپەڕی، داوام لەو پێشمەرگانە کرد، لەبەر ئەوەی شەهید نەکرێن، بچنە ئەو کونی زێرابەوە،

خۆشم لەگەڵ نوورەدینی برام و هێرش (شازین) لە سەرەوەماینەوە. هێرش پێی ڕاگەیاندم کە نوورەدینی براشم بچێتە نێو کونی زێرابە وشکبووەکەوە، بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبێت کە دوو برا پێکەوە شەهید نەبن، بەڵام من بە هێرشم ڕاگەیاند جیاوازیی تۆ و نوورەدینی برام نییە، هەر کەسێکتان شەهید بن، بۆ من وەک یەک وایە. هێرش وتی: کاک کەریم واز لەو قسانە بهێنە. برادەرانیش بەسکەخشکێ دەیانویست لەوسەری سەردابی زێرابەکەوە بێنە دەرەوە، چونکە مەودای درێژ بوو، بەڵام کە گەیشتبوونە ئەوسەری، بە چیمەنتۆ گیرابوو. جارێکی تر هەر هەموویان بەسکەخشکێ گەڕابوونەوە و ئێمەش بەردەوام چاوەڕانمان دەکردن، زۆریان پێچوو، لەناکاو تۆپێک لە دووریی نێوان من و هێرش و نوورەدینی برامدا تەقییەوە، هەموومانی تاساند و دوای چەند چرکەساتێک ئینجا هەستم کرد خوێن بەسەر ڕووخساری نوورەدینی برامدا دێتە خوارەوە. هەر چۆنێک بوو هەموومان بەرەو ناوچەی سنووری ئازادکراوی هێزی پێشمەرگە گەڕاینەوە و کاتێک لە گوندی باڵخدا بە هێزەکەمان شاد بووینەوە، نوورەدینی برام پێی ڕاگەیاندم کامیلی مام ڕەسووڵی خزممان شەهید بووە. بۆ سبەی بە ئامار باس لە دەستکەوت و شەهید و بریندارەکان کرا. جگە لە فەرماندەی کەرتی پێنجی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون، کامیلی مام ڕەسووڵ و حەمەی مەلا عەلی گەر بەهەڵەدا نەچووبم، سەر بە حیزبی دیموکراتی ئێران بوو، باوەڕپێکراوی شۆڕش و مرۆڤێکی دڵسۆز و نیشتمانپەروەر بوو، بەکر قەڵادزێی و پێشمەرگەیەکی تر نازناوی نازانم، ئەویش ناوی بەکر بوو، شەهید بوون و دوو برینداریش هەبوون کە یەکێک لە برینداراەکان نوورەدینی برام بوو.

دەستکەوتەکانی هێزی پێشمەرگە: دەستبەسەرکردنی تەواوی بنکەی سەرەکیی بارەگای ئیستخبارات و بنکەی تایبەتیی ناحیەی کارێزە، دەستگیرکردنی بەڕێوەبەری ناحیەی کارێزە و تەواوی ئەو مەلەفانەی کە ئەنجوومەنەکانی گوندەکان پەیوەندیی نهێنییان لەگەڵ بەعسدا تێدا بوو، دیلکردنی چەندین سەرباز و چەکداری کوردی ڕژێم و چەندین چەکی جۆراوجۆر و تەقاندنەوەی هەندێک

له بنکەکان. بەڵام کاتێک کامیلی مام ڕەسووڵ شەهید دەبێت و کامەرانی برای لە کاتی هێرشکردنەکەدا لەگەڵیدا دەبێت بۆ دەربازبوونی تەرمەکەی، شەهید کامیل دەدات بە کۆڵیدا و لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا تەرمەکەی ڕزگار دەکەن و دەیگەیەننە نزیک بارەگای تیپ.

## بڕیاری گوللەبارانکردنی تاوانباران

پاش ئەوەی هێزی پێشمەرگە بنکەی ئیستخباراتی کۆنتڕۆڵ کرد و ئەو مەلەفانەیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، ناوی هەندێک لە ئەنجوومەن و شۆفێری نێو گوندەکان کە ماوەیەکی زۆر بووبوو پەیوەندییان بە ئیستخباراتەوە هەبوو، پێم وایە هەشت بۆ دە کەس دەبوون، هەموویان بە بڕیاری شۆڕش گوللەباران کران کە ناوی چەند کەسێکیانم لەیادە، ئەویش: عەلی دایکێ خەڵکی گوندی ولاخلو، کوێخا ڕەسووڵ خەڵکی گوندی مالومە بوو، هەندێک لە کەسوکاری کوژراوەکان تەرمەکانیان بردنەوە و زۆریشیان لە داخی ئەو بڕیارەی شۆڕش کە گوللەبارانی کردن، پاڵیان دا بە ڕژێمەوە.

## تا دەهات بەرەکانی شەڕ فراوانتر دەبوون

هێزی پێشمەرگە لە هەموو تیپ و کەرت و مەڵبەندەکان بەتەواوی ماندوو ببوون و لە شەڕێکەوە دەگوازرانەوە بۆ شەڕێکی تر. کاتێک هێزێک لە جەنگدا سەرکەوتوو دەبێت، ئەو هێزە دەبێت ئامادەکاریی خۆراک و تەقەمەنی و پۆشاک و پێداویستیی برینداری و تەنانەت گواستنەوەی تەرمی شەهیدەکانیشی بۆ کرابێت. بۆ مێژوو دەڵێم و ئەم یادەوەرییەم نووسیوەتەوە، جگە لە خیانەتکار و تاوانبارانی هەڵگیرساندنی شەڕی کوردکوژە و کورد بە کورد کوشتن کە ناوی لێ نرابوو شەڕی براکوژی، هیچ هێزێکی حیزب و هیچ شۆڕشێک هێندەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان قوربانیی نەداوە و تووشی شەڕ و پێکدادان نەبووە بەرامبەر بە ڕژێمی بەعسی داگیرکەری خاکی کوردستان و دوژمنی

گەلی کورد. گەر هەر شکست و بێهیواییەک لە سەرکەوتنی پێشمەرگەدا لە داستانی قەیوان ماوەتدا هەبووبێت، ئەوا ئەو شۆڕشە وەک پێویست توانای چەک و تەقەمەنی و خۆراک و پۆشاک و پێداویستیی بریندارەکانی هێزی پێشمەرگەی نەبووە، پاشان ئێرانیش وەک ڕێککەوتننامە و خاوەنی بڕیار و بەڵێن، هاوکاریی هێزی پێشمەرگەی نەکردبوو لە ڕووی ماددی و تەقەمەنی و گواستنەوەی بریندار و... هتد. دوای گرتنی ناحیەی کارێزە بە چەند ڕۆژێکی کەم، فەرمانمان پێ کرا کە بچین بۆ زنجیرەچیاکانی گوندەکانی دۆڵبێشک کە نزیک سنووری سەر مەرزی سەفرە و زەروون بوو. بە سەرکەوتنمان بۆ سەر شاخ، تیپی ٥١ی گەرمیان و تیپی ٥٧ی سەرگرمە و تیپی پارێزگاری و جگە لە کەرتی ئێمە، چەند کەرتێکی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروونی لێ بوو، هەمیشە ڕژێم بە هەموو چەکێکی قورسەوە بوردوومانی دەکردین. زنجیرەشاخەکان بەردەلانی، هێزی پێشمەرگە ماندووو تەواو بێزاری لە ڕووخسارياندا بەدی دەکرا. ڕادەستکردنی ئەو زنجیرەچیایەی دۆڵبێشک کە شوێنێکی ستراتیژی بوو، لە هەموو تەمەنی ژیانی سیاسی و زیندانی و بریندارییبوونمدا، ڕۆڵەی قارەمانی وەک نێو ئەو شەڕەم نەدیبوو. پتر لە هەژدە کۆپتەر بە ئاسمانەوە بۆردوومانیان دەکردین، جگە لە بۆردوومانی سەربازگەکانی تری ڕژێم و هێرشی دڕندانەی سەرباز و چەکدار و سیخورەکانیان، بەڵام پێشمەرگەکان بێمنەت بوون لە شەهید و بریندارببوونیان. لەیادمە «سالار چاوشین»، دواتر پێم وایە بە نەخۆشی ماڵئاوایی لە ژیان کرد، کە فەرماندەی یەکێک بوو لە کەرتەکانی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون، دەستی بەسەختی بریندار ببوو، بە دەستەکەی تریەوە ئارپیجیی دەنا بە کۆپتەرەکانەوە و خوێن بە قۆڵ و دەستیدا دەهاتە خوارەوە. لەسەر شاخ کۆبوونەوەیەکی خێرا کرا و نەخشە و پلانی پووچەڵکردنەوەی هێرشەکانی دوژمن درا، چونکە بە شەو شوێنە گشتی و گرنگەکان بە دەست هێزی پێشمەرگەوە بوو، بە ڕۆژیش ڕژێم هێرشی بە کۆپتەر و تۆپ و تانک و زرێپۆشەکانیەوە دەکرد و هێزی پێشمەرگەش سەنگەرەکانی خۆیان چۆڵ دەکرد.

## جاشی هەرکی و سورکی،
## شاخەکانیان بە قۆنتەرات بە بیست هەزار دینار دەگرت

کەرتی ئێمە لەبەر ئەوەی شارەزای ناوچەکە بووین، عومەر عەرەب بە سامان گەرمیانیی وت ئەمڕۆ هێزێکی یەکجار کۆ بووەتەوە و نزیک کەوتوونەتەوە، بەنیازن شەو هێرش بکەنە سەرمان، ئێمە دەچینە پشتی ئێوە و بە ڕووی دوژمندا خۆمان حەشار دەدەین، هەرکە هێزی دوژمن سەر کەوتن و هێرشیان کرد، ئێوە ڕووبەڕوویان ببنەوە و ئێمەش لە پشتەوە لێیان دەدەین. ئەو نەخشەیە زۆر ترسناک بوو، چونکە هێزی پێشمەرگە تەقەی لەوان دەکرد و فیشەکی پێشمەرگەکان بە ئاڕاستەی ئێمەدا دەهات، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە بە دیوی ڕژێمدا بووین و هێزی جاشەکانیش بەلای ئێمەدا سەر دەکەوتن و هەریەک لە ئێمەش لەناو دەوەنە وشکبووەکان و پشتی پەنا بەردەکاندا خۆمان حەشار دابوو. شەڕ دەستی پێ کرد و پێشمەرگە لە سەرەوە لێیان هاتنە دەست و ئێمەش لە پشتەوە تەقەمان لێ دەکردن، بەڵام ئێمە ژیانمان زۆر لە مەترسیدا بوو، چونکە هێزی پێشمەرگەش کاتێک تەقەیان لە جاشی هەرکی و سورکییەکان دەکرد؛ فیشەکەکان ڕووبەڕووی ئێمەش دەبووەوە و ڕژێمیش بە هەمان شێوە تەقەیان لە پێشمەرگە دەکرد؛ ئێمەی دەگرتەوە، چونکە ئێمە کەوتبووینە نێوان هەردوو لایانەوە و جاشەکان بە جۆرێک سەریان لێ شێوابوو هەریەک بە لایەکدا ڕایاندەکرد، یەکێک لە جاشەکان لە ترسی گیانی خۆی کەوتە بەر دەستمان و جلی ڕەش و سپیی خەتخەتی لەبەردا بوو، لەگەڵ خۆماندا بردمان. ئەو شەوە تا بەیانی بۆردوومان دەکراین. بۆ سبەی کە ڕۆژ بووەوە، بە دووربین سەیری تەرمی کوژراوەکانی جاشەکانمان دەکرد، زیاتر لە پەنجا کوژراومان ژمارد، جگە لەوەی لەنێو دەوەن و تاشەبەردەکاندا تەرمەکانی تریان نەدەبینران. بەڵام پێشمەرگەیەک شەهید بوو بە ناوی «سالار»، بەداخەوە لە کاتی شەهیدبوونیدا کەوتبووە دیوی دوژمن کە بەردەوام تۆپبارانی دەکرد، بۆ ڕۆژی دواتر هێنامانەوە و

به سێ پێشمەرگەدا تەرمەکەیمان ڕادەستی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون کرد کە شۆڕش ئیسماعیل سەرپەرشتیی دەکرد. ئەو چەکدارەی کە بەدیل گرتبوومان، هەندێک زانیاریمان لێ وەرگرتبوو کە چەکداری عەشیرەتی هەرکی و سورکی بوون و بەرپرسەکانیان شاخەکانیان بە قۆنتەرات لە ڕژێمی بەعس بە میقداری بیست هەزار دیناری ئەو سەردەمە وەرگرتبوو. عومەر عەرەب وتی: کەریم وەرە لەگەڵمدا، بردمانە ئەودیوی ڕەبییەکە و پێی وت بڕۆرەوە بۆ لای سەددام. چەند مەترێک لێمان دوور کەوتەوە، تاکوو چەند ڕۆژێکیش ئێمە لەوێ بووین، تەرمەکەی هەر لە شوێنی خۆیدا مابووە و ئەوەش وەک تۆڵەیەک بۆ «شەهید سالار» کە لەو هێرشەدا شەهید کرابوو، ئێمە دووچاری کێشەیەکی گەورە ببووین، چونکە ڕۆژبەڕۆژ ڕژێم هێزی زیاتری دەنارد و کەسیش بەهانای ئێمەوە نەدەهات. عومەر عەرەب وتی: ئێمە تەواو برسی و تینوو و پێداویستیی برینداری و فیشەکمان پێ نەدەما و کەسیش نەیدەزانی ئامانجی ئێمە چی دەبێت و شەڕی بەرەیی (جەبهەیی) بەو شێوەیە ناکرێت و بەو جۆرەش بەکوشت دەدرێین، من دەچم بۆ لای شۆڕش ئیسماعیل بۆ ئەوەی ڕێگەچارەیەک بدۆزینەوە. عومەر عەرەب پێی ڕاگەیاندم ئاگام لە کەرتەکە بێت و بۆ سبەی دەگەڕێتەوە لامان، منیش لە ناخی خۆمەوە ئەوەم پێ باش نەبوو، چونکە پێم شەرم بوو بڵێم ئێمە ماندووین و برسی و بێ فیشەکین، عومەر عەرەب پێشمەرگەیەکی لەگەڵ خۆیدا برد و بەزویربوونەوە ئێمەی بەجێ هێشت. زۆر دڵتەنگ بووم، چونکە نەمدەزانی چی بە پێشمەرگەکان بڵێم، بۆ شەو جارێکی تر جاشەکانی هەرکی و سورکی هێرشێکی دڕندانە تریان کردە سەرمان و شوێنەکانی پێشەوەی ئێمەیان گرت و کۆنترۆڵیان کرد. ئێمەش لەگەڵ هێزی هاوبەشی ٥١ی گەرمیان و ٥٧ی سەرگرمە، سێ بریندارمان دا و لەو زنجیرەچیایە پاشەکشەمان کرد و هاتینە زنجیرە چیایەکی تر، واتە بەرەو لاوازی و تەسکبوونەوەی سنووری ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە و شەڕەکان دەچووین و تا دەهات ئەوان سنووری هێزی پێشمەرگەیان کۆنترۆڵ دەکرد و هێزی زیاتریان بۆ دەهات.

## سامان گەرمیانی: خەڵکی سلێمانی هەموو خوێڕی و حیز و دزن!

بۆ ڕۆژی دواتر هێزێکی تری ٢٥ی خاڵخالان و ٨٦ی دەشتی هەولێر هاتن بەهانامانەوە، دوای ئەو هەموو ماندووبوون و شەونخونییە، فیشەک و هەندێک نانی وشک و کولێرەیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو. شەو هێرشمان کردەوە سەر ئەو شوێنانەی کە بەجێمان هێشتبوو، دووبارە کۆنترۆڵمان دەکردەوە و دەکەوتەوە ژێر دەسەلاتی هێزی پێشمەرگە. من نامەوێت شێوازی بۆردوومانکردن و جۆری ڕەفتاری دڕندانەی ڕژێم و چەکدارەکانیان زۆر دووپات بکەمەوە، بەلام ئەوەی کە هەیانبوو و پێیان دەکرا، لە ئێمەدا بەکاریان دەهێنا.

بۆ ڕۆژی دواتر جارێکی تر هێزی پێشمەرگە بەرەو دواوە پاشەکشەمان کرد. هێرش (شازین)م زۆر خۆش دەویست، کوڕێکی قارەمان و دڵسۆز بوو، هەمیشە دەفتەرێکی بچووکی پێ بوو ساڵ و کات و شوێن و یادەوەرییەکانی تیا دەنووسی، کە ئێستە بووە بە نووسەرێکی باش و جددی و کاری وەرگێڕانی فارسی بۆ کوردی دەکات و چەندین بابەتی جۆراوجۆری مێژوویی لە سایت و ماڵپەڕەکاندا بلاو کردووەتەوە. لەگەڵ هێرشدا لەپەنای تاشەبەردێکی گەورەدا پاڵمان دابووەوە، فیشەکی ئەو جاشانەی کە ئەو ڕەبییەی ئێمەیان بەدەستەوە بوو، لەوێوە بە ئارپیجی و بیکەیسی و قەناسەوە ئاڕاستەی هێزی پێشمەرگە دەکرا. تیپی ٥١ی گەرمیان فەرماندەیەکیان لەگەڵدا بوو ناوی شێخ جەمال بوو، بۆ چەند کاتژمێرێکی کەم لەو شەڕەدا پێی ئاشنا بووم، فەرماندەیەکی بەئەمەک و دڵسۆز بوو، هێرش پێی ڕاگەیاندن کاک شێخ جەمال شتێکی باش دەکەیت بێیتە نێوان ئەم دوو تاشەبەردەوە کە من و کەریمەشەل پاڵمان پێوە داوە، بەلام شێخ جەمال وەلامی دایەوە و وتی: «زۆر عەیبە سڵ لە فیشەکی دوژمن بکەمەوە!» بەپێوە ڕاوەستابوو، بە دووربین دەیڕوانییە جاشەکان و ئەوانیش بە هەموو جۆرە چەکێکی قورس ئێمەیان بۆردوومان دەکرد. بە فیشەکی «قەناس»ی جاشەکان،

پێشمەرگەیەکی تیپی ٥١ی گەرمیان بریندار بوو و فیشەکێکیش لەنێوان من و هێرشدا هات و بەر سەر دڵی شێخ جەمال کەوت، هێندە ئاگام لێی بوو وتی: «ئاخ، تینوومە!» و ئاوم بدەنێ، چەند چرکەیەکی پێچوو و لە باوەشی من و هێرشدا هەموو ژیانی خۆی بە شۆڕش و گەلەکەی بەخشی و شەهید بوو. زۆر بەداخەوە بۆ کاکە شێخ جەمالی فەرماندە، بەڵام چاونەترسی و قارەمانێتیی خۆی لەو چرکەساتەدا بووە هۆی شەهیدبوونی، دەنا ڕەنگە بەو جۆرە ڕەفتاری مەردانە و خووڕەوشتی بەرزی پێشمەرگانەی نەکردایەوە و حیسابی بۆ دوژمنی خۆی بکردایە، لەو کاتەدا شەهید نەکرایە. بۆ چەند ڕۆژی دواتر عومەر عەرەب نەگەڕایەوە، خۆشم زۆر ماندوو بوبووم و پێشمەرگەکانیش سکاڵا و گلەییان دەکرد، کۆبوونەوەیەکی بچووکم بە پێشمەرگەکان کرد و پێم ڕاگەیاندن فەرماندەی کەرتەکەمان ڕۆشتووە و جێگری کەرتەکەمان شەهید بووە. عەلی قلیاسانی لە گوندی باڵخ بە خۆی و مەفرەزەیەکەوە مابووەوە، تەنها من مابووم سەرپەرشتیی کەرتەکەم دەکرد و نەشمدەزانی چۆن پێشمەرگەکان ڕازی بکەم، چونکە ناهەقیان نەبوو، پاشان ئەوەش شەڕی هێزی پێشمەرگە نەبوو بە چەکی سووک بەرهەڵستی لە هەزاران چەکداری ڕژێم بکات بەو هەموو قودرەت و تۆپ و فڕۆکەی جەنگییەوە. هێرش هاتە وەڵام و وتی: «فەرماندەی کەرتەکەمان کارێکی خراپی کردووە و ئێمەی بەجێ هێشتووە!» لەو کاتەشدا سامان گەرمیانی هات بۆ لام وتی: «زۆر عەیبە بۆ عومەر عەرەب ڕایکردووە و ئێوەی بەجێ هێشتووە، خەڵکی سلێمانی هەموو خوێڕی و حیز و دزن و بەرپرسی پێشمەرگەکانی سلێمانی لە باوەشی ژنەکانیان دوور ناکەونەوە و ئێوەش شەڕ دەکەن!» منیش هاتمە وەڵام و وتم: «عومەر عەرەب ڕاینەکردووە و فەرماندەیەکی قارەمانە، بەڵکوو بە کارێک چووە بۆ لای شۆڕش ئیسماعیل و دەگەڕێتەوە.»

بە نەگەڕانەوەی عومەر عەرەب، تەواوی پێشمەرگەکان سارد ببوونەوە و هەندێک پێشمەرگەی هێزی گەرمیان کەوتنە توانج و گاڵتەپێکردن. لە ڕاستیدا

سامان گەرمیانی لە دڵسۆزیی خۆی و بەزەییهاتنەوەی بە پێشمەرگە و بریندارەکاندا لە ناخی خۆیدا، ئەو جنێو و وشە سارد و سووکانەی دەرهەق بە خەڵکی سلێمانی دەکرد، بەڵام سلێمانی پایتەختی ڕۆشنبیران و هەزارەها شەهید و زۆرترین سەرکردە و جێی هەموو چینوتوێژێکی تیا بووەتەوە و هەمیشە سنگیان فراوان بووە لە ئاست ڕەخنە و ڕەخنەلەخۆگرتن، نەدەبوو سامان گەرمیانی بەو شێوەیە هێرشی بکردایەتە سەر خەڵکی سلێمانی بەگشتی، دەبوو تەنها ڕەخنەی لە عومەر عەرەب بگرتایە و تەڕ و وشکی پێکەوە نەسووتاندایە.

دوای ڕاپەڕین و دروستبوونی حکومەت و پەرلەمان، لە ساڵی ٢٠١٤دا لەگەڵ سکرتێری کۆمەڵەی پێشمەرگە کەمئەندامبووەکانی سەنگەر؛ شوان موغاغی و بەرپرسی کۆمیتەی ئەڵمانیای کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکانی کوردستان؛ هاوڕێ کامەران سەردانی سامان گەرمیانیمان کرد و باوەشی پێدا کردم و دوای گێڕانەوەیەکی کورتی مێژووی ئەو داستانە و قارەمانێتیی ئەو پێشمەرگانەی لەوێدا بەرگرییان دەکرد، بە سامان گەرمیانیم وت: «لەبیرتە وتت پێشمەرگەکانی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون ترسنۆکن و خەڵکی سلێمانی هەمووی حیزن؟» پێم ڕاگەیاند کە بەنیازی نووسینەوەی یادەوەرییەکانم و ئەو جنێوانەت وەک خۆی بۆ دەنووسمەوە، چونکە ئەوە مێژووە و دەبێت وەک خۆی بنووسرێتەوە، دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: «کاکە برا گیان ئەوە مەنووسە.» پاشان وتی: «منیش ناهەقم نەبوو، ئیتر ئەوە شەڕە و باشترە جنێو بدەین وەک ڕابکەین.» یەکێک لە میوانەکان وتی: «کاکە شەهاب گیان مەنووسە حیز و دزن، بنووسە بێموبالات بوون و خۆیان دزیوەتەوە.» منیش وتم: «کاکە گیان وای نەوتبوو، سامان گەرمیانی چیی وتووە، ئەوەی بۆ دەنووسمەوە.» هەموویان دەستیان کرد بە پێکەنین و سامان گەرمیانی وتی: «زۆر بەداخەوە بۆ ئەو تێکۆشەر و دڵسۆزانەی گیانی خۆیان بەخت کرد و شەهید بوون!»

## عومەر عەرەب وتی:
## «با سامان گەرمیانی پڕ بە دەمی خۆی گوو بخوات...»

لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٨٦دا، بە بڕیاری شۆڕش ئێمە لە زنجیرەچیای دۆڵبێشکدا گەڕاینەوە بۆ بارەگای کەرتەکەمان کە لە گوندی باڵخ بوو. عەلی قلیاسانی کە فەرماندەی مەفرەزەی کەرتەکەمان بوو، لەگەڵ عومەر عەرەب و نیوەی هێزی پێشمەرگەی کەرتەکەمان لە بارەگاکەماندا مابوونەوە، منیش بە نائومێدی و ئازاری دەروونیی ئەو پێشمەرگانەی بەبەر چاوی خۆمەوە لە زنجیرەچیای دۆڵبێشکدا شەهید و بریندار دەبوون و دیمەنی تۆپبارانی ترسناکی تانگ و زرێپۆش و کۆپتەر و هێرشی دڕندانەی جاشەکانی عەشیرەتی هەرکی و سورکی، ببووە برینێک سارێژبوونی هەر وا ئاسان نەبوو. ئەو پێشمەرگانەی کە لەگەڵمدا بوون، دوو هێندەی من قارەمان و دڵسۆز و بەجەرگ بوون، پێشمەرگەی وامان لەگەڵدا بوو لە شەڕی زنجیرەچیای دۆڵبێشکدا زۆری پێناخۆش بوو کە ئێمە گەڕاینەوە بۆ بارەگاکەمان لە گوندی باڵخ، تەنانەت هەندێکیانم بەزۆر هێنایەوە لەگەڵ مەفرەزەکەمدا. کاتێک گەیشتینەوە گوندی باڵخ، عومەر عەرەب پێی وتم: «ئەوە چییە ئەو دەنگۆیە بڵاو بووەتەوە گوایە من ڕامکردووە و شەڕەکەم بەجێ هێشتووە؟ ئەی تۆ عەیب ناکەیت شەڕت پێ نەکراوە و سەر لوتکەی شاخەکانت ڕادەستی جاشەکان کردووە، گەر ئەوەندە ترسنۆکیت، بۆچی پێت نەوتم ترسنۆکم؟» منیش وەڵامم دایەوە کە دەزانم نە تۆ ترسنۆکیت و نە من و پێشمەرگەی مەفرەزەکەم لەسەر شاخ ترسنۆک بووین، بەڵام من چی بکەم تەنها چەند مەخزەنێک فیشەک بە لاقەدی خۆم و پێشمەرگەکانی مەفرەزەکەمەوەیە و ماوەی دوو هەفتەیە ئێمە لە جەنگی ڕووبەڕووی زلهێزێکی دڕندانەی بەعسداین بۆ خۆپاراستن لە خۆمان و چیاکان، فیشەکی نێو مەخزەنەکانی جاشە مردووەکانی نێو ئەو جەنگە بەکار دەهێنین. جگە لەوەی هەر پێشمەرگەیەک کولێرەیەکی بەر کەوتووە، دوای برسێتی و

تینوویێتی و بێ خۆراکی! ئێستەش تۆ بە من دەڵێیت: ترسنۆک، بۆچی شەڕت پێ نەکراوە؟» پاشان سامان گەرمیانی بە خۆی و هێزەکەیەوە هاتن بەهانامانەوە، هەر کەرتە و فەرماندەی خۆی لەگەڵدا بوو، ئەوەی کە بێ فەرماندەی کەرت بوو، تەنها ئێمە بووین کە من ڕۆڵی کاریگەر و تایبەتم لە ئەرکی بەڕێوەبردنی شەڕەکەدا گرتبووە ئەستۆی خۆم، بەڵام پرسیاری سەرەکیی سامان گەرمیانی ئەوە بوو کە «تۆ بۆ نەگەڕابوویتەوە بۆ ناو شەڕەکە؟»، لەو کاتەشدا هێندە نەبوو مام جەلال بۆ هاوکاریکردنی هێزی پێشمەرگە سەردانی دەرەوەی وڵاتی کردبوو، عومەر عەرەب وتی: «با سامان گەرمیانی پڕ بە دەمی خۆی گوو بخوات، لە هەموو ژیانیدا هێندەی من شۆڕشگێڕ نەبووە. ئێستە مام جەلال لە دەرەوەی وڵاتە، زۆری لە بەرپرسەکان لە غیابی مام جەلالدا خۆیان لە ترسی ئەو شەڕەدا حەشار داوە و شەڕی ناچارکراو بە پێشمەرگە دەکەن.» پاشان عومەر عەرەب وتی: «کەریم گیان، لەبیرت نایەت کە لەبەر حەوزە وشکەکەدا بە ئەمری نەوشیروان مستەفا تاوانبارانی بەعسمان بە سزای گەل و شۆڕش دەگەیاند و تۆش بریندار بوویت و هاوارت لێ دەکردم عومەر بمکوژە و بەجێم مەهێڵە؟ من دڵنیام گەر لەگەڵ سامان گەرمیانیدا بوویتایە، بۆ دەربازبوونی ژیانی خۆی؛ تۆی دەکوشت و بەجێی دەهێشتیت. لەبیرت دێت ئازاد هەڵەدنی و ئەزوەر ناسراو بە «هێرش» ئۆتۆمبێلێکی جۆری لاندگرۆزەری ساڵی ۱۹۷۹یان ڕفاند، کە خوشکەزایەکی پارێزگاری سلێمانی شێخ جەعفەر کە بە «شێخ چۆپی» ناسرابوو! ئازاد هەڵەدنی لەسەر ئەو چالاکییە پاش ماوەیەک دەستگیر کرا و لەلایەن نۆکەرەکانی شێخ جەعفەر (شێخ چۆپی)؛ پارێزگاری سلێمانی بە تێزاب سووتێنرا! کێ بوو کە فەرماندەی کەرت بوو لە تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون؟ یەکەمین کەس ئەو ئۆتۆمبیلەیان بە دوو ئارپیجی و یەک بیکەیسی و نۆ پێشمەرگەوە، تەسلیم بە ڕژێمی بەعس بوونەوە؟ کێ بوو بڕیاری لەسەر کوشتنی جەیشی شەعبی و تاوانبارانی دەردەکرد و بە منیان پێ بەکوشت دەدان گوایە سەر بە دەزگاکانی ڕژێمن! پێشمەرگەیەکی

قوڕبەسەر گەر بە هەر چی جۆرێک بووایە تەسلیم بووایەتەوە، یان دەیانکوشت یان دەچوونە سەری بڕێ پارەیان لێ وەردەگرت. خۆ هیچ پیشمەرگەیەک هێندەی ئەو فەرماندەیەی کە لە تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون بوو، پێشمەرگە و چەکی شۆڕش و تەنانەت ئەو ئۆتۆمبێلەی کە ئازاد هەڵەدنی لەسەر بە تێزاب سووتێنرا و شەهید کرا؛ تاوانی نەبوو! خۆتان دەزان کێ بوو و خزمی کێ بوو و بۆچی لێپرسینەوە و لێپێچینەوەیان لەگەڵدا نەکرد و بۆ تەنها جارێکیش ناوی بە خراپ باس نەکرا و هیچ مەفرزەیەکی پێشمەرگەش لێپرسینەوەیان لەگەڵدا نەکرد، ئەوە من بووم ترسنۆک یاخود ئەوان!»

پاشان عومەر عەرەب هێندە تووڕە و بێزاریی ئەو شۆڕشەی لەنێو ڕووخساردا تیا بەدی دەکرا، وتی: «غەریب کونجرینی لە هەندێک لەو بەرپرسانە شۆڕشگێڕتر و چاونەترس و دڵسۆزتر بوو، هەر ئەوانە وایان لێ کرد و لە هەوڵی تێکشکاندنی باری کەسایەتیی فەرماندە قارەمانەکان بوون و لەخشتەیان دەبردن و ڕوویان لە ڕژێم دەکرد.» غەریب کونجرینی فەرماندەی تیپ بوو، پێش داستانی قەیوان بە چەند مانگێک تەسلیم بە ڕژێم ببووەوە و دواتر وەک «ئامر سریە»ی فەوجی سووک (فەوجی خەفیفە) ڕەبایەیەکی لەناو سوورقەڵاتدا لەلایەن ڕژێمەوە پێ سپێردرابوو، پەیوەندیی کردبووەوە بە نەوشیروان مستەفا و هەموو ئەو چەکدارانەی کە لەگەڵیدا بوون، بریتی بوون لە دوانزە چەکدار، پەیوەندییان کرد بە شۆڕشەوە. من هێندە ماندوو بووم لەو شەڕەدا و نەشمدەزانی ئامانجی دوارۆژی ئەو شەڕە چی دەبێت، هەر ئەوەندەم پێ کرا و وتم: «سامان گەرمیانی لەسەر حەقە و گەر تۆش لە جێی سامان گەرمیانیدا بوویتایە و سامان گەرمیانییش عومەر عەرەب بووایە، ئەو ڕەخنەیە هەر دەگیرا.» عومەر عەرەب ئەو پێشنیار و وەڵامەی منی پێ پەسەند بوو و وتی: «تۆش و سامان گەرمیانییش ڕاست دەکەن.» منیش لە وەڵامدا وتم: «ئەو ڕەخنانەی کە تۆ لە هەندێک سەرکردایەتی و سیاسەتمەدارانت گرت، بێشک

ڕاستگۆییان تیا بەدی دەکرێت، کە خۆم هەر هەموو ئەو ناهەقییانەم بە چاوی خۆم دەبینی و لە نزیکەوە ئاگاداری هەموو ناڕاستگۆییەکان و تێکشکاندنی کەسایەتییەکانم.» لە ڕاستیدا نەشمدەزانی عومەر عەرەب بۆ هێندە داخلەدڵ و تووڕە بوو، بە دڵشکاوی و خەمبارییەوە وتی: «من لە هەموو ئازارەکانتان دەگەم و دەزانم بووم بە هۆکاری ئەوەی جنێو و وشەی بازاڕی ناڕاستەی ئێوە و هەمووان بکرێت، بەڵام ئەوە من بووم دایک و باوکم هەر لە سەرەتای هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلوول دەربەدەر بوون و ئەوە من بووم لەسەر دەربەدەریی خانەوادەکەم لە باشووری عێراقدا کە نیشتەجێی زۆرەملێ بووین و لەنێو زوڵم و زۆرداریی عەرەبی ڕەگەزپەرست ژیانی سەختمان بەسەر برد و زمانی کوردیم هەر لەیاد نەچوو و نازناوی عومەر عەرەبم پێوە لکاوە. ئەوە من بووم فەرماندەی ئەو کەرتەی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون، کە هەموو ڕۆژێک بە ئازایەتی و قارەمانێتیی ئێوەی تێکۆشەر؛ چالاکیمان لە ناوجەرگەی دەسەڵاتی ڕژێمی بەعسدا ئەنجام دەدا و ئیزاعەکەی یەکێتی بەشانازییەوە بە ناوی یەکێتییەوە و بە سروودی نیشتیمانییەوە زیاتر ورەی هێزی پێشمەرگەی پێ بەرز دەکردەوە و بەرپرسەکانیش کە ئێستە تانەوتەشەر لە پێشمەرگەی کەرتەکەم دەدەن و جنێو بە خەڵکی شارە جوانەکەی سلێمانی دەدەن، هەر خۆیان بە خۆیان بن، با بێن بزانم کام بەرپرس و کام دەملووس و ماستاوچی، هێندەی یەک پێشمەرگەی کەرتی من چالاکیی کردبێت و کەسوکاری وەک خێزان و بنەماڵەی من ئاوارە و دەربەدەر و تووشی دوژمنایەتی بووبێت!»
بۆ یەکەم جارم بوو عومەر عەرەب بەو شێوەیە ببینم، چونکە هەرگیز لە ژیانی پێشمەرگەیاتیدا ئەو کوڕە ئازایە و فەرماندەیەم بەو جۆرە دڵشکاوە نەبینیبوو، نەشمدەزانی هۆکاری چییە ڕۆژبەڕۆژ نائومێدیی زیاتری تیا بەدی دەکرا، هەر ئەوەندە تێگەیشبووم عومەر لەلایەن هەندێک بەرپرسانەوە پەی پێ دەبرا و دژایەتییان دەکرد، ئەوەش بووە هۆکاری ئەوەی لە کۆتاییدا پشتی لە شۆڕش کرد، ئەو شۆڕشەی کە هەموو بنەماڵەکەی لەسەر

دەربەدەر کرا. عومەر ئەو دەمە تەمەنی تەنها بیست و پێنج ساڵانێک دەبوو، کەچی هەندێک لەو سەرکردانەی تەمەنیان هەڵکشابوو، دژایەتییان دەکرد و ئەو کورەیان بەرەو هەڵدێر برد. دوای دوو ڕۆژ پشوودانمان، هێزێکی زۆر گەورە و پڕچەک لەلایەن دوژمنەوە خۆیان ئامادە کردبوو بەرەو کارێزەی کۆن و ئەو گوندانەی باڵخ و گاپیلۆن کە لەسەر ڕێی سەرکردایەتی بوون و دووچاری شەڕێکی سەخت بووین.

## شەڕی کارێزەی کۆن و ئابڵوقەدانمان و نزیکبوونەوەمان لە مەرگ

پاش جنێوەکانی سامان گەرمیانی و وەڵامی عومەر عەرەب و نەگەڕانەوەی بۆ نێو هێزی کەرتەکەمان، دووبەرەکی کەوتە نێو هێزی پێشمەرگەی گەرمیان و پێشمەرگەی سلێمانی و تەواوی سەرکردایەتی بەو دووبەرەکییە ئاگادار بوون و تا دەهات پێشمەرگە لاوازتر و زۆریشیان خۆیان لە شەڕکردن دەشاردەوە و هەندێکیشیان لەپڕ دیار نەدەمان، بەتایبەت ئەو پێشمەرگانەی کە لە کاتی دانوستاندا ببوون بە پێشمەرگە، ئەوەش هەڵوێستێکی زۆر خراپ بوو کە لە سامان گەرمیانییەوە دەستی پێ کرد و تا دەهات پێشمەرگەی گەرمیان لەبەر چاوی پێشمەرگەی خەڵکی سلێمانی ناشرین دەبوون و بە هەمان شێوەش پێشمەرگەی سلێمانی لەبەر چاوی پێشمەرگەی گەرمیان ترسنۆک دەبینران. لەبەر ئەوەی کەرتی ئێمە لەو سنوورەدا زۆر شارەزا بوون، زۆربەی شەڕەکانی دەستەویەخە و پێشی شەڕەکان؛ بە هێزی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون دەکرا، بۆ ئەو مەبەستەش داوا لە کەرتی ئێمە دەکرا کە بچین ڕێ لەو هێزەی دوژمن بگرین کە خۆیان ئامادە کردووە بۆ هێرشکردنە سەر گوندەکانی کونەماسی و کارێزەی کۆن و گوندی باڵخ. عومەر عەرەب داوای لێ کردم لەگەڵ مەفرەزەیەکدا بچم بۆ کارێزەی کۆن، منیش پرسیارێکم لێ کرد و وتم: «عەلی قلیاسانییش وەک من فەرماندەی مەفرەزەیە، نەبا لە ناخی خۆیدا وەهمێک دروست بێت و پێم باشە هەندێک

ئەرکی بەرپرسیاریتیی شەڕەکان بخەیتە ئەستۆی، چونکە ئەوە پتر لە دوو مانگە؛ زیاتر ئەو ئەرکەت بە من سپاردووە.» عومەر عەرەب لە وەڵامدا وتی: «من جیاوازیی هیچ پێشمەرگەیەک ناکەم و هەمووان وەک یەک دەبینم.» عەلی وەک فەرماندەی مەفرەزەش تێکۆشەرێکی قارەمانە و زیاتر ئەرکی پاراستنی بارەگاکەمان و گوندەکەم پێ سپاردووە، ئەوەش بووەتە هۆکاری ئەوەی بەزۆری نەمناردووە بۆ سەر شاخ و نێو شەڕەکان.

منیش داوام لە چەند پێشمەرگەیەک کرد کە بێن لەگەڵمدا، بەڵام کەم کەسیان ئامادەییان تیا بوو، ئەوەش هۆکاری ئەوە نەبوو کە لە ترس و بێورەیی و لاوازیدا بێت، بەڵکوو زۆر شەکەت و ماندوو ببوون، خۆم چەند پێشمەرگەیەکم دەستنیشان کرد بە ناوی ڕێبوار کانیسپیکەیی جەبارە سوور، ڕەفیق، نوورەدینی برام، هێرش و چەند پێشمەرگەیەکی تر، ژمارەمان سیانزە پێشمەرگە دەبوو.

ئێمە ئەو هێرشەمان بەهەند وەرنەگرتبوو و پاشان دڵنیا بووین لەو تێکۆشەرە دڵسۆزانەی کە پێکەوە بووین و بە سووک زانینی دوژمن. بە «زمە»ی تەفەنگەکانمان و «حەربە»ی لوولەی کلاشینکۆفەکانمان، شەو چەند چاڵێکمان هەڵکەندبوو وەک سەنگەر بەکارمان هێنا. «زمە»ی تفەنگ بەوە دەوترێت لوولەی تفەنگی پێ پاک دەکرایەوە و «حەربە»ش چەقۆیەکی درێژە بەژێر لوولەی کلاشینکۆفەکەوەیە، لە کاتی پێوستی جەنگدا بەکار دەهێنرا. تۆپبارانی ڕژێم هیچ بوارێکیان نەداین و تا دەهات تەقەکردن لەلایەن چەکدارانی ڕژێمەوە زیاتر و هێزەکانیان نزیکتر دەبوونەوە. لەگەڵ ڕووناکبوونەوەی سەرلەبەیانی، بە هەموو جۆرە چەکێکی قورس هێرش کرایە سەرمان. لە شەڕێکی پتر لە نۆ کاتژمێردا، بارودۆخێکی زۆر خراپمان بەسەردا هات و هەر چی پێشمەرگەیەکم دەناردەوە بۆ بارەگاکەمان کە بچێت فیشەک و خۆراکمان بۆ بهێنێت، دەڕۆشت و نەدەهاتەوە، تاکوو ئەوەی لەو سیانزە پێشمەرگەیە، تەنها پێنج پێشمەرگەماینەوە. ئەگەرچی نووسەرانی کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکان لقی کوردستان بەدووروودرێژی

باسیان لەو نەبەردییانە کردووە و هێرش (شازین) لە نووسینی یادەوەرییەکانیدا دەڵێت ئێمە دوانزە پێشمەرگە بووین، بەڵام لێرەدا بە پێویستی دەزانم بۆ ئەنگوستخستنە سەر ڕاستی و دروستییەکان و جۆری ڕووبەڕووبوونەوەکانی هێزی پێشمەرگە کە ئێمەش لەوپەڕی ناڕەحەتی و ماندووبووندا بووین، من داوام لە هێرش کرد کە بچێت لە بارەگاکەمان لە گوندی باڵغ فیشەکمان بۆ بهێنێت، بەڵام هێرش بەدەستبەتاڵی گەڕایەوە بۆ لامان. لە گۆڤاری «چیا[1]»دا دەڵێت: سیانزە سەعات شەڕ، شەوی ٢٢-١٩٨٦/٢٣ لەنێوان گوندی باڵغ و کارێزەی کۆن، سەنگەرمان لە هێزێکی پێشەوەی دوژمن گرت و کاتژمێر ١١ی شەو بەسەر ١٤ سەنگەردا دابەش بووین. ئەو شوێنەی کە ئێمە بۆی چووبووین، پێشتر لەلایەن هێزەکانی پێشمەرگەوە وەک خاڵێکی لاواز و لاوەکی تەماشا دەکرا، هیچ هێزێکی لێ نەبوو، هەر بۆیە ئەو شەوە بە برووسکەیەک ئاگاداریان کردین کە بەرەو ئەو ناوچەیە بڕۆین کە چەند سەنگەرێکی کۆنی لێیە. فەرماندەی سەربازیی ئەو ناوچەیە؛ «ئازادی حەمەی گەمحان»ی فەرماندەی تیپی ٩٩ی بتوێن بوو، کاتژمێر ١٢ی شەو دوژمن کەوتە تەقەکردن لە سەنگەرەکانمان، شەڕێکی بەرانبەرێن لەنێوان ئێمە و دوژمن دەستی پێ کرد، دوژمن بە هەموو جۆرە چەکێک کەوتە بۆردوومانکردنی سەنگەرەکانمان و زانیاریی پێ گەیشتبوو شوێنێکی فەراغ هەیە دەتوانن درزەی بۆ بکەن و دەست بەسەر گوندی باڵخدا بگرن. ئەم هەواڵە لەلایەن ڕێکخستنەکانی یەکێتییەوە بە ئازاد گەیشتبوو، هەر بۆیە بەپەلە ئێمەیان بۆ ئەو بۆشاییەی نێوان باڵغ و کارێزە ئامادە کرد، شەڕی بەرامبەرێن لەنێوان ئێمە و دوژمندا درێژەی کێشا، زیاتر لە ٤ سەعات بە جۆرەها چەک سەنگەرەکانی ئێمەیان دەکوتا،

---

[1]. بڕوانە: گۆڤاری چیا، کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکانی کوردستان، چاپخانەی حەمدی، ژمارەی (٣)ی ئەیلوولی ٢٠٠٧، ل١١١. بەبێ دەستکاریکردن لێرەدا خستوومەتە بەر دیدی خوێنەر و ئەگەر هەڵەیەکی ڕێزمانی و پێچەوانەی گێڕانەوەی مێژووی تێدا بێت، ئەوا خودی نووسەر لێی بەرپرسیارە.

ڕیزە فیشەکی ڕەشاشی بیکەیسی بەسەر سەنگەرەکانماندا گیزەی دەکرد و بەردەم و ناو سەنگەرەکانمانیان ڕووناک دەکردەوە، زیاتر لە ١٠٠ گوللە ئارپیجییان بەسەرماندا دەتەقاند. دوژمن ترسێکی زۆری هەبوو، هەر بۆیە بەبەردەوامی تەقەیان لە سەنگەرەکانمان دەکرد. شەو چەند هەنگاوێک لێمان هاتنە پێشەوە، بەڵام کەوتینە تەقەکردن لێیان و ناچار پاشەکشەیان کرد. ئێمە هیچ جۆرە هێرشکێمان نەکردە سەریان، چاوەڕێی هێرشی دووەم بووین، بەڵکوو ئەوان هێرش بکەن و بە زەرەرێکی زۆرەوە پاشەکشەیان پێ بکەین. دڵنیا بووین دەیانشکێنین، چونکە شوێنمان قایم بوو، ئەمەجگە لەوەی لای ڕاستیشمانەوە پێشمەرگەکانی تیپی ٩٩ی بتوێنی لێ بوو کە زۆر دوور نەبوو لێمانەوە، زۆربەیان لای سابیر ڕەسووڵ و ئازادی حەمەی گەمحان کۆ ببوونەوە. بە درێژایی ئەو شەوە لە شەڕێکی قورسدا بووین.

لێرەدا شتێک هەیە دەمەوێت بیڵێم، دوو کاتژمێر بەسەر چوونمان بەرەو سەنگەرەکاندا تێنەپەڕیبوو، ئەوەی جگە لە کەریمەشەل (شەهاب کەریم - بەندە) هیچ فەرماندەیەکی ترمان لەگەڵدا نەبوو، پێشمەرگەکانیش کەوتنە ملبادان و دەرچوون لە فەرمانی بەرپرسەکەیان. لە کاتژمێر ٥ی سەرلەبەیانیدا دوژمن بە هێزێکی گەورەی پۆشتەوە پەلاماری سەنگەرەکانی ئێمەیان دا، شەڕ بەگەرمی دەستی پێ کرد، ئێمە تەنها پێنج پێشمەرگەماینەوە و دوو پێشمەرگەشمان هەر شەو هەڵهاتن. ئەو بەیانییە بەتەواوەتی شەکەت و هیلاک بووین، شەو نەخەوتبووین، کاتێکیش دوژمن هێرشی هێنا، بەسەختی لەگەڵیدا کەوتینە شەڕەوە. هێرشەکە لە چەند قۆڵێکەوە بوو: قۆڵی یەکەم لە کارێزە کۆنەوە بەرەو چەمی پیرئەلیاس، قۆڵی دووەم لە هەمان شوێنەوە بەرەو سەنگەرەکانی ئێمە (واتە لای چەپی هێزەکەی سابیر ڕەسووڵ و ئازادی حەمەی گەمحان)، قۆڵی سێیەم لەلای ڕاستی جرتاواوە بۆ کونەماسی و لەوێشەوە بەرەو پشتی کونەماسی و بەرەو لوتکەی حەسەن بەگ. قۆڵی یەکەم لە کارێزە کۆنەوە دەستی پێ کرد، لەلایەن تیپی ٩٩ی بتوێن، بە خراپترین شێوە دوژمنیان شکاند. لەو قۆڵەش بەرەو ئێمە هێرشیان هێنا،

دوژمن هەندێ پێشڕەویی لەوێوە کرد، ئێمە توانیمان لە هێرش ڕایانبگرین، بەڵام وەزعمان یەکجار نالەبار بوو، فیشەکمان بەرەو کەمبوونەوە دەچوو، لە شەوەوە نانمان نەخواردبوو، ئاویشمان پێ نەبوو. کاتژمێر ٦-٧ی بەیانی بەتەواوەتی تەقەی دوژمن هەراسانی کردبووین، زاتمان نەدەکرد بەقەد تاڵە موویەک سەر دەربکەین، وەک خۆڵ بەرامبەر بە سەنگەرکانمان دەهاتن، هەزاران فیشەک قەراخ و پێشەوەی سەنگەرەکانمانیان دەسمی. ئەم پێشڕەوییەی دوژمن هەموومانی ترساند، چونکە دوژمن دەیتوانی بگەڕێتەوە و پشتمان بگرێت و زۆر ناوچە لە دەست پێشمەرگە بچێت. هێزی پەلاماردەری دوژمن لە جاش و سەرباز، بەپێی ئەو زانیارییانەی لە کارێزەوە هاتبوو، زیاتر لە ٤٠٠٠ چەکدار لە قۆڵی ئێمەوە شەڕ بەردەوام بوو، دوژمن وردە وردە پێشڕەویی دەکرد و دەکشایەوە. وەک پێشتر باسم کرد وەزعمان لە هەموو ڕوویەکەوە خراپ بوو، ئێمە لە گەرمەی شەڕدا بووین چەند پێشمەرگەیەکی کەرتی ٣ی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون بە فەرماندەیی سالاری شێخ عومەر گەیشتنە لامان کە ژمارەیان ٥ پێشمەرگە دەبوو. بەڕاستی ئەو پێنج پێشمەرگەیە هەریەکەیان بۆخۆیان بەرامبەر بە دەیان چەکداری دوژمن دەوەستان. بەرزانی تەمین، نزار، سالاری شێخ عومەر لەگەڵ دوو پێشمەرگەی تردا کە ژمارەمان بوو بە دە پێشمەرگە، لە سەنگەرەکانمان سەرگەرمی تەقەکردن بوون. لە هێزە پەلاماردەرەکەی دوژمن، ئەوەندەمان زانی لە پشتەوە دەستڕێژیمان لێ دەکرێ و خەریک بوو فیشەک سەری سێ چوارێکمان هەڵگرێ. هەموومان پێکەوە هاوارمان دەکرد «تەقە مەکەن»، سەرەتا وا تێگەیشتین کە پێشمەرگەکانی خۆمانە و ئێمەش بە جاش تێگەیشتوون بۆیە تەقەمان لێ دەکەن. چەند جارێک هاوارمان کرد، بەڵام سوودی نەبوو، بەتوندی سەنگەرەکانمانیان دەکوتی، بەتەواوەتی خۆمان نوقمی سەنگەرەکەمان کرد و بە هیچ شێوەیەک نەماندەوێرا سەر هەڵبڕین، من خەیاڵم بۆ ئەوە دەچوو تیپێک یان گرووپێک پێشمەرگە هەڵگەڕابنەوە، یان خیانەتیان لێ کردووین و لەگەڵ هێرشی دوژمندا ئەوانیش پەلامارمان

دەدەن، یان چەکمان دەکەن، یان تەسلیمی دوژمنمان دەکەنەوە.

بەڵام بۆچوونەکەمان هیچیان ڕاست نەبوون، بەڵکوو ئێستا (ئەوسا) جاش پشتی گرتبووین و دزەیان کردۆتە حەساسترین سەنگەری پێشمەرگەوە، ئێستا لە پشت و پاشەوە دەیانەوێت کونمان بکەن و تەقەش بەبەردەوامی گەرمە و ئێمەش لە دووڕیانێکداین، ڕوومان لە هەر شوێنێک بکردایە؛ دوژمن زەفەری پێ دەبردین، ماوەیەکی پێچوو تاکوو تەقە لە پشتەوەماندا نەما، سەیری دواوەمان دەکرد هیچ لەئارادا نییە، تەقەیەکی زۆرە، بەڵام بەرەو ئێمە فیشەک نایەت، ئینجا زانیمان کە مەفرەزەیەکی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون توانییان ئەو هێزەی دوژمن کە پشتی گرتبووین، هێرش بکەنە سەریان و لە ماوەیەکی کەمدا بیانشکێنن. بەڕاستی گەر ئەو مەفرەزەیەی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون نەبووایە، ئەگەر هەمووشمان نەکوژرابانایە، ئەوا شەهیدێکی زۆرمان دەدا و بەخراپی تێک دەشکاین، چونکە ئێمە توانای بەرەنگاری پێشەوە و دواوەی خۆمان نەدەبوو، نەشماندەتوانی لە دواوە و پێشەوە شەڕی دوژمن بکەین. لێرەدا پێویستە ئاماژە بە ناوی ئەو مەفرەزە قارەمانانەی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون بدەم کە لەدوای سەنگەرەکانمان دوژمنیان شکاند و ئێمەیان لەو بازنە ترسناکەدا ڕزگار کرد. بەداخەوە ناوی ئەو مەفرەزە پێشمەرگەیەم بەتەواوەتی لەیاد نەماوە، تەنها ناوی ٣ پێشمەرگەیان نەبێت، هەرسێکیان لە پلەی فەرماندەدا بوون: ئازاد هۆندەرێنی؛ جێگری کەرتی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون، خلە بێدین (دلێر)؛ فەرماندەی مەفرەزەی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون، جەمال چاوشین؛ فەرماندەی مەفرەزەی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون. پاش شکاندنی ئەڵقەی پشتەوەمان، ئیتر لەوە دڵنیا بووین هێرشی دوژمن لە پشتەوە ناتوانن زەفەرمان پێ بەرێت و بەئاسانی پێشڕەوی بکات. هاوکات لەگەڵ شکاندنی هێزی دوژمن لە قۆڵی پێشمەرگەکانی تیپی ٩٩ی بتوێن، بەپێچەوانەوە هێرشەکە بە شێوەیەکی سەخت بۆ سەر ئێمە درێژەی کێشا و لەگەڵ دوژمندا شەڕێکی قورسمان کرد. لەگەڵ بەرگریکردنی ئێمە، تیپی ٩٩ی بتوێن بە هێزێکەوە بەهانامانەوە هاتن کە ژمارەیان ٣٠

پێشمەرگە دەبوون، بە هاتنی ئەم پێشمەرگانە، سەنگەرەکانی ئێمە هێندەی تر قایم بوو. هەر ئەو ڕۆژە «کەریمەشەل» پێی ڕاگەیاندم کە بچمەوە باڵخ و بزانم لە مقەڕفیشەکی کلاشینکۆف و گوللە ئارپیجیی لێیە یان نا؟ گەڕامەوە بارەگا و لە قەوانێکی ژەنگاوی زیاتر، هیچی ترم نەدۆزییەوە. کاتێ لە مقەڕەکەدا پشوویەکم دا، بارەگاکە بەسەریەکدا درابوو، ژوورەکە بۆنی مردووی لێ دەهات، جگە لە چەند لێفەیەکی خۆڵاوی و دڕاو، هیچی تری لێ نەبوو، قاپ و قاچاخەکانی بارەگا؛ خۆڵ سواغی دابوون. بۆنی خۆڵ و پشیلەیەکی مردوو سەری کاس کردبووم، ناچار هەستامە سەر پێی و گەڕامەوە لای برادەران. لە گەڕانەوەمدا، چاوم بە چەند پێشمەرگەیەکی تیپی ٨٧ی قەرەچووخ کەوت. پاش چاک و چۆنی، پێشمەرگەیەکی خڕیلانەی قەڵەو و سەر و ڕووخسار تۆزلێنیشتوو لێی پرسیم: جەنابت پێشمەرگەی کوێی؟ منیش وەڵامم دایەوە: تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون، گوتی: زۆر باشە، ئێمە دەچین سەنگەرەکان لە برادەرانی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون وەردەگرین، بەڵام پێش هەموو شتێک دەمانەوێت کاک ئازاد و کاک سابیر ڕەسووڵ ببینین. منیش لەگەڵیاندا ڕۆشتم. پێشمەرگەکە گوتی: «من فەرماندەی کەرتم، بە ‹فاقە مەخمووری› ناسراوم، سەنگەرەکانی برادەرانی ئێوە وەردەگرین و زانیاریم لەسەر ئەو هێرشەی ئەمڕۆش هەیە کە کرایە سەرتان. دەستتان خۆش، شەڕی چاکتان کرد.» منیش گوتم: «سوپاست دەکەم، ئێوەش تیپێکی چالاکن، بەبەردەوامی لە ڕێگای ئێزگەی ڕادیۆوە چالاکییەکانی ئێوەش دەخوێنرێتەوە، کەم جار بووە ناوی ٨٧ی قەرەچووخ نەهێنرێت.» بەدەم ڕێگاوە فاقە مەخمووری لێی پرسیم: «ئەوەندە زانیاریم هەبێت دوژمن لەم ناوچەیەوە نزیکە، کوڕی سلێمانی نەمانکەیتەوە بەناو حکومەتدا، ئێمە شارەزا نین! بە خودای پێش ئەوەی بمدەیتە دەستی حوکمەتێ، تەپرت پێ لێدەدەم.» دەستی کرد بە پێکەنین و گەیشتینە لای ئازادی حەمەی گەمحان، منیش چوومەوە لای برادەران. بە گەیشتنم، کەریمەشەل دەستی کرد بە پێکەنین و گوتی: «کوا فیشەک؟» گوتم: «فیشەکی چی؟ بارەگای

چی؟ مقەڕ ئەڵێی کەلاوەیە!» کەریمە شەلیش گوتی: «وام زانی کە تەئخیر بوویت، خەریکی ئەوەیت فیشەکەکان بە لۆرییەک بگوازیتەوە!» ئەوەندەی نەبرد چەند پێشمەرگەیەکی ۸۷ی قەرەچووغ گەیشتنە لامان و شوێنەکانی ئێمەیان پڕ کردەوە و سەنگەرەکانمان بۆ ئەوان بەجێ هێشتن و گەڕاینەوە بارەگاکانمان. بارەگای چی! پیس و پۆخڵ، هیچ شتێک لە جێی خۆیدا نەمابوو، ڕاخەرەکان بەلوولکراوی لە سووچێکدا فڕێ درابوون، خۆڵ بەری پەنجەرە و سەرتاقەکانی داپۆشیبوو، لەگەڵ کەریمە شەل و عەلیدا لە سووچێکدا دانیشتین، جەبار و ڕەفیقیش لەلامانەوە پاڵ کەوتن. کەریمە شەل ڕووی لێ کردین و گوتی: «ماندوویت ها؟» گوتم: «ماندووم، خۆت ئەزانیت لە سەرەتای شەڕەوە ئێمە پشوومان نەداوە. لەو بڕوایەدام شەڕیش بەم زووانە کۆتایی نایەت و دوژمنیش واز ناهێنێت، چونکە سوپا بەتەمایە هەموو ئەو ناوچانەی مەبەستیەتی؛ داگیری بکات. تۆش ئەزانی ئێران شەڕەکەی گواستۆتەوە کوردستان و بەردەوامیش لە ناوچەی سەر سنوور هێز بەرەو ماوەت و ناوچەکانی تر دەگوازرێتەوە، ئەوەتا چەند پێشمەرگەیەکمان ماوە هەموو هەڵاتوون، کەس نازانێت بەرەو کوێ ڕۆیشتوون، خۆشت ئەزانی بەر لە شەڕ؛ مقەڕ قەرەباڵغ بوو. جگە لە میوانەکان، سەیر کە شوێنی هەندێکیان ئێستاش دیارە، لە کەرتەکانی تریشدا پێشمەرگە فیراری کردووە، بەڵام دەبێت ئەوەشت لەبیر بێت کە ئەم شەڕەش پێویستی بە ئیرادە هەیە، ئەمەش جگە لەوەی کە لە ڕووی جەستەییشەوە دەبێت تەندروست باش بێت.» کەریمە شەلیش گوتی: «ڕاست دەکەیت، منیش لەو بڕوایەدام شەڕ بەم زووانە کۆتایی نایەت، هەمووومان ماندووین و پێشمەرگەشمان هەڵاتن، بەڵام با سەبر بگرین، بزانین چی دەبێت.»

## نامەی شێخ جەعفەر و شەڕی گردی حەسەن بەگ

کاتێک مرۆڤ تووشی گرفتێکی گەورە و ماندووبوونێکی جەستەیی و دەروونی دەبێت، بەتایبەتی ئەرکی ئەخلاقی سیاسی و چارەنووسی گەلێکی هەمیشە ستەملێکراو، کە ئێمە وەک پێشمەرگە ئەو ئەرکە ئەخلاقی و سیاسی و شۆڕشگێڕییەمان خستبووە ئەستۆی خۆمان، پێمان شەرم بوو باس لە تەنها چرکەساتێکی ماندووبوون و شەونخونی و ئازاری جەستەیی خۆمان بکەین، چونکە پێمان دەوترا پێشمەرگە. هێندە نەبوو لە بارەگای کەرتەکەماندا لە شەڕی دەستەویەخەی کارێزەی کۆن گەڕابووینەوە کە ئابلۆقە درابووین و هەریەکەمان نزیکبوونەوەی مەرگی خۆی دەهاتە بەرچاو، بارەگای ئێمەش کە لە گوندی باڵخ بوو، زۆر مەترسیدار بوو، لەبەر ئەوەی گوندی باڵخ یەکێک بوو لەو گوندانەی دوای گرتنی کارێزەی کۆن و کونەماسی، مەترسیی گەورەی لێ دەکرا و بارەگاکەشمان لەو گوندەدا بوو، نیوەی دانیشتووانی گوندەکە بەرەو شار و شارۆچکەکان هەڵهاتبوون و هەندێکیشیان لەوێ مابوون. بۆ مێژوو دەڵێم هەندێک خەڵکی گوندی باڵخ کە لە ناخی دڵ و دەروونیانەوە پێیان ناخۆش بوو پێشمەرگەیەکی کەرتی ئێمەیان لە گوندی باڵخ دارکاری (فەلاقە) دەکرد و هێندەیان لێ دەدا لەتاو ئازاری جەستەیی خۆی هاواری بۆ تەواوی دانیشتووانی گوندی باڵخ دەبرد. ئێوارە بوو، لەگەڵ عەلی قلیاسانی کە فەرماندەی مەفرەزەی کەرتەکەمان و هێرش (شازین) و نوورەدینی برام، بەناو دێکەدا بەرەو بارەگاکەمان دەڕۆشتین، گوێمان لە دەنگی گریان وناڵەی پێشمەرگەیەک بوو کە بە هەموو جۆرێک ئازاری دەروونی و جەستەیی دەدرا و وشەی ناشرین و نەشیاوی پێ دەوترا و پێیان دەوت تۆ خەتمایلی بەعسیت (خەتمایل بەو کەسانە دەوترا کە لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە دەهاتنە نێو ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگە و زانیارییان بۆ ڕژێمی بەعس دەنارد و زۆر جاریش پێشمەرگەیان بەنهێنی شەهید دەکرد)، پێیان دەگوت: «ڕاستیمان پێ نەڵێیت،

ئێستە دەمت پڕ دەکەین لە فیشەک، دەی ئیعتراف بکە!» منیش دەنگی ئەو پێشمەرگەیەی خۆمانم ناسییەوە کە «حەیدەر»ی ناو بوو، بەڵام پرنسیپی حیزبی و شۆڕش وای لێ کردبووم کە نەمتوانیبوو بچم بەهانایەوە، من دەمزانی حەیدەر چەندە دڵسۆز و قارەمانە. پێم وایە لە کاتی نووسینی ئەم یادەوەرییەمدا، حەیدەر بەرپرسێکە لە دەزگای شەهیدان. ترسی من لە بەرگریکردنی حەیدەر، ئەزموونم لە دارکاری (فەلاقە)کردندا هەبوو. ئازار و ئەشکەنجەی حەیدەر، دوو هێندە ئازاری ناخی دەروونی منی دەدا. کاتێک لە پاکتاوکردنی شۆڕشگێڕان و ئیعدامکردنی هەندێک لە تێکۆشەران کە لە نێوانیاندا «وریا» بە تەور شەهید کرا، من هیچ تیروتوانجێکم بۆ ئەخلاقی سیاسی و شۆڕشگێڕانە نەبوو، تەنها لە دانیشتنێکی ئاسایی نێو چەند پێشمەرگەیەکدا وتم: بەداخەوە بۆ شەهید وریا ناهەقیی بەرامبەر کرا، کاتێک من پێناسەی وریام بە شەهید کرد، ئاگادار کرام و بانگ کرام لەسەر پێناسەی شەهیدبوونی ئەو تێکۆشەرە قارەمانە کە زۆرترین چالاکیی ناوشاری پێ دەسپێردرا و دواتر بە غەدر شەهید کرا. هەندێک لە پێشمەرگەی دانوستان (مفاوەزات)، داوای لێبوردن لەو پێشمەرگانەش دەکەم کە بەم شێوەیە ناویان دەبەم، هەر تێکۆشەرێکیش تەنها بۆ یەک ڕۆژیش بەرگریی لە میللەتەکەی کردبێت؛ بە دڵسۆز و قارەمانی دەزانم، بەڵام هەندێکیشیان بەو شێوەیەی هاوسەنگەرەکانمان خەباتیان نەدەکرد، زیاترینیان سەرقاڵی ڕەسمگرتن و پیاسەی ئێوارانی سەر گرد و نێو گوندەکان بوون و کاتێکیش تووشی شەڕی گەورەی دوژمن دەبووین، زۆرێکیان بەجێیان هێشتین. یەکێک لەو پێشمەرگانەی مفاوەزات، کە من لە دانیشتنەکەدا باسم لە شەهید وریا کردبوو، بۆ چارەنووسی نەگریسی من، ئەو شەوە جەبار فەرمان لەو گوندەدا بوو، دەپەڕییەوە بۆ بەری قەرەداغ، هەرگیز ئەو ڕۆژەم لەیاد ناچێت، جەبار فەرمان پێی وتم: «تۆ چیت و خۆت بە چی دەزانیت، بە تاوانباران دەڵێیت شەهید؟ ئاقڵ دەبیت باشە، دەنا وات لێ دەکەم کەس نەزانێت بۆ کوێ بڕۆیت و سەری خۆت هەڵگریت!» من پرسیار لە هەموو

خوێنەرانی ئەم یادەوەرییەم دەکەم، ئاخۆ شەهیدبوونی وریا؛ تاوان بوو، یاخود بە تاوانباریان دەزانی؟ لەو لێپرسینەوەی جەبار فەرمان لە گوندی کانی گۆران، وەک چۆن لە خەوێکی پڕ ماندووی پڕ حەسرەت بەخەبەر بێنێتەوە، بەو شێوەیە ترسنۆکیی من بەرامبەر بەرگریکردن لە تێکۆشەری دێرین و قارەمان حەیدەر، زۆر خۆم بە خەجاڵەت دەزانی کە من فەرماندەی ئەو تیکۆشەرە بووم و نەمتوانی بەرگری لە دڵسۆزی و نیشتمانپەروەریی بکەم کە پێشمەرگەکان حەیدەریان بە خەتمایل و جاسووس و سەر بە ڕژێم دەزانی. بۆ زانیاریی زیاتری گشتیی ئەستۆپاکیی حەیدەری تێکۆشەر و دڵسۆز، بڕوانە گۆڤاری چیا، کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکانی کوردستان، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٧، لاپەڕە٩١.

## تۆمەتێکی نابەجێ!

لە سەرەتای شەڕی قەیوان ماوەتدا، «حەیدەر پێنجوێنی» هاوڕێم بوو کە ئەوکات بەرپرسی ئازووقە و زانیاری و چاوساغی ناوچەکە دەبێت، بە فەرمانی قادری حاجی عەلی و ئازاد هەورامی ڕەوانەی ئۆردووگای کارێزە و دەروپشتی ئەو ناوچەیە دەکەن، لە ماوەیەکدا حەیدەر توانیبووی ژمارەیەکی یەکجار زۆر مریشکی سەربڕاو و حەوت هەزار و پێنج سەد سرنجی دەرزی بۆ بەرەی شەڕگەکان پەیدا بکات. لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش، بۆ پشوودان دەچێتە ماڵی «حاجی عەزیز» لە گوندی باڵخ، لەو کاتەدا مەفرەزەیەک پێشمەرگە دەچنە ماڵی حاجی عەزیز و حەیدەر دەستگیر دەکەن بە فەرمانی مەڵبەند و کۆسرەت ڕەسووڵ، گوایە گومانیان لێیەتی دەستی لەگەڵ دوژمندا تێکەڵ کردبێت و پەیوەندیی بە ئیستیخباراتەوە هەبێت، ئیتر هەر لەو ماڵەوە حەیدەر بە شەق و شەقازللە و تێهەڵدان تاکوو زیندانی بەرگەڵوو نایوەستێنن. سەیرە، بۆ کاری خراپە چەند بەدەستوبردین و بەپەلە بڕیار دەدەین! ئینجا لە زیندانی

بەرگەڵوو زۆر خراپ عەزیەتیان دابوو، بۆ ئەوەی ئیعتیراف بکات پەیوەندیی بە کێوە هەیە. پاش ماوەیەک مەسەلەکە وا دەرنەچوو، ئینجا ئازاد کرا و درێژەی بە کاری پێشمەرگانەی خۆی دەدا. ئەوەی کە ببووە هۆی گومانی بەرپرسان لە حەیدەر، چۆنیەتیی پەیداکردنی ئەو ژمارە زۆرەی سرنجی دەرزیلێدان بوو کە چۆن ئەو هەمووەی لە ماوەیەکی کەمدا پەیدا کردبوو، لە کاتێکدا لە نەخۆشخانەکانی سلێمانی و شارەکانی تری کوردستاندا بۆ دەرمان دەست نەدەکەوت! ئەم کارە ئازایانەی حەیدەر وای لە بەرپرسەکان کرد پەلە بکەن لە بڕیارداندا و پاش گرتن و ئازاردان و زیندانیکردن، ناچار هیچیان لەسەر نەدۆزییەوە و ڕاپۆرتی ماستاوچییەکان بێکاریگەر بوو، لە دواییشدا بە وتەی فارسەکان دەڵێت: «ببەخشە!»

ڕژێمی بەعس هەمیشە لە هەوڵی تێکشکاندنی هێزەکانی پێشمەرگەدا بوو، چونکە بە هەزارەها چەکداری کورد و عەرەب و تەنانەت هێزی سەربازیی لە باشووری عێراقەوە بۆ شەڕی پێشمەرگە هێنابوو و بە هەموو کەرەستەیەکی جەنگییەوە کە بۆیان ئامادە کرابوو. ئێمە تەنها وەک پارتیزان شەڕی دوژمنمان دەکرد، نە دەوڵەت بووین تاکوو شەڕی دەوڵەتێک بکەین، نە حزبێک بووین پاڵپشتیی تەواومان هەبێت لەلایەن وڵاتی دەرەوە و ئەو وڵاتانەی کە بڕیاری هاوکاریکردنیان دەداین وەک تورکیا و ئێران و سووریا و ناڕاستگۆییان لەگەڵدا دەکردین.

تێکۆشەرانی نێو شەڕەکانیش سەرەڕای ماندووبوون و قوربانیدان و خۆبەختکردن، تەنها ئەوەندەیان پێ دەکرا بۆ ماوەیەکی کاتی بەرەنگاری ئەو هێزە دڕندانەی ڕژێم ببنەوە و تا دەهات هێزی پێشمەرگە شکستی زیاتری دەهێنا و دوژمنیش بەرەو پێشتر دەهات. بۆ تەسککردنەوەی سنووری ئازادکراوی پێشمەرگە، شێخ جەعفەر مستەفا ئەو کاتە بەرپرسی سەربازیی مەڵبەند بوو، لە ئێستەدا یاریدەدەری سەرۆکی هەرێمی کوردستانە بۆ کاروباری سەربازی، لە چەمی پیر ئەلیاس لەخوار گوندی باڵخ، هەواڵی هێرشکردنە سەر گوندی باڵخ و گردی حەسەن بەگی پێ گەیشتبوو،

نامەیەکی بە پێشمەرگەیەکدا ناردبوو، لەو کاتەشدا عومەر عەرەب بە خۆی و مەفرەزەیەکەوە ڕۆژێ پێشتر چووبووە نزیک گوندی کونەماسی و ڕووبەڕووی زلهێزێکی دڕندە و پڕچەک و تەقەمەنی ببووەوە. نوورەدینی برام نامەکەی دایە دەستم و تیایدا نووسرابوو بەوەی بچینە سەر گردی حەسەن بەگ کە دەیڕوانییە سەر گوندی کونەماسی و کارێزە و باڵخ و گەڕەدێ و لەخوار لوتکەی حەسەن بەگی سەرووی گوندی ولاخلوو بوو، من و ئەو پێشمەرگانەی کە لە بارەگاکەماندا مابوونەوە، هەمووان پێکەوە بۆ بەرگریکردنی پێشوەختی ئەو زلهێزەی دوژمن ڕۆشتین، لەگەڵ هەندێک پێشمەرگەی دابڕاوی کەرت و تیپەکان کە بە هۆی ئەو هێرشە دڕندانەی ڕژێمەوە کرابووە سەریان و لە کەرت و تیپەکان دابڕابوون و چەند سەربازێکی هەڵهاتوو کە ناویان لێ نرابوو هێزی بەرگری، کە ئەو هێزە لە تەواوی گوندەکاندا هەبوون و منیش بڕوا و متمانەم پێیان نەبوو، چونکە وەک پێشمەرگە ڕۆڵی کاریگەریان لە ڕووبەڕووبوونەوە و هەستکردن بە نیشتمانپەروەری نەبوو، بەڵکوو هەڵهاتبوون لە سەربازبوونیان لە جەنگی عێراق ئێران و بۆ هەلێک دەگەڕان کە چۆن بتوانن خۆیان بگەیەننە ئۆردووگاکانی ئێران و پیاسەی شەوانی شەقامەکانی (کوچە)ی عەرەب لە تاران و دەربازبوونیان بۆ وڵاتانی هەندەران. یەکێتییش ناچار بوو ڕێگر نەبێت لە مانەوەیان لە سنوورەکانی ئازادکراوی هێزی پێشمەرگە و بڕیارێکی بۆ دەرکردن و ناویان لێ نان هێزی بەرگری و ئەنجوومەنی گشتیی گوندەکان ئاگاداری کاروباری ئەو هێزە بەرگرییە بوو کە هەرگیز هیچ ئامادەییەکیان تیا نەبوو. کاتێک پێشمەرگە لە چیاکان لە شەڕدا بوون، ئەوان ئەو تفەنگانەی کە پێیان بوو، لە کایەن (جێی حەوانەوەی ئاژەڵ) حەشار دەدا و کاتێکیش پێشمەرگە لە ناویاندا بەدەربکەوتایە، تفەنگەکانیان لە شان دەکرد و بەناو ئاوایی گوندەکاندا دوو هێندەی پێشمەرگە لە ناخی خۆیاندا ڕۆڵی خۆیان دەبینی، بەڵام لەلایەن دانیشتووانی گوندەکانەوە بە چاوی پێشمەرگە سەیر نەدەکران. لەیادمە لە گوندی هەنارانی خواروو، ئەو

دەمە کوێخا حسێنی هەناران؛ پیاوێکی قسەخۆش و جێی بڕوا و متمانەی مام جەلال و نەوشیروان مستەفا و تەواوی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانی بوو، یەکێک بوو لەو هاوڵاتییانەی لە ترسی جەنگی عێراق و ئێران هەڵهاتبوو، ئێمەش ڕێمان کەوتە گوندی هەناران، داوای لێ کردم ئێوارەی ئەو ڕۆژە بچینە ماڵەکەی کە لە یەک ژوور پێک هاتبوو، پاش ئێوارەخوان و قسەی شەوی بەر چرا، داوای هاوکاریی لێ کردم کە بە فەرماندەی کەرتەکەم بڵێم چەکی پێ نەکڕن. ئێستە بە پلەی لیوا لە یەکێک هێزەکانی حزب وەک کارمەندی حزبی دامەزراوە و دووریش نییە هاوڵاتییەک کاری بکەوێتە ئەو شوێنە، نەتوانێت بە واژۆی ئەو سەردانی پێ بکرێت. چەک کڕین لەلایەن شۆڕشەوە وەک بڕیارێک بۆ ئەو سەربازە هەڵهاتووانە دەرکرا کە لەژێر سنووری ئازادکراوی هێزی پێشمەرگەدا حەسابوونەوە و بە هێمنی و ئارامی لەو گوندانەدا دەژیان کە خەڵکی گوندەکانیش هاوکارییان دەکردن و دواتر لە کاتی پێویستیدا، واتە شەڕی ڕووبەڕووبوونەوەی هێزی پێشمەرگە و نەیارەکانی، ئەو هێزی بەرگرییە کەس نەیدەزانی لە کوێ تفەنگەکانیان فڕێ دەدا و هەڵدەهاتن.

سەرلەبەیانی لەگەڵ عەلی قلیاسانی؛ فەرماندەی مەفرەزە، پێکەوە لەگەڵ هاوڕێیان لە ئامادەکاریدا بووین بۆ سەرکەوتن و بەرگریکردن لە هێزی پێشمەرگەی پشتی خۆمان و پێشەوەی دوژمن. بە یەکێک لە پێشمەرگەکانم ڕاگەیاند کەرتی ئێمە دوو ئاڕبیجی و دوو بیکەیسیمان هەیە. جەبارە سوور کە تێکۆشەرێکی خاوەن بەئەزموون و پێشمەرگەیەکی زۆر ئارام و چاونەترس و دڵسۆز بوو، لە شەڕی کەتووی سەر بە شاربازێڕ، لەبەر ئەوەی چاوی کز بوو، پاشان لەو شەڕە سەختەدا لە ئێمە دابڕابوو، بەر دەستی جاشەکانی هەرکی و سورکی قۆنتەراتچییەکانی بەعسی داگیرکردنی شاخ و گرد و دۆڵەکانی کوردستان جەبارییان بەدیل گرتبوو، دواتر شێخانی بەرزنجە هەوڵی ئازادکردنیان بە میقداری پارەیەکی زۆر دابوو کە لەلایەن بنەماڵە هەژارەکەیانەوە هاوکاری ئەو بڕە پارەیە بوون و ببووە هۆی ئازادکردنی

جەبار و دواتریش شۆڕش هێندە بێڕەحم بوو، لەبریی ئەوەی مەدالیای ئازایەتی و دڵسۆزی و خۆڕاگریی پێ ببەخشن کە جەبارە سوور تەمەنی لەو کاتەدا ١٩ ساڵان بوو کە لە شەڕی چیای سەختی لوتکەی حەسەن بەگدا لەتەنیشت خۆمەوە پێکەوە هەردووکمان بریندار کراوین و جەباریش شەهید بوو، کەچی بەپێچەوانەوە هێشتا گومانی ئەوەیان لێ دەکرد کە خەتمایل بێت و بەعسیش ئازادی کردبێت، وەک ئەو خەتمایلە بەعسییەی خرابووە پاڵ حەیدەر و دواتریش ئازاد کرا.

هێشتا سەر نەکەوتبووینە سەر گردی حەسەن بەگ و تەواو ماندوو ببووین و پێشمەرگەی کەرتەکەشمان هەندێکیان لە دڵسۆزیدا هەنگاوی خێرایان دەنا بۆ ئەوەی زووتر بگەنە شوێنی مەبەست، کەچی بۆڵەبۆڵ و گوێبیستی وشەی نەشیاو بووم، منیش بۆ ئەوەی بزانم چی ڕووی داوە، چونکە ئەرکێکی قورسم پێ سپێردرابوو کە بە نامەی فەرمیی شێخ جەعفەر مستەفا ئاراستەم کرابوو، دەبوو وەک پرنسیپی حیزبی و شۆڕشگێڕانە ئەرکی خۆمان جێبەجێ بکەین. گەڕامەوە بۆ خوارەوە، کە پێشمەرگەکان دوو دوو بەرەو ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن بۆ سەر گردی حەسەن بەگ سەر دەکەوتین. هێرش بە ڕووخسارێکی گرژ و تفەنگەکەی بە دەستەوە بوو، هێندەی نەمابوو تەقە بەرەو ڕووی ئەو پێشمەرگانە بکات و بیانکوژێت، گەر فریاش نەکەوتمایە، ڕەنگە کار لە کار بترازایە و هێرش یەک دووانێکی بکوشتایە. بۆ ئەو مەبەستەش وەک لە چەند لاپەڕەی پێشوودا ئاماژەم پێ داوە و وەک سەرچاوەیەک بۆ ئەو مێژووە بڕوانە گۆڤاری چیا[1] دەڵێت:

کاتژمێر ٣ی نیوەشەو بەپەلە لە خەو هەڵساین و کەوتینە خۆکۆکردنەوە لەگەڵ ئەو هێزەی کە ناوم هێنا (هێزی بەرگری) و کەوتینە ڕێ. ئارپیجییەکمان هەبوو، کەریمەشەل و عەلی کە هەردووکیان وەک فەرماندەی مەفرەزە

---

١. گۆڤاری چیا، کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکانی کوردستان دەریدەکات، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٦٧.

لەگەڵماندا بوون، بە جەباریان ڕاگەیاند کە یەکێک لەو دوو ئارپیجییەکە لە مقەڕدا و لە شوێنێکی قایمدا بشارنەوە، چونکە پێویستمان نییە لەگەڵ خۆماندا بیبەین. ملی ڕێگامان گرتە بەر و بەرەو هەورازێکی سەخت ملمان نا، لەبناری بەنەدورەوە بەنەدور زنجیرەچیایەک بوو، دەیڕوانییە سەر گوندی کونە ماسی و گوندی باڵخ و گوندی وڵاخلوو تا لاشانی زنجیرەکێوی حەسەن بەگ گەیشتینە شوێنی مەبەست کە شاخێکی ڕووتەن و سەربەرەوخوار بوو کە دەکەوێتە سەروو پشتی کونەماسی و خوار لوتکەی حەسەن بەگ. هەندێک لە هێزی بەرگری و پێشمەرگەکان لە مقەڕەوە کە کەوتینە ڕێ، هەر بۆڵەبۆڵیان بوو، ئێمەشیان بێتاقەت کردبوو، قسەی ڕەق و ناخۆشیان دەکرد و دەیانگوت: ئەم هەواڵە نازانین چ خوشک حیزێک داویەتی بە تیپ، بۆ ئەوەی خۆی بەرێتە پێشەوە و ماستاو و گەوادی بکات! زۆربەی ئەو پێشمەرگانەی بۆڵەبۆڵیان دەکرد، هێزی بەرگری و پێشمەرگەی دەزگای ئیداری و موتەفەریقە و هەڵاتووەکانی شەڕ بوون. بۆیە بەر لەوەی بگەینە سەر شاخ، پشوویەکمان دا. ئەو برادەرانە هەر قسەی ناخۆشیان دەکرد و لەبەر خۆیانەوە جنێویان دەدا، بۆیە خۆم پێ نەگیرا و گوتم: ئەرێ ئەوە عەیب ناکەن ئەم هەموو قسە پڕوپووچانە دەکەن؟ لە مقەڕەوە ئێوە هەر خەریکی قسەی ناشرین و جنێودانن بەم و بەو، ئەگەر حاڵتان وایە فەرموو بچنە خوارەوە ملتان بشکێنن! یەکێکیان ویستی خۆیم لێ سوور بکاتەوە و لێم هاتە پێشەوە، گوتم: بڕۆ دواوە با لێرەدا وەک سەگ نەتتۆپێنم، خوێڕی! دوایی کەوتمە جنێودان بە هەموویان، گوتم ترسنۆکن و پیاوی شەڕ نین. کەریمەشەل کە لەسەرووی ئێمەوە بوو، بەتووڕەییەوە هاتە خوارەوە و گوتی: هێرش، ئەوە چییە؟ وەڵامم دایەوە کە ئەمانە لە مقەڕەوە هەر خەریکی بۆڵە و جنێودانن، تاقەتی ئێرەیان نییە، ئێمەشیان بێتاقەت کردووە. کەریمەشەل گوتی: ئەوە چ خوێڕییەکە؟ گوتم: هەموویان! دەورمان گرتن و دووانمان چەک کرد، کەریم گوتی: هەر چی قسەی کرد، بیکوژە! دوایی چەکەکانمان دانەوە و تۆزێ قسەمان بۆ کردن و گوتمان: ئێمە لە یەکەم

ڕۆژی شەڕەوە بەشداریمان کردووە خەو نەچۆتە چاومان، بە خەیاڵیشماندا نایەت. بەڵام ئێوە ئەمە یەکەم جارتانە وا دێنە سەر شاخ، کەچی تەحەمولی یەک سەعاتتان نییە. تاوەکوو دنیا ڕووناک دەبێتەوە و بزانین دەنگوباس چییە، ئایا دوژمن هێرش دەکاتە سەرمان یان نا، ئەوسا ئەگەر هێرش نەکرا، دەگەڕێینەوە شوێنی خۆمان و ئێوەش بۆکوێ دەچن؛ بچن، ئیتر عەیب ناکەن ئەم هەموو قسە ڕەقانە دەکەن و پێشمەرگەکانیشتان بێتاقەت کردووە! بەعام بێدەنگ بوون و کەسیان قسەیان نەکرد، من چاوێکم هەر لەسەر یەک دووانێکیان بوو، لە دڵی خۆمدا ئەوەم لێک دەدایەوە کە شەڕ دەست پێ دەکات ئەو بۆڵەبۆڵکەرانە لەدواوە تەقەمان لێ دەکەن و بمانکوژن (ئەم حاڵەتە لە زۆر جێگادا ڕووی دابوو). لەو لاشانەدا کەریمەشەل حەرەسیاتی دەرکرد و پێشمەرگەیەک کرا بە حەرەس، ئێمەش پاڵ کەوتین، تفەنگەکانمان لای خۆمانەوە دانا، یەکی پەتویەکی ڕزیویشمان پێ بوو، من پەتۆکەم بە خۆمدا دا و پاڵ کەوتم، کەریمەشەل نەخەوتبوو، هەر وەنەوزی دەدا و ئەمدیو و ئەودیوی دەکرد. لە کاتژمێر ٥ی دەمەوبەیانی مەفرەزەیەکی جاش بەدزییەوە لێمان هاتە پێشەوە. ئەوان چاویان لە حەرەسەکەی ئێمە بوو کە خەوی لێکەوتووە و سەریشی بەسەر تفەنگەکەیدا شۆڕش کردبۆوە، ئەمەیان بە هەل زانی و بەنیاز بوون بمانکوژن یان بەساغی ئەسیرمان بکەن.

لەو کاتەی کە جاشەکان بەرەو ئێمە دێن، کەریمەشەل هاوار لە جاشەکان دەکات وا دەزانێ برادەرانی هێزی بەرگرین و دەڵێ: زەحمەت نەبێت حەرەسەکان بگۆڕن، با ئەویش بێت سەرخەوێک بشکێنێ. لەو کاتەدا حەرەسەکەمان کە پێشتر خەوی لێکەوتبوو، بەئاگا دێتەوە و میلی تفەنگ ڕادەکێشێ و ڕیزێک ئەکات بە ناویاندا، ئێمەش هەروەک شێت پەلاماری تفەنگەکانمان دا و کەوتینە تەقەکردن لەبەردەمی خۆماندا و یەکێک لە جاشەکان بریندار دەبێت و ئیتر بەشەلەشەل بەرەو خوارەوە هەڵدێت و ئیتر تەقە دادەمەزرێت و جاشەکان لە بنارەوە هێرش دەکەن

بەرەو ئەو لاشانە ڕووتەڵانەیەی ئێمەی پێوە بووین، ئینجا بڵاو بووینەوە و سەنگەرمان لێ گرتن. تانکەکانی سوپاش لە سوورەقەڵاتەوە بەخەستی کەوتنە بۆردوومانکردنی سەنگەرەکانمان. بەڕاستی ئەو شوێنەی ئێمەی پێوە بووین، جگە لە چالاکییەکی خۆکوژی؛ هیچی تر نەبوو، چونکە شاخەکە ڕووتەن بوو، لاشانێکی سەربەرەوخوار بوو، بەرامبەر بە سوورەقەڵاتیش زۆر بەجوانی دیار بووین، دوژمن پێویستی بە ڕوانگە (رصد) نەبوو بۆمان، هەر بۆیە تانکەکان و تۆپخانەی دوژمن بەجارێک هیلاکیان کردین، ئەمە جگە لە هێرشی جاشەکان و چەندین ڕەشاشی بیکەیسی (BKC) و دۆشکە کە لەخوار لاشانی ئێمەوە تەقەیان لێ کردین، فیشەک و گوللەتۆپ وەک خۆڵ بەرامبەرمان دەهات.

من ڕەشاشێکی ئارپیکەی (RBK)م پێ بوو، شەوەکەی دایانمێ، مەخزەنێکم بەرەو شوێنی ڕەشاشی بیکەیسی (BKC)یەکە تەقاند کە بەتەواوەتی سەغڵەتی کردبووین، بەڵام سوودی نەبوو. دوژمن هەر بەردەوام بوو لە هێرشکردن بۆمان، بەڵام ڕەشاشی بیکەیسی (BKC)یەکەی دوژمن بەتەواوەتی تەقەکانی ئێمە و بەرگریکردنەکانمانی بێکاریگەر کردبوو.

ڕەفیق داوای لێ کردم کە مەخزەنێکی چلی بە ئاراستەی ڕەشاشەکەدا بتەقێنم، بەڵکوو بتوانم بێدەنگی بکەم. مەخزەنێکی چلیم بەو شوێنەوە نا، فیشەکی ئێمە و ئەوان تێکەڵ بە یەکتر ئەبوون، مەخزەنەکەی من گڕدار بوو، ئەوەی دوژمنیش بە هەمان شێوە، هەردوو لامان یەک زریزەی ئاڵتوونیمان بە هێڵێکی درێژ بەرامبەر بە یەکتری دەگۆڕییەوە و دیمەنێکی یەکجار جوانی دروست کردبوو. بەڵام لە گەرمەی تەقەکردندا بووم، فیشەکێک لای ڕاستی سەرمی تیغ کرد و ئەتوت دە کیلۆ بە سەرمدا کێشراوە، یەکسەر ڕەشاشی ئارپیکە (RBK)یەکەم دانا و دەستم بە دەموچاومەوە گرت. چاوی ڕاستم ئاوی تێ زا، پاشان سەرێکم ڕاوەشاند و بە دوو پەنجە فشارم خستە سەر پێڵووی چاوم، ماوەیەک بەو شێوەیە ڕامگرت، پاشان دەستم لەسەر هەردوو چاوم بەر دا و هەستم دەکرد شتەکان تەڵخ دێنە بەر چاوم، لەو

کاتەدا کەریمەشەل هاواری لێ کردین کە من و ڕەفیق بگەڕێینەوە پاشەکشە لە سەنگەرەکانی پێشەوە بکەین و بێینە دواوە. کە پاشەکشەمان کرد، لە لاشانی دۆڵێکدا دانیشتین و کەوتینە لاشانی ئەودیوی دوژمنەوە، تەنها حەرەسێکمان لەسەر بەرزاییەکەدا هێشتەوە، تاکوو ئاگاداری جموجۆڵی دوژمن بێت. بۆ زانیاریی زیاتر، جۆری چەکی ئاڕبیکەی لە کلاشیکۆف گەورەتر و بەهێزترە و لە جۆری چەکی بیکەیسی بچووکتر و بیکەیسی بەهێزترە لە چەکی ئاڕبیکەی، سەرەتا زۆر دەترسام چاوێکم لەدەست دابێت و کوێر بووبم، بەڵام هەستیشم دەکرد فیشەکەکە زۆر بەتەنکی لای سەری سمیوم. کەریمەشەل گوتی: هێرش دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ مقەڕ و ئاڕبیجییەکی (RBG)یەکی لێیە و بەڵکوو بیهێنیت، من دەزانم ئێرە شوێنمانە و بەم زووانەش لێرە ناڕۆین و لەوانەیە هێزی تریش بەهانامانەوە نەیەت. ڕووم نەهات باسی ئەو سووکەبریندارییەی خۆم بکەم و بڵێم سەرم فیشەک تیغی کردووە و وەزعم باش نییە. لەسەر شاخەوە بەرەو گوندی باڵخ بەڕێ کەوتم. تۆپبارانی دوژمن هێندە چڕ بوو، زیاتر لە ٢٠ گوللەتۆپ دەیدا بە زەویدا و ٢٠ی تریش بە ئاسمانەوە بوون. کە گەیشتمە ناو ڕەزەکانی پشت گوندی باڵخێوە، گووللەتۆپێک لەنزیکی چەند مەترێکەوە لە پەنامدا ناڵەی کرد و کێشامی بە زەویدا، تا دوو سێ دەقیقە نەمتوانی هەستم، مێشکم بەتەواوەتی کاس بوو، خۆڵ و گڵ و لەتە بەردی ئەو ناوەی کێشا بە سەرمدا. ویستم هەستمەوە، توانام لەبەر بڕابوو. برووسکەیەک بە قاچی چەپمدا هات، دەستم بە سەرمەوە گرت و هەستامە سەر پێ، وردە وردە بەرەو گوندەکە دەکشام، ئەوەندەی پێنەچوو هەستم دەکرد شەقاوەکانم تێکەڵوپێکەڵیان دەبن، لەپەنا دارێکدا دانیشتم و جگەرەیەکم داگیرساند، ئینجا بۆم دەرکەوت بریندارم بەبێ ئەوەی بە خۆمم زانیبێت.

بۆ ئەم مەبەستەش کەریمەشەلی فەرماندەمان دوای پرسیارکردن، زانیمان کە مەفرەزەیەکی پێشمەرگە کە چەند کەسێکیان لە هێزی بەرگری بوون، پشتەوەی ئێمەیان بەبێ پرس چۆڵ کردبوو، پاشان لێپرسراوی ئەو

مەفرەزەیەمان بانگ کرد و تێرووپڕ جنێومان پێ دا، ئینجا پێش خۆمان دا بۆ لای شۆڕش ئیسماعیل و سابیر ڕەسووڵ و ئازادی حەمەی گەمحان، لەوێش لەبەر چاوی ئەو فەرماندانەدا قسەی ڕەقمان بەرامبەر کردن و پاشان فەرماندەکانیش پێیان گوت: «ئەرکێک کە ناتوانی لەئەستۆی بگری، بۆچی دەیکەیت کە خەریک بوو هەموو پێشمەرگەکان بە شەهیدبوون بچن!» دوابەدوای ئەوەش شۆڕش ئیسماعیل و سابیر ڕەسووڵ و ئازادی حەمەی گەمحان دەستخۆشیی ئەو خۆڕاگرییەیان لێ کردین کە بەبێ نان و ئاو لە ١٢ی شەوەوە بەرگریمان کردووە و لە سەنگەرەکانمان نەجووڵاوین. پاشان شۆڕش ئیسماعیل بردمیە ئەولاوە و گوتی: «واز لەو برادەرانە بهێنە، نەدەبوو لەبەر چاوی سابیر ڕەسووڵ و ئازادی حەمەی گەمحان بەو شێوەیە قسەت بکردایە، لە کاتێکدا من فەرماندەی تیپم و بەرپرسم لە هەر شتێک لەم ناوچەیەدا ڕوو بدات!» منیش داوای لێبووردنم لێ کرد و پاش خواحافیزی، لەگەڵ کەریمەشەلدا گەڕامەوە لای برادەران.

بەر لەوەی بگەڕێمەوە ناو سەنگەرەکانمان، ئازادی حەمەی گەمحان گوتی: «ئەگەر برسیتانە، وەرن شتێک بخۆن!» بەڕاستی من زۆرم برسی بوو، یەکسەر وتم: «وەڵا برسیمانە!» لەگەڵ کەریمەشەلدا تێر نان و پەنیر و چامان خوارد، لە دواییدا چووینەوە لای برادەران، کە ئێمەیان دی، گوتیان: «ڕەنگتان دیارە شتێکتان خواردووە.» من یەکسەر گوتم: «کاک ئازاد نانی داینێ، دوو دوو ئەگەر شەرم ناکەن، بچن نان بخۆن.»

ئیتر بڕیاریان دا بچنە لای شۆڕش ئیسماعیل، تاکوو بەو دوو پێشمەرگەیەی ناردوویانە بۆ چەمی پیر ئەلیاس؛ خواردنیان بۆ بهێنن. ئەم شەڕە ١٢ کاتژمێری خایاند، بەڵام ژمارە ١٣ بۆ هەردوو لامان جێگەی نەگبەتی بوو، چونکە جەنگ هەرگیز خزمەت بە مرۆڤایەتی ناکات و هەر چی کارەساتی ناخۆش وماڵوێرانکەرە لە جەنگەوە پەیدا دەبێت. هەموومان شەڕ هەڵدەگیرسێنین، کەچی هەمووشمان لە مەرگ ڕادەکەین. دوژمن خاکی داگیر کردووین، شەڕی ئێمەش شەڕی ناچارییە، دەنا کەی شەڕ خۆش بووە؟ لە

ڕاستیدا من نەمزانیبوو هێرش (شازین) بریندار کرابوو، گومانی ئەوەشم لێ نەدەکرد بە فێڵ وەک هەندێک پێشمەرگەی تر خۆی بدزێتەوە، بەڵام هەستم بە بوونی شتێکی نادیار دەکرد و لەلام گەڵاڵە نەدەبوو، هۆکاری نەگەڕانەوەی هێرش چی بوو، ئەویش بریندارکردنەکەی ببووە هۆی دابڕانی کاتیی لەگەڵ ئێمە و دواتر کە گەڕایەوە ناومان، زۆرم پێ ناخۆش بوو کە بەو شێوەیە من ناردبووم ئاڕبیجییەکمان بۆ بهێنێت، بەڵام بە هۆی منەوە بوو لە ڕێگادا بریندار کرابوو.

## شەڕی بەردەسپییان، کۆتایی هەموو شەڕەکان بوو

بەم شێوەیە ژیانی پێشمەرگە زۆر لە ناڕەحەتی و شەونخونی و بێخۆراکی و باران و بەفر و سەر شاخ و گردەکان بوو، لەم شەڕ دەگوازرراینەوە بۆ شەڕێکی تر، لە شاخێکەوە بۆ شاخێکی تر و گوندێکی تر، بەبێ ئەوەی بۆ تەنها ڕۆژێکیش هێزی پێشمەرگە پشوو بدات و گەر ساتێکیش خەو بە چاویاندا بهاتایە، لە دەنگی بۆردوومان و شریقەی تۆپ و ڕاجیمە و گوللەی زرێپۆشەوە بەخەبەر دەهاتن و زۆر جاریش شەهید و برینداریان لێ دەکەوتەوە.

پتر لە دوو مانگ لەگەڵ ئەو زلهێزەی ڕژێمی بەعسدا لە شەڕدا بووین، بە دەیان شەهید و بریندارمان دەدا و پێشمەرگەش جگە لەوەی تەنها ئاڕبیجی و بیکەیسی و چەند زرێپۆشێک لە بەرزاییەکانەوە و لە دووریی شەڕەکانەوە تەقەیان پێ دەکرا و چەند هاوەنێکی بچووکمان هەبوو لەلایەن «شەریف قورئانی»یەوە کە ئەزموونێکی باشی هەبوو بۆ پێکانی سەربازگە و بارەگا و بنکەکانی دوژمن کە پێی دەوترا تۆپخانەی شۆڕش. چەکی شانی پێشمەرگە، تەنها کلاشینکۆف و تفەنگی ژیسێ و ئاڕبیکەی بوو، ئەمەش بۆ بەرامبەر ئەو هێزە دڕندەیەی بە هەزارەها چەکدار و فڕۆکەی جەنگی و کۆپتەر و... هتد، جگە لە قارەمانێتی و باوەڕی پتەوی بەرزی هێزی پێشمەرگە، هیچی تر

نەبوو. لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٨٦دا، چەند مانگێکمان مابوو بۆ ساڵی نوێ و تا دەهات دەچووین بەرەو سەرما و ڕەهێڵەی باران و بەفر و بەتایبەت سەرمای بەرەبەیان کە لەنێو شاخەکاندا بەسەرمان دەبرد، چەند هێزێکی زۆر لە کەرت و تیپەکان بەرەو «بەردە سپییان» و سەر لوتکەی کێوی حەسەن بەگ کە لە گوندی وڵاخلوو بۆی سەر دەکەوتین و کێوێکی پڕ تاشەبەردی گەورە و بەرز و سەخت بوو. لوتکەی بەردەسپییان و حەسەن بەگ؛ شوێنێکی ستراتیژیی هێزی پێشمەرگە بوو، لە پشتیەوە، لە ناحیەی کارێزە و کونەماسی، کە ئێستە کونەماسی بووە بە سەیرانگا و بە سەدان هاوڵاتی بۆ حەوانەوە و ئاسوودەبوونیان دەچنە ئەو سەیرانگایە و ئەو دەمەش بە خوێنی زۆرترین پێشمەرگەی یەکێتی بەرگریی لێ دەکرا، دوژمن زۆر پێویستی بە شاخی حەسەن بەگ هەبوو، چونکە لەوێوە هێرشی بۆ سەر سنوورەکانی سەفرە و زەروون دەکرد، بۆ چوونەپێشەوەی شەڕی بەرامبەری ئێران.

لە ڕێکەوتی ١٩٨٦/١١/٤، هێزی دوژمن هەر لە بەرەبەیانەوە تاکوو تاریک بوو، زۆرترین فڕۆکەی جەنگی و کۆپتەر و بۆردوومانێکی زۆر ترسناک کراین. تیپی مەڵبەندی دوو، تیپی ٦٥ی بەلفەت و تیپی ٤٣ی ئاسۆس و تیپی٤٧ی پیرەمەگروون و تیپی ٦٣ی جووتیاران، بەسەر شاخەوە بووین و دواتریش سامان گەرمیانی و شۆڕش ئیسماعیل سەر کەوتنە سەر شاخ و هێزێکی کەمی پانزە پێشمەرگەیەک دەبوون هاتن بەهانامانەوە. ژمارەی ئەو پێشمەرگانەی بە من سپێردرابوون، چواردە تێکۆشەری زۆر قارەمان و خۆڕاگر بوون، بریتی بوون لە: داود، دلاوەرەشەل، شوانەی یوسفی عەبەکە، فەرەیدوون، غەفووری حاجی ڕەشید، ڕێبواری مام کوێخای کانی سپیکەی دۆڵەڕووت، هێرش (شازین)، نوورەدینی برام، ئازاد کەرکووکی، سەردار قادر (سەرداری قالەی خەڵووز)، ئاکۆی مەلا عەبدول، کامەران ڕەسووڵ برای شەهید کامیل لە کەرتەکەی خۆیان دابڕابوو، هاتبووە لای ئێمە. سەر شاخی حەسەن بەگ؛ سەخت و تاشەبەردی گەورە و هەندێک

کونی بچووکی لە شێوەی ئەشکەوتدا تیا بوو، هەر چۆنێک بوو لەنێو ئەو تاشەبەردانە و بە پارچە بەردی بچووک هەندێک سەنگەری بچووکمان دروست کردبوو، مەفرەزەیەکی کەرتی ٣ی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون کە سالاری شێخ عومەر و پێشڕەو ئەحمەد (پێشەی ئەحە کەلان) هەردووکیان فەرماندەی مەفرەزە بوون کە بریتی بوو لە سیانزە پێشمەرگە بەم ناوانە: بەرزانی تەمین، نزار دوای ئەو شەڕە شەهید بوو، ئەنوەر لە شەڕێکی تردا شەهید بوو، ڕەسووڵ دواتر شەهید بوو، برایمی حاجی حەمەی وایەرمەن (بلە لووتە) دواتر شەهید بوو، دلێر ئەحمەد (دلێری ئەحە کەلان) لە ڕاپەڕینی سەرتاسەری ئازادکردنی کوردستان ساڵی ١٩٩١ لە گرتنی شاری کەرکووکدا شەهید بوو، ئازاد عەرەب کە سەربازێکی هەڵهاتووی بە ڕەگەز عەرەب لە جەنگی عێراق و ئێران، لە گوندی کانی گۆراندا نیشتەجێ بوو، دواتر بوو بە پێشمەرگەیەکی دڵسۆز و قارەمان و لە شەڕەکانی شەدەڵە شەهید بوو، ڕزگار گاپیلۆنی، سەرکەوت، حاجی کەریم، عومەری مامە عەزە، سالاری شێخ عومەر، پێشڕەوی ئەحە کەلان. لەپێش ئێمەوە لە بەردەسپییان تووشی شەڕێکی دەستەویەخە بوون و سالاری شێخ عومەر کە فەرماندەی مەفرەزەکە بوو و بریندار ببوو، لەگەڵ ئەوەشدا فیشەکی کەمی پێ مابوو. گەر ئازاد عەرەب وەک ئاماژەم پێ دا لە ئەنجامی جەنگی عێراق و ئێراندا وەک سەربازێکی هەڵهاتوو لە گوندی کانی گۆراندا ژوورێکی بچووکی کردبووە جێی حەوانەوەی ژیانی خۆی و دواتر ببووە پێشمەرگە لە تیپەکەماندا؛ فریای سالاری شێخ عومەر نەکەوتایە، دوور نەبوو سالار فیشەکی پێ نەمابووایە و بەزیندوویێتی بەر دەستی دوژمن بکەوتایە، ئەگەرچی سالاری شێخ عومەر هێندە تێکۆشەرێکی بێئەزموونی خەباتی سیاسی و چەکداری نەبوو، لێ شەڕەکان هێندە سەخت و هێزی پێشمەرگەش بە چەکی سووکەوە وەک چەکی کلاشینکۆف، مەگەر تەنها ئەو بیروباوەڕە جوانە و دڵسۆزی بۆ خاک و نیشتمان، بەرەنگاریی ئەو شەڕە سەختەی بکردایە کە هەزاران شۆڕشگێڕی بزووتنەوەی ئازادیخوازی گەلی

کورد بەرگەی زوڵم و زۆری و هێرشی دڕندانەی حیزبی بەعسی بگرتایە.

شەڕی هێزی پێشمەرگەی ئەو مەفرەزە کەمەی لەپێش ئێمەوە بوو، جگە لەوەی سالار بریندار بوو، دوو پێشمەرگەشیان ناوەکانیانم لەیاد نەماوە؛ شەهید بوون و تەرمەکانیان بەر دەستی دوژمن کەوتبوون. پاش کشانەوەی مەفرەزەکەی سالاری شێخ عومەر و پێشڕەوی ئەحە کەلان بۆ لای ئێمە و ئێمەش ماندووبوونێکی یەکجار زۆرمان پێوە دیار بوو، هێشتا شۆڕش ئیسماعیل کە ئێستە وەزیری پێشمەرگەیە و سامان گەرمیانی ئەندامی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە؛ نەگەیشتبوونە لامان، دیار بوو ئەوانیش زیاتر لە ئێمە و هێزەکانی تر ماندوو ببوون. ئەو شوێنە دوژمن کۆنترۆڵی کرد و بە دەیان فڕۆکەی جەنگی بۆردوومانی ئێمەیان کرد و ڕووبەڕووی شەڕێکی ترسناک و دەستەویەخە بووینەوە و مەفرەزەکەی سالاری شێخ عومەر و پێشڕەوی ئەحە کەلان و چەند پێشمەرگەیەکی تری کەرتەکان، لە نێوانیاندا حەمەی برای شەهید وەستا مەجید و کامەران عوسمان (کامەرانی عوسە شەل)، غازی و توانای برای شەهید دلێری شێخ ڕەزا؛ بەشداری شەڕەکە بوون.

کاتێک هێزی مەفرەزەکەم لەسەر شاخ و پێش ئەوەی بریندار ببم، برسی و تینوو و فیشەک و خواردەمەنیمان لێ بڕابوو و منیش شەرمم لە پێشمەرگەکان دەکرد، دوای ئەو هەموو ژیانبەخشین و فیداکاری و کۆڵنەدانەوە بە هەر کەسێکیان بڵێم کە لە شاخ بچنە خوارەوە بۆ گوندی وڵاخلوو کە تاک و تەرا خەڵکی گوندەکەی تیا مابوو، کە بچن هەر هیچ نەبێت هەر شتێک ناوی خواردن و خواردنەوەی لێ بنرێت؛ بۆمان بهێننە سەرەوە، نەگەیشتمە هیچ ئاکامێک و بە باشم زانی بە براکەی خۆم بڵێم، چونکە وەک پێشمەرگە؛ فەرماندەی ئەو بووم و لە ڕوانگەیەکی تریشەوە من برا گەورەی ئەو بووم، داوام لە نوورەدینی برام کرد کە لەسەر شاخ بچێتە خوارەوە، ئەویش لەو وتەی من دەرنەچوو، پێی وتم: «باشە، دەچمە خوارەوە، بەڵام بە چی نان و ئاو و تەقەمەنیتان بۆ بهێنم؟» لە ڕاستیدا

منیش نەمزانی چۆن وەڵامی بدەمەوە. نوورەدینی برام چووە خوارەوە و تاکوو چەند کاتژمێریک نەهاتەوە، منیش هێندەی تر شەرم گرتمی بەوەی کە براکەم ڕایکردووە لە شەڕەکەدا. زۆرمان برسی بوو، دەستم دایە گەڵای دار دەوەنیک و چەند گەڵایەکم لێ خوارد، پاش چەند چرکەیەک هێڵنجم دا و ڕشامەوە و ئازارێکی ناخۆش بە گەدەمدا هات. نوورەدینی برام هاتەوە و خوێن بە نێوچەوان و جامانەیەکی پڕ خوێنی لە ملیەوە ئاڵاند بوو، کە بۆ دووەم جار بوو لە داستانی قەیوان ماوەت و گرتنی ناحیەی کارێزەدا بریندار بوو، بە ولاخێک (هێستر) هەندێک خواردەمەنیی لەگەڵدا خۆیدا هێنابوو بۆ سەر شاخ، وەک دوو تەنەکەی پڕ لە ئاو و دوو گوێنی پڕ کولێرەی بۆ هێناوبووین، لەلایەن هاوڵاتییانی سڤیلی کوردستان و ئەو دایک و خوشکانەی کە ڕۆڵە و براکانیان پێشمەرگە بوون و لەلایەن تەواوی ئەندامانی ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشار بۆیان ناردبووین.

بۆ مێژوو دەڵێم :شۆڕش ئیسماعیل و سامان گەرمیانی، دوو بەرپرسی ئیداری و سەربازی و دڵسۆز و بەئەمەک بوون، ئەگەرچی تەنها بەختیاری برای شۆڕش ئیسماعیل و ئازاد وەندەرێنی فەرماندەی مەفرەزەی کەرتی تیپ بوو، کەریم سەر سپی فەرماندەی مەفرەزە بوو، پێش ئەو هێزەی کە هێنابوویان بۆ هاوکارکردنمان، کەوتبوون و پێش ئەوان هاتبوونە سەر شاخ، بۆ ڕۆژی دواتر سەرلەبەیانی هێرشێکی زۆر سەخت لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە دەستی پێ کرد و زۆرترین چەکداری ڕژێم بە هەموو توانایەکیانەوە، شەڕێکی خوێناویی دەستەویەخە ڕووبەڕووی هێزی پێشمەرگە بوونەوە، تۆپێک لەنێوان شۆڕش ئیسماعیل و سامان گەرمیانی و من و ئازاد وەندەرێنی و کەریم سەرسپی تەقییەوە و کەریمی شەهید کرد، کە بووە یەکەم شەهیدی ئەو هێرشە. سوپای ڕژێم و هێزی پێشمەرگە تێکەڵ بە یەک بوون. من لەو شەڕەدا فیشەکێکی بیکەیسی بەر لاکەلەی پشتم کەوت و بە هەمان شێوەش جەبارە سوور کە چەند کاتژمێرێکی کەم هاتبووە لامان و لەتەنیشت منەوە فیشەکی بیکەیسی بەر ناوسکی

کەوتبوو و لە پشتەوە هەڵیتەکاندبوو. نوورەدینی برام و کامەران ڕەسووڵ برای شەهید کامیل و غەفووری حاجی ڕەشید و ڕێبواری مام کوێخای کانی سپیکەیی، ئێمەیان لەسەر شاخ بردە خوارەوە بۆ گوندی وڵاخلوو و بەداخەوە هەردووکمان کە زۆر پەرێشان بووین و جەبارە سوور دەستی کردە ملم و زەردەخەنەیەک گرتی و پێی وتم: «خەمت نەبێت، چاک دەبیتەوە، گرنگ ئەوەیە سەرکەوتوو بووین!» بەداخەوە ڕۆحی دەرچوو و شەهید بوو و ژیانی بەخشی بە گەل و خاکی کوردستان. ئەوەی زانیاریم لەسەر شەهید جەبارە سوور هەبوو، زۆر جار باسی بێبەزەیی باوکی بۆ دەکردم و دەیوت من منداڵ بووم و دایکم مردووە و باوکیشم دوای مردنی دایکم، ژیانی هاوسەرگیریی پێک هێناوە و هەر لە منداڵییەوە خراپ بووە لەگەڵماندا و هەموو ژیانم پڕ ئازار و ئەشکەنجە بووە بە هۆی ئەو ژنەی باوکمەوە، چەندەها شەو لە ماڵەوە دەریکردووم و نەیهێشتووە وەک منداڵی تر حەز و ئارەزووەکانم بهێنێمە دی و ناخۆشترین ئازاری ژیانی مرۆڤ؛ بێبەشبوون لە نازی دایکایەتییە. پاش ئەوەی جەبارە سوور شەهید بوو و من خوێنێکی زۆرم لێ دەچۆڕی، هەر چۆنێک بوو گوێدرێژێکیان پەیدا کرد و منیان بەبریندارێ خستە سەر گوێدرێژەکە و بە گردی پشتی گوندی گەڕەدێدا سەر کەوتین. کامەرانی مام ڕەسووڵ برای شەهید کامیل، بۆ ئەوەی بەسەر گوێدرێژەکەوە نەکەومە خوارەوە؛ ئاگاداری دەکردم و نوورەدینی برام و غەفووری حاجی ڕەشید ئەملا و ئەولایان دەگرتم و بەرەو گوندی گەڕەدێ بەڕێ کەوتین. جگە لەوەی بە زرێپۆش تەقەیان لە چواردەوری شەڕەکە دەکرد و فڕۆکەی جەنگی بەردەوام بۆردوومانی دەکرد. ئەو ڕێگایەی ئێمەی پیا سەر دەکەوتین، هەورازێکی سەخت بوو، لەبەر ئەوەی ڕێی ستراتیژیی هێزی پێشمەرگە و بەهاناهاتنی هێزەکانی تر و هێنانی ئازووقە بوو بۆ نێو شەڕەکان، ڕژێمی بەعس ئەوێی کردبووە ئامانجی خۆی و زیان بە هێزەکانی تێکۆشەرانی کەرت و تیپەکان بگەیەنێت. لەو بۆردوومانکردنانەدا جارێکی تر بە پارچەی مووشەکی فڕۆکە جەنگییەکان بریندار بووم و هێندەی نەدەما

لەتاو ئازاری جەستە؛ ڕۆحم دەربچێت، چونکە من خۆم بریندار ببووم و جارێکی تریش بریندار بوومەوە. پاش گەیشتنمان بۆ گوندی گەڕەدێ، بە تراکتۆر منیان گەیاندە بەرگەڵوو کە زیندان و نەخۆشخانەی شۆڕشی لێ بوو. نەخۆشخانەی چی! تەنها ژوورێکی گەورە و ڕاڕەوێکی باریکی درێژی لە گڵ و خشتی سوور دروستکراو و چەند دۆشەکێک و هەندێک لە پێداویستیی برینداری و نەخۆشی لێ بوو. گەر ئەو نەخۆشخانەیە لەگەڵ بارودۆخی ئێستەدا بەراورد بکرێت، هێشتا بە جێی حەوانەوەی ئاژەڵان نایەت، بەڵام هێزی پێشمەرگە هێندە بە باوەڕێکی بەرز و پتەو بەرگریی لە خاکی کوردستان دەکرد، هەندێکیان برینداریش دەبوون پێیان شەرم بوو شەڕ بەجێ بهێڵن و لەنێو هاوڕێ و هاوسەنگەرانیاندا بڵێن بریندارین.

دکتۆر شوان کە مرۆڤێکی دڵسۆز و خۆنەویست بوو، لە وڵاتی سویدەوە گەڕابووەوە و لەو نەخۆشخانەیەی بەرگەڵوو لەژێر بۆردوومانی فڕۆکە جەنگییەکانی ڕژێمی بەعسدا پێشمەرگەی برینداری چارەسەر دەکرد و خزمەتی دەکردن، پێی ڕاگەیاندم کە ئەو فیشەکەی بەر لاکەللەی پشتم کەوتووە، لێرەدا چارەسەر ناکرێت و گەر بۆیشت دەربهێنم؛ چووەتە نێوان ئێسقانی فەقەراتتەوە و تووشی شەلەل دەبیت و ڕەنگە قاچ و دەستت لەکار بکەوێت، بەڵام لە ماوەیەکی داهاتووی دوورودرێژدا خۆی وردە وردە لە شوێنی خۆی دەجووڵێت و دواتر دەرکردنی ئاسانتر دەبێت. دوای ڕاپەڕین و لە ساڵی ١٩٩٥ وەک هەر هاوڵاتییەکی ئاسایی ڕووم لە تاراوگە کرد و لە ئەڵمانیا لە شاری نورنبێرگ (nürnberg)دا نیشتەجێ بووم، لە نەخۆشخانەی سەرەکیی ئەو شارەدا فیشەکەکەیان بۆ دەرهێنام و ئەو چەند ساڵە زۆرە هەمیشە بە جەستەیەکی ناتەندروست و نائاسایی ژیانم دەگوزەراند. پێش ئەو هەموو کارەساتە دڵتەزێن و شەڕ و کوشتارەی کە لە جەنگی بەرەیی (جەبهەیی) قەیوان ماوەتدا تووشی ببووین، پێش هێرشەکە و پێش ئەوەی بریندار بم، شۆڕش ئیسماعیل بانگی کردمە بەر پەنای ڕکەبردەکانی سەر شاخ و پێی ڕاگەیاندم من دەزانم عومەر عەرەب ئێوەی بەجێ هێشتووە و

خۆی لە شەڕەکاندا دەدزیتەوە، من زۆر سوپاسی تۆ دەکەم کە ئەم چەند مانگە بریندار بوویت و شەڕەکانت بەجێ نەهێشتووە. منیش وەڵامم دایەوە کە فەرماندەی کەرتەکەمان ماوەیەک لە کاتی شەڕەکاندا لەگەڵماندا بووە و هەواڵی برینداربوونیم پێ گەیشتووە و ئەوەش بووەتە هۆکاری ئەوەی کە لەگەڵماندا نییە. شۆڕش ئیسماعیل وەڵامی دایەوە و وتی: «وا نییە، من باشتر دەزانم وەک لە تۆ. ئێمە چەندین زانیاریمان لایە کە ڕژێمی بەعس ژمارەی سوپا و هێزە چەکدارەکانی چەندە و ژمارەی شەهید و بریندار و پێشمەرگەی ڕاکردوو و ترسنۆکمان لایە و لە هەموو ساتەوەختێکدا ئاگاداری هەموو بارودۆخێکین کێ دڵسۆز و خۆڕاگر بووە لەم شەڕانەدا. من زۆر سوپاسی تۆ دەکەم کە چەند جارێک بریندار بوویت و ڕۆڵی باشت هەبووە لەم شەڕانەدا...» دیارە من کە ئێستە ئەم وشانە دەنووسم و باس لەم یادەوەرییانە دەکەم، زەمەن و کاتێکی زۆر نییە مێژووی هاوسەنگەران لەیاد بکرێن، تاوانبارانی نێو شۆڕش و ترسنۆک و بوودەڵە و گەندەڵکارانی سەردەمی ئەو ڕۆژگارە لە ئێستەدا زۆریشیان بوونەتە بەرپرسی باڵای حیزب و پاسەوان و مووچەی خەیاڵی و ئۆتۆمبێلی بەنرخ و تەواوی پێداویستییەکانی ژیانیان بۆ دابین کراوە.

هەموو مرۆڤێک قابیلی گۆڕانە و هەموو مرۆڤێکیش دووچاری هەڵە و کەموکوڕی دەبێت، ئێمەش ئەو هەڵانە بەسەرماندا تێناپەڕێت، بەڵام بۆ مێردمنداڵێکی وەک ئێمە گەورەترینمان تەمەنی نەدەگەیشتە بیست ساڵان، کە لەو تەمەنەدا هێشتا مرۆڤ چاکە و خراپەی خۆی لێک جیا ناکاتەوە، کە هێشتا من لەو تەمەندا شیاوی فەرماندەیی نەبووم و فەرماندەش دەبێت هیچ نەبێت تەمەنێکی هەڵکشاوی هەبێت، بەڵام بارودۆخی سیاسیی شۆڕش لەو کاتەدا پێویستی بەوە هەبوو، یاخود باشتر بڵێم تەمەنی هەرەتی لاوێتی کە تەمەنێکی پڕ لە هەڵە و داچوونە. شۆڕش ئیسماعیل پێی وتم: دەبێت منیش ئەو ئەرک و ماندووبوون و خۆڕاگرییەی تۆم لەیاد نەچێت کە

ڕۆڵی فەرماندەیەکی باشت گێڕاوە و پێشنیاری ئەوە دەکەم لەم هەموو خۆڕاگرییەدا، لە داهاتوودا فەرماندەی کەرتەکە بێت. لە کۆتایی قسەکانیدا وتی: «ڕۆژێک دەبێت ئەم هەموو ناڕەحەتی و ناخۆشییە دەبێتە مێژوویەک شانازیی پێوە دەکەین.» کاتێک شۆڕش ئیسماعیل بە هێمنی و خۆڕاگرییەوە ئەو وشە جوانانەی ئاراستە کردم، وای لێ کردم ئەو گەڵا درەختەی لە برساندا دەمخوارد، ئازاری گەدە و جەستەیی لەنێو هەناومدا لەبیر بردمەوە. دوژمن لەو هێرشەدا شکستی هێنابوو و پتر لە ٣٠ چەکداریان لێ کوژرا و تەرمی کوژراوەکانیان بەجێ هێشتبوو و دەستکەوتی پێشمەرگەش ئەو چەکانە بوون کە بە دەست کوژراوەکانەوە بەجێ مابوون و چەند جۆرێک چەکی وەک بیکەیسی و ئارپیجی و فیشەکێکی زۆریان بەجێ هێشتبوو. زیانی پێشمەرگەش چوار شەهید و سێ بریندار بوو، لەو هێرشەی کە منی تیا بریندار و جەبارە سووری تیا شەهید بووبوو.

## ئێستا دەڕۆم، هەر شەقێك دەیهاوێژم؛ کوندەیەك میزی پێوەیە

داستانی قەیوان ماوەت و خۆڕاگریی هێزی پێشمەرگە، پتر لە ٣ مانگ بە خوێنی گەشی ١٠٦ شەهید و زۆرترین بریندار و سووتاندنی چەندین گوند و شەهیدبوونی دانیشتووانی گوندەکان کۆتایی هات. لە ڕێکەوتی ١٩٨٧/١/١٥دا ڕژێمی بەعس تەواوی هەموو سنوورەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی لەو دەڤەرەدا داگیر کرد، سەرکردایەتیی یەکێتی ڕاگەیاندن و نەخۆشخانە و تەواوی بارەگای مەکتەبی سیاسیی گواستەوە، بەتایبەت بۆ گوندی قاسمەڕەش.

زیندانییەکانی نێو زیندانی بەرگەڵوو، هەندێکیان بە کەفالەت و هەندێکیان

به بڕێک پاره ئازاد کران و هەندێک له بەعسییه خوێنڕێژەکان گوللەباران کران و هەندێک پێشمەرگەش به هەر تۆمەتێک بێت ئازاد کران و هەندێکیشیان دواتر وەک غەدرێکی شۆڕشگێڕانه و بەبێ بەڵگه و بێتاوان گوللەباران کران، وەک: جەباری عەلی عەوێز و سالاری حاجی دەروێش و سەلاح چاوزەق و زاهیر کونجرینی و جوامێری سەرتیپ و... هتد. بۆ ئەو مەبەستەش شۆڕش نەیدەزانی چی بکات و چۆن خۆی له بێوەفایی و به دوور له خووڕەوشتی سیاسی و پەیمانی ستراتیژیی ڕێککەوتننامەی وەک ئێرانی جمهوری ئیسلامیی کۆنەپەرستی ئێران و ئەو جینۆسایدکردنەی بەسەر گەلەکەماندا هات، ڕوون و ئاشکرا بکات.

هەر له گوندی سەرگەڵوو و به دیوی مێرگەپاندا تاکوو دەگاته گوندی قزلەر، دانیشتووانی گوندەکان چۆڵیان کردبوو و تەواوی سەروەت و سامانیان بەجێ هێشتبوو، تەنانەت لەنێو گوندی قزلەردا هەندێک ئاژەڵ و پەلەوەر به هۆی بۆردوومانی دڕندانەی فڕۆکه جەنگییەکانی ڕژێمەوه کوژرابوون. من له نەخۆشخانەی بەرگەڵوو بەڕێ کەوتم و نەشمدەزانی ڕوو له کوێ بکەم تا برینەکەم سارێژ دەبێت. له چیای داباندا به سواری هێسترەوه تووشی وەهاب (وەهابەکەچەڵ)؛ بەرپرسی سەربازیی مەڵبەند (مەسئول عەسکەری) بووین لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا، که ئێمەی بینی من بریندار و بەسەر پشتی هێسترێکەوه و نوورەدینی برام و غەفووری حاجی ڕەشید و ڕێبواری مام کوێخای کانی سپیکەییم لەگەڵدایه، زۆر ڕێزی لێ گرتم و وتی: «دەنگوباسی گشتی چییه و بۆ کوێ دەچیت؟» منیش له وەڵامدا وتم: «هێزی پێشمەرگه ئەوەی بۆی کراوه و توانای هەبووه ڕووبەڕووی دوژمن بووەتەوه، بەڵام هەر شکستێکیش ڕووی دابێت، پێشمەرگه شەڕی بەرەیی لەگەڵ ئەو دوژمنه سەرسەخت و پڕچەک و زلهێزەدا پێ ناکرێت و تەواوی بەرزایی و شوێنه ستراتیژییەکانمان بەدەستەوه داوه. ئەویش پێی وتم: نەخێر، وا نییه و دەستی کرد به پێکەنین. زۆر سەیره هەندێک جار مرۆڤ هەست به دۆڕاندن و شکستی خۆی بکات، دواتر شکستهێنانی خۆی پێ به

ئازایەتی و یاخود پێ شەرم بێت! ئەمە لە کاتێکدا من ڕاستییەکانم بۆ وەهاب باس کرد، خۆ نەبێت ئەویش بێئاگا بووبێت لەو ڕاستییانەی کە من باسم لێوە کرد. بەڵام پرسیاری ئەوەی لەلا دروست کردبوو کە من لەنێو شەڕی سێ مانگەی داستانی قەیوان ماوەتدا دوو جار بریندار بووم و ئەویشم لەگەڵ مەفرەزەیەکی پێشمەرگەدا بەڕێکەوت لەو دەڤەرەدا بینیوەتەوە و سەیر لەوەدایە بەرپرسێکی سەربازیی مەڵبەند پرسیاری چۆنیەتیی سەرکەوتن و شکستی شەڕی هێزی پێشمەرگە لە من بکات! وەهاب ئەگەرچی زۆر زوو هەڵدەچوو و تووڕەیی بێئەندازە بوو، بەڵام بە مافی خۆشی و بە ئازایەتی و قارەمانێتیی خۆی گەیشتبووە ئاستی بەرپرسیارێتی لەنێو شۆڕشدا. دەستی کرد بە گیرفانیدا، ١٥ دیناری دەرهێنا و پێی وتم: با ئەوەت پێ بێت، بەڵام من پارەکەم لێ وەرنەگرت، پاشان پارە لەوێدا هیچ ڕۆڵ و کاریگەریی نەبوو، شۆفێری هەندێک تراکتۆر و ئۆتۆمبێلی لانکرۆزەر و پیکاب لە چاونەترسیی خۆیاندا هاتوچۆیان دەکرد و خەڵکی گوندنشینەکانیان دەگواستەوە بۆ شار، ئەوانیش پارەیان لە پێشمەرگە وەرنەدەگرت. پارەکەی کرد بە گیرفانی غەفووری حاجی ڕەشیددا. جوانترین دیمەنیش ئەوە بوو پیکابێکی لاندکرۆزەریان پێ بوو، زۆر بەهەڵمەت بوو بۆ سەرکەوتن بە چیای هەلاج و داباندا و منیش بەبرینداری بەسەر پشتی هێسترەکەوە و ئەو هاوسەنگەرانەی لەگەڵمدا بوون، بەسەر ئەو چیا سەختەدا هەر چۆنێک بوو سەر کەوتین و کاتێکیش گەیشتینە سەر لوتکەی هەلاج و دابان، لە ناخی خۆمدا وام لێک دەدایەوە ئەو بەرپرسە دەبوو منی برینداری لە جێی خۆیدا لە پێشی ئۆتۆمبێلەکەیدا دانایە و گەر خۆشی لەناو ئۆتۆمبێلەکەدا جێی نەبووایەتەوە، بەپێ بە چیای هەلاج و داباندا سەر بکەوتایە. کاکە وەهابی مەسئول عەسکەری زۆر بەخێرایی گەیشتە سەر لوتکە و هەورازی بەردەلانی شاخی هەلاج و دابانی بڕی و ئێمەش بۆ حەوانەوە و سارێژبوونی برینداریەکەم، گوندی هەنارانی سەرروومان پێ باش بوو، چونکە بۆردوومان نەدەکرا، لەبەر ئەوەی هێزی پێشمەرگەی تیا نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا نزیکەی شەش ماڵێکی تێدا

مابووەوە. بەڵام گوندی هەنارانی خواروو کە نزیک گوندی کانی بەردینە و کانی سپیکە بوو، هێشتا زۆربەیماڵەکانی تیا مابووەوە. بە بڕیاری قادری حاجی عەلی، ئاڵوگۆڕیان لە کەرت و تیپەکاندا کرد. قادری حاجی عەلی بەرپرسی مەڵبەندی دوو بوو. من بە هۆی برینداربیەکەمەوە نەمتوانیبوو ئامادە بم. بۆ ئەو مەبەستە وەک لە لاپەڕەکانی پێشوودا ئاماژەم بە گۆڤاری چیا دا، لە لاپەڕە (٨٨)دا دەڵێت: نیوەڕۆ تەشکیلاتی تیپ بە ئامادەبوونی سەرجەم پێشمەرگە و فەرماندەکان دەستی پێ کرد، قادری حاجی عەلی تەشکیلاتی کرد و هەندێک فەرماندە پلەیان بەرز کرایەوە و پۆرتی چەند کەسێکیان شکاند و دەمەقرەیەکی زۆریشی تیادا ڕووی دا. یەک پلەش بەو پێشمەرگانە نەدرا کە سێ مانگ و نیو لەبەر بەفر و سەرما بەرگرییان کرد و تا کۆتایی شەڕی قەیوان ماوەت بەشدارییان کردبوو کە هەندێکیان ئەزموونی باشیان لە شەڕی پێشمەرگایەتیی بەرەیی (جەبهەیی)دا پەیدا کردبوو. زۆرێکیش خۆی بە مەغدوور دەزانی کە پلەکەی دەرەجەیەک بەرز کراوەتەوە. هەندێک پێشمەرگەش کەوتنە ڕەخنە و گلەیی لەناو خۆیاندا. شۆڕش ئیسماعیل لیژنەیەکی لە چەند پێشمەرگەیەک دروست کرد و پێی ڕاگەیاندن کە بچن ئەو پێشمەرگانەی بە دەنگ بروسکەکەی تیپەوە نەهاتوون و بە ڕادیۆش بڵاو کرایەوە چەکیان بکەن و بەقۆڵبەستراوی ڕەوانەی زیندانی بەرگەلوویان بکەن. ئەگەر نەهاتن، بۆتان هەیە تەقەیان لێ بکەن و بیانکوژن، بۆ ئەوەی فێری لاملی نەبن و ئیلتیزام بە فەرماندەوە بکەن. کۆمەڵێک پێشمەرگە خۆیان ئامادە کرد و بەرەو چەککردنی هاوڕێکانیان کەوتنە ڕێ. یەکێک لەو برادەرانە پێی گوتم: بۆ تۆش نایەیت لەگەڵماندا؟ گوتم: ئامادە نیم هاوڕێی خۆم چەک بکەم. ئەم کارەش باش نییە کاک شۆڕش دەیکات، هیچ نەبێت ئەم جارە عەفوویان بکات و سەرنجیان بۆ ئەم ملبادان و نارێکوپێکییەیان ڕابکێشێت. گوتی: کەیفی خۆتە، ئێستا دەڕۆم. هەر شەقێک دەیهاوێژم، کوندەیەک میزی پێوەیە. مەفرەزەکەیان ناو نا «ئینزیبات» و چەند گوندێک بەدوای پێشمەرگەکاندا دەگەڕان، هەر چییەکیان لەو برادەرانە دیبوو،

پەلاماریان دابوون و بە زیندانی ڕەوانەی بەرگەڵوویان کردبوون. ئاخر چۆن پێشمەرگەیەک کە تا دوێنێ هاوڕێت بووە و لە سەنگەرێکدا بووبن و سەدان جار لەکەناری مەرگدا گەڕاوینەتەوە، چەکی بکەم و شەقی تێ هەڵبدەم و ڕەوانەی زیندانی بکەم، لەسەر شتێکی واش کە نەیدەهێنا بەو جۆرە مامەڵەیەیان لەگەڵدا بکرێت! بۆ زانیاری، زیندانی بەرگەڵوو و نەخۆشخانە و زۆربەی بەشی ڕاگەیاندن دەگوازرانەوە و چۆڵ دەکران، بەڵام جێی سەرنج و تێبینییە پێشمەرگەیان ڕەوانەی زیندانی بەرگەڵوو دەکرد! پاش ماوەیەک لە گوندی هەنارانی سەروو ماینەوە و گوندەکانی تر بەردەوام لەژێر بۆردوومانی دوژمندا دەسووتێنران و کاول دەبوون و هێزی پێشمەرگەش زیاتر ڕوویان لە بەرزاییەکان دەکرد و نێو گوندەکانیان بەجێ دەهێشت و دواتر ئەو گوندەی ئێمەی تیا بووین، ئەویش بەبەردەوامی بۆردوومان دەکرا. هێزێکی بێئەندازەی زۆری گەورە لە هەموو سنوورەکانەوە ئامادەی هێرشکردن بوون و تەنها گوندێک کە بۆردوومان نەدەکرا، گوندی هەنارانی خواروو بوو. کاتژمێر حەوتی ئێوارە چووینە گوندی هەنارانی خواروو و لە ماڵی کوێخا حسێنی هەناران ماینەوە. کوێخا حسێنی هەناران؛ مرۆڤێکی قسەخۆش و خانەوادەیەکی دڵسۆز و نیشتمانپەروەر بوو، تەواوی سەرکردە و فەرماندە و زۆری هێزی پێشمەرگە چوونەتە ماڵەکەی و دەیانناسی و تەنانەت خودی «مام جەلال» زۆری خۆش دەویست. مام جەلالیش خاوەنی ئەزموون و ئاشتەوایی و دڵی کەسی نەدەیەشاند و هەر کاتێکیش پێشمەرگەیەک، فەرماندەیەک، هەر کەسێک هەڵەیەکی بکردایە، گەر زوێریش بووایە، دوای چەند خولەکێک قسەی خۆشی دەکرد و دڵنەوایی بەرامبەرەکەی دەدایەوە و هاوکارییشی دەکرد، بۆ ئەوەی ئەو هەڵە و کەموکوڕییانە دووبارە نەبنەوە، ئەگەرچی من لە تەمەنی پێشمەرگایەتیمدا چەند جارێک بە دیداری شاد ببووم، بەڵام تەنها یەک جار لە گوندی گەڕەدێدا لە نزیکەوە گفتوگۆیەکی زۆر کەمم لەگەڵدا کردووە و قسەی بۆ کردووین. لە ماڵی مام کوێخا حسێنی هەناران دوو ڕۆژ ماینەوە و تەواوی خانەوادەکەی لە گەورە و بچووکەوە ڕێزدار بوون و

ڕێزیان لە هەموو خەڵکی دەگرت. لە ناوتاقان و پشتی گوندی هەنارانەوە بەرەو گوندی کانی گۆران، هێزێکی زۆر لە چەکداری ڕژێم ئەو سنوورەیان تەنی و هێزەکە گەیشبووە نزیک گوندی هەنارانی سەروو کە پێشتر ئێمەی تێدا بووین. ئەوەی کە بمانکردایە، تەنها بەرگرییەک بوو لە خۆمان و شکستخواردوو دەبووین و دەکوژراین، جگە لەوەی خەڵکی گوندەکە بۆردوومان دەکران و ئەو گوندە دەسووتێنرا. تا دەهات هێزەکەش بەرەو نزیکبوونەوە دەهات و نەماندەزانی چی بکەین، بەتایبەت من بریندار و نەمدەتوانی هەنگاوی زۆر خێرا بنێم و بە گردە بەرزەکاندا سەر بکەوم و ئەو ناوچەیەش دۆڵێکی درێژ دەیبەستەوە بە گوندی هەنارانی سەروو و هێزی دوژمنیش بە بەرزاییەکانەوە بوون. شەو مام کوێخا حسێن هاتە لامانەوە و هەندێک ئەزموونی شۆڕشی بۆ باس کردین و ئامادەیی تیا بوو خۆشی بەرگری بکات لەگەڵ ئێمەدا، بەڵام ئەوەش سوودی نەبوو، جگە لەماڵوێرانی و کاولبوونی گوندەکە. دوای بیرکردنەوە و گفتوگۆیەکی زۆری نێوانمان، ڕێبواری مام کوێخای کانی سپیکەیی وتی: بچینە گوندی کانی سپیکە، لە لایەکەوە نزیک شارە و لە لایەکی ترەوە ماڵی باوکی خۆمە و پاشان چەکمان پێ نەبێت، بۆ ئەوەی ماڵی باوکم تووشی هیچ کێشەیەک نەبن. ئەو پێشنیارەی ڕێبوارمان پێ باش بوو، غەفووریش وتی: منیش ئەو برا گەورەیەم ڕادەسپێرم هاوکاریمان بکات، تا بارودۆخەکە هەر هیچ نەبێت کەمێک ئاسایی بێتەوە و دواتر دەگەڕێینەوە شوێنی خۆمان. گەر بۆشمان نەکرا، بەنهێنی دەمێنینەوە. کەسێکی باوەڕپێکراومان ناردەوە بۆ لای خانەوادەی ماڵی ڕێبوار و ئەوانیش بە هەمان شێوە ماڵی غەفووریان ئاگادار کردبووەوە. بۆ دوو ڕۆژی دواتر چووینە گوندی کانی سپیکە، بەڵام براکەی غەفوور بەبێ ئەوەی من ئاگادار بم (ساماڵ شێخە) کە پێشتر پێم وایە ڕابەر سیاسیی کەرت بوو لەناو هێزی پێشمەرگەدا و برایەکی فەرماندەی کەرت بوو و تاکوو ئێستەش ئەندامی کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکانی کوردستانە، ڕادەستی ڕژێم ببووەوە و پاشان وەک دابونەریتی عەشایەری نازانم کە کێشەیان لەگەڵ خێڵێک یان

عەشیرەتێکی تردا هەبوو بێت، بەڵام هێندە دەزانم کە جێگری فەوجی سووک (خفیفە) بوو، کە بەرپرسی سەرەکیی «ئامر فەوجەکە»ی ئەویش بە هەمان شێوە برایەکی فەرماندەی کەرت بوو لە ڕابردوودا لەناو هێزی پێشمەرگەدا، پەیوەندیی نهێنیی هەر بە شۆڕشەوە مابوو و وەک باس دەکرا پێشمەرگەی برینداری حەشار دەدا و تەقەمەنیی بۆ هێزی پێشمەرگە دەنارد، بەڵام نازانم جۆری پەیوەندییەکەی چۆن بوو. کە برا گەورەکەی غەفوور بەم کارەی زانی و «ساماڵ شێخە» ئاگادار کرابووەوە لە جێی حەوانەوە و چۆنیەتیی بریندارکردنی من و ئابلۆقەدانی ئەو گوندە و مانەوەی ئێمە لە کانی سپیکەدا، بۆ ئەوەی زیاتر خۆی لە جۆری پەیوەندیکردن بە ڕێکخستنەکانەوە و هێزی پێشمەرگە بگەیەنێت، هەموو ئەو خەبەر و باسەی گەیاندبووە بەرپرسی فەوجەکەی. بۆ سەرلەبەیانی برایەکی ڕێبواری مام کوێخا لە خەو هەڵیساندین و وتی: هەستن، چواردەوری دێکەمان گیراوە و مشوری خۆتان بخۆن! پاش نیوکاتژمێر، برا گەورەکەی غەفوور پێی ڕاگەیاندین: مەترسن و هەموو شتێکم بۆ سامال شێخە گێڕاوەتەوە و ئەویش بەڵێنی پاراستنی ئێوەی داوە و لەگەڵ خۆمدا هێناومە و چاوەڕێتانە. بەداخەوە دەبوو ئێمە لە هەموو شتێک ئاگادار بکراینایەتەوە، بەڵام هەندێک کەس کە بڕیاری خێرا دەدات؛ لە ڕقوکینەی بۆ بەرامبەردا نییە، ڕەنگە ئەو زاتەی ئەو ڕەفتارەی بەرامبەر بە ئێمە کردبوو؛ براکەی خۆی لەگەڵماندا نەبووایە، سەرنجی خراپ و لێکدانەوەمان بە جۆرێکی تر بووایە، بەڵام ئەویش لە ترسی ژیانی ئێمە ئەو کارەی ئەنجام دابوو. کاتێک لە ماڵی مام کوێخا بەدەر کەوتین و ڕووبەڕووی ئەوان هەنگاومان دەنا و خەڵکی ناو گوندی کانیسپیکە لە سەربان و نێو دێکەدا دەیانڕوانییە ئێمە، ژنێک دەستی کرد بە گریان و دوعای دەکرد و دەیوت: «خوایە، تۆ ئەوە قبووڵ نەکەیت، چۆن منداڵی خەڵکی بە ناوی شۆڕشەوە بەکوشت و فریو دەدەن! ئاخر ئێوە لە خوا ناترسن، ئەم منداڵانە ئیعدام بکرێن!» من فرمێسک بە چاومدا دەهاتە خوارەوە، کاتێک ئەو ژنە بەو شێوەیە تکا و نزای لە خودا دەکرد و دەپاڕایەوە کە ئێمە تووشی گرفت

نەبین، قێزم لە پێشمەرگایەتیبوونی خۆم و ڕادەستیی دوژمن دەکردەوە و مردنی خۆمم پێ ئاواتەخواز بوو. هەر لە هەرەتی منداڵییەوە من خولیای خەبات و لەگەڵ دەستپێکردنی خەباتی پێشمەرگایەتیمدا لە گوندێکی ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە دەستم پێ کرد و دوای سێ ساڵ زیندانیبوونم لە قەسابخانەکانی ئەبو غرێب و چوار جار برینداری و جارێکی تر تووشی هەمان ڕووخساری ئەو دڕندانە بوومەوە کە هەموو ژیانی خۆم لەو پێناوەدا بۆ شۆڕش بەخت کرد. پاش ئەوەی ساماڵ شێخە لە ماڵێکی باوەڕپێکراوی خۆی و بە ئاگاداریی ئەندامانی خانەوادەی غەفووری هاوسەنگەرم پشوویەکی پێ دام و هەندێک جاریش پێی دەوتم: کارێکی وات بۆ دەکەم تاکوو برینەکەت سارێژ دەبێت، من بەرپرس دەبم لە ژیانتان. ماوەیەک بەو شێوەیە ناشزانم لە کوێوە هاوکاریی منی دەکرد و تا ئەو کاتەی تەواو چاک بوومەوە و قورسایی لەسەر ژیانی ئێمە و لە کاتی لێپرسینەوەدا لەلایەن لێکۆڵەری ڕژێمدا کەم کردەوە. ساماڵ شێخە لەپێش ڕاپەڕیندا وەک باسیان لێوە دەکرد، بەنهێنی چەند پێشمەرگەیەکی بریندار و هەندێکیشیان کە بۆ چالاکی دەهاتنەوە؛ وەک ئێمەی داڵدە دابوو، دواتر ڕژێمی بەعس پەیوەندییەکانی بە شۆڕشەوە لەلا ئاشکرا ببوو، دەستگیریان کردبوو و کوشتبوویان و کەسیش هۆکاری تیرۆرکردنەکەی لەلا ئاشکرا نەبوو، چونکە تەرمی خۆی و ئۆتۆمبێلەکەیان بەتەنها لە شوێنی تیرۆرکردنەکەیدا بەجێ هێشتبوو.

## دروستبوونەوەی مەفرەزە نهێنییەکانی نێو شار لەدوای ئەنفال

وشەی ئەنفال لە زۆر بابەتدا شیکردنەوەی زۆری دەوێت، ئەگەر بمانەوێت بزانین کە ئەنفال مانای چییە و لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە و بۆ کێ و بۆ چ مەبەستێک بەکار هێنراوە، ئەوە پێویستە چاوێک بە دەقەکانی قورئاندا بخشێنین و لە چەمک و ڕەهەندەکانی وشەکە تێبگەین. ئەگەرچی ئەم پەرتووکە پەیوەست نییە بە ئەنفال و ڕەخنە لە ئایین و ئیسلام، بەڵام کاتێک

تاوانی کیمیاباران و سووتاندنی گوندەکان و جینۆسایدکردنی هاوڵاتییانی سڤیلی کوردستانی باشوور بە ناوی ئەنفالەوە کراوە، ئەوەش بووە هۆکاری ئەوەی بزانین ئەنفال بە مانای چی و بۆ چ مەبەستێک بەکار هاتووە و بۆچی ئەنفال وەک تاوانێکی دڕندانەی نامرۆیی لە گەلی کورددا تاقی کرایەوە! لێرەدا هەوڵ دەدەم زانیارییەکی زۆر کورت کە لە پەرتووکی «خوێننامە[1]»دا بەدووروودرێژی باس کراوە، بخەمە بەر دیدی خوێنەر. دەیان لاپەڕەی ئەوم کورت کردووەتەوە بۆ دوو خاڵ:

خاڵی یەکەم: لە کۆندا و لە نیوەدوورگەی عەرەبیدا، پێش سەرهەڵدانی ئیسلام هەر شەڕێک لەنێوان بنەماڵە و خێڵ و عەشیرەت و هۆزەکاندا ڕووی بدایە، نەریتی ئەو کاتە وا بووە کە لایەنی سەرکەوتوو دەستی دەگرت بەسەر ماڵ و سامان و گیانی لایەنی ژێرکەوتوودا. بۆ نموونە؛ تەواوی پیاوەکانی بەدیل دەگرتن و زۆربەیانی دەکوشتن و ژن و منداڵەکانیانی دەکردنە کۆیلەی خۆیان، دواتر هەر چی ماڵ و سامانیان هەبوو کۆیان دەکردنەوە و لەناو خۆیاندا دابەشیان دەکردن. هەندێک جاریش وا ڕووی داوە کە بەشێک لە پیاوان و ژن و منداڵەکان نەکوژن، بەڵکوو بە پارەیەکی زۆر بیانفرۆش، یاخود بە منەت لە (کولتووری کوردیدا پێی دەڵێن بەپیاوەتی)، یان لەسەر داوا و ڕێککەوتنی سەرۆکهۆز و سەرمایەدار و ئەرستۆکرات و پیاوماقوڵانی ئەو کاتە ڕێککەوتنیان لەسەر کراوە و ئازاد کراون. بەو دیل و ژن و منداڵ و کەلوپەل و سامانەی کە لەدوای شەڕەکە دەستی بەسەردا گیراوە، دەڵێن: ئەنفال یان غەنیمە. کەواتە ئەنفال یان غەنیمە، وشەیەکی عەرەبییە، واتە تاڵانی، واتە ئەو کەس و دیل و کوژراو و ژن و منداڵ و سامان و ئاژەڵ و پەلەوەر و تەواوی ئەو کەلوپەلانەی کە دوای شەڕ دەستیان بەسەردا دەگیرا (تاڵانین، غەنیمەن، ئەنفالن). گرنگ نەبووە کە لە شەڕەکەدا چی ڕووی داوە، بەڵکوو ئەوە گرنگ بووە کێ سەر دەکەوێت و

---

[1]. خوێننامە، مەریوان هەڵەبجەیی، چاپی سێهەم، فەسڵی سێ، دەرگای یەکەم.

لەدوای شەڕ چ دەستکەوتێک یان تالانییەک، غەنیمەیەک، ئەنفالێکی دەست دەکەوێت. پاش سەرهەڵدانی ئیسلام و گەشەسەندن و تۆکمەکردنی جێپێی موسڵمانان لە شاری مەدینە و بەدەستهێنانی دەسەڵات، ئەم نەریتەیان وەک خۆی دووبارە کردەوە. بۆ نموونە؛ لە شەڕەکانی بەنو قورەیزە و خەیبەردا کە خودی پەیامبەری ئیسلام لە هەردوو شەڕەکەدا سەرکردایەتیی لەشکری موسڵمانانی کردووە، بەسەر لایەنی بەرامبەردا سەرکەوتوو بوون و لە هەردووکیشیاندا کارەساتی جەرگبڕ ڕووی داوە و پاش سەرکەوتنیان؛ تالانییەکی یان غەنیمە یان ئەنفالێکی زۆروزەبەنەیان دەست کەوتووە، تەواوی پیاوەکانیان کوشتووە، تەواوی سامان و کەلوپەل و شتی گرنبەها و ئاژەڵ و زەویوزار و ژن و منداڵەکانیان کۆ کردوونەتەوە و لەناو خۆیاندا دابەشیان کردوون. بەڵام ئەو کاتەی کە یەکەم جار وشەی ئەنفال لە قورئاندا ئاماژەی بۆ کرا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەنگ و ئاژاوەیەی کە لەپاش شەڕی بەدر لەناو موسڵمانەکاندا ڕووی دا. موسڵمانەکان لەو شەڕەدا سەر کەوتن، تالانییەکی زۆر زۆر کەوتە چنگیان، زۆریی تالانییەکە (ئەنفالەکە) ئاژاوەی خستە ناو موسڵمانانەوە و لەناو خۆیاندا کردیانە دەنگەدەنگ، هەر کەسە و داوای بەشی زیاتری بۆ خۆی دەکرد، پەیامبەری موسڵمانانیش بڕیاری دا کە لە دابەشکردنی تالانییەکاندا پەلە نەکەن، ئەوە بوو کەلوپەلەکان کۆ کراونەوە، بەڵام دابەش نەکران. لە گەڕانەوەی لەشکرەکە پێش ئەوەی بگەنەوە بە شاری مەدینە، پەیامبەر چەند قسەیەکی کرد و وتی: ئەمانە وەحین و لە خوداوە بۆم نێردراوە و ئیتر چەندین ئایەتی خوێندەوە، یەکەم ئایەتی ئەو کۆمەڵە ئایەتە باسی ئەنفال دەکات، تێیدا وەک چۆن سەردەمی جاهیلی کۆکردنەوە و دابەشکردنی تالانییەکانی بە کارێکی دروست و باش دەزانی، بە هەمان شێوە ئەو ئایەتە ئەم نەریتەی بە کارێکی دروست و باش زانی و کۆکردنەوە و دابەشکردنی تالانی (ئەنفال)ی حەڵاڵ کرد، بەڵام بە کەمێک دەستکارییەوە. دەستکاریکردنەکەش نەریت نەبوو، بەڵکوو دەقێکی شەرعی و ئیلاهی بوو. بۆ نموونە؛ سوورەتەکە ناو نرا ئەنفال، هەروەها

یەکەم ئایەتیش باسی ئەنفالی دەکات، سوورەتی «الانفال» ئایەتی یەکەم دەڵێت: ﴿يسئلونَكَ عَنِ الأَنْفالِ قُلِ الأَنْفالُ لِلّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللّهَ وَأَصْلِحُوا ذاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾، ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ﴾.

واتە: «(ئەی محەمەد) دەربارەی (الانفال) تالانییەکانی پاش جەنگ پرسیارت لێ دەکەن، تۆش پێیان بڵێ تالانییەکان بۆ خودا و پەیامبەرەکەیەتی، دە ئیتر ئێوەش لە خودا بترسن و کێشەی نێوانتان چارەسەر بکەن و ئاشت ببنەوە. ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن و ئیماندارن، ئەوە ملکەچی بڕیارەکانی خودا و پەیامبەرەکەی بن.»

لە ئایەتێکی تردا لەبریی وشەی «ئەنفال»، وشەی غەنیمە بەکار هاتووە، هەمان سوورەت، لە ئایەتی ژمارە (٤١)دا دەڵێت: «باش بزانن کە ئەو دەستکەوتانەی کۆتان کردووەتەوە، هەر شتێک بێت، ئەوە یەک لەسەر پێنجی بۆ خودا و پەیامبەرەکەیەتی.»

بێگومان لە ڕاڤەکاندا باسی ئەوە کراوە کە چۆن چوار بەشەکەی تریان دابەش کردووە، بەڵام ئەوەی گرنگ بێت ئەوەیە لەم دوو ئایەتەدا ئەوەمان زانی کە ئەنفال چ مانایەکی هەیە و بۆچی و کێ و بە چ مەبەست و ئامانجێک بەکار هاتووە.

خاڵی دووەم: پێش سەرهەڵدانی ئیسلام و دوای سەرهەڵدانی ئیسلامیش، لەو زەمەنەدا نەریتیان وا بووە کە ناو بۆ شەڕەکانیان یان بۆ گەشت و قافڵە بازرگانییەکان دابنێن. بۆ نموونە؛ شەڕی بەدر، بۆیە ناو نرا بەدر، چونکە لەپاڵ کانی و شوێنێکدا شەڕەکە کرا کە ناوی بەدر بوو، ئیتر ئەم کولتووورە درێژەی کێشاوە و ئێستاش هەر وایە، لەناو کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا بووە بە باو ناوی بەدر لە کوڕەکانیان دەنێن. بۆ نموونە؛ لەم ساڵانەی دواییدا تورکیا هێرشی کردە سەر ڕۆژئاوای کوردستان، شەڕەکە ناو نرا «فەتح»، ئەم وشەیە ناوی سوورەتێکی تری قورئانە. هەر ئەم کولتووورە بوو کە وای کرد لە دەسەڵاتی بەعس لە بەغداددا لە ساڵی ١٩٨٨دا هێرشێکی زۆر بەرفراوان

بکەنە سەر ناوچە ڕزگارکراوەکانی باشووری کوردستان تا داگیری بکاتەوە، ئەوە بوو بە ناوی ئەنفالەوە هێرشەکەیان دەست پێ کرد و وەک بڕیاریان دابوو تەواوی دەستگیرکراوەکانیان بێ هیچ بەزەییەک قەتڵوعام کردن، هەر چی ماڵ و سامانیشیان هەبوو وەک تالآنی بران. لە ئەنفالەکاندا زیانێکی زۆر بەر گەلی کورد و ناوچەکە و شۆڕش کەوت، نزیکەی سەد و هەشتا و دوو هەزار هاوڵاتیی سڤیل لە پیاو و ژن و منداڵ، بە پیر و نەخۆشەوە، بە چەندین شێوازی جیا جیا قەتڵوعام کران، هەندێکیان گێڕاویانەتەوە بەشێکی زۆر لە ژن و کچە دەستگیرکراوەکان دەستدرێژیی سێکسییان کراوەتە سەر و دواتر کوشتوویانن، شێوازی کوشتنەکانیشیان زیاتر لە کۆکردنەوە و دروستکردنی گۆڕە بەکۆمەڵەکاندا بووە. کارەساتەکان هێندە دڵتەزێن بوون، کە ئەم ناوە (ئەنفال) لەبیر نەچێتەوە و بۆ هەتاهەتایە ببێتە پەڵەیەکی ڕەش بە ناوچەوانی هەموو ئەوانەی کە باوەڕیان بە کوشتن و بە قەتڵوعامکردنی خەڵکەوە هەیە.

جینۆسایدکردنی هاوڵاتییانی سڤیلی باشووری کوردستان و خاپوورکردنی سەدان گوند و دەستگیرکردن و دەربەدەرکردنیان لە زێدی باوباپیرانیان بە ناوی ئەنفالەوە، بە چەند قۆناغێکی جیاواز سەرانسەری کوردستانی گرتەوە. بۆ زانیاریی زیاتر، زۆرێک لە نووسەران و تێکۆشەرانی بەشداربوو و ڕزگاربووی نێو کارەساتی ئەنفال؛ یادەوەرییەکانیان نووسیوەتەوە. بڕوانە: کتێبی «قەندیل بەغدای هەژاند[1]» باسی لە چۆنیەتیی شەڕی سەختی هێزی پێشمەرگە دەکات و دەڵێت: لە گەرمەی ئەنفال و ئەو کاتەی ژن و منداڵ و پیر و لاوی کورد بێخەتا و لەخۆڕا ڕاپێچ دەکران و بێسەروشوێن دەکران، سەدان پێشمەرگە تەسلیم دەبوونەوە لەبەر سەختیی خەبات و بێ ئاوەدانی، وە حکومەتی بەعس وای دانابوو تەواو شۆڕش و پێشمەرگەی تەفروتونا کردووە و جارێکی دیکە پێشمەرگە لە خاکی ئەنفالکراو و کیمیاباران نامێنن.

---

[1]. قەندیل بەغدای هەژاند، شەهید ڕێباز، بەشی سێیەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەیوەند، ٢٠١١، ل١١٩.

عەمەلیاتی ئەنفال لە ١٩٨٨/٢/٢٣ دەستی پێ کرد تا کۆتایی مانگی ئەیلوولی ١٩٨٨. ئەو عەمەلیاتانە سەرانسەری کوردستانی گرتەوە، ناوچەیەک نەما کەم تا زۆر ئەو کارەساتەی بەر نەکەوتبێ. کافرەکانی بەغدا لەپێش هەموو شتێک، مزگەوت و شوێنە ئاینییەکانیان خاپوور دەکرد.

ئەنفالی یەک: بۆ سەر بارەگای سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و دۆڵی جافەتی و مەرگە و شارستێن و بناری سووورداش.

ئەنفالی دوو: بۆ سەر ناوچەی قەرەداغ و بازیان، لە ١٩٨٨/٤/٢ کۆتایی هات کە لە گوندی سێوەسانان زیاتر لە حەفتا کەس بە چەکی کیمیایی شەهید کران.

ئەنفالی سێ: بۆ سەر ناوچەی گەرمیان کە بە هەزاران کەسی تێدا بەدیل گیران و ئافرەتەکانیان شوێن بزر کرد و لاو و پیرەکانیان شەهید کرد و بێشەرمانە هەر لە هێلکەی مریشک تا دەگاتە مەکینە و ئۆتۆمبێل بەتاڵان بردیان.

ئەنفالی چوار: بۆ سەر ناوچەی شێخ بزێنی و چەمی ڕێزان و ساڵەیی دەشتی کۆیە و کە زیاتر لە هەزار کەس شوێن بزر کران کە بە سەدان مناڵ و ئافرەتانیان لەگەڵ دابوو. هەر چی ماڵ و حاڵیان هەبوو بەتاڵان ڕۆیشت و لە گوندی گۆپتەپەوە بە زەبری چەکی کیمیایی نزیکەی سەد و پەنجا کەس شەهید کران.

ئەنفالی پێنج: بۆ دۆڵی بالیسان و خۆشناوەتی و مەلەکان و گەرەوان و وەرتێ، لەوێ پێشمەرگەکانی کورستان بۆ ماوەی دوو مانگ زیاتر شەڕیان لەگەڵ دوژمن کرد.

عەمەلیاتی ئەنفالی شەش: لە ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٢٨ بۆ سەر ناوچەی بادینان، لەوێش بە هەزاران ئافرەت و منال شەهید کران، ئاوارە و دەربەدەریی خەڵکیش بۆ تورکیا بێ ژمارە بوون.

پێشتر باسم کرد کە ئەنفال یەکێک لە ئازارە سەخت و نەبڕاوەکانی کوردە، دەرکی ئەو تونێلە نەبڕاوەیە کە مرۆڤی کورد پێیدا تێپەڕ دەبێت و ناگاتە

هیچ شوێنێک، ئەو برینەیە سوێ و ئازاری ساڵانەی ڕۆح نوێ دەکاتەوە، ئەو ئازارەیە کە هەمیشە ڕۆحی کوردبوونمان زیندوو دەکاتەوە و خەباتی نوێمان جۆش دەدا و دەرگای بوون و تێکۆشانمان بۆ دەخاتەوە سەرپشت و چەکەرەی لەدایکبوونمان هەزارەها جار شین دەکاتەوە. ئەنفالماڵێکی پڕ لە برووسکی بەجێماو و سووتماکی پڕ تاوانە، دەستی ڕەشی زوڵم و ویژدانێکی نەکلۆکی زوڵم و ژانە. ئەم بێویژدانییە گەورە و بچووکی نەفامیوە و تەنانەت منداڵی سەر بێشکەی کردووەتە پێکانی ئامانجەکانی، ڕژێم و هەزاران کۆرپەی ساوای لە بیابانەکانی عەرەبیدا زیندەبەچاڵ کردووە، ئەنفال واتە کوشتن و بڕین و گوللەبارانکردن و زیندەبەچاڵکردن، بەبێ جیاوازی لەنێوان ژن و پیاوی بەساڵاچوو و گەورە و بچووک و تەنانەت سووتاندنی دار و درەخت و نەهێشتنی ئاژەڵەکان و کوشتنی باڵندەکانیش بە ئاسمانەوە. دوابەدوای ئەو تاوانە دڕندانە و گواستنەوەی بارەگای مەکتەبی سیاسی و ڕاگەیاندن و تەواوی هێزی مەڵبەند و تیپەکانی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، کاریگەریی زۆری هەبوو لەسەر لاوازکردنی ڕێکخستن و دەستەی شانە نهێنییەکانی پێشمەرگەی نێو شار و جۆری پەیوەندییەکانیان بە سەرکردایەتی و مەڵبەند و تیپەکانەوە. بەم شێوەیە دوای جەنگی درێژخایەنی پتر لە هەشت ساڵی عێراق و ئێران و کۆتایی جەنگ لە نێوانیاندا، ڕژێمی بەعس هەلێکی باشی بۆ ڕەخسا و هەموو هێزەکانی ئەو سوپا دڕندانەی کە هەیبوون، لە دژی بزووتنەوەی ڕزگاریی ئازادیخوازی گەلی کوردی بەکار هێنا و بەبێ هیچ جیاوازییەک بە یەک چاو و بیروباوەڕەوە، میللەتی کوردی بە دوژمنی خۆی دەزانی و ئەوەی بە دوور لە کاروکردەوەی نامرۆیی بوو، لەگەڵ گەلی کورددا ئەنجامی دا. بەم شێوەیە پتر لە ساڵێک سەرکردایەتیی یەکێتی و پەیوەندیی ئەو مەفرەزە پارتیزانانەی کە لە بەری قەرەداغ و دۆڵی جافایەتی مابوونەوە و قۆرخکردنی تەواوی سنوورەکانی هێزی پێشمەرگە لەلایەن بەعسەوە، ببووە هۆی ئەوەی بەکەمی لە هەواڵی سەرکردایەتی و پەیوەندیی هێزی

پێشمەرگە و ڕاگەیاندن و ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناو شار. لە کۆتایی جەنگی عێراق و ئێران و هێرشکردنە سەر هێزەکانی پێشمەرگە و کیمیاباران و ئەنفالکردن و جینۆسایکردنی گەلی کورد، ڕژێمی بەعس بۆ سەرکوتکردنی نەیارەکانی و بەتایبەت «شیعەکان» وەک «حیزبی دەعوە» کە ئێران هەموو هاوکارییەکی دەکردن، چەندین شوێنە پیرۆزییە ئایینییەکانی سووتاند و تەنانەت چەند مووشەکێکی ئاڕاستەی مەزارگەکانیانی کردبوو کە شیعەکان بەلایانەوە پیرۆز بوو، کیمیابارانی هەڵەبجەی شەهید کە پتر لە پێنج هەزار ژن و منداڵ و بەتەمەنی تیا بووە قوربانی و ئەنفالی پتر لە سەد و هەشتا و دوو هەزار هاوڵاتیی سڤیل، سووتاندنی پتر لە پێنج هەزار گوند لە کوردستان، تەواوی هاوڵاتییانی کورد و عەرەبی توورە کردبووو بڕوا و متمانە لەنێو هێزی سوپاکەیدا نەدەما و تا دەهات ڕژێمی بەعس لاوازتر دەبوو. ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشار پەیوەندییەکانیان بەهێزتر دەکردەوە و سەرکردایەتی پلانی خۆیان دادەڕشت و جۆری پەیوەندییەکانیان لەگەڵ مەفرەزە پارتیزانەکان و ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشاردا بەهێزتر دەکرد. چەند مەفرەزەیەکی پارتیزانەکان بەنهێنی دەهاتنەوە نێو شار، یەکێک لەو مەفرەزە پارتیزانانە؛ «عەبە ڕەق» وەک فەرماندەیەک لەگەڵ سێ پێشمەرگەدا هاتنەوە و بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لە ماڵێکدا مانەوە کە دواتر دێمەوە سەر ئەو چیرۆکە. بە نامەی فەرمیی بەرپرسی ڕێکخستن (ع، ب، ش)، داوای دروستبوونەوەی شانەیەک (لیژنە) پێشمەرگەی ناو شارم لێ کرا لەلایەن سیروانی حاجی عوسمان و عەبدوڵڵای سدیق سوارە. من هەر چەندە لەگەڵ عەبدوڵڵای سدیق سوارەدا لەیەکەوە نزیک بووین و خزمایەتیمان هەبوو، بەڵام بە هۆی ئەزموونی سیاسی و خەباتی چەکداری و وەک ئەوەی لە ڕابردوودا لە شاخ ڕۆڵی بەرپرسم بینیبوو، پاشان لەوان بەتەمەنتر بووم، لەو داواکارییەی ئەوان پەشیمان بوومەوە و گەیشتمە ئەو بیرکردنەوەی کە دەبێت لەو ڕۆژگارە سەختەی بەسەر ئێمەدا هاتووە، بە بیرکردنەوەیەکی باش و بەئەزموون، کاری شانە نهێنییەکانی پێشمەرگەی

ناوشار ئەنجام بدەین، دوای ئەوەی کە پێشتر کە من بێئاگا بووم لە جۆری پەیوەندییەکان. نوورەدینی براشم لەگەڵ سیروانی حاجی عوسمان، عەبدوڵڵای سدیق سوارە، ئەیوب حەمە ساڵح قەرەچەتانی، ڕزگار عومەر محێدین؛ وەک شانەیەکی نهێنی ئاگادار کرابوون، بەڵام لە سەرەتادا هیچ کامێکیان بە یەکتریان نەدەزانی. من بڕیاری خۆم لەگەڵ کەسێک دابوو، بەڵام بەرپرسی ڕێکخستن ئەو داواکارییەی ڕەت کردەوە و بە ئێستەشەوە نازانم هۆکاری چی بوو، ئەوانیش ئەو کەسەیان ئاگاداری ڕێکخستنەوەی شانە نهێنییەکانیان نەکردبوو، ئەوە نەبێت من بڕوام بە نووردەینی برام نەکردبێت و متمانەم بە سیروانی حاجی عوسمان و عەبدوڵڵای سدیق سوارە نەکردبێت. بیرکردنەوەی من لەو کاتەدا تەنها دەگەڕایەوە بۆ کەم و زۆریی تەمەن و ئەوانیش تەمەنیان لە من بچووکتر بوو، ئەوەش دوودڵیی لە ناخمدا چاندبوو کە ببووە مەترسییەکی گەورە بۆ من، چونکە ئەنجامدانی کار و چالاکیی ناوشار ئەرکێکی قورس و ترسناک بوو، لەنێو حەشامەتدا لوولەی دەمانچەت ئاڕاستەی سەر دڵی دوژمنەکەت بکەیت، ئایا سەرکەوتوو دەبیت، یان شکست دەهێنیت؟ لە ڕابردوودا لە چالاکییەکی کەرتەکەماندا، کاتێک بۆ سزادانی تاوانبارێک مەفرەزەیەکمان ڕێک خست و پێنج پێشمەرگە بەرەو شار دەهاتینەوە، هێشتا چەند کاتژمێرێکمان مابوو بگەینەوە ناوشار، دووانیان پەشیمان بوونەوە و داوای گەڕانەوەیان دەکرد، لە ڕاستیدا هەردووکیان زۆر قارەمان و لە چەندین بۆسە و بەرگریکردن و ڕووبەڕووبوونەوەی هێزی دڕندانەی ڕژێمی بەعسدا دڵسۆزییان دەنواند و بەئەمەک و دڵسۆز بوون، بەڵام کاتێک باست لە ڕۆحکێشانی دوژمنێکی سەرسەختی تاوانبارت بکردایە، زۆر کەم کەس ئەو ئیرادەی ڕۆحکێشانەی تیا بەدی دەکرا، ئەوەش ببووە هۆکاری چاوترساندنی من ئاخۆ کارێکم پێ بسپێردرێت و لە کاتی کارەکەمدا بەرامبەرەکەم پەشیمانییەکی تیا بەدی بکرێت و شکست بهێنم! بۆیە بڕیارم دا ئەو کەسەی کە ڕێکخستن ڕازیی لەسەر نەبوو، خۆم بەتەنها داواکارییەکانیان جێبەجێ بکەم. دوای ئەنجامدانی

دوو چالاکی، بەبێ ئەوەی نە ئەو هاوڕێیانە بە کارەکانم بزانن، نە منیش ئاگاداری هەواڵی کار و چالاکییەکانی ئەوان بووم و ئەوانیش ئاگاداری و هیچ پەیوەندییەکیان بە شانە نهێنییەکانی ترەوە نەبوو، بەڵام پێکەوە چالاکیی ناوشاریان ئەنجام دابوو.

لە ڕێکەوتی ١٩٨٩/٧/٢٥دا کاتژمێری یانزە و نیو، لە چێشتخانەی «حەسەنی مووسا»، عەبدوڵڵای سدیق سوارە لەلایەن «کاوە حەمە ڕەشید» ناسراو بە «کاوە کاراتی» دانیشتووی شاری سلێمانی، سەر بە موخابەراتی عێراق دەستگیر کرا. چێشتخانەی حەسەنی مووسا، یەکێک بوو لە چێشتخانە بەناوبانگەکانی شاری سلێمانی، خاوەنەکەی کەسایەتییەکی ناسراو بوو. عەبدوڵڵای سدیق سوارە بۆ بژێویی ژیانی خۆی کە تەنها کچێکی دوو ساڵانی هەبوو، لەوێدا کاری دەکرد، هەمان ڕۆژ، ڕێکەوتی ساڵی ١٩٨٩/٧/٢٥دا، کاتژمێر حەوت و بیست خولەک، کاوە کاراتی بە چوار ئۆتۆمبێلی خاکیی جێمسی جۆرە ئۆتۆمبێلێک تایبەت بوو، دەزگای مخابەرات بەکاریان دەهێنا، چونکە کەسی لە نێودا دیار نەدەبوو، هێزێکی زۆری چەکدار ماڵی ئێمەیان ئابڵۆقە دا و لەناکاو لە دیواری دەرگای سەرەکی و حەوشەی پشتەوە و لە سەربانەوە بە تفەنگ و بە دەنگەدەنگێکی زۆر و ترسناکەوە نوورەدینی برام دەستگیر کرا. پێشتر لە هەمان ڕۆژدا، بەڵام پێش دەستگیرکردنی نوورەدینی برام، سیروانی حاجی عوسمان و ئەیوب حەمە ساڵح قەرەچەتانی، ڕزگار عومەر محێدین؛ لەلایەن کاوە کاراتی کە سەر بە دەزگای موخابەراتی عێراقی بوو، دەستگیر کرابوون. هۆکاری دەستگیرکردنیان زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکاری جیاواز، یەکێک لەو هۆکارانەش کە تەواوی دەزگای موخابەراتی سلێمانی و ئاسایشی سلێمانیی لێ ئاگادار کرابوونەوە. لە دانیشتنێکی سەر مێزدا و بڕوابوون بە کەسێک کە لە ڕابردووی سەردەمی ڕۆژگاری سەختی قوربانیدان و پێشمەرگایەتیدا یەکێک بوو لەو پێشمەرگانەی کە هاوسەنگەرمان بوو، تەواوی دەنگی هەریەک لە عەبدوڵڵای سدیق سوارە و نووردەینی برام و سیروانی حاجی عوسمانی

تۆمار کردبوو کە گوایە ئاگادار کراونەتەوە بەوەی کە شانە نهێنییەکانی پێشمەرگە دروست بکەنەوە و چەند چالاکییەکی خۆیانیان لەو دانیشتنەدا باس کردبوو. زیاتر بەڵگەی تەواو لەسەر عەبدوڵڵای سدیق سوارە خرابووە ڕوو، چونکە ئەو قسەی زیاتری کردبوو. دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر و ئازار و ئەشکەنجەدانی هەریەکەیان، عەبدوڵڵای سدیق سوارە وای بە باش زانیبوو وەک خۆیان لەناو دەچن؛ کەسانی تر لەدوای خۆیان نەبنە قوربانی. لە کاتی ئەشکەنجەدان و لێپرسینەوەدا، نەهیی لە دروستبوونی شانە نهێنییەکانی پێشمەرگە کردبوو. لە وەڵامدا وتبووی من دەمەوێت سەرۆککۆماری عێراق «السيد الرئيس صدام حسين» بکوژم. کاتێک بەرپرسانی ڕژێمی بەعس هەڵسەنگاندنیان بۆ ئەم وەڵامە کردبوو و پێیان ڕاگەیاندبوو چۆن دەتوانیت «السيد الرئيس صدام حسين» بکوژیت؟ لە وەڵامدا عەبدوڵڵای سدیق سوارە لەبەردەم دادگای شۆڕش بەعس (محكمة الثورة)، لەدوای لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوە؛ لەوێدا دادگایی دەکرایت و یان زیندانیی هەتاهەتایی یاخود بڕیاری لەسێدارەدانی لەسەر دەدرا، وتبووی: «سەددام حسێن» هەر کاتێک سەردانی سلێمانی بکات، منداڵی خۆش دەوێت و لە شوێنە گشتییەکان وەک شەقامە سەرەکییەکان، چاوی بە خێزان و منداڵان دەکەوت، منیش دەچوومە نێویان و دەمکوشت! ئەوانیش ئەو وەڵامەی عەبدوڵڵای سدیق سوارەیان بەهەند وەرگرتبوو و دوای دادگاییکردنی سیروانی حاجی عوسمان کە ئەو وەڵامی دابووەوە هێشتا هیچیان نەکردووە، بەڵام بەنیاز بوون کاری ڕێکخستن بکەن و بە هەمان شێوە نوورەدینی برام وتبووی من بەنیاز بووم بچمەوە شاخ و ببمەوە بە پێشمەرگە. ئەیوب حەمە ساڵح قەرەچەتانی، ڕزگار عومەر محێدین، بە هەمان شێوە هەریەکەیان وەڵامێکیان بۆ خۆیان ئامادە کردووە و دڵسۆزانە هیچ کەسێکیان تێوە نەگلاندووە لە دەستگیرکردن و زیندانیکردنی هاوڕێکانیان. سەد مخابن، دادگای شۆڕشی بەعس (محكمة الثورة) بڕیاری لەسێدارەدانی عەبدوڵڵای سدیق سوارە و ئەیوب حەمە ساڵح قەرەچەتانی دەدات و هەریەک لەوانی تریش زیندانی

هەتاهەتایی بەسەریاندا دەسەپێنرێت. برایەکی عەبدوڵای سدیق سوارە بە ناوی بێستوونی سدیق سوارە پێشمەرگە دەبێت و بۆ ماوەی بیست ساڵ حوکم دەدرێت و دواتر لە ساڵی ١٩٧٩دا بە لێبوردنی گشتی ئازاد دەکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا برایەکی بە ناوی محەمەد سدیق سوارە بە هەمان شێوە پێش عەبدوڵلا لەسێدارە دەدرێت و برایەکی تریان بە ناوی لوقمانی سدیق سوارە لە ساڵی ١٩٨٣دا لە کەرتی خۆماندا پێشمەرگە دەبێت و ئێستەش لە ژیاندا ماوە و باری گوزەرانی زۆر خراپە. زۆر بەداخەوە بۆ هەندێک لە بەرپرسان کە تا ئێستەش هیچ کامێکیان لەو خانەوادەیان نەپرسیوەتەوە و هیچ هاوکارییەک نەکراون، کە زۆربەی خانەوادەکەیان لە ڕێی خەبات و شۆڕش و کوردبووندا لەناو چوون و لە ڕۆژگارێکی پێویستدا و خەباتی سەختی چیا بەرزەکاندا پێشمەرگە بوون.

لەگەڵ شکستی هەمیشەیەیی ڕژێمی بەعس و پەیوەندییەکانی، ڕێکخستنەکانی نێو شار زیاتر دەبوون. وەک پێشتر ئاماژەم پێ دا پێشمەرگە پارتیزانەکانیش هاندەرێکی زۆر باش بوون بۆ جۆری پەیوەندییەکان و کەم تا زۆر هاتنەوەیان بۆ نێو شار. فەرماندەی لێهاتوو و دڵسۆز و قارەمان عەبە ڕەق کاتێک بەزەحمەت هاتبووە نێو شار، تەنها مەبەستی ئەوە بوو کە شۆڕش هەر ماوە و هەر دەمێنێت و لە کاتی گەڕانەوەشیدا بۆ شاخ؛ کەوتبوونە بۆسەیەکی چەکدارەکانی بەعس و لە شەڕێکی دەستەویەخەدا و بەنارەحەتی دەرباز ببوو. لەدوای ئەنجامدانی چالاکییەکدا هێندە شپرزە بووم، نەمدەزانی ڕوو لە کوێ بکەم! بەڵام بەرێکەوت خۆم کرد بە ماڵی کەریمی شێخ عیسا، کە لە شاخ هاوسەنگەر و جێی بڕوا و متمانە بوو، برازایەکی بە ناوی هەلالە لەگەڵ بینینی ڕووخساری شێواوم، بەبێ ئەوەی هیچ ترسێکی تیا بەدی بکەم، زۆر دڵسۆزانە هاوکاریی تەواوی کردم و بۆ دڵنیابوون و ڕزگاربوون لە دڵەڕاوکێ و پاراستنی ژیانم، لە سەربانی خانووەکەیان لەتەنیشت برایەکی خۆیەوە جێی بۆ ڕاخستم. بۆ ڕۆژی دواتر ئارامییەک بە دەروونمدا هات و دڵنیا بووم لەوەی هیچ کەسێک بە جۆری

کار و چالاکییەکەمی نەزانیوە. باوکی هەڵاڵە لەگەڵ قالە تەگەرانیدا لەناو چووبوو. «قالە تەگەرانی» کەسایەتییەکانی ناسراوی ناوچەی شاربازێڕ و گوندی تەگەران بووە و لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە لەگەڵ هەندێک کەسایەتیی ناسراو و کۆمەڵێک هاوڕێی خۆیدا بێسەروشوێن کراون.

ڕۆژبەڕۆژ کار و چالاکییەکانی ناوشار زیاتر دەبوون، لە ڕێکەوتی ۱۹۹۰/۱۲/٦دا یەکێک لە هەرە چالاکییە سەختەکانی ئەو ڕۆژگارە کە تەواوی شاری سلێمانیی هەژاند و تەواوی دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێمی سەرقاڵ کردبوو، هەموو کووچە و کۆڵانەکانی شاری سلێمانیی بەدوای ئەنجامدەری ئەو چالاکییەدا دەگەڕان و بە تاوانبارێکی سەرسەختیان دەزانی. کوشتنی سێ تاوانباری بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیی ڕژێمی بەعس (مدریە الامن العامە) بەم ناوانە، بە سزای گەل و شۆڕش گەیاندبوو:

جاسم، لەدایکبووی شاری ڕومادی، بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی (مدریە الامن العامە)ی سلێمانی.

مفەوەز سەباح، لەدایکبووی شاری موسڵ

مفەوەز عەلی، لەدایکبووی شاری حلە

کاتێک ئەم تاوانبارانە لەلایەن عومەر شێخ محەمەد ناسراو بە «شێخ عومەر» بە سزای گەل و شۆڕش گەیەنران، شێخ عومەر لە بارودۆخێکی خراپدا بوو، بە ئاشکرابوونی ئەنجامدانی ئەو چالاکییە، تەواوی خانەوادەکەی دەستگیر کران. ڕژێمی بەعس لەلایەن ئەندام و دەزگا نهێنییەکانییەوە ڕایگەیاندبوو بەوەی هەر کەسێک شوێن و جێی حەوانەوەی شێخ عومەر دەستنیشان بکات، خەڵاتێکی گەورەی ماددیی پێ دەبەخشێت. کاتێک دەنگۆی ئەو هەواڵە بڵاو ببووەوە، بەڕێکەوت چاوم بە دلێری شێخ ڕەزا کەوت. دلێری شێخ ڕەزا؛ فەرماندەیەکی کەرتی یەکێک لە تیپەکانی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون بوو، پێشتر باوەڕپێکراوی شەهید جەمالی عەلی باپیر بوو، ئاگاداری کردمەوە بەوەی شۆڕش سەرقاڵی دروستبوونەوەی مەفرەزە

نهێنییەکانی نێو شارە. دیارە دلێری شێخ ڕەزا وەک فەرماندەیەکی لێهاتوو و باوەڕپێکراوێکی شۆڕش، ئاگاداری ئەو هەموو نهێنییانە نەبووبێت، چی دەکرێت و چۆن ڕێکخستنەوەکان سەرلەنوێ ئامادەکاریی خۆیان بۆ پلانێکی نوێ ڕێک دەخەنەوە و پەیوەندییەکانیان بەهێزتر دەکەن! دلێر پێی ڕاگەیاندم ئاگاداری ئەو جموجۆڵەیت، چەند کەسێکی باوەڕپێکراوی ڕژێم کوژراون؟ منیش وەڵامم دایەوە و وتم: بەڵێ، دەزانم ناوی شێخ عومەرە. دوای ئەنجامدانی ئەو چالاکییە، شێخ عومەر لەماڵی پووری یەکێک لە برادەرەکانی خۆی لە گەڕەکی مامۆستایان بە ناوی هاوڕێ عەباس، حەشاریان دابوو. دیار بوو دلێر وەک فەرماندەیەکی لێهاتوو، وەک من هەندێک زانیاریی سەبارەت بە دروستبوونەوەی شانە نهێنییەکان هەبوو، یاخود زانیاریی پێش من هەبووبێت، لای من ئاشکرای نەدەکرد. وەک پێشتر ئاماژەم پێ دا دروستبوونەی ڕێکخستن و شانە نهێنییەکان بەو جۆرە داڕێژرابوو کە شانەکان پەیوەندی و زانیارییان لە جۆری کار و چالاکییەکانی یەکتردا نەبێت. بەو شێوەیە ڕژێمی بەعس ڕوو لە داڕووخان و شۆڕش و ڕێکخستنەکان بەرەو بووژانەوە و جەماوەریش بەوپەڕی ورەی بەرزەوە لە چاوەڕوانی ڕاپەڕینێکی سەرتاسەری بوون. دوای شەڕی داگیرکردنی کوێت لە ساڵی ١٩٩٠دا لەلایەن ڕژێمی بەعس و شکستهێنانی بەرامبەر بە داگیرکردنی و دەستپێکردنی یەکەم ڕاپەڕینی سەربازی لە باشووری عێراق و جموجۆڵی جەماوەر و دەنگی ناڕەزایەتیی هاوڵاتییانی شاری ڕانیە، لە مانگی ئازاری ساڵی ١٩٩١دا یەکەم ڕاپەڕین دەستی پێ کرد و دواتر قۆناغ بە قۆناغ شارەکانی تری کوردستانی گرتەوە. ئەگەرچی ڕژێمی بەعس بە شێوازێک شکستی سەربازی و مەعنەویی هێنابوو، ناچار لێبوردنی گشتیی ڕاگەیاند و زۆربەی زۆری زیندانەکانی نێو بەندیخانەکانی ئازاد کرد، بەڵام هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر خەڵکی بەگشتی نەدەکرد و ناچار هێرشێکی دڕندانەی کردە سەر جەماوەری کوردستان و هاوڵاتییانی سڤیلی باشووری کوردستان. وەک ئەزموونێک لە تاوانی

درندانەی ڕابردووی ئەنفال و کیمیاباران، لە ئازاری ساڵی ١٩٩١دا کۆڕی بەکۆمەڵیان ئەنجام دا و تەواوی شار و شارۆچکەکانی کوردستان چۆڵ کران و ڕوویان لە سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و باکووری کوردستان کرد. لە زۆربەی ڕاگەیاندنەکان و کەناڵی تیڤییەکانی وڵاتاندا هەواڵی ئەو کارەساتەی بەسەر گەلی کورددا هاتبوو، بڵاو دەکرانەوە. وەک ئاماژەم پێ دا، یەکەم ڕاپەڕین لە شاری ڕانیە ئەنجام درا، بە دەروازەی ڕاپەڕین لە مێژوودا ناو دەبرێت و دواتر لە ١٩٩١/٣/٢١دا بە هێزی جەماوەر و هێزی پێشمەرگەی کوردستان شاری کەرکووک ئازاد کرا. پاش ئەوەی بەرەی کوردستانی بۆ جارێکی تر لە ساڵی ١٩٩٢دا دانوستانیان لەگەڵ ڕژێمی بەعس کردەوە و ئەو ئەفسەر و سەرباز و دیلانەی لە ئەنجامی ڕاپەریندا لەلایەن بەرەی کوردستانییەوە دیل و دەستبەسەر بوون، لەگەڵ زیندانە سیاسییەکان گۆڕانەوە و سیروانی حاجی عوسمان، نوورەدینی برام، ڕزگار عومەر محێدین؛ ئازاد کران، جگە لەوەی چەندین زیندانی تری سەر بە هەموو حیزبەکان کە پێشتر لە زیندانی ئەبو غرێبدا بوون کە بریتی بوون لە: فەرەیدوون دارتاش، مامۆستا ئەحمەدی سەناعە، مامۆستا حەمە ساڵح، مامۆستا عەزیز، دکتۆر مەجید، ئیبراهیم خانەقینی، کەمالی ئاڵای شۆڕش، بابە تایەر، بەکری مام نووری کە لە زینداندا ماڵئاوایی هەتاهەتایی لە ژیان کرد، ڕەفیق ناسراو بە «ڕەفە باڵشکاو» سەر بە حیزبی سۆسیالیستی کوردستان بوو، پاش ئەوەی حوکمی زیندانی هەتاهەتایی بەسەردا سەپێنرابوو، پێش ئازادکردنی زیندانەکان بە دوو مانگ لەسێدارە درا، عەتای حاجی ئەحمەد لەگەڵ پەنجا زیندانی تردا ئازاد کران و لەبەردەم بارەگای ڕێکخستنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لە شاری سلێمانی لەلایەن جەماوەرێکی زۆر بە ئاهەنگ و هەڵپەڕکێ و سروودی نیشتمانییەوە پیشوازییان لێ کرا.

«هیچ چانسێک بوونی نییە، ئێمە هەموو دیلی چارەنووسێکین.»
**دۆستۆیڤسکی**

مرۆڤ لە چرکەساتی لە دایکبوونیەوە، بەبێ حەز و ئارەزوومەندی و داخوازییەکانی خۆی دێتە ئەم سەرزەمینە و تێکەڵ بە ناو کۆمەڵگە و ئەو بنەماڵەیەی چارەنووسی بۆی دیاری کردووە؛ دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا بەبێ هیچ ئاسوودەبوونی ویژدانی تاکەکەسیی مرۆڤبوونی خۆی، وەک خواستێکی نەویستیش ئەو چارەنووسەی بەسەردا دەسەپێنرێت، دواتر دەبێتە موڵکی سروشتێکی نەخوازراو و ملکەچ بە کاردانەوە گشتییەکان، مەرجی ناوچەیی لەنێو چێوە خێزانی و کۆمەڵگاییەکە و بەرکەوتەکانی بۆ سروشت و ژیان گەشە دەکات. کەواتە کاتێک تۆ لە مەرجی ژیانی ناوچەیەکدا لەدایک دەبیت، ئەو شوێنە هەر گۆشەیەکی لەدایکبوونی مرۆڤ بێت، گرنگ نییە وەک هەڵکەوتەی نێو خێزان و بنەماڵەیی خوورەوشتی بە هەر ئاراستەیەکدا بێت و خوێندەوار بێت، یاخود نەخوێندەوار، قارەمان یاخود ترسنۆک، خاوەنی سەروەت و سامانی زۆر و ئیماندار و خواپەرست و بێباوەڕ. مەبەست لە مەرجی ناوچەییش ئەوەیە کە تۆ لە مەرجی ژیانی ناوچەیەکدا لەدایک دەبیت، وەک شوێن کە جیاوازە وەک کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتییەکان یان ڕۆژئاواییەکان، خێزانیش هەمان پێوەری بۆ جیاکردنەوە لەنێو پەروەردەی هەژاری و دەوڵەمەندی، خوێندەوار و نەخوێندەوار، ئاییندار و بێباوەڕ، ناوچە و خێزان دروست دەکات.

بۆ نموونە؛ پەروەردەی شوێن بە واتای ناوچە، داڕێژەری چێوەی پەروەردەی خێزانە. کەواتە ئەو شوێنە و ئەو ناوچەیە ڕێچکەی ژیانت بۆ دیاری دەکات. باڵکردن و نما و سەرکەوتنی بەرگرییەکانی مانەوەی پڕ لە کێشە و گرفتی ئازاراویی گەلێک لە هاوتەمەنەکانم بیر ناچنەوە، ساتەوەختی منداڵی و هەرزەکاری و گەنجێتی و کامڵبوونی ئێمە وەک پێوەر بۆ ژیانی

گەشەکردووی مرۆڤێکی ئاسایی کە تێیدا باجی زمان، ئایین، خێزان، ڕەگەز، گەورەیی و بچووکی، بوێری، ترسنۆکی، بازوو و باسکی پتەو، نەخۆشی و کاڵفامی، دەوڵەمەندی و هەژاری، یاخیبوون و سەرشۆڕی، بێ بەرگی و پۆشتەیی لە ژیان و زۆرگەلێکی تر لەم باجدان قبووڵکردنە، بوونە بەشێک لە ماڵوێرانی و ئاسوودەیی بۆ بەرچاوی زۆرینەی بەرچاو بەستراو بە کولتوورێکی سەپاو لە کۆمەڵگەی کوردیدا.

ئەم کورتە نووسینەم بووەتە بەشێک لە چیرۆک و بەسەرهاتەکانی نێو ئەم یادەوەرییەم، بە کۆتایی و پاشکۆی ئەم پەرتووکە دەخرێتە بەر دیدی خوێنەر و هۆشدارییەکە بۆ هەندێک لە سیاسەتمەداران و هێشتا ئاماژەی تەواوم  بە تاوانکاری و جۆری خەبات و نائەخلاقیی سیاسیی ڕابردووی ئەوسای سەردەمی شاخ و بارودۆخی ئێستای شێوازی بەڕێوەبردنی سیستمی حوکمڕانی لە عێراق و کوردستان بەگشتی و تەژی لە گەندەڵی و بەهەدەربردنی سامانی گشتیی وڵات کە لە ڕابردوودا پێیان دەوترا شۆڕشگێڕ و لە ئێستەشدا بە هەندێکیان دەوترێت دز و گەندەڵ نەکردووە. لە لاپەڕەکانی پێشوودا باسم لە هەندێک تاوانی شەڕی کوردکوشتن کردووە کە چەندین تێکۆشەری تیا بوونە قوربانیی نێو شەڕی بە ناهەق و بەزۆر سەپێنراو بەسەر خەباتگێڕاندا. دەمەوێت لە پاشکۆی ئەم پەرتووکەدا چیرۆکێکی بێباوککردنی منداڵێک بخەمە ڕوو کە لەلایەن هاوڕێیەکمەوە ئاراستەی کردبووم بە ناونیشانی بەرهەمی شەڕی ناوخۆ، لە تەواوی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بڵاو ببووەوە، بە خوێندنەوەی سەرسام دەبێت. ئەزموونێکی شەڕی ناوخۆ و کوردکوشتن لەلایەن حیزبەکانی لەمەڕ ئێمە، بۆ نەوەی دواڕۆژی دەخەمە ڕوو، بۆ ئەوەی بزانین بەرهەمی شەڕەکانی براکوژی لەلایەن حیزبەکانی کوردستان چەندە ئازاربەخشە و چەندە کاریگەریی دەروونیی لەسەر خانەوادە و بنەماڵەی قوربانییەکان هەبووە کە هەرگیزاوهەرگیز لەیاد ناکرێن، لێرەدا تەواوی نووسینەکە وەک خۆی دەخەمە ڕوو.

هاوڕێیەکم گوتی: لای بەرپرسێکی سەربازی دانیشتبووم، هەر لەخۆوە هات بە خەیاڵمدا کە پرسیارێکی لێ بکەم، پێم وت: کاک سەردار، چی ڕووداوێک هەیە ئازارت دەدات؟ لە وەڵامدا وتی: لە شەڕی ناوخۆدا بانگ کرابووین بۆ کۆبوونەوە. لەبەرامبەر بارەگاکەدا (مقەڕەکەدا) کەپرێکی بە دار دروستکراوی لێ بوو، منداڵێک تەپەدۆرێکی دانابوو، ساردیی تیا دەفرۆشت، ئێمەش زۆر تینوو بووین، لامان دا و سەر و ساردییەک بخۆینەوە. منیش پێم وت: کوڕی بچووک، هەریەکە و ساردییەکمان بۆ هەڵپچڕە!

منداڵەکەش خەریکی هەڵپچڕینی ساردییەکان بوو، لەبەر ئەوەی کە منداڵ بوو، فریای ئەو تینوویتییەی ئێمە نەدەکەوت و منیش دەستم خستە سەر شانی و وتم: باوکە خوێڕییەکەت لەبەر موبەریدە دانیشتووە و تۆی بەم گەرمایە ناردووە بۆ ساردی فرۆشتن! بەڵام منداڵەکە بە حەسرەت و داخێکی قووڵەوە سەری بەرز کردەوە و وتی: خاڵۆ، باوکم نەماوە. منیش زۆر نارەحەت بووم، بۆچی ئەو پرسیارەم کرد! ئەوەش بووە هۆکاری ئەوەی خۆم پێ ڕانەگیرێت و پێم وت: بەقوربان، نەمزانی کە باوکت نەماوە، گەر قسەیەکیشم کردووە و تۆی پێ نارەحەت بێت، ئەوا داوای لێبوردنت لێ دەکەم و بمبورە. بەڵام پرسیارێک، ئەی باوکت بە چی تیا چوو؟ بەدەم قسەکردنیشەوە میقداری پەنجا دینارم کرد بە گیرفانیدا. منداڵەکە بەدەم ساردی هەڵپچڕینەوە وتی: باوکم، سەردار کوشتی. دوابەدوای ئەو وەڵامە، ئەوەندەی تر ڕووخام، چونکە بە وشەی «سەردار» خۆمم بیر دەکەوتەوە، دەبێت چەند منداڵی ترم بەو شێوەیە بێ باوک کردبێت! بەجارێک ئەژنۆم شکا، توانام نەما بەپێوە بوەستم، بەڵام نەمهێشت هاوڕێکانم پێم بزانن. بەردێک وەک سەکۆیەک لەژێر کەپرەکەدا بوو، لەسەری دانیشتم و پێشمەرگە و پاسەوانەکانم سەرقاڵی ساردی خواردنەوە و گاڵتەوگەپ بوون، منیش بەجارێک ڕووخابووم و ئاگام لە خۆم نەمابوو لەتاو ئەو منداڵە و حەزیشم دەکرد بزانم ڕاست دەکات! لە دڵی خۆشمدا دەموت: بەڵکوو وا نەبێت! خۆ من خەڵکم زۆر کوشتووە، بەڵکوو باوکی ئەو منداڵە من نەمکوشتبێت، هەر

هیچ نەبێت کەمێک خەمەکەم سووکتر دەبێت، چونکە تا ئەو کاتە نەمدەزانی کە من کەسێک کە دەیکوژم؛ بەو شێوەیە ماڵوێران دەبێت. ناخم بەجارێک ڕووخابوو. جارێکی تریش پرسیارم لێ کردەوە و پێم وت: کوڕی بچووک، باوکت لەکوێ کوژرا؟ منداڵەکەش لە وەڵامدا وتی: لە ئەشکەوتێکدا لەگەڵ هاوڕێکانیدا، «سەردار» هەرسێکیانی کوشت. ئیتر من گومانم نەما بەوەی کە من باوکی ئەو منداڵەم نەکوشتووە. پرسیارێکی ترم لەلا دروست بوو و وتم: کاکە بچکۆل، کە گەورە بوویت، بەنیازیت سەردار بکوژیتەوە؟ منداڵەکە لە وەڵامدا وتی: هەر کاتێک گەورە بم، نایەڵم بژی، وەک سەگ دەیتۆپێنم. ناچار منیش پێکەنیم، بەڵام ئەو پێکەنینە نەبوو بمەوێت خەمەکانم بڕەوێنم و بزەش بخەمە سەر لێوی هاوڕێکانم، بەڵکوو پێکەنینێکی دەستکرد. تەنها لەبەر دڵی ئەو، میقداری سەد دیناری تریشم کرد بە گیرفانیدا و پێم وت: ئافەرین، هەر کاتێک کە گەورە بوویت، «سەردار» وەک سەگ بتۆپێنە. تا ئێستەش هەموو شەوێک کە دەخەوم، ئەو منداڵە دێتەوە بەر چاوم. چاوی فرمێسک قەتیسماو و پڕ لە کینە و ڕقە جوانەکانی نایەڵن بۆ تەنها ساتێکی کەمیش پشوو بدەم و بۆ تەنها ساتێکیش پێڵووی چاوەکانم دابخرێن، لە زهنی خۆمدا لێکدانەوەی ترم هەبوو، ئاخۆ من چەند منداڵی تری بەو شێوەیەم بێ باوک کردبێت، بەڵام بەداخەوە، ئەو شتانە قەرەبوو ناکرێنەوە، دەنا هەر چی سەروەت و سامانم هەیە دەمدا بەو منداڵە کە دڵی ئاسایی بکەمەوە و خۆشم لە ئازاری ویژدانم ڕزگارم بووایە! چیرۆکی تراژیدیا و ڕووداو و قوربانییەکانی شەڕی نێو حیزبەکان بە ناوی شەڕی براکوژی و شەڕی ناوخۆ زۆرن و باسکردنیان؛ کولاندنەوەی زام و برینی بنەماڵەی غەدرلێکراوانە، کە هەرگیز ئەو برینانە سارێژ نابن و بەبرینداری دەمێننەوە. بەداخەوە هەندێک لە سیاستمەدار و هەندێک لە سەرکردەکانی نێو حیزبەکان پابەند نەبوون بە بڕیار و ئەو بەڵێنانەی کە بە هاوڵاتییانان دابوو. لێرەدا دەمەوێت ئاماژە بە دوای پرۆسەی ئازادیی سەرتاسەریی ڕزگاربوونی کوردستان و حیزب و حکومەت بدەم و ئاماژە بە دید و تێڕوانینی هەندێک لەو بەرپرسانە بدەم کە لە ڕووی

باری گوزەران و جۆری سیستمی بەڕێوەبردن؛ جیاوازییەکی زۆریان هەیە لەگەڵ بارودۆخی ئێستە و ژیانی سەردەمی شاخ، کە هەندێکیان بەئاستەم هاولاتییان دەتوانن سەردانیان بکەن و بیانبینن. چەند وتارێکم پێشوەخت لە چەند ماڵپەڕێکی گشتیی سەربەخۆدا بلاو کردبووەوە، دەمەوێت بە هەندێک دەستکاریی کەمەوە سەبارەت بە خۆدەوڵەمەندکردن و دوورەپەرێزی لە هاولاتییان و دەستبەردارنەبوونی پلەوپایەی و حیزب و دەسەلات؛ بۆ ئێوە ڕوون بکەمەوە. زۆرێک لە بینینی خەڵک بۆ دۆخی ئێستای یەکێتی، دەڵێن یەکێتی بووە بە کۆمپانیا. گەر بێ شەرم و سڵەمینەوە سەرنجێکی کورتی ئێستای سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بدەین، تێدەگەین لەوەی ئەم یەکێتییە قارەمان و جەستە زامدارە، ئەم ڕووباری خوێنە، ئەم هەموو خانووە قوڕانە، ئەم هەموو زیندانی سیاسی و قوربانیدانی هەڵەبجە و ئەنفال و هەزاران پێشمەرگەی کەمئەندام و تێکۆشەری دێرین و هەژاران؛ بە دەست دوو بەشی لەیەکنەچووی دژبەیەک بەڕێوە دەبرێت. بەشێک بەبێ ترس و خەم، خەریکی خۆدەوڵەمەندکردن و بازرگانیکردنە بە هەموو سەروەرییەکان و خەباتی شەهیدان و یەکێتییەوە. بێ شەرم دەست بۆ هەموو پیرۆزییەکانی یەکێتی و ئازاراکانی دەبات، بەشەکەی تری بە دڵ لەگەڵ هزر و زانست و خزمەتدا تێدەکۆشێ بۆ سەرخستنی زیاتری سەری بەرزی یەکێتی و بۆ بەرزترین پلەی سەرکەوتن.

**بەشی یەکەم، سێ جۆرن:**

جۆری یەکەم: هێزی دەرەکییان بە قۆناغ کردۆتە سەرچاوەی دەسەلات و هێزی خۆسەپاندن و بوونەتە جێی گرژی و ئاڵۆزی، تەواوی جەستەی یەکێتییان تەنیوە و لە سەرەوە وەک زەروورەتی سەپاو هاتوونەتە خوارەوە و لە جومگەکانی دەسەلاتدا خۆیان گیر کردووە و سوودیان لە نائارامیی گشتی و ژینگەی ململانێکانی ناوەوە وەرگرتووە بۆ مانەوە و سەرچاوەی دارایی دەرەکییان بۆ چاوبەستن لەگەڵ بازرگانیی ناوخۆ جۆین کردووە.

**جۆری دووهەم:**

هێزی ناوەکییە کە بەسەر ناوچە و خێڵ و دین و پاداشتدا دابەش بوون، گەرچی ئەم نموونانە ئاسانتر دەدۆزرێنەوە، بەڵام چارەسەریان قورستر و ئاڵۆزترە وەک لایەنی کۆمەڵایەتی و دۆخی سیاسیی کوردستان، بەتایبەتی دوای بینینی نموونەی بەرامبەر لە نەیار و دروستکردنی بەرژەوەندی، هەندێکیان هەمان سیستمی جاشایەتیی زۆرەملێیان گواستەوە بۆ ناو شۆڕش و حیزب تێگەیشتن بە بوونی هێز، دەتوانن دەوڵەمەند ببن و دەسەڵاتیش بپارێزن و بمێننەوە. ئەمانە لە ڕاو و ڕووتەوە بۆ ئاودیوکردنی شۆڤڵ و داگیرکردنی هەزاران دۆنم زەوی، خۆیان کردە خاوەن بیرە نەوت. کۆمپانیا زەبەلاحەکان و بەرژەوەندییەکانیان بردە دەرەوەی هەرێم و عێراق!

**جۆری سێیەم:**

تێکەڵەیەک لە هەردوو جۆری سەرەوە، بە ڕاگرتنی بالانسی موونەرمی لە پەستانی دەرەکی و شەڕی ناوەکی و باڵباڵێن بۆ خۆچەقاندن. بەکورتی و کوردوتەنی، بەبێ ڕەتووش ئەمانە یەکێتییان لە پڕۆژە و پەیڕەو و ستراتیجەوە بردووە بۆ دەستکەوت و هەڵپەی خواستی کەسی و یەکێتییان خستۆتە خزمەت خۆیانەوە، پێشیان وایە ئیتر کۆتایی دنیا بەستراوە بە کۆتایی ئەوانەوە و دەستبەرداری هیچ نابن و وا تێگەیشتوون کە خوێنی شەهیدانی یەکێتی لە چاویان دەچۆڕێ و دەبێ ئەوان شەڕی ڕاستەقینەی بۆ بکەن، دەنا بە دوورکەوتنەوە و مردنی ئەمان، یەکێتییش بێ سێ و دوو وەفات دەکات...

**بەشی دووهەمیش سێ جۆرن:**

**جۆری یەکەم:**

عەقڵی سیاسی و هزر و ڕۆحی یەکێتین، خاوەن پڕۆژە و ئامانجن بۆ گەل، بەری ڕەنج و خەباتی چەند ساڵەی خەباتی نهێنی و زیندان و شار و شاخی تێکۆشەرانن، هەڵگری زۆرترین ئازارن بۆ خەڵک و خەمڕەوێنی ڕاستەقینەی بنەماڵەی شەهیدان و تێکۆشەرانن، سەربەرز و ڕووسوورن،

پڕن لە تێگەیشتن و دنیابینین، ڕێ ڕۆشنکەری بەردەوامی خەباتی نوێن، ئەمانە ڕاوێژکاری ڕاستەقینەن بۆ گەڕانەوەی شارێی ڕزگاریی میللەتێک کە یەکێتیی تیا لەدایک بوو. بۆ ئەم نموونەیەش، هەندێک لە بەرپرسان و سیاستمەدار و خەڵکانی بەئەزموونی سەردەمی شاخ و دوای پرۆسەی ئازادیی کوردستان زۆرن، لە پێناو دورستکردنەوەی لۆژیکی عەقڵ و نوێبوونەوەیەکی پێشکەوتووتر.

**جۆری دووهەم:**

گەنجە خوێنگەرم و خاوێنەکانی دەستیان لە هیچ خراپە و بازرگانی و ملدانەوە نەگلاوە و وەک هێزی هەستانەوە، سنگیان کردۆتە قەڵغانی بەرگری و مانەوە لە تێکۆشانی تێکۆشەرانی یەکێتی و ئامانجەکەی کە ڕزگارکردنی کوردستان و بنەبڕکردنی گەندەڵی و بەد بەکارهێنانی حیزبە بۆ بەرژەوەندیی کەسی. ئەمانە جێی ئومێدێکی زۆرن و ئومێد دەکرێ ئایندەی یەکێتی پێش بخەن و لە پاشکۆ و پڕۆ حیزبەکانی هەرێم دەرمانبێنن. «پڕۆ» واتە لەگەڵ پرۆژەکە، لەگەڵ ڕەوتەکە، واتە لەگەڵ بوون، پاشکۆ ئەوانەن کە خۆیان هەڵواسیوە و دەیانەوێت سوود لە بەرهەمەکە ببینن و دەستکەوتیان هەبێت لە کاسەلێسەکان باشترن، پڕۆ ئەوانەن کە لەگەڵ پرۆژە فکرییەکەدان و دەستیان هەیە لە جێبەجێکردندا، بۆ نموونە پڕۆ پارتییەکان ئەوانەن لە دەرەوەی پارتی ئیش بە پرۆژەکەی پارتی دەکەن و باوەڕیان بە سەرکەوتن و توانا و تێگەیشتنی پارتی هەیە.

**جۆری سێیەم:**

هەموو ئەو کادرە خەمخۆر و دڵسۆزانەن کە شەویان خستۆتە سەر ڕۆژ و کار بۆ دروستکردنەوە و پشتیوانیی ئەو دوو جۆرەی سەرەوە خستۆتە گەڕ واتە جۆری دووهەم، ئومێدی ئایندە و سەرکردەی دوارۆژی گەلەکەمانن و دەیانەوێت سیستمی سیاسی بگۆڕن بۆ سیستمێکی مۆدێرن و سەرکەوتوو. لێرەوە بەرپرسیارێتیی گرنگ دەکەوێتە بەر ئەندامانی حیزب

و دەبێت ویژدان و مێژوویان پاک ڕابگرن و دەنگ بدەن بەوانەی دەیانەوێ دەنگیان دلێر و سەریان بوێر بێت.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، خاوەنی سەروەریی پڕ شانازی و سەرکەوتنە بەسەر دۆخە ئاڵۆز و دژوارەکانی مێژووی سیاسییەوە لە ناوچەکەدا. یەکێتیی نیشتمانی بە مێژووی خۆی؛ حیزبێکی چاونەترس و بوێر بووە و لە هیچ بەرپرسیاریەتییەکی مێژوویی خۆی نەدزیوەتەوە و تێکۆشاوە و سەرکەوتوو بووە. یەکێتی لە دەرەوەی خوێدا بەئاستەم توانراوە و کەس نەیتوانیوە بەرەنگاری بێتەوە وەک پەراوێزخستن و وەلانان و دوورخستنەوە. ڕێبازی یەکێتی لە خەڵکەوە بە خەڵک و بۆ خەڵک بووە، بەڵام زۆر بەداخەوە لە بارودۆخی ئێستەی سیاسی، بوونی بەرژەوەندیی تایبەتی و دەستکەوتی تاکەکەسیدا، هەندێکی نێو سەرکردایەتییەکەی ئاراستەی خزمەتکردنی خەڵک و بنەماڵەی شەهیدان و ماندوونەناسانی یەکێتییان بە مەبەستی کۆکردنەوەی سەروەت و سامانی تایبەتی بۆ بنەماڵە و خۆیان هاوپێچ کردووە. تەواوی ئۆرگانەکانی جەستەی یەکێتییان داڕزاندووە و نیوە پەککەوتە و نیوە مردوو کردووە و دەیانەوێت هەموو ئەندامانی یەکێتی بێدەنگ بن بەرامبەر گیانەلا، «گیانەلا» کەسێک کە لە سەرەمەرگدایە و نەمردووە، لەسەر سپاردنی گیانە بە مەرگ و لە کۆتایی نزیک دەبێتەوە و گیان دەسپێرێ. یەکێتی و پەککەوتنەکەی بۆتە بێئومێدی زۆری شۆڕشگێڕ و ماندوونەناسەکانی یەکێتی. بەبێ دوودڵی دەبێت هەموو دڵسۆز و خەمخۆرانی یەکێتیی نیشتمانی بەبێ گوێدانە هیچ بەرژەوەندییەکی تاکەکەسی، هیممەت بکەن و دڵنیا بن لەوەی یەکێتی دەبێت بە قۆناغی هەڵسانەوەدا تێپەڕێ و ئاوڕ لە پەککەوتە و پەککەوتەییەکانی ناو پەکخستن نەداتەوە و هیچی تر خۆی نەخڵافێنێت بە ژمارەی سواو و سەقەتەوە کە جگە لە سڕینەوەی جوانییەکانی تری یەکێتی، هیچی تر سەوز ناکەن بۆ کەسوکاری شەهیدان و یەکێتی و کوردستان. لە دواجاردا دەبێت بزانین یەکێتی قوربانیی دەوێت، قوربانییش خوێنی نوێ و هێزی نوێی دەوێت و

دەکرێ، نەک کەسێک کە خۆی بەتۆپزی توانای هەنگاوێکی نەبێ و داوا لە ئەندامانی بکات هیممەت بکەن تاکوو یەکێتی سەر بکەوێت.

ئەم دەربڕین و تێبینییەشم دەبێتە پاشکۆی یادەوەرییەکانم، بەندە لە ساڵی ۱۹۷۹دا وەک زۆرێکی لە زەمەنی شۆڕش و خەباتی کورددا، پێخزاوی قوڕ و گۆم و چڵپاوی ژیانی سەخت و گلانی ڕۆژگارم چەشتووە، لە پێناو شۆڕش و ئەرکی بەرپرسیارێتی و هاوخەمی و دڵسۆزیم وەک هاونیشتمانییەک، بۆ ماوەی بیست ساڵ لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە حوکم دراوم، پتر لە دوو ساڵی ئازار و ئەشکەنجەدانی نێو زیندانەکانی دائیرەی ئەمن و ئیستخبارات و هەیئەی خاسە و زیندانەکانی ئیسخباراتی شاری سلێمانی و کەرکووک و بەغدام چەشتووە، بۆ ماوەی چوار جار لەنێو شاری سلێمانی و داستانی قەیوان ماوەت و شەڕی دەستەویەخەی نێو دۆڵەڕووتی سنووری شاری سلێمانی بریندار کراوم، چەندین جار چانسی ژیانەوەم بە مەرگی لەناکاو و ڕێکەوت سپاردووە و گەڕاومەتەوە ناو هاوڕێ و هاوسەنگەران و ڕۆحلەمشت بووم بۆ دووبارەبوونەوەی ئەو مەرگە هەڵبژێردراوە لەنێوان دۆزینەوەی بوون و نەبووندا بۆ خەبات و شۆڕش و گەلەکەم. ئەم مێژووە لەسەر بنەمایەکی جیاوازتر لە نووسینەوەکانی تری هاوڕێیانی زیندان و شار و شاخ گەلاڵە بووە، زادەی خوێن و کەلەپچە و هەڵواسینی ئازارەکانی نێو زیندان و شڵپەی دەنگی گوللەی کاسە سەر و ڕاکردنی کووچە و کۆڵانەکانی نێو شار و قریوەی دەستوەشاندن و سەربزێویی تۆڵەکردنەوەی شەهیدان و بەرهەمی ئارەقەی ژێر دەوار و سەنگەرەکانی بەرگری و دەنگی نارنجۆک ئەنداز و ئاڕبیجی و بیکەیسی و خوێنی شەهیدان و ئازاری گوندنشنیان بوو. نووسینی ئەم یادەوەرییە، شکۆی گەورەی شەهیدان و سەروەرییەکانی شاخ و کەسوکاری سەربەرزیان بوو، ئەمە نووسینەوەی یادەوەرییەکانی ناخی پێشمەرگەیەکی گیانفیدای بەئازارە کە تەمەنی حەڤدە ساڵان بوو کە ویستی بە تەقاندنەوەی دوو نارنجۆک (ڕومانە) لەنێو سەنتەری شاری سلێمانی پڕ حەشامەت و تەنیو لە چەکدارانی دامودەزگا دڕندەکانی ڕژێمی بەعسدا

گەلەکەی سەر بخات و ئاسوودەیی بنۆشێت، نەک وەک بارودۆخی ئێستە بەر گلۆڵەیەک لە برین و غەمی سەختی میللەتەکەیدا بکەوێت و بە ئاڵۆزکاوی و بێچارەیی بیانبینێت، کە ڕۆژانە بێشەرمانە سەدان کەمتەرخەمی بەرامبەر بە بنەماڵەی شەهیدان و خەباتی تێکۆشەرانی دەکرێت، ئەوەش هۆکاری ئەوەیە ئەم دەستبردنە بۆ مێژووە دەبێتە خواستی زۆرینەی تێکۆشەران و زیندانیانی سیاسی و ئەندامانی نێو ڕێکخستن و کادرە دێرینەکان و دروستبوونی پرسیاری گەورە و سەرنج و تێبینی، نەک خۆبەگەورەزانین و خۆزلکردن بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوتی تاکەکەسی، کە لە ئێستادا بۆتە مایەی شەرمەزاری بۆ زۆرێک کە تەنها خۆیان دەبینن و بە هیچ شێوەیەک نایانەوێت هیچ کەموکورپییەکان و سیستم و دەستوور و یاسای ئەقڵیەتی شاخ و تاوان و دیل کوشتنی شەڕی نێو حیزبەکان و خۆشاردنەوەی هەندێک لە بەرپرسان لە کیمیاباران و ناردنی خانەوادەیان بۆ هەندەران و خۆحەشاردانیان لەنێو بارەگا دوورەکانی سەر سنوورەکان و ناردنی پێشمەرگە بۆ پێشەوەی بەرەکانی جەنگ، هیچ شتێک لەمانە و لە ڕابردوویان بەبیر بهێنرێتەوە کە کوڕی خەڵکیان دەکردە قوربانی و خۆشیان بە ژێری و ژیان و خوێنی ڕژاوی پێشمەرگەیان کردە پارە و تەلاری بەرزی چەند نهۆمی خۆشگوزەرانی بۆ خۆیان و نەوەکانیان.

بەدڵنیاییەوە ترسی دەستبردن و باسکردن و گێڕانەوەی چیرۆک و بەسەرهاتی دڵتەزێنی ئەو هەموو ئێسک و پرووسکە سووتماکەی شۆڕش و شاخ، نەک کارێکی ئاسان و گرانە، بگرە خوێناوی و تۆڵەسێنەرەوەیە بۆ من و بێگومان دەبێتە کەیسێکی کەسی بۆ نێوانی من و نەیارانم، کە تێیدا بەشانازییەوە بڕیارم داوە تەمەنی مانەوەم بە خزمەتکردنی خوێنی شەهیدان و هاوسەنگەرانم ببەخشم، کە بۆ شۆڕش و کوردایەتی دەستبەرداری هەموو حەز و ئارەزووەکانی ژیان و هەموو تەمەنی لاوێتییان بەخشی. بەڵێنتان پێ دەدەم تا دوا هەناسەم بەرگریکاریان دەبم و لە گۆ و دەست ناکەوم بەرامبەر بە هیچ کەموکورپییەک و کەمتەرخەمییەک و ڕاستییەکان وەک

خۆی باس دەکەم. گرنگیی ئەم جۆرە مێژووانە بۆ ئایندەی نەوەکانی داهاتوو، دیاریکردنی جۆری خەبات و تیۆری سیاسی و هزری ئامادەبووی نوێیە بۆ ژیان و دەستکەوتەکانی ڕابردوو، پەردە لادانە لەسەر خەباتی چەوتی و چەواشەکاریی کەسی و مەرامی بۆگەنیان بۆ سەرخستن و دەستخستنی هەندێک لە کەمییەکانی تێپەڕیو کە تێیدا زۆرینەیان پەشیمانی دەچێژن.
بەندە لەدوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١دا ژیانی هاوسەرگیریم پێک هێنا، لە ساڵی ١٩٩٥دا ڕووم لە دنیای غوربەت کرد و لە شاری نورنبێرگ (-nürn berg) ئەڵمانیا مافی پەنابەرێتیم وەرگرت. لە هەمان ساڵدا وەک ئەندامێکی ڕێکخستنی یەکێتی لەو شارەدا، کە بەرپرسی ڕێکخستن؛ کەمال سەرگەڵوویی بوو، لە ئێستەدا لە مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانی لە شاری سلێمانی خزمەت دەکات، کاری ڕێکخستنم دەکرد. لە ژیانی هاوسەرگیریمدا دوو کچ و دوو کوڕ بە ناوی سیڤان کە لە ئێستەدا سەرقاڵی خوێندنە لە زانکۆ، وشە قوتابیی ناوەندییە، کوڕەکانم (کۆبین، کۆڤان) دەرچووی قوتابخانەی ئامادەیی لە ئەڵمانیان. لە ساڵی ١٩٩٧دا سەرقاڵی نووسین و کاری ڕاگەیاندن و لەگەڵ دروستبوونی سایت و ماڵپەڕە گشتییەکان، مەکتەبی ڕێکخستنی یەکێتی و «pukmedia» لە گۆڤاری لڤین و ڕۆژنامەی هاوڵاتی و ماڵپەڕی گشتی و وتاری کورد و «NRT» و زۆرترین ڕۆژنامەی ئەلکترۆنیی ئەهلیی سەربەخۆ و ئازاد بابەتی ڕەخنەیی و مێژووی سیاسی بڵاو کراوەتەوە، لە ساڵی ٢٠٠٩دا لە ئەڵمانیا شاری «Ludwigshafen»دا، ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری ڕێکخراوی پەپوولە (schmetterling)ی منداڵان و لە ساڵی ٢٠١٥دا ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری بازنەی ئەڵمانیای پلاتفۆڕمی و دابڕان و ئەندامی کۆنفرانسی ڕێکخراوی گشتیی پلاتفۆڕمی دابڕان، لە زۆربەی زۆری شارەکانی ئەڵمانیا، کۆڕ و چالاکییەکانمان بۆ چەندین ڕۆشنبیر و پرۆفیسۆر و خاوەن بڕوانامەی دکتۆرای زانکۆی وڵاتە بیانییەکان ئەنجام داوە، بۆ ژیانێکی نوێی ئاوارەیی چنی؛ بە ماندووبوون و چنگەکرێ و هەژاری، ڕێگا سەختەکانی ماندووبوونم کردە کامەرانی و

سەرکەوتنم بۆ گرکانی ئاسوودەیی دەچوون لە فەنابوون! کورتی و چەوتی ڕێگا و خواستەکانی نەهامەتی ئێمەی وەک خێزان دابڕاند و دەرگای تەنهاییم کەوتەوە ڕێ. بوومەوە بەو بابردەڵیی مەنفا و لەگەڵ نەوڕەسەکانی پاییزدا کۆچی دوا لانەی خۆمم کرد و چوومەوە ناو هێلانەیەکی تەنها و ساردی بێنەوا. لەگەڵ هزر و سۆز و یادگارییەکانی خۆمدا، کەوتمەوە بەرکەوتن و چوومەوە دنیای خەونە ترسناکەکانی زەمەن و گەڕامەوە بۆ نێو کونجی زیندانەکانی زەمەنی لاوێتیم و مەرگ و دووکەڵ و مەتەرێز؛ بوومەوە تەنها و تەنهایی منی کردەوە بە پێڵووی چاوێکی تیژی نەترووکاو، دۆست و هاوڕێی و هاوسەنگەرانم چوونە جێگەی ڕاستەقینەی خۆیان، بەشانازییەوە ئەوانەم بۆ ئاشکرا بوون دەمەوێت لە کەلێن و درزی ئەو دەرگای ڕاستییەوە کۆتایی بە نووسینی ئەم یادەوەرییەم بهێنم و بڵێم وەک پێشمەرگەیەکی چنگ پڕ لە گوللەی ناخ بەئازار لە هەر هەڵەیەکی ڕێنووس و زمانەوانی و بەدحاڵیبوونێکی نەشیاو، لە نەگەیشتنی وتەکانم وەک خۆی ببورن، چونکە دەمەوێت لە ڕاستیی ڕووداو و تاوانەکان و ئەو بەسەرهاتانەی لە تەمەنی ژیانی خەباتمدا بە چاوی خۆم بینومن و کە خۆشم بەشێکی گرنگی ئەو مێژووەم، لە ڕاستیی بابەتەکان خۆم لا نەدەم و چاونەترس و بوێرانە هەروەک سەردەمی پێشمەرگایەتی بەبێ سڵەمینەوە دەست بۆ ئازارەکانی ببەم...



لە ڕاستەوە شەهاب کەریم/ ئەردەلان ئیسماعیل عارف،
ساڵی ١٩٨٢

کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکانی کوردستان

لقـی هەندەران

ئەنجومەنی باڵا

کۆمیتەی ئەڵمـــانیا

TEL: 0172711442

E.mal : haure.kamaran@yahoo.de


بابەت / بانگهێشت

زۆر بەڕێز : نووسەرو ڕۆشنبیر هەڤاڵ " شەهاب کەریم "

سڵاوێکی گەرم : هیوامان سەرکەوتن وبەختەوەریتانە..

لە یادی چلەمین ساڵرۆژی دامەزراندنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستاندا کۆمیتەکەمان لەسەعات 16:00 ی ڕۆژی 31.05.2015 ڕێورەسمێکی شایستە دەگێڕێ وبەڕێزتان بۆ ئەم یادکردنەوەیە بانگهێشت کراون، بەشداریتان مایەی خۆشحاڵیمانە.

لەگەڵ ڕێزماندا.

ئەدرەس :

Oberdorfstraße 45

53757 Sank Augustin – Buisdorf

کۆمیتەی ئەڵمانیای کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکان

لیژنەی سەرپەرشتی مەراسیم



شەهاب کەریم. مەدالیای ڕێزلێنان لە لایەن کۆمیتەی ئەڵمانیای کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکان کوردستان



لە ڕاستەوە شەهید عەبدوڵا سدیق سوارە/ شەهید جوامێری سەرتیپ



نورەدینی برام، ناسراو بە سەربەست



تاكوو بەڕاستی تفەنگێكت بە دەستەوە نەبێت، تێناگەیت گوللە چی دەبڕێ و ئازارەكەی چۆنە! تاكوو پێشمەرگەیەكی گیانلەسەردەست نەبیت، تێناگەی نرخی گیانبەخشین چەندە و بەخشندەش كێیە! تاكوو پەلاماری نانەڕەقی نێو كوانووی ڕۆژانی خەبات نەدەیت، تێناگەیت برسێتی چییە! ئەمانە لێكدانەوە و پرسیارێكردنی كەسێكی سادەن بۆ ژیانێك كە ساڵانێكی زۆر چڕەدووكەڵ و بۆنی barووتی لە شار و شاخ و زیندانەكان هەڵگرتووە، پریشكی گڕ و پەڵەی بەجێماوی خوێنی شەهیدی لێ بەجێ ماوە. نووسینەوەی ئەم مێژووە، دیوێكی تری پێچەوانەی گێڕانەوە دێرینەكانە كە لە خەباتی پێشمەرگەوە بۆ جیهانە فراوانەكەی سیاسەت و دەسەلات تۆماریان كردووە. ئەو مێژووەی كە بەشێك لە دەسەلاتداری كوردی نووسیویانەتەوە، بەئەنقەست ئەو پرسیارانەیان پشتگوێ خستووە كە وەڵامەكەی بە خراپ بەسەر خۆیاندا دەشكایەوە. ئیتر لێرەوە لوولەی تفەنگی پێشمەرگەیەكی دێرینی پڕ لە بەخشین و قوربانی دێتە دەنگ و هەندێك نهێنیی ڕاستەقینە بۆ مێژوو تۆمار دەكات، كە ڕەنگە تەقاندنی دوا فیشەكی تفەنگەكەی خۆی بێت.



# A HISTORY FROM GUN BARREL

shahab karim